# صحيح ابن خزيمة

## بە کوردی



للإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السلمي النيسابوري

بەرگی یەکەم

وەرگێرانی

عباس محمد أمين




پڕۆژەی پیت
بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرمووده

# صحيح ابن خزيمة
## بەکوردی

نووسینی: الإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السُّلمي النّيسابوري
وەرگێڕانــی : عــباس محــمد أمــين
دیزایینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
هەڵەچن و ڕێنووس : بڕیـار هێرۆیی
خــەتی بــەرگ : ســتـافــی پیــت
چـاپــی یەکــەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ز
٦٤٩ لاپــــەڕە
٢٤ × ١٧ ســـم
بابـەت : ئـایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ١١٣ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ پێ دراوە











# صحيح ابن خزيمة

## بەكوردى




نووسينى

الإمام أبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السُّلمي النّيسابوري

وەرگێڕان

عباس محمد أمين

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

پاش ستاییشی شایستە بۆ خوای بەخشندە، صەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر باشترین بەندەی خوا موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی ....

لەخزمەتدابوونی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە هەر شێوازێك شەڕەف و گەورەییەکی زۆرە بۆ خزمەتکارەکەی.

ئێمە وەك ستافی پیت، بە هاوکاری کۆمەڵێك مامۆستای قەدرگران و ئەهلی عیلم و خاوەن توانا و خاوەن عەزم، بڕیارمان دا لە ماوەیەکی دیاریکراو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە وەربگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- نەبوونی ئاشنایەتی ئەم نەوە نوێیە بە زمانی عەرەبی، کە ئەمەش دواجار دەبێتە هۆی بێبەشبوونی نەوەی داهاتوو لە گەورەترین زانست کە میراتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢- هەژاری کتێبخانەی کوردی لە کتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە تا ئێستا وەك پێویست کاریان لەسەر نەکراوە و وەرنەگێڕدراون.

لە ڕاستییدا ئەم پڕۆژەیە بە هیچ جۆرێك ئامانجی بازرگانی و قازانجی ماددی لە نییەتدا نییە.

داوای تەوفیق و هاوکاری لە خوای پەروەردگار دەکەین، لە دوعای خێری خۆتان ئەم ستافە و کارەکەی لەبیر مەکەن.

**ستافی پیت**

٢٢ / ١٠ / ٢٠٢٢



# پێشەکی وەرگێڕ

هەرچی حەمد و سوپاس و ستاییش هەیە بۆ پەروەردگاری مەزن، درود و سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەری شیرین موحەممەد ﷺ سەروەر و پێشەوای مرۆڤایەتی، زەریایەك ڕێز و شکۆ بۆ هاوەڵانی کە بە شوێنکەوتنی ئەو زاتە پاکە ﷺ بوون بە پێشەنگی مرۆڤایەتی، وە سۆز و میهرەبانی خوا بباریٚ وەك لێزمەی بارانی بەهار بەسەر دڵ و جەستە و ڕووحی هەموو هەڵگران و خزمەتکارانی فەرمووده و فەرموودەناسان و دڵسۆزانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ تا ڕۆژی دوایی ...

بێگومان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ سەرچاوەی دووەمی ئیسلامە لەدوای قورئان، بۆیە پارێزگاریکردن لێی و داگیرساندنی داینەمۆکەی و کردەوەپێکردنی ئەرکێکی زۆر پیرۆزە، لە هەمان کاتدا کارێکی گرانە و بە هەموو کەس ناکریٚ، شوێنکەوتووانی دڵسۆزترین و ژیرترینی نێو موسوڵمانانن، جا هەر کەسێك دەست بگرێت بە قورئان و سوننەتی ڕاست و دروست هەرگیز سەرگەردان نابێت.

خوێنەری ئازیز!

ئەم پەڕتووکەی لەبەر دەستتدایە یەکێکە لەو پەڕتووکانەی کە فەرموودە ڕاست و دروستەکانی پێغەمبەری ﷺ تێدا نووسراوە، بێگومان ئەمیش بەرهەمی مرۆڤە، مرۆڤیش پارێزراو (معصوم) نییە لە هەڵە و پەڵە، جا دەگونجیٚ بە ڕێژەیەکی کەم فەرموودەی لاوازی تێدا بێت، بێگومان لە پەراوێزدا ئاماژەیان پیٚ کراوە.

ئەوەی گرنگە بیزانیت ئەوەیە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەریایەکی بێبنی جۆراوجۆرن، هەرگیز ئاوی وشك ناکات، ئەگەر مرۆڤ تەواوی تەمەنی لە پێناو زانستی فەرموودە بەکار بێنیٚ هێشتا ناتوانێت دەوری بەشێکی بدات، بۆیە ئامۆژگاریم بۆ تۆی خوێنەر ئەوەیە:

تکایە لە خۆتەوە فەرموودەیەك دەرمەهێنە و پاشان بچی فەتوای پیٚ بدەی، بەڵکوو لە هەر شوێنێك ئاڵۆزییەك لە تێگەیشتنی فەرموودە هەبێت، یان دوو فەرموودەی بە

ڕواڵەت دژیەکی هێنا بێت، ئەوە دانەر خۆی دکتۆرە لەو بوارەدا، ئیبنو صەلاحی شارەزووری ﷺ وتەکەی گواستۆتەوە کە گوتوویەتی: (لا أَعْرِفُ أَنَّهُ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ حَدِيثَانِ -بإسنادَينِ صَحِيحين- مُتَضَادَّيْنِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ فَلْيَأْتِني بهِ لأُؤَلِّف بَيْنَهُمَا)، واتە: دوو فەرموودەی صەحیح نابینم لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدرابێتەوە و دژی یەکدی بن، جا هەر کەسێکیش شتێکی لەو جۆرەی لایە با بۆم بێنێ هەتا کۆیان بکەمەوە، قورسایی ئەم وتەیە تەنها و تەنها هەڵگرانی زانستی فەرموودە و (فِقە) لێی تێدەگەن، ئەوانەی تەمەنی خۆیان لەو پێناوەدا بەکار هێناوە.

وە لە هەر شوێنێك دانەر ڕوونکردنەوەی نەدابێت، ئەوە هەوڵم داوە بەپێی توانا ئەو ئاڵۆزییە ڕوون بکەمەوە، بۆیە دەکرێ فەرموودەکان بچوێنین بە دەرمانخانەیەك، کە جۆرەها دەرمانی تێدایە، نەخۆش ناتوانێ لە خۆیەوە دەرمانێك ببات و بەکاری بێنێ، بەڵکوو پێویستی بەوەیە دکتۆرێك باسی چۆنییەتی بەکارهێنانی دەرمانەکەی بۆ بکات، ئەو دکتۆرەش کەسانی زانا و شارەزان لە فیقهی زانستی فەرموودە و زانستی شەرعی بەگشتی.

**هەندێک زانیاری دەربارەی نێوەڕۆکی ئەم پەڕتووکە بەهادارە:**

یەکەم: خودی دەستەواژەی پەڕتووکەکە تا ڕادەیەك وشك و قورسە، هەوڵم داوە تا بکرێ بە شێوەیەك وەریبگێڕم هەموو، یان زۆربەی خەڵك لێی تێ بگەن.

دووەم: هەموو سەرباسەکانی ئەم پەڕتووکە تێگەیشتن و ڕاوبۆچوونی خاوەنەکەی بۆ ئێمە باس دەکات، سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە دەیهێنێت.

سێیەم: بەشێك لە سەرباسەکان دانەر قسە لەسەر بەراوردی زمانی عەرەبی دەکات، بۆیە کاتێ دەکرێتە کوردی خوێنەر بەئەستەم لێی تێ دەگات، مەگەر کەسێك بێت خۆی زۆر شارەزا بێت لە زمانەکەدا، یاخود باس لە زانستی (أصول الفقه) دەکات، هەموو کەس ناتوانێت لەو دەستەواژانە تێ بگات.

چوارەم: لە هەر شوێنێك ئەم ڕستە هاتبوو: (فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ) ئەوە بەشێك لە فەرموودەکەی هێناوە.




پێنجەم: لە هەر شوێنێك وشەی: (المُطَّلِبي) بەكار هێنا، مەبەستی پێی ئیمام شافیعییە، چونكە خۆی لەسەر ئەو مەزهەبە بووە.

**گرنگترین كارەكانم لەم پەڕتووكەدا، لە چەند خاڵێكدا دەخەمە ڕوو:**

یەكەم: لەبەر بەرژەوەندی خوێنەر سەنەدی فەرموودەكانم لابردووە، تەنها ناوی ئەو هاوەڵەم هێناوە كە فەرموودەكەی گێڕاوەتەوە، هەندێ جار درێژەم داوە بە سەنەدی فەرموودەكە، چونكە باسكردنی سەنەد لەو شوێنە پێویست بووە كە باس بكرێ.

دووەم: لە هەر شوێنێك ئەبو بەكری كوڕی خوزەیمە قسەی لەسەر سەنەدی فەرموودە كردبێ، بە هەمان شێوەی سەنەدەكان سڕیومەتەوە، مەگەر زۆر پێویست بووبێت، ئەو كات سەنەدی فەرموودەكەم داناوە، هەرچیش پەیوەندی بەو بابەتەوە بووبێت لە ناوی گێڕەرەوەكان و تەعدیل و تەخریجكردنیان لەلایەن پێشەوا ئەبو بەكر ئیبنو خوزەیمە هێناومە.

سێیەم: بەشێكی زۆر لە وشە گرانەكانم بۆ خوێنەر ڕوون كردۆتەوە، هەروەها لە هەر شوێنێك پێویستی بە ڕوونكردنەوە بووبێت ڕوونم كردوەتەوە.

چوارەم: هەوڵم داوە فەرموودەكان دەقاودەق وەربگێڕم، تا خوێنەر وەكوو خۆی لێی تێ بگات.

لە كۆتاییدا، كۆتا قسەم ئەوەیە مرۆڤ خاڵی نییە لە هەڵە، هەر هەڵە و پەڵەیەك هەبوو ئەوە لە منەوەیە، وە هەموو ڕاستییەكانیش بە یارمەتی خوا بووە.

**عباس محمد أمین**

**خوێندكاری دكتۆرا - ١٥/ ٩ / ٢٠٢٢**



رقم الخزانة: / - /

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدُ للهِ ربِّ العالمين، والصلاةُ والسلامُ على نبينا محمدٍ وعلى آله وصحبه أجمعين.

**أما بعد**، فقد أذنت لمشروع "**بيت**" للخدمة الحديثية ترجمة تحقيقي لكتاب صحيح ابن خزيمة، ونقل أحكامي، أسأل الله لي ولهم التوفيق والسداد، وأن ينفع المسلمين أجمعين بعملهم.

٢٧/ رمضان/ ١٤٤٢







د. ماهر ياسين الفحل




## سوپاس و پێزانین

دوای سوپاسگوزاری خوای گەورە، جێی خۆیەتی کە لە ناخی دڵمەوە ڕێز و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ستافی (ڕێکخراوی پیت) بکەم کە زۆر بە بایەخەوە و بێ سڵکردنەوە لە ماندووبوون، گیانفیدایانە دوای هەڵەچنین و پێداچوونەوەی زانستی وەرگێڕان، ئەم بەرهەمە بەپێزەیان گەیاندە قۆناغی چاپکردن، وە خستیانە بەر دیدی خوێنەرانی بەڕێز، وە حەقی خۆیەتی لێرەدا سوپاسیان بکەم کە یارمەتییان داوم لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە، هەروەها سوپاسی ئەو ئازیزانە دەکەم کە زۆر بەدڵسۆزییەوە پێداچوونەوەی ورد و دەقیقیان بۆ ئەم پەڕتووکە گەورەیە کرد، هیوادارم نموونەیان زۆر بێت و هەمیشە سەرکەوتوو بن، بێگومان پاش یارمەتی خوای گەورە، ئەگەر دڵسۆزی و خەمخۆری ئەوان نەبووبایە بە هۆکار، ئەوە ئەم بەرهەمە لە شوێنی خۆیدا قەتیس دەبوو، ساڵانێکی زۆری پێویست دەبوو بکەوێتە بەر دیدی خوێنەران، دیارە ئەوان خزمەتی فەرمایشتی کەسێکیان کردووە خوا لە وەسفیدا فەرموویەتی: ﴿بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٢٨﴾التوبة. واتە: بۆ بڕواداران بەسۆز و بەبەزەیی بوو. وە ئەو پیاوە بەوەفاترینی مرۆڤەکانە، لە کاتێکدا دێتە هانایانەوە مرۆڤەکان هەموویان هەڵپەی نەفسی نەفسی دەکەن.

هەروەها زۆر سوپاسی هەریەك لە بەڕێزان (د. هۆشمەند و مامۆستا موحەممەد گردەشێخاڵی) دەکەم، کە پێداچوونەوەی زانستیان بۆ ئەم پەڕتووکە کرد.

هەروەك سوپاسی خێزانی ئازیز و بە وەفام دەکەم، کە چەندین جار بەوردی کاری هەڵەچنینی بۆ نووسینەکانم کردووە، حەقی خۆیەتی پێزانینی ئەوم هەرگیز بیر نەچێت، چونکە ئەو گەورەترین هۆکارە لە پشتی هەموو نووسینەکانمەوە.

لە کۆتاییدا داواکارم لە پەروەردگاری مەزن جێ پێی ئەم ستافی (پیت)ە چەسپاو بکات، شوێنی دەستیان پتەو بکات، دڵیشیان دامەزراوتر بکات، بۆ خزمەتکردنی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە هەنگاوەکانیان بە ئامانج بگەیەنێ و بەخێری بگێڕێ بیانخاتە ژێر چەتری ڕەحمەتی خۆی لە دنیادا بۆ خزمەتکردنی ئەم ئیسلامە، لە ڕۆژی دواییشدا شاد و دڵخۆشیان بکات بە دیداری فەخری عالەم رسول الله ﷺ.

**عباس محمد أمين**

## پوختەی ژیانی پێشەوا ئیبنو خوزەیمە ﷬

**ناوی، نازناوی، لەدایکبوونی، گەشەی زانستی:**

زانای پایەبەرز و ناودار خاوەنی چەندین پەڕتووك، ئەبو بەکر ﷬ موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خوزەیمەی کوڕی موغیرەی کوڕی صاڵیحی نەیسابوری (کە شارێك بووە لە شارەکانی خوراسان)، لە مانگی صەفەر لە ساڵی (٢٢٣) دوو سەد و بیست و سێی کۆچی چاوی بە دونیا هەڵهێناوە لە شاری نەیسابور، هەر لە منداڵییەوە گرنگی داوە بە فەرمووده و (فِقه)، لە سەردەمی خۆیدا ئەوەندە بەتوانا و بلیمەت لێهاتوو بووە، نموونەیان پێی هێناوەتەوە.

**مامۆستاکانی، خوێندکارەکانی:**

پێشەوا ئیبنو خوزەیمە ﷬ وەکوو هەر زانایەك هەر لە منداڵییەوە دڵسۆزانە سوور بووە لەسەر وەرگرتنی زانستی شەرعی و گەڕان بەدوایدا، لەسەر دەستی زانایانی ناوچەکەی گەشەی کردووە، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا گەشتی بۆ زۆربەی وڵاتەکان دەست پێ کردووە بەمەبەستی وەرگرتنی زانست، لەوانەش: شاری مەر، ڕەی، شام، جەزیرە، میصر، بەغدا، واسیت، بەصرە، کوفە، هەمەدان، وە لەلای زۆرێك لە زانایان زانستی شەرعی و فەرموودەی وەرگرتووە، لێرەدا ئاماژە دەکەم بە هەندێك لەو مامۆستا و زانایانەی کە زۆرترین فەرموودەی لێیانەوە وەرگرتووە و لە صەحیحەکەیدا دایناوە:

١- موحەممەدی کوڕی بەشاری کوڕی عوسمانی کوڕی کەیسان ﷬، دانیشتووی بەصرە ناسراو بە بوندار، (٥٦٠) پێنج سەد و شەست فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٢- موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی عەبدوڵای زوهلی ﷬، دانیشتووی نەیسابور، (٣٠١) سێ سەد و یەك فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٣- عەبدولجباری کوڕی عەلائی کوڕی عەبدولجەباری ئەلعەتار ﷬، دانیشتووی بەصرە، (٢٢٣) دوو سەد و بیست و سێ فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٤- یەعقوبی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی کەسیر، ئەبو یوسفی دەوڕەقی ﷺ، دانیشتووی بەغدا، (٢٢٢) دوو سەد و بیست و دوو فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٥- موحەممەدی کوڕی موسەنای کوڕی عوبەیدی کوڕی قەیس ئەبو موسا ﷺ، دانیشتووی بەصڕە، (٢٠٦) دوو سەد و شەش فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٦- یونسی کوڕی عەبدولئەعلای کوڕی موسا، ئەبو موسای صەفدی ﷺ، دانیشتووی میصر، (١٧٨) سەد و حەفتا و هەشت فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٧- یوسفی کوڕی موسای کوڕی ڕاشد، ئەبو یەعقوب ﷺ، نیشتەجێی بەغدا، ناسراو بە ڕازی، (١٥٤) سەد و پەنجا و چوار فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٨- ئەحمەدی کوڕی عەبدەی کوڕی موسا، ئەبو عەبدوڵا ﷺ، دانیشتووی بەصڕە، (١٤٣) سەد و چل و سێ فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

٩- سەلەمی کوڕی جەنادەی کوڕی موسلیم، ئەبو سائیب ﷺ، دانیشتووی کوفە، (١٤٢) سەد و چل و دوو فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

١٠- سەعیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حیسان، ئەبو سەعید ﷺ، دانیشتووی مەککە، (١٢٢) سەد و بیست و دوو فەرموودەی لێیەوە گێڕاوەتەوە.

**خوێندکارەکانی:**

کاتێ کە ئیبنو خوزەیمە گەیشتە پلەیەکی بەرز لە زانستی شەرعی خەڵکانێکی زۆر ڕوویان تێ کرد، بۆ ئەوەی زانستی لێ وەربگرن، لێرەدا تیشك دەخەینە سەر هەندێك لە خوێندکارەکانی:

١- ئیبنو حیبان موحەممەدی کوڕی حاتیم، ئەبو حاتیمی بوستی ﷺ.

٢- ئیبراهیمی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ.

٣- ئەبو حامدی کوڕی شەرقی ﷺ.

٤- ئەبو عەلی حوسەینی کوڕی موحەممەدی نەیسابوری ﷺ.

٥- ئەبو عەمری کوڕی حەمدان ﷺ.

**٦- ئەحمەدی موحەممەدی کوڕی بالوەیە، ئەبو حامید ﷺ.**

هەروەها کۆمەڵێك لە مامۆستاکانی حەدیسیان لێیەوە ڕیوایەت کردووە، لەوانەش: پێشەوایان بوخاری و موسلیم لە دەرەوەی صەحیحەکانیان، وە ئەبو عەبدوڵای موحەممەدی کوڕی یەحیای زوهلی (رحمهم الله).

**بوێری و زیرەکـی ئیبنو خوزەیمە ﷺ:**

پێشەوا ئیبنو خوزەیمە ﷺ پیاوێکی مەرد و بەغیرەت بوو هەرگیز لە دەسەڵاتدار نەدەترسا لە وتنی هەقدا، جا خۆی دەڵێ: ڕۆژێك لەلای کاربەدەستێك بووم بە ناوی (ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەد)، لە باوکیەوە فەرموودەیەکی گێڕایەوە، لە سەنەدەکەیدا هەڵەی کرد، منیش هەڵەکەم بۆی ڕاست کردەوە، کاتێك لەلای دەرچووم ئەبو زەڕی دادوەر وتی: ئێمە بیست ساڵە دەزانین ئەو فەرموودە هەڵەیە، یەکێکمان جورئەتمان نەکردووە ڕووبەڕوو ڕەدی بکاتەوە، منیش پێم وت: دروست نییە بەلامەوە گوێم لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێت هەڵە و پەڵەی تێدا بکرێ، وەڵامی نەدەمەوە.

**پلە و پایەی ئیبنو خوزەیمە ﷺ لەلای زانایان:**

لەبەر ئەوەی خاوەن زانست و پلە و پێگەی تایبەت بوو، زمانی زانایان لە وەسف و پیاهەڵدانی نەوەستاوە و بەجوانترین شێوە باسیان کردوە، بە باشم زانی هەندێك لەو وتە جوانانە بخەمە ڕوو:

پێشەوا ئیبنو حیبان ﷺ دەڵێ: هیچ کەسم نەبینیوە لەسەر زەویدا هێندەی ئەو جوان لە فەرموودە تێ بگات و دەستەواژەکانی وەکوو خۆی لەبەر بکات، تەنانەت هەموو سوننەتەکان لە پێش چاوی بوو.

پێشەوا دارەقوتنی ﷺ دەڵێ: ئیبنو خوزەیمە ﷺ پیاوێکی چەسپاو و بێوێنە بوو.

ئەبو عەبدوڵا حاکمی نەیسابوری ﷺ بە سەنەدی خۆی دەگێڕێتەوە، کە ئەبولعەباسی کوڕی سوڕەیجەوە دەڵێ: ئیبنو خوزەیمە ﷺ بە مەقاش پەند و ئامۆژگاری لەنێو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەردەهێنا.

ئەبو عەبدوڵا حاکمی نەیسابوری ﷺ دەڵێ: فەزیلە و پێگەی ئەم پێشەوایە لە چەندین پەڕاودا لەلامە، ئەوەندە زۆرە لێرەدا جێی نابێتەوە.

پێشەوا زەهەبی ﷺ دەڵێ: ئیبنو خوزەیمە ﷺ لەنێو دەروونەکان مەزنە، لە دڵەکانیشدا گەورەیە، ئەویش بەهۆی زانستەکەی و خواناسی و شوێنکەوتنی بۆ سوننەت.

منیش دەڵێم:

لەدوای وەرگێڕان و قوڵبوونەوەم لە پەڕتووکەکەیدا، بۆم دەرکەوت ژیرترین و تێگەیشتووترین پیاوە لە (فقه) و فەرموودە، ئەو دوو زانستەی پێکەوە کۆ کردۆتەوە، دیارە کەمێکی کەم لە زانایان توانیویانە ئەو دوو زانستە پێکەوە کۆ بکەنەوە، هەرکەسێك قووڵ ببێتەوە لە سەرباس و لێدوانەکانی لەسەر فەرموودە، بەڕوونی ڕاستی ئەم قسەیەی بۆ دەردەکەوێ.

**کۆچی دواییکردنی پێشەوا ئیبنو خوزەیمە ﷺ:**

ئیبنو خوزەیمە ﷺ لە شەوی شەممەی دووەم لە مانگی (ذي القعدة) لە ساڵی (٣١١) سێ سەد و یازدەی کۆچی، لە تەمەنی نەوەد و چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، لە ژوورێکی ماڵەکەی خۆی نێژرا، دواتر ئەو ژوورە کرا بە گۆڕستان، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

**پەڕتووکەکانی:**

بێگومان پێشەوا ئیبنو خوزەیمە ﷺ خاوەنی چەندین پەڕتووکی گەورەیە، پێشەوا حاکمی نەیسابوری ﷺ دەڵێ: پەڕتووکەکانی زیاترن لە سەد و چل پەرتووك جگە لە بابەتەکانی، سەد بابەتیشی هەیە نوسیوویەتی.

جا ئەو پەڕتووکانەی کە پێشەوا حاکم ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە هیچیان چاپ نەکراوە ،جگە لە دوو دانەی نەبێت ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم: (کتاب التوحيد): ئەم پەڕتووکە چەندین جار چاپ کراوە، دواجار بە دوو بەرگ چاپ کراوە، بە تەحقیقی: عەبدولعەزیزی کوڕی ئیبراهیمی ئەلشەهوان.

دووەم: (صحيح ابن خزيمة): ئەویش ئەو پەڕتووکەیە کە ئێستا لەبەر دەستماندایە و وەرمگێڕاوە، پێم خۆشە بە کورتی چەند دێڕێك دەربارەی قسە بکەم:

ئەم پەڕتووکە ناوی: (مختصر المختصر من المسند الصحيح) پوختکراوەی پوختکراو لە پەڕتووکی: (المسند الكبير)ە، کە فەرمودەیەکی زۆری لەخۆ گرتووە.

لەم بارەیەوە عەبدولعەزیزی ڕاجیحی ﷺ دەڵێ: لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ ئیبنو خوزەیمە پەڕتووکی (المسند الكبير)ی کۆ کردۆتەوە، پاشان پوختی کردۆتەوە، پاشان پوختکراوەکەشی پوخت کردۆتەوە، بۆ نموونە ئەگەر وا دابنێین: ئەو لە (المسند الكبير) شەست هەزار فەرموودەی کۆ کردۆتەوە، پاشان پوختی کردۆتەوە بۆ سی هەزار، پاشان ئەویشی پوخت کردۆتەوە بۆ دە هەزار، جا مەبەست لە (مختصر المختصر) ئەوەیە کە باسمان کرد[1].

ئەوەشی گەیشتۆتە بەردەستی ئێمە لە (صحيح ابن خزيمه) یەك لەسەر چواری پوختکراوی پوختکراوەکەیە، جا بەڕاستی ئەم پەڕتووکە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە بایەخێکی زۆری پێ دراوە لە کۆن و لە ئێستادا، هیچ پەڕتووکێکی زانستی فەرموودە نییە حەتمەن باسی گەورەیی ئەم پەڕتووکەی تێدا کراوە، چونکە خاوەنەکەی لەلای زانایان نازناوی (إمام الأئمة)ی وەرگرتووە، هەر وەك لەم سەردەمەشدا چەندین کەس توێژینەوەی ماستەر و دکتۆرایان لەسەری نووسیوە، بەشێك لە گەوهەر و مرواریەکانیان خستۆتە ڕوو، لە ڕاستیدا پەڕتووکێکی ئاوا مەزن و گەورە کە فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ تێدا کۆ کراوەتەوە، هەرچەند وەسفی بکەم ناتوانم حەقی خۆی پێ بدەم.

کۆتا قسەم لێرەدا ئەوەیە، هەر کەسێك ئەم جۆرە پەرتووکانە لە ماڵی خۆیدا دابنێ و گرنگی پێ بدات و بیانخوێنێتەوە و ماڵ و منداڵی پێی ئاشنا بکات، قۆناغ بە قۆناغ و بەبێ پەلەکردن و توندوتیژی، وەك ئەوە وایە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەیدا بێت قسەیان بۆ بکات، فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ دەریایەکی بێبنە، هەر جارێك دووبارەی بکەیتەوە، پەند و وانەیەکی تازەی لێ فێر دەبێت.

---

(١) شرح صحيح ابن خزيمة ج١ / ص٤، عبد العزيز بن عبد الله بن عبد الرحمن الراجحي مصدر الكتاب: دروس صوتية قام بتفريغها موقع الشبكة الإسلامية (http://www.islamweb.net ) الكتاب مرقم آليا، ورقم الجزء هو رقم الدرس - ١٢ درسا.

## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

أَخْبَرَنَا إِمَامُ الْأَئِمَّةِ فَقِيهُ الْآفَاقِ أَبُو بَكْرٍ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ بْنِ خُزَيْمَةَ النَّيْسَابُورِيُّ الْحَافِظُ رَحِمَهُ اللَّهُ، قَالَ: كِتَابُ الْوُضُوءِ مُخْتَصَرُ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ الصَّحِيحِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِنَقْلِ الْعَدْلِ، عَنِ الْعَدْلِ مَوْصُولًا إِلَيْهِ ﷺ مِنْ غَيْرِ قَطْعٍ فِي أَثْنَاءِ الْإِسْنَادِ وَلَا جَرْحَ فِي نَاقِلِي الْأَخْبَارِ الَّتِي نَذْكُرُهَا بِمَشِيئَةِ اللَّهِ تَعَالَى.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الثَّابِتِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِأَنَّ إِتْمَامَ الْوُضُوءِ مِنَ الْإِسْلَامِ

١- عَنْ يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ قَالَ: قُلْتُ: - يَعْنِي - لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ أَقْوَامًا يَزْعُمُونَ أَنْ لَيْسَ قَدَرٌ قَالَ: هَلْ عِنْدَنَا مِنْهُمْ أَحَدٌ؟ قُلْتُ: لَا قَالَ: فَأَبْلِغْهُمْ عَنِّي إِذَا لَقِيتَهُمْ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﵄ يَبْرَأُ إِلَى اللَّهِ مِنْكُمْ، وَأَنْتُمْ بُرَآءُ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي أُنَاسٍ، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ لَيْسَ عَلَيْهِ سَحْنَاءُ سَفَرٍ، وَلَيْسَ مِنْ أَهْلِ الْبَلَدِ يَتَخَطَّى حَتَّى وَرَدَ، فَجَلَسَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: «الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَأَنْ تُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ وَتَعْتَمِرَ، وَتَغْتَسِلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَأَنْ تُتِمَّ الْوُضُوءَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ»، قَالَ: فَإِذَا فَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَنَا مُسْلِمٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ» قَالَ: صَدَقْتَ، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي السُّؤَالِ عَنِ الْإِيمَانِ وَالْإِحْسَانِ وَالسَّاعَةِ(١).

### بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

پێشەوای پێشەوایان، فەقیهی شەرعزانی سەردەمی خۆی، ئەبو بەكری موحەممەدی كوڕی ئیسحاقی كوڕی خوزەیمەی نەیسابوری، شارەزا و فەرموودەناس ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەڵێ: پەڕتووكی دەستنوێژ: پوختكراوەی پوختكراوەیە لەو فەرموودانەی سەنەدیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەنەدێكی ڕاست و دروست، بە گواستنەوەی كەسی دادپەروەر و لە كەسی دادپەروەر تا دەگاتە ئەو ﷺ بەبێ پچڕان لە سەنەدیدا و بەبێ لەكە و توانج لەوانەی فەرموودەكانیان گواستۆتەوە كە بە ویستی خوا باسیان دەكەین.

---

(١) إسناده صحيح.

## باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەڕاست و دروستی هاتووە دەربارەی دەستنوێژگرتن بەتەواوی لە ئیسلامەوەیە

واتە: یەحیای كوڕی یەعمەر دەڵێ: بە عەبدوڵای كوڕی عومەرم ﷺ وت: ئەی باوكی عەبدوڕەحمان، خەڵكانێك پێیان وایە قەدەر نییە، وتی: ئایا كەسێكمان تێدایە لە ئەوان؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەگەر پێیان گەیشتی پێیان ڕابگەیەنە لە منەوە بەڕاستی ئیبنو عومەر ﷺ لەلای خوا بەرییە لێتان و ئێوەش بەرین لە ئەو، پاشان وتی: عومەری كوڕی خەتاب ﷺ بۆی باس كردم وتی: لە كاتێكدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین لەگەڵ كۆمەڵە خەڵكێكدا، لەپڕ پیاوێك هات شوێنەواری سەفەركردنی پێوە دیار نەبوو، خەڵكی شارەكەش نەبوو هەتا گەیشتە لای و لەبەردەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشت وتی: ئەی موحەممەد ﷺ ئیسلام چییە؟ فەرمووی: (ئیسلام ئەوەیە شایەتی بدەی بەوەی هیچ پەرستراوێ بەحەق نییە جگە لە خوا، هەروەها موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، وە نوێژەكان بەجێ بهێنی و زەكات بدەیت و حەجی ماڵی خوا بكەیت و عومرە بكەیت، وە خۆت بشۆری لە جەنابەت، هەروەها دەستنوێژ بەچاكی بگریت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت)، وتی: ئەگەر ئەوانەم كرد ئەوە من موسوڵمانم؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: ڕاستت كرد، وە باسی فەرموودەكەی كرد بەدووررودرێژی دەربارەی پرسیاركردن لە ئیمان و ئیحسان و ڕۆژی دوایی.

## بَابُ ذِكْرِ فَضَائِلِ الْوُضُوءِ يَكُونُ بَعْدَهُ صَلَاةٌ مَكْتُوبَةٌ

٢- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ حُمْرَانَ بْنِ أَبَانَ أَنَّهُ أَخْبَرَ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ دَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ عَلَى الْبَلَاطِ، فَقَالَ: أُحَدِّثُكُمْ بِحَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، وَصَلَّى، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلَاةِ الْأُخْرَى»[١].

---

(١) إسناده صحيح.

### باسی فەزڵ و گەورەیی دەستنوێژ کە لە دوایەوە نوێژی فەرز هاتبێ

واتە: هیشامی کوڕی عورِوە دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم، لە حومرانی کوڕی ئەبانەوە، کە ئەو هەواڵی پێ داو و گوتوویەتی: عوسمانی کوڕی عەفانم ﷺ بینی لە بەلات (الْبَلَاط: شوێنێکە نزیك مەدینە خەڵکی نوێژیان تێدا دەکرد)، داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، ئینجا دەستنوێژی گرت و وتی: باسێکتان بۆ دەکەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت بەچاکی و نوێژ بکات، خوا (لە گوناهەکانی) نێوانی ئەو نوێژە بۆ نوێژەکەی دیکەی دەبووریت.

### بَابُ ذِكْرِ فَضْلِ الْوَضُوءِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا يَكُونُ بَعْدَهُ صَلَاةُ تَطَوُّعٍ، لَا يُحَدِّثُ الْمُصَلِّي فِيهَا نَفْسَهُ

٣- عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ دَعَا يَوْمًا بِوَضُوءٍ، فَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[١].

### باسی فەزڵ و گەورەیی دەستنوێژگرتن سێ جار سێ جار، بەدوایدا نوێژی سوننەت بکات و داڵغە لێ نەدات لەنێو نوێژەکەیدا (خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ)

واتە: حومرانی مەولای عوسمان دەگێڕێتەوە، عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ ڕۆژێك داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، ئینجا دەستنوێژی گرت، سێ جار هەردوو لەپی

---

(١) إسناده صحيح.

دەستەکانی شۆرد و مشی کرد، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد، دواتر سێ جار دەستی ڕاستی شۆرد تا ئەنیشکەکانی، پاشان دەستی چەپی شۆرد وەك دەستی ڕاستی، پاشان مەسحی سەری کرد، پاشان سێ جار قاچی ڕاستی شۆرد تا قولەپێیەکانی، پاشان قاچی چەپی هەر وەکوو ئەوی دیکە شۆرد، پاشان وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وەکوو ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێت وەکوو ئەم دەستنوێژەی من، پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات داڵغە لێ نەدات تیایدا خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ).

## بَابُ ذِكْرِ حَطِّ الْخَطَايَا بِالْوُضُوءِ مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ صَلَاةٍ تَكُونُ بَعْدَهُ

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أَوِ الْمُؤْمِنُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَتْ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ»[١].

## باسی لابردن و هەڵوەرینی گوناهەکان بەهۆی دەستنوێژ، بەبێ باسکردنی نوێژ لە دوایەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی موسوڵمان یان بڕوادار دەستنوێژی گرت و ڕوخساری شۆرد، هەموو ئەو گوناهانەی کە بە چاوی تەماشای کردووە لەگەڵ ئاوەکەدا دەردەچن، یان لەگەڵ کۆتا تکی ئاوەکەدا دەردەچن، ئەگەر دەستەکاتی شۆرد لەگەڵ ئاوی دەستنوێژەکەدا هەموو گوناهەکان دەردەچن کە بە دەستی کردوویەتی، یان لەگەڵ کۆتا تکی ئاوەکەدا دەردەچن، ئەگەر قاچەکانی شۆرد لەگەڵ ئاوی دەستنوێژەکەدا هەموو گوناهەکان دەردەچن کە بە قاچەکانی کردوویەتی، یان لەگەڵ کۆتا تکی ئاوەکەدا دەردەچن، هەتا بەپاکی لە گوناهەکان دەردەچێ.

---

(١) إسناده صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ حَطِّ الْخَطَايَا، وَرَفْعِ الدَّرَجَاتِ فِي الْجَنَّةِ بِإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَإِعْطَاءِ مُنْتَظِرِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ أَجْرَ الْمُرَابِطِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:«أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ»[1].

## باسی لابردن و هەڵوەرینی گوناهەکان و بەرزبوونەوەی پلە و پایەکان لە بەهەشت، بەهۆی دەستنوێژگرتن بەچاکی لە کاتی ناڕەحەتی، وە بەخشینی پلە و پایەی پاسەوانی لە پێناوی خوا بۆ ئەو کەسەی لە نوێژێکەوە چاوەڕوانی نوێژەکەی دیکە دەکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی خوا گوناهەکانی پێ دەسڕێتەوە و پلەی پێ بەرز دەکاتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: دەستنوێژگرتن بەچاکی لە کاتی ناڕەحەتی (سەرما بێت یان ئازاری جەستە)، وە زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت و چاوەڕوانیکردنی نوێژ لەدوای نوێژ، بەڕاستی ئەوە (الرباط)ە ئەوە (الرباط)ە، (واتە: یاخود پاداشتی وەکوو ئەوە وایە خاوەنەکەی لە پێناوی خوادا پاسەوانی سنوورەکانی بڕواداران بکات تا دوژمن زەفەریان پێ نەبات).

## بَابُ ذِكْرِ عَلَامَةِ أُمَّةِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِينَ جَعَلَهُمُ اللَّهُ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ بِآثَارِ الْوُضُوءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَامَةً يُعْرَفُونَ بِهَا فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ

٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمَقْبَرَةِ فَسَلَّمَ عَلَى أَهْلِهَا وَقَالَ: «سَلَامٌ عَلَيْكُمْ أَهْلَ دَارِ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا». قَالُوا: أَوَلَسْنَا بِإِخْوَانِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «أَنْتُمْ أَصْحَابِي، وَإِخْوَانِي قَوْمٌ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ، وَأَنَا فَرَطُكُمْ

---

(١) إسناده صحيح.

عَلَى الْحَوْضِ». قَالُوا: وَكَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ رَجُلًا لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَيْ خَيْلٍ بُهْمٍ دُهْمٍ أَلَا يَعْرِفُ خَيْلَهُ؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ أَثَرِ الْوُضُوءِ، وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ، أَلَا لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوْضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ، أُنَادِيهِمْ أَلَا هَلُمَّ، فَيُقَالَ: إِنَّهُمْ قَدْ أَحْدَثُوا بَعْدَكَ، وَأَقُولُ سُحْقًا، سُحْقًا»[١].

## باسی نیشانەی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە خوا کردوونی بە چاکترینی ئوممەت و لەنێو خەڵکی هەڵیبژاردوون، لە ڕۆژی دوایی بە شوێنەواری دەستنوێژ دەناسرێنەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لای گۆڕستانێك سڵاوی لە خەڵکەکەی کرد و فەرمووی: سڵاوتان لێ بێت ماڵی بڕواداران، ئێمە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت دەگەین بە ئێوە، حەزم دەکرد لە دنیادا براکانم ببینایە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە برای تۆ نین؟ فەرمووی: ئێوە هاوەڵی منن، براکانم ئەوانەن هێشتا نەهاتوونەتە دنیاوە، من (لە ڕۆژی دواییدا) پێشتان دەکەوم بۆ لای حەوزی (کەوسەر)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ئەوانە دەناسیت کە دوای تۆ دێن لە ئومەتەکەت؟ فەرمووی: ئایا نەتانبینیوە پیاوێك ئەسپێکی ڕەشی قەترانی هەبێت، نێوچاوی سپی بێت، سێ دانە لە دەست و قاچەکانی بازنەی سپی تێدا بێت، ئایا ئەو پیاوە ئەسپەکەی خۆی ناناسێتەوە؟ وتیان: بەڵێ دەیناسێتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەوانیش لە ڕۆژی دواییدا دێن بە شوێنەواری دەستنوێژیان دەناسرێنەوە منیش پێشوازییان لێ دەکەم بۆ لای حەوز (کەوسەر)، ئاگادار بن خەڵکانێك لە حەوزەکەم دوور دەخرێنەوە وەکوو چۆن وشتری وێڵ دوور دەخرێتەوە، من بانگیان دەکەم بێن بۆ ئێرە، دەوترێ: ئەوان دوای تۆ داهێنانیان کردووە (واتە: شتانێکیان زیاد کردووە لە ئایینی ئیسلامدا بوونی نییە)، منیش دەڵێم: دووری بۆ ئەوان، دووری بۆ ئەوان.

---

(١) إسناده صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَطْوِيلِ التَّحْجِيلِ بِغَسْلِ الْعَضُدَيْنِ فِي الْوُضُوءِ «إِذِ الْحِلْيَةُ تَبْلُغُ مَوَاضِعَ الْوُضُوءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِحُكْمِ النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ»

٧- عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَتَوَضَّأُ فَجَعَلَ يَبْلُغُ بِالْوَضُوءِ قَرِيباً مِنْ إِبْطِهِ، فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الْحِلْيَةَ تَبْلُغُ مَوَاضِعَ الطُّهُورِ»[١].

## باسی بەچاکدانانی درێژکردنەوەی شوێنەواری دەستنوێژ بە شۆردنی هەردوو باڵ لە کاتی دەستنوێژگرتن، چونکە بازنەی ناسینەوە دەگاتە ئەو جێگایانەی کە لە کاتی دەستنوێژ دەشۆردرێن لە ڕۆژی دواییدا بە حوکم و بڕیاری پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئەبو حازم دەڵێ: ئەبو هوڕەیڕەم ﷺ بینی دەستنوێژی دەگرت ئاوی دەستنوێژی تا نزیك بنباڵی دەبرد، پێم وت: (مەسەلە چییە؟)، وتی: من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بێگومان ناسینەوە (لە ڕۆژی دواییدا) بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژ تا ئەو جێگایەیە کە لەکاتی دەستنوێژ تەڕ دەکرێ.

## بَابُ نَفْيِ قَبُولِ الصَّلَاةِ بِغَيْرِ وُضُوءٍ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

٨- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: مَرِضَ ابْنُ عَامِرٍ فَجَعَلُوا يُثْنُونَ عَلَيْهِ، وَابْنُ عُمَرَ ﷺ سَاكِتٌ، فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لَسْتُ بِأَغَشِّهِمْ، وَلَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[٢].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.



## باسی نوێژکردن بەبێ دەستنوێژ وەرناگیرێ بە بەڵگەی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کە (مُفَسَّر) نییە

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد دەڵێ: ئیبنو عامر نەخۆش کەوت خەڵك وەسف و پیاهەڵدانیان دەکرد، ئیبنو عومەریش ﷺ بێدەنگ بوو، دواتر وتی: بەڵام فێڵبازترین کەسیان نیم، بۆت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ هیچ نوێژێك وەرناگرێ بەبێ پاکی (واتە: دەستنوێژ)، وە هیچ زەکات و صەدەقەیەکی دزێتیش وەرناگرێ.

ڕوونکردنەوە:

(مُجْمَل): بریتییە لە قسەیەك ماناکەی ڕوون و ئاشکرا نییە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە.

(مُفَسَّر): بریتییە لەو قسەیەی ماناکەی ڕوون و ئاشکرایە.

٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ إِلَّا بِطُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ»[١]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نوێژێك بەبێ پاکی (واتە: دەستنوێژ) وەرناگیرێ، وە هیچ زەکات و صەدەقەیەکی دزێتیش وەرناگیرێ.

١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ»[٢]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ هیچ نوێژێك وەرناگرێ بەبێ پاکی (دەستنوێژ)، وە هیچ زەکات و صەدەقەیەکی دزێتیش وەرناگرێ.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَفَى قَبُولَ الصَّلَاةِ لِغَيْرِ الْمُتَوَضِّئِ الْمُحْدِثِ الَّذِي قَدْ أَحْدَثَ حَدَثًا يُوجِبُ الْوُضُوءَ، لَا كُلَّ قَائِمٍ إِلَى الصَّلَاةِ، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ مُحْدِثٍ حَدَثًا يُوجِبُ الْوُضُوءَ

١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقْبَلُ صَلَاةُ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ»[١].

**باسی فەرموودەیەکی شیکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە ناڕوونەی (مُجْمَل)ەی کە باسم کرد (لە فەرموودەی ژمارە ٨)، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئەو کەسەی ڕەت کردۆتەوە کە دەستنوێژی نییە بەجۆرێ پێویست بە دەستنوێژگرتن بکات، نەك هەر کەسێك کە هەڵدەستێ بۆ نوێژ ئەگەر چی بێدەستنوێژیش نەبێت پێویست بە دەستنوێژ بکات**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی هیچ یەکێك لە ئێوە وەرناگیرێ ئەگەر بێدەستنوێژ بوو هەتا دەستنوێژ نەگرێ.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا أَوْجَبَ الْوُضُوءَ عَلَى بَعْضِ الْقَائِمِينَ إِلَى الصَّلَاةِ لَا عَلَى كُلِّ قَائِمٍ إِلَى الصَّلَاةِ فِي قَوْلِهِ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ ﴿٦﴾﴾ **المائدة، إِذِ اللَّهُ جَلَّ وَعَلَا وَلَّى نَبِيَّهُ ﷺ بَيَانَ مَا أَنْزَلَ عَلَيْهِ خَاصًّا وَعَامًّا، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ بِسُنَّتِهِ أَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَمَرَ بِالْوُضُوءِ بَعْضَ الْقَائِمِينَ إِلَى الصَّلَاةِ، لَا كُلَّهُمْ، كَمَا بَيَّنَ عَلَيْهِ السَّلَامُ أَنَّ اللَّهَ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ:** ﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ ﴿١٠٣﴾﴾ **التوبة، بَعْضَ الْأَمْوَالِ لَا كُلَّهَا، وَكَمَا بَيَّنَ بِقِسْمَةِ سَهْمِ ذِي الْقُرْبَى بَيْنَ بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنَّ اللَّهَ أَرَادَ بِقَوْلِهِ:** ﴿ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴿٣٦﴾﴾ **النساء، بَعْضَ قَرَابَةِ النَّبِيِّ ﷺ دُونَ جَمِيعِهِمْ، وَكَمَا بَيَّنَ أَنَّ اللَّهَ أَرَادَ بِقَوْلِهِ:** ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾﴾ **المائدة، بَعْضَ السُّرَّاقِ دُونَ جَمِيعِهِمْ، إِذْ سَارِقُ دِرْهَمٍ فَمَا دُونَهُ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ سَارِقٍ، فَبَيَّنَ النَّبِيُّ**

---

(١) صحيح.

**ﷺ بِقَوْلِهِ: «الْقَطْعُ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا»، أَنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَ السُّرَّاقِ دُونَ بَعْضٍ بِقَوْلِهِ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾ ﴾المائدة،قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾ ﴾النحل.**

١٢- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الْفَتْحِ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، وَصَلَّى الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّكَ فَعَلْتَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُهُ قَالَ: «إِنِّي عَمْدًا فَعَلْتُهُ يَا عُمَرُ»، هَذَا حَدِيثُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مَهْدِيٍّ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا دەستنوێژی پێویست (واجب) کردووە لەسەر هەندێ لەو کەسانەی کە هەڵدەستن بۆ نوێژ نەك هەموو ئەوانەی کە هەڵدەستن بۆ نوێژ بە فەرماییشتی خۆی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر هەستان بۆ نوێژ ڕوخسارتان بشۆرن. بێگومان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاسپاردووە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو پەیامەی کە دایبەزاندووە بۆی بەتایبەت و بەگشتیش، پێغەمبەر ﷺ بە سوننەتەکەی ڕوونی کردۆتەوە خوا فەرمانی کردووە بەهەندێك لەوانەی کە هەڵدەستن بۆ نوێژ نەك هەموویان، هەر وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرماییشتی خوای ﷻ ڕوون کردۆتەوە کە فەرموویەتی: ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: ئەی موحەممەد زەکات و صەدەقە لە ماڵەکانیان وەربگرە. مەبەستی پێی هەندێ لە ماڵ و سامانەکانیانە نەك هەمووی، وە هەر وەك چۆن بەشی (ذِي الْقُرْبَى) خزمە نزیکەکانی ڕوون کردۆتەوە لە نێوان نەوەکانی هاشم و نەوەکانی عەبدولموطەلیب، خوا ﷻ مەبەستی لە فەرماییشتی خۆی: ﴿ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾ هەندێ لە خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە نەك هەموویان، وە هەر وەك چۆن ڕوونی کردۆتەوە بێگومان خوا ﷻ مەبەستی لە فەرماییشتی خۆی: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾ ﴾ (دەستبڕینی ) هەندێ لە دزەکانە نەك هەموویان، چونکە دزینی درهەمێك و کەمتریش لەوە هەر ناوی دزی لێ**

---
(١) حديث صحيح.

**دەنرێ، پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە بە فەرمووودەی خۆی: (الْقَطْعُ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا) واتە: دەستبڕین لە ڕوبعە دینارێکەوەیە و زیاتریش لەو ڕێژەیە، خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموو: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی کە بۆیان دابەزیوە**

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت، بەڵام لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد و بە یەك دەستنوێژ نوێژەکانی کرد، عومەر ﷺ پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، تۆ شتێکت کرد پێشتر نەتکردبوو، فەرمووی: من بەئەنقەست ئەوەم کرد ئەی عومەر ... ئەوە فەرموودەی عەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدییە.

**١٣-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ إِلَّا يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ؛ فَإِنَّهُ شُغِلَ فَجَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِوَضُوءٍ وَاحِدٍ[١].

واتە: ئیبنو بورەیدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت جگە لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە نەبێت، چونکە سەرقاڵ کرا بۆیە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە بە یەك دەستنوێژ.

**١٤-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ صَلَّى الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوَضُوءٍ وَاحِدٍ[٢].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت، بەڵام لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە هەموو نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کرد.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُضُوءَ لَا يَجِبُ إِلَّا مِنْ حَدَثٍ

١٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: قُلْتُ لَهُ: أَرَأَيْتَ وُضُوءَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ لِكُلِّ صَلَاةٍ طَاهِرًا كَانَ أَوْ غَيْرَ طَاهِرٍ عَمَّنْ هُوَ؟ قَالَ: حَدَّثَتْهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ حَنْظَلَةَ بْنِ أَبِي عَامِرٍ ﭬ الْغَسِيلَ حَدَّثَهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ أَمَرَ بِالْوُضُوءِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ طَاهِرًا كَانَ أَوْ غَيْرَ طَاهِرٍ، فَلَمَّا شَقَّ ذَلِكَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، وَوُضِعَ عَنْهُ الْوُضُوءُ إِلَّا مِنْ حَدَثٍ، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَرَى أَنَّ بِهِ قُوَّةً عَلَى ذَلِكَ فَفَعَلَهُ حَتَّى مَاتَ[١].

## باسی بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەوەی دەستنوێژ پێویست (واجب) نابێت مەگەر بۆ کەسێك بێدەستنوێژ بێت

واتە: موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حیبان دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﭭ وتی: پێم وت: ئایا بینیوتە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﭭ دەستنوێژ بگرێ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی هەبووبێت یان دەستنوێژی نەبووبێت چۆن بووە؟ وتی: ئەسمائی کچی زەیدی کوڕی خەتاب بۆی باس کرد کە عەبدوڵای کوڕی حەنزەڵەی کوڕی ئەبو عامر ﭬ بۆی باس کرد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە دەستنوێژگرتن لە کاتی هەموو نوێژێك، دەستنوێژی هەبووبێت یان دەستنوێژی نەبووبێت، کاتێ ئەوە قورس بوو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە سیواککردن بۆ هەموو نوێژێك، وە دەستنوێژی لەسەر هەڵگیرا مەگەر بۆ بێدەستنوێژی، جا عەبدوڵا دەیبینی هێزی تێدایە لەسەر دەستنوێژگرتن بۆ هەموو نوێژێك بۆیە تا مرد ئەنجامی دا.

## بَابُ صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى طُهْرٍ مِنْ غَيْرِ حَدَثٍ كَانَ مِمَّا يُوجِبُ الْوُضُوءَ

١٦- عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ، أَنَّهُ شَهِدَ عَلِيًّا ﭬ صَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ جَلَسَ فِي الرَّحْبَةِ فِي حَوَائِجِ النَّاسِ، فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ دَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ «فَمَسَحَ بِهِ ذِرَاعَيْهِ وَوَجْهَهُ وَرَأْسَهُ وَرِجْلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ فَضْلَ

---

(١) إسناده حسن.

وُضُوئِهِ وَهُوَ قَائِمٌ»، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُونَ أَنْ يَشْرَبُوا وَهُمْ قِيَامٌ، «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُ»، وَقَالَ: «هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ يُحْدِثْ» (وفي رواية أخرى) عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ كَمَا فَعَلْتُ، وَقَالَ: «هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ يُحْدِثْ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَرَوَاهُ مِسْعَرُ بْنُ كِدَامٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَيْسَرَةَ، عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ وَقَالَ: ثُمَّ قَالَ: «هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ يُحْدِثْ»، ثنا يُوسُفُ بْنُ مُوسَى، ثنا الْفَضْلُ بْنُ دُكَيْنٍ، وَعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى»[1].

## باسی چۆنیەتی دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دەستنوێژ بەبێ ئەوەی دەستنوێژی شکابێت و پێویست بکات دەستنوێژ تازەوە بکاتەوە

واتە: نەزالی کوڕی سەبرە دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ عەلی ﷺ ئامادە بوو نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان لەبەر هەیوانەکەدا دانیشت بۆ ڕاییکردنی ئیشوکاری خەڵك، کاتێ کاتی نوێژی عەسر هات داوای تەشتێ ئاوی کرد، دواتر هەردوو باڵی و ڕوخساری و سەری و هەردوو پێی پێ مەسح کرد، پاشان زیادەی ئاوی دەستنوێژەکەی خواردەوە لە کاتێکدا بەپێوە ڕاوەستا بوو، پاشان وتی: خەڵکانێك پێیان باش نییە بەڕاوەستانەوە ئاو بخۆنەوە، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی خواردەوە (بەڕاوەستانەوە) وەکوو چۆن من ئاوم خواردەوە، وە فەرمووی: ئەمە دەستنوێژی ئەو کەسەیە کە دەستنوێژی نەشکاوە (وە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا) لە نەزالی کوڕی سەبڕەوە، باسی فەرموودەکەی کرد، وتی: من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کرد وەکوو چۆن من کردم، وە فەرمووی: ئەمە دەستنوێژی ئەو کەسەیە کە دەستنوێژی نەشکاوە، وە ئەبو بەکر وتی: میسعەری کوڕی کیدام گێڕاویەتەوە لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەیسەرە لە نەزالی کوڕی سەبرە لە عەلییەوە وتی: پاشان فەرمووی: ئەمە دەستنوێژی ئەو کەسەیە کە دەستنوێژی نەشکاوە.

---

(١) حديث صحيح.



## جِمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَحْدَاثِ الْمُوجِبَةِ لِلْوُضُوءِ

**بَابُ ذِكْرِ وُجُوبِ الْوُضُوءِ مِنَ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ وَالنَّوْمِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ يُوجِبُ الْفَرْضَ فِي كِتَابِهِ بِمَعْنًى، وَيُوجِبُ ذَلِكَ الْفَرْضَ بِغَيْرِ ذَلِكَ الْمَعْنَى عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّمَا دَلَّ فِي كِتَابِهِ عَلَى أَنَّ الْوُضُوءَ يُوجِبُهُ الْغَائِطُ وَمُلَامَسَةُ النِّسَاءِ؛ لِأَنَّهُ أَمَرَ بِالتَّيَمُّمِ لِلْمَرِيضِ، وَفِي السَّفَرِ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ، مِنَ الْغَائِطِ وَمُلَامَسَةِ النِّسَاءِ، فَدَلَّ الْكِتَابُ عَلَى أَنَّ الصَّحِيحَ الْوَاجِدَ لِلْمَاءِ عَلَيْهِ مِنَ الْغَائِطِ وَمُلَامَسَةِ النِّسَاءِ بِالْوُضُوءِ، إِذِ التَّيَمُّمُ بِالصَّعِيدِ الطَّيِّبِ إِنَّمَا جُعِلَ بَدَلًا مِنَ الْوُضُوءِ لِلْمَرِيضِ وَالْمُسَافِرِ عِنْدَ الْعَوَزِ لِلْمَاءِ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْوُضُوءَ قَدْ يَجِبُ مِنْ غَيْرِ غَائِطٍ، وَمِنْ غَيْرِ مُلَامَسَةِ النِّسَاءِ، وَأَعْلَمَ فِي خَبَرِ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ أَنَّ الْبَوْلَ وَالنَّوْمَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى الِانْفِرَادِ يُوجِبُ الْوُضُوءَ، وَالْبَائِلُ وَالنَّائِمُ غَيْرُ مُتَغَوِّطٍ وَلَا مُلَامِسِ النِّسَاءِ، وَسَأَذْكُرُ بِمَشِيئَةِ اللَّهِ ﷺ وَعَوْنِهِ الْأَحْدَاثُ الْمُوجِبَةُ لِلْوُضُوءِ بِحُكْمِ النَّبِيِّ ﷺ خَلَا الْغَائِطِ وَمُلَامَسَةِ النِّسَاءِ اللَّذَيْنِ ذَكَرَهُمَا فِي نَصِّ الْكِتَابِ خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ مِمَّنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَذْكُرَ اللَّهُ حُكْمًا فِي الْكِتَابِ فَيُوجِبَهُ بِشَرْطٍ أَنْ يَجِبَ ذَلِكَ الْحُكْمُ بِغَيْرِ ذَلِكَ الشَّرْطِ الَّذِي بَيَّنَهُ فِي الْكِتَابِ»**

١٧- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ ﵁ أَسْأَلُهُ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا زِرُّ؟ قُلْتُ: ابْتِغَاءَ الْعِلْمِ قَالَ: يَا زِرُّ فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَضَعُ أَجْنِحَتَهَا لِطَالِبِ الْعِلْمِ رِضًا بِمَا يَطْلُبُ قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّهُ وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ بَعْدَ الْغَائِطِ، وَكُنْتَ امْرَءًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَهَلْ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ فِي ذَلِكَ شَيْئًا؟ قَالَ: نَعَمْ كَانَ يَأْمُرُنَا إِذَا كُنَّا سَفَرًا - أَوْ قَالَ مُسَافِرِينَ - أَنْ لَا نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ، وَلَكِنْ مِنْ غَائِطٍ وَبَوْلٍ وَنَوْمٍ» هَذَا حَدِيثُ الْمَخْزُومِيِّ، وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ عَبْدَةَ فِي حَدِيثِهِ: فَقَالَ قَدْ بَلَغَنِي أَنَّ الْمَلَائِكَةَ تَضَعُ أَجْنِحَتَهَا[1].

---

(١) إسناده صحيح.

کۆباسی ئەو شتانە کە دەستنوێژ پێویست (واجب) دەکەن

باسی پێویستبوونی دەستنوێژ لە سەرئاوکردن و میز و خەوتن، وە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا فەرز (پێویست)ی کردووە لە کتێبەکەیدا بە مانایەك، هەروەها فەرزی دیکەیشی پێویست کردووە بە جگە لەو مانایە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ، خوا ﷻ بۆیە لە کتێبەکەیدا بەڵگەی هێناوەتەوە کە سەرئاوکردن و جیماع و دەستبازیکردن لەگەڵ ئافرەتان دەستنوێژ پێویست دەکات، چونکە فەرمانی بە تەیەموم کردووە بۆ نەخۆش، وە لە گەشت و لە کاتی نەبوونی ئاو لە سەرئاوکردن و دەستبازی لەگەڵ ئافرەتان، قورئان ئاماژەی کردووە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی لەشی ساغە و ئاوی دەست دەکەوێت پێویستە لەسەری لە کاتی سەرئاوکردن و دەستبازیکردن لەگەڵ ئافرەتان دەستنوێژ بگرێت، چونکە تەیەموم بە خۆڵی پاك لەجیاتی دەستنوێژ دانراوە بۆ نەخۆش، هەروەها بۆ گەشتیار لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو، وە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە هەندێ جار دەستنوێژگرتن پێویست دەبێت بە جگە لە سەرئاوکردن و دەستبازیکردن لەگەڵ ئافرەتان، وە لە فەرموودەکەی صەفوانی کوڕی عەسال ڕایگەیاندووە کە میزکردن و خەوتن هەریەکەیان بەجیا دەستنوێژ پێویست دەکەن، وە ئەو کەسەی میز دەکات و دەخەوێت جگە لەو کەسەیە سەرئاو دەکات و دەستبازی لەگەڵ ئافرەتان دەکات، بە ویستی خوا ﷻ باسی ئەو بێدەستنوێژییانە دەکەم کە دەستنوێژ پێویست دەکەن بە حوکم و بڕیاری پێغەمبەر ﷺ جگە لە سەرئاو و دەستبازی لەگەڵ ئافرەتان کە هەردووکیان لە قورئاندا باسکراون، پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی قووڵ نەبۆتەوە لە زانست کە پێی وایە ئەوە دروست نییە خوا باسی حوکمێك بکات لە قورئاندا پێویستی بکات بە مەرجێك ئەو حوکمە پێویست بێت، بەبێ ئەو مەرجەی کە ڕوونی کردۆتەوە لە قورئاندا

واتە: زیری کوڕی حوبەیش دەڵێ: هاتم بۆ لای صەفوانی کوڕی عەسالی موڕادی ﷺ بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم دەربارەی خوفەکان، ئەویش وتی: چی تۆی هێناوە ئەی زیر، بەڕاستی فریشتەکان باڵیان ڕادەخەن بۆ خوێندکاری زانستی (شەرعی)، چونکە ڕازین بەوەی کە دەیکات، وتی: وتم: شتێك لە نەفس و دەروونم دروست

بووە دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان لەدوای سەرئاوکردن، تۆش یەکێکی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا بیستوتە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە شتێکی باس کردبێ؟ وتی: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمانی پێ دەکردین کاتێ لە سەفەردا بووباین- خوفەکانمان دانەکەنین سێ شەو و سێ ڕۆژ مەگەر بۆ (خۆشۆردنی) لەشگرانی، بەڵام بۆ سەرئاو و میزکردن و خەوتن دەمایەوە لە پێماندا.

**بَابُ ذِكْرِ وُجُوبِ الْوُضُوءِ مِنَ الْمَذْيِ «وَهُوَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي قَدْ أَعْلَمْتُ أَنَّ اللَّهَ قَدْ يُوجِبُ الْحُكْمَ فِي كِتَابِهِ بِشَرْطٍ، وَيُوجِبُهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ بِغَيْرِ ذَلِكَ الشَّرْطِ، إِذِ اللَّهُ ﷻ لَمْ يَذْكُرْ فِي آيَةِ الْوُضُوءِ الْمَذْيَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَوْجَبَ الْوُضُوءَ مِنَ الْمَذْيِ، وَاتَّفَقَ عُلَمَاءُ الْأَمْصَارِ قَدِيمًا وَحَدِيثًا عَلَى إِيجَابِ الْوُضُوءِ مِنَ الْمَذْيِ»**

١٨- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؛ لِأَنَّ ابْنَتَهُ كَانَتْ عِنْدِي، فَأَمَرْتُ رَجُلًا فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «مِنْهُ الْوُضُوءُ»[١].

**باسی واجببوونی دەستنوێژ لە مەزی ئەویش لەو شتەیە کە ڕامگەیاندووە بێگومان خوا هەندێ جار حوکمی واجب دەکات لە کتێبەکەیدا بە مەرج، وە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەشی ﷺ واجبی دەکات بەبێ ئەو مەرجە، لە کاتێکدا خوا ﷻ لە ئایەتی دەستنوێژدا باسی مەزی نەکردووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەستوێژی واجب کردووە لە هاتنە خوارەوەی مەزی، زانایانی وڵاتەکان لە کۆن و لە ئێستاشدا یەکدەنگن لەسەر واجببوونی دەستنوێژگرتنەوە لە هاتنە خوارەوەی مەزی**

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم[٢] زۆر بوو، شەرمم کرد پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم چونکە کچەکەی خێزانم بوو، بۆیە پیاوێکم ڕاسپارد (پرسیارم بۆ بکات)، ئەویش پرسیاری لێ کرد، فەرمووی: دەستنوێژی بۆ دەگیرێتەوە.

---

(١) إسناده صحيح.

(٢)) الْمَذْيِ: ئاوێکی سپی تەنکی لینجە لە کاتی وورووژانی ئارەزوودا دێتە دەرەوە بەبێ چێژوەرگرتن و فیچکەکردن.

**١٩-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: اسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمَذْيِ مِنْ أَجْلِ فَاطِمَةَ ﷺ، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الْأَسْوَدِ ﷺ فَسَأَلَ عَنْ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «فِيهِ الْوُضُوءُ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: شەرمم دەکرد پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم سەبارەت بە مەزی، بە هۆی فاتیمە ﷺ، فەرمانم کرد بە میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ ئەویش لەو بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی: دەستنوێژی لێ دەگیرێ.**

## بَابُ الْأَمْرِ بِغَسْلِ الْفَرْجِ مِنَ الْمَذْيِ مَعَ الْوُضُوءِ

**٢٠-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً فَجَعَلْتُ أَغْتَسِلُ فِي الشِّتَاءِ حَتَّى تَشَقَّقَ ظَهْرِي، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ- أَوْ ذُكِرَ لَهُ - فَقَالَ لِي: «لَا تَفْعَلْ، إِذَا رَأَيْتَ الْمَذْيَ فَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، وَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، فَإِذَا أَنْضَحْتَ الْمَاءَ فَاغْتَسَلَ»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ: لَا تَفْعَلْ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَقُولُ لَفْظُ زَجْرٍ يُرِيدُ نَفْيَ إِيجَابِ ذَلِكَ الْفِعْلِ[٢].

## باسی فەرمانکردن بە شۆردنی داوێن بەهۆی هاتنەخوارەوەی مەزی لەگەڵ دەستنوێژگرتن

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم زۆر بوو لە زستاندا خۆم دەشۆرد هەتا پشتم شەقی تێ کەوت بەهۆی ئاوی سارد، ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد - یان بۆی باس کرا- پێمی فەرموو: کاری وا مەکە، ئەگەر مەزیت بینی ئەندامی نێرینەت بشۆرە و دەستنوێژ بگرە وەکوو چۆن دەستنوێژ دەگری بۆ نوێژ، وە ئەگەر ئاوت بە فیچکە دەرچوو خۆت بشۆرە. ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی: (لَا تَفْعَلْ) لەو دەستەواژەیە کە دەڵێم دەستەواژەی سەرزەنشتکردنە مەبەست پێی ڕەتکردنەوەی پێویستبوونی ئەو کردارەیە.**

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.

# بَابُ الْأَمْرِ بِنَضْحِ الْفَرْجِ مِنَ الْمَذْيِ

٢١- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ ﷺ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَمَرَهُ أَنْ يَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ إِذَا دَنَا مِنْ أَهْلِهِ فَخَرَجَ مِنْهُ الْمَذْيُ مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: فَإِنَّ عِنْدِي ابْنَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَهُ قَالَ الْمِقْدَادُ: فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «إِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَنْضَحْ فَرْجَهُ وَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ»[١].

## باسی فەرمانکردن بە ئاوپرژێنکردنی داوێن بەهۆی مەزی

واتە: میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ دەگێڕێتەوە، عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ فەرمانی پێ کرد پرسیار بکات لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێك ئەگەر لە خێزانەکەی نزیك ببێتەوە و مەزی لێ دەربچێت چی لەسەری پێویستە؟ عەلی ﷺ وتی: من کچی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانمە شەرم دەکەم پرساری لێ بکەم؟ میقداد وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەو بارەوە، فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئەوەی بینی ئەوە با داوێنی ئاوپرژێن بکات و دەستوێژ بگرێت وەك دەستوێژگرتنی بۆ نوێژ.

٢٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَرْسَلْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الْأَسْوَدِ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنِ الْمَذْيِ يَخْرُجُ مِنَ الْإِنْسَانِ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَوَضَّأْ وَانْضَحْ فَرْجَكَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: میقدادی کوڕی ئەسوەدم ﷺ نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پرسیاری لێ کرد دەربارەی مەزی کە لە داوێنی مرۆڤەوە دەردەچێت چی بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستنوێژ بگرە و داوێنت ئاوپرژێن بکە.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِغَسْلِ الْفَرْجِ وَنَضْحِهِ مِنَ الْمَذْيِ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ لَا أَمْرُ فَرِيضَةٍ وَإِيجَابٍ

**٢٣** - عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ رَجُلًا مَذَّاءً فَسُئِلَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «يَكْفِيكَ مِنْهُ الْوُضُوءُ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِي فِي الْمَذْيِ قَالَ: «يَكْفِيكَ مِنْ ذَلِكَ الْوُضُوءُ»، قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي بَابِ نَضْحِ الثَّوْبِ مِنَ الْمَذْيِ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە شۆردنی داوێن و ئاوپرژێنکردنی بەهۆی مەزی، فەرمانێکە بۆ بەچاکدانان و ڕێنیشاندانە، نەک فەرمانێکی فەرز و پێویست (واجب) بێت (واتە: شۆردنی چاکە بەڵام فەرز نییە)

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: من پیاوێك بووم مەزیم زۆر بوو لەو بارەوە پرسیارم بۆ کرا لە پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: دەستنوێژگرتنت لێی بەسە. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی سەهلی کوڕی حونەیف هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبارەی مەزی فەرمووی: دەستنوێژگرتنت لێی بەسە. لە بەشی ئاوپرژێنکردنی پۆشاك لە مەزی تەخریجم کردوە.

## بَابُ ذِكْرِ وُجُوبِ الْوُضُوءِ مِنَ الرِّيحِ الَّذِي يُسْمَعُ صَوْتُهَا بِالْأُذُنِ أَوْ يُوجَدُ رَائِحَتُهَا بِالْأَنْفِ

**٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا فَأَشْكَلَ خَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَوْ لَمْ يَخْرُجْ فَلَا يَخْرُجَنَّ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا»[2].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) حديث صحيح.

## باسی پێویست (واجب) بوونی دەستنوێژ لەو بابەی کە دەنگی دەبیسترێ بە گوێ یان بە لووت بۆنی دەکرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە هەستی بە شتێك کرد لەنێو سکیدا کەوتە گومانەوە لێی ئایا شتێکی لێ دەرچووە یان هیچی لێ دەرنەچووە، با لە نوێژەکەی دەرنەچێت هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێت یان بۆنێك دەکات.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُضُوءَ لَا يَجِبُ إِلَّا بِيَقِينِ حَدَثٍ «إِذِ الطَّهَارَةُ بِيَقِينٍ لَا تَزُولُ بِشَكٍّ وَارْتِيَابٍ، وَإِنَّمَا يَزُولُ الْيَقِينُ بِالْيَقِينِ، فَإِذَا كَانَتِ الطَّهَارَةُ قَدْ تَقَدَّمَتْ بِيَقِينٍ لَمْ تُبْطَلِ الطَّهَارَةُ إِلَّا بِيَقِينِ حَدَثٍ»

**٢٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الشَّيْءَ، وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ فَقَالَ: «لَا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دەستنوێژ پێویست (واجب) نابێت مەگەر دڵنیا بێت لە بێدەستنوێژی، چونکە دەستنوێژ کە لێی دڵنیا بن بەگومان و دوودڵی لاناچێت، بێگومان دڵنیایی بە دڵنیایی لادەچێت، جا ئەگەر پێشتر دەستنوێژی هەبوو بەدڵنیایی دەستنوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە مەگەر دڵنیا بێت لەوەی دەستنوێژی شکاوە

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی پیاوێك لەنێو نوێژ هەست بە شتێك دەکات، فەرمووی: با نوێژەکەی نەبڕێ هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێ یان بۆنێك دەکات.

---

(١) حديث صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ قَدْ لَا يَحْوِي جَمِيعَ الْمَعَانِي الَّتِي تَدْخُلُ فِي ذَلِكَ الِاسْمِ «خِلَافَ قَوْلِ مَنْ يَزْعَمُ مِمَّنْ شَاهَدْنَا مِنْ أَهْلِ عَصْرِنَا مِمَّنْ كَانَ يَدَّعِي اللُّغَةَ مِنْ غَيْرِ مَعْرِفَةٍ بِهَا، وَيَدَّعِي الْعِلْمَ مِنْ غَيْرِ مَعْرِفَةٍ بِهِ، أَنَّ الِاسْمَ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ يَحْوِي جَمِيعَ مَعَانِي الشَّيْءِ الَّذِي يُوقَعُ عَلَيْهِ بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ بِالْأَلِفِ وَاللَّامِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَوْقَعَ اسْمَ الْأَحْدَاثِ عَلَى الرِّيحِ خَاصَّةً بِاسْمِ الْمَعْرِفَةِ، وَاسْمِ جَمِيعِ الْأَحْدَاثِ الْمُوجِبَةِ لِلْوُضُوءِ الرِّيحُ يَخْرُجُ مِنَ الدُّبُرِ خَاصَّةً، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ»**

**٢٦-** عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ أَبِي عَائِشَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ؓ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَزَالُ الْعَبْدُ فِي الصَّلَاةِ مَا كَانَتِ الصَّلَاةُ تَحْبِسُهُ مَا لَمْ يُحْدِثْ» وَالْإِحْدَاثُ: أَنْ يَفْسُوَ أَوْ يَضْرِطَ إِنِّي لَا أَسْتَحْيِي مِمَّا لَمْ يَسْتَحِي مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ناو (لە زمانی عەرەبیدا) هاتبێت و (الْأَلِفِ وَاللَّامِ)ی تەعریفی وەرگرتبێت، هەندێ جار هەموو ئەو مانایانە لەخۆ ناگرێت کە دەچێتە چوارچێوەی ئەو ناوە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وایە بەهەمیشەیی دەچێتە ئەو چوارچێوەیەوە لەوانەی لەم سەردەمەدا بینیومانن کە بانگەشەی شارەزابوون دەکات لە زمانی عەرەب بەبێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی لێی هەبێت، وە بانگەشەی زانست دەکات بەبێ ئەوەی شارەزایی لە زانست هەبێت، پێی وایە ناو بە (الْأَلِفِ وَاللَّامِ)ی تەعریف هەموو ماناکانی ئەو شتە لەخۆ دەگرێت کە لەبارەیەوە هاتووە، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ناوی (الْأَحْدَاثِ)ی بەتایبەت بۆ بالێدەرچوون بەکار هێناوە بەناوی ناسراو (اسم المعرفة)، وە ناوی هەموو ئەوانەی بێدەستنوێژی پێویست (واجب) دەکەن، بایەکە بەتایبەت لە کۆمەوە دەردەچێت، بێگومان ئەم مەسەلەیەم ڕوون کردەوە لە کتێبی ئیماندا**

واتە: موحەممەدی کوڕی ئەبو عائیشە دەڵێ: ئەبو هورەیرە ؓ بۆی باس کردم پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام بەندە لەنێو نوێژدایە تا نوێژ لە شوێنی خۆی بیهێڵێتەوە، بەمەرجێ بێدەستنوێژ نەبووبێت. (الْإِحْدَاثُ) بریتییە لەوەی هەوای لێ دەربچێت یان دەنگ، من شەرم ناکەم لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەرمی لێ نەکردووە (لە ڕوونکردنەوەی بابەتەکە).

---

(١) حديث صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ مُخْتَصَرًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «أَوْهَمَ عَالِمًا مِمَّنْ لَمْ يُمَيِّزْ بَيْنَ الْخَبَرِ الْمُخْتَصَرِ، وَالْخَبَرِ الْمُتَقَصَّى أَنَّ الْوُضُوءَ لَا يَجِبُ إِلَّا مِنَ الْحَدَثِ الَّذِي لَهُ صَوْتٌ أَوْ رَائِحَةٌ»**

٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا وَضُوءَ إِلَّا مِنْ صَوْتٍ أَوْ رِيحٍ»[١].

**باسی فەرموودەیەك بەكورتی هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، خەڵكانێك بەهەڵەدا چوون لەوانەی فەرمودەی پوخت و كورت لە فەرموودەی درێژ و موفەصەل جیا ناكەنەوە پێیان وایە دەستنوێژ پێویست نابێت مەگەر تەنها بۆ ئەو بێدەستنوێژییەی كە دەنگی دێت یان بۆنی بایەك**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ (واجب) نییە مەگەر لە دەرچوونی دەنگێك یان بۆنی بایەك (لە كۆمیەوە دەربچێت).

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصِّي لِلَّفْظَةِ الْمُخْتَصَرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَعْلَمَ أَنْ لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ صَوْتٍ أَوْ رِيحٍ عِنْدَ مَسْأَلَةٍ سُئِلَ عَنْهَا فِي الرَّجُلِ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ قَدْ خَرَجَتْ مِنْهُ رِيحٌ فَيَشُكُّ فِي خُرُوجِ الرِّيحِ، وَكَانَتْ هَذِهِ الْمَقَالَةُ عَنْهُ ﷺ: «لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ صَوْتٍ أَوْ رِيحٍ» جَوَابًا عَمَّا عَنْهُ سُئِلَ فَقَطْ لَا ابْتِدَاءَ كَلَامٍ مُسْقِطًا بِهَذِهِ الْمَسْأَلَةِ إِيجَابَ الْوُضُوءِ مِنْ غَيْرِ الرِّيحِ الَّتِي لَهَا صَوْتٌ أَوْ رَائِحَةٌ، إِذْ لَوْ كَانَ هَذَا الْقَوْلُ مِنْهُ ﷺ ابْتِدَاءً مِنْ غَيْرِ أَنْ تَقَدَّمَتْهُ مَسْأَلَةٌ كَانَتْ هَذِهِ الْمَقَالَةُ تَنْفِي إِيجَابَ الْوُضُوءِ مِنَ الْبَوْلِ وَالنَّوْمِ وَالْمَذْيِ، إِذْ قَدْ يَكُونُ الْبَوْلُ لَا صَوْتٌ لَهُ وَلَا رِيحٌ، وَكَذَلِكَ النَّوْمُ وَالْمَذْيُ لَا صَوْتَ لَهُمَا وَلَا رِيحَ، وَكَذَلِكَ الْوَدْيُ »**

٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا فَأَشْكَلَ خَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَوْ لَمْ يَخْرُجْ، فَلَا يَخْرُجَنَّ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف (معلول)..

(٢) حديث صحيح.

**باسی فەرموودەیەك درێژەپێدەری دەستەواژە کورتەکەی پێشووە کە لە پێشەوە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا فەرموویەتی دەستنوێژ نییە مەگەر کەسێك دەنگی لێ دەرهاتبێت یان بۆنێك، ئەو فەرموودەیە لە میانەی پرسیارێکدا بووە پرسیاری لێ کراوە لەبارەی پیاوێك وا گومان دەبات لە نوێژەکەیدا بۆنێك دەرچووە، جا ئەم فەرموودەیە: (لَا وُضُوءَ إِلَّا مِنْ صَوْتٍ أَوْ رِيحٍ)، وەڵام بووە بۆ پرسیارێك لێی کرابوو نەك ئەوەی فەرموو‌بێت بەبێ ئەوەی پرسیاری لێ کرابێت، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو‌بێت بەبێ ئەوەی پرسیارێکی لێ کرابێت ئەوەی ئەو فەرموودەیە پێویستبوونی دەستنوێژ ڕەت دەکاتەوە لە میز و خەو و مەزی، دەگونجێ میز نە دەنگی هەبێت نە بۆن، بەهەمان شێوە خەو و مەزیش نە دەنگیان هەیە نە بۆن، هەروەها وەدیش (الْوَدْيُ: ئاوێکی سپی لینجە لەدوای میز دەردەچێ)**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە هەستی بە شتێك کرد لەنێو سکیدا گومانی هەبوو ئایا شتێك لە (کۆمی) دەرچووە یان دەرنەچووە، ئەوا با دەرنەچێت (لە نوێژەکەی) هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێت یان بۆنی بایەك هەست پێ بکات.

**٢٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَيَقُولُ: إِنَّكَ قَدْ أَحْدَثْتَ، فَلْيَقُلْ: كَذَبْتَ إِلَّا مَا وَجَدَ رِيحَهُ بِأَنْفِهِ، أَوْ سَمِعَ صَوْتَهُ بِأُذُنِهِ هَذَا لَفْظُ وَكِيعٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ: فَلْيَقُلْ كَذَبْتَ أَرَادَ فَلْيَقُلْ كَذَبْتَ بِضَمِيرِهِ لَا يَنْطِقُ بِلِسَانِهِ، إِذِ الْمُصَلِّي غَيْرُ جَائِزٍ لَهُ أَنْ يَقُولَ كَذَبْتَ نُطْقًا بِلِسَانِهِ[١]».

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەراستی هەر یەکێك لە ئێوە لەنێو نوێژەکەیدا شەیتان دێت بۆ لای، دەڵێ: بێگومان تۆ دەستنوێژت شکا، با ئەویش بڵێ: درۆت کرد مەگەر بە لووتی بۆنی بکات یان بەگوێی دەنگی ببیستێ. ئەمە دەستەواژەی وەکیعە. ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی: با بڵێ درۆت کرد. مەبەستی ئەوەیە لە ناخیەوە ئەوە بڵێ نەك بە دەربڕینی زمانی، چونکە دروست نییە بۆ نوێژخوێن بە زمانی ئەوە بڵێ (لەنێو نوێژدا).

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّمْسَ قَدْ يَكُونُ بِالْيَدِ
## « ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ اللَّمْسَ لَا يَكُونُ إِلَّا بِجِمَاعٍ بِالْفَرْجِ فِي الْفَرْجِ

**٣٠-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هُرْمُزَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ يَأْثُرُهُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ ابْنِ آدَمَ أَصَابَ مِنَ الزِّنَا لَا مَحَالَةَ، فَالْعَيْنُ زِنَاؤُهَا النَّظَرُ، وَالْيَدُ زِنَاؤُهَا اللَّمْسُ، وَالنَّفْسُ تَهْوَى أَوْ تُحَدِّثُ، وَيُصَدِّقُهُ أَوْ يُكَذِّبُهُ الْفَرْجُ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَعْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ اللَّمْسَ قَدْ يَكُونُ بِالْيَدِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ ﴿٧﴾ ﴾الأنعام، قَدْ عَلَّمَ رَبُّنَا عَزَّ وَجَلَّ أَنَّ اللَّمْسَ قَدْ يَكُونُ بِالْيَدِ، وَكَذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ لَمَّا نَهَى عَنْ بَيْعِ اللِّمَاسِ دَلَّهُمْ نَهْيُهُ عَنْ بَيْعِ اللَّمْسِ أَنَّ اللَّمْسَ بِالْيَدِ، وَهُوَ أَنْ يَلْمِسَ الْمُشْتَرِي الثَّوْبَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يُقَلِّبَهُ وَيَنْشُرَهُ، وَيَقُولُ عِنْدَ عَقْدِ الشِّرَاءِ إِذَا لَمَسْتُ الثَّوْبَ بِيَدِي فَلَا خِيَارَ لِي بَعْدُ إِذَا نَظَرْتُ إِلَى طُولِ الثَّوْبِ وَعَرْضِهِ أَوْ ظَهَرْتُ مِنْهُ عَلَى عَيْبٍ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ قَالَ لِمَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ حِينَ أَقَرَّ عِنْدَهُ بِالزِّنَا: لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ لَمَسْتَ، فَدَلَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: أَوْ لَمَسْتَ غَيْرَ الْجِمَاعِ الْمُوجِبِ لِلْحَدِّ، وَكَذَلِكَ خَبَرُ عَائِشَةَ «قَالَ أَبُو بَكْرٍ: «وَلَمْ يَخْتَلِفْ عُلَمَاؤُنَا مِنَ الْحِجَازِيِّينَ وَالْمِصْرِيِّينَ وَالشَّافِعِيُّ، وَأَهْلُ الْأَثَرِ أَنَّ الْقُبْلَةَ وَاللَّمْسَ بِالْيَدِ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ الْيَدِ وَبَيْنَ بَدَنِ الْمَرْأَةِ إِذَا لَمِسَهَا حِجَابٌ وَلَا سُتْرَةٌ مِنْ ثَوْبٍ وَلَا غَيْرِهِ أَنَّ ذَلِكَ يُوجِبُ الْوُضُوءَ» غَيْرَ أَنَّ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ كَانَ يَقُولُ: «إِذَا كَانَتِ الْقُبْلَةُ وَاللَّمْسُ بِالْيَدِ لَيْسَ بِقُبْلَةِ شَهْوَةٍ؛ فَإِنَّ ذَلِكَ لَا يُوجِبُ الْوُضُوءَ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ وَيُصَدِّقُهُ أَوْ يُكَذِّبُهُ الْفَرْجُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ أَنَّ التَّصْدِيقَ قَدْ يَكُونُ بِبَعْضِ الْجَوَارِحِ لَا كَمَا ادَّعَى مَنْ مَوَّهَ عَلَى بَعْضِ النَّاسِ أَنَّ التَّصْدِيقَ لَا يَكُونُ فِي لُغَةِ الْعَرَبِ إِلَّا بِالْقَلْبِ، قَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ بِتَمَامِهَا فِي كِتَابِ الْإِيمَانِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار (اللَّمْس) بە مانای دەستلێدان دێت، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا دەزانێ تەنها بۆ جیماعکردن دێت لە داوێنەوە بۆ داوێن

واتە: عەبدورەحمانی کوڕی هورموز دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هێناویەتی: هەموو نەوەیەکی ئادەم مەحاڵە هەر دەبێ تووشی شتێک ببێت لە زینا:

---

(١) حديث صحيح.

جا زینای چاو تەماشاکردنە، زینای دەستیش دەستپێداهێنانە، نەفسیش دەجوڵێت یان بیری لێ دەکاتەوە، داوێنیش ئەوە دەسەلمێنێت یان بەدرۆی دەخاتەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری داوە کە (اللَّمْس) هەندێ جار بە دەست دەبێ، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِي قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر نامەیەکی نووسراومان بناردایەتە خوارەوە بۆت لەنێو کاغەزێکدا بووایە و دەستیشیان لێ بدایە. بێگومان پەروەردگارمان ڕایگەیاندووە کە هەندێ جار (اللَّمْس) بە دەست دەبێت، بەهەمان شێوە پێغەمبەریش ﷺ ڕایگەیاندووە، چونکە قەدەغەی کردووە لە کڕین و فرۆشتنی (اللِّمَاس)، قەدەغەکردنەکەی بۆ ڕێنیشاندانە لە مامەڵەکردنی دەستلێدان، ئەویش بریتییە لەوەی کڕیار تەنها دەست دەدات لە شمەکەکە بەبێ ئەوەی ئەمدیودیوی بکات، یان بیکاتەوە، لە کاتی گرێبەستی کڕینەکەدا دەڵێ: ئەگەر دەستم لێ دا ئەوە ماڵی منە، دواتر ئەگەر قوماشەکەم کردەوە و تەماشای درێژی و کورتیم کرد هەر کەموکوڕییەکەم تێدا بینی پەشیمان بوونەوەم بۆ نییە، وە کاتێك کە ماعزی کوڕی مالیك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانی نا بە زیناکردن فەرمووی: (لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ أَوْ لَمَسْتَ) واتە: لەوەیە ماچت کردبێت یان دەستت پێدا هێنابێت. ئەم دەستەواژەیە (أَوْ لَمَسْتَ) مەبەستی پێی جگە لەو جیاعکردنەیە کە بەهۆیەوە حەدی شەرعی پێویست دەکات، هەروەها فەرموودەکەی عائیشەش، ئەبو بەکر دەڵێ: هیچ یەکێك لە زانایانمان لە حیجازییەکان و میصرییەکان و شافیعی و ئەهلی (الْأَثَرِ)یش جیاوازییان نییە لەوەی ماچکردن و دەستلێدان ئەگەر لە نێوان دەست و جەستەی ئافرەتەکە هیچ پەردە و بەربەستێك نەبوو ئەوە دەستنوێژ پێویست دەبێت، بەڵام مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێ: ماچکردن و دەستلێدان ئەگەر ئارەزوو هەڵنەسێنێ دەستنوێژ پێویست ناکات.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (وَيُصَدِّقُهُ أَوْ يُكَذِّبُهُ الْفَرَجُ) واتە: داوێنیش ئەوە دەسەلمێنێت یان بە درۆی دەخاتەوە. لەو شتانەیە کە لە کتێبی ئیماندا باسم کردوە، بێگومان (التَّصْدِيقَ) بەڕاستدانان هەندێ جار بە هەندێك لە ئەندامەکانی جەستە دەکرێ، نەك وەکوو ئەوەی هەندێ لەوانەی کە بەشێك لە خەڵکی بەهەڵەدا دەبەن دەڵێن: (التَّصْدِيقَ) لە زمانی عەرەبدا تەنها بۆ دڵ بەکار هاتووە، بێگومان ئەم بابەتەم بەتێروتەسەلی لە کتێبی ئیماندا ڕوون کردۆتەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْوَضُوءِ مِنْ أَكْلِ لُحُومِ الْإِبِلِ

**٣١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وَإِنْ شِئْتَ فَلَا تَتَوَضَّأْ». قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: فَتَوَضَّى مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَبض الْغَنَمِ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: «لَا»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ نَرَ خِلَافًا بَيْنَ عُلَمَاءِ أَهْلِ الْحَدِيثِ أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ صَحِيحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، وَرَوَى هَذَا الْخَبَرَ أَيْضًا: عَنْ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، أَشْعَثُ بْنُ أَبِي الشَّعْثَاءِ الْمُحَارِبِيُّ، وَسَمَّاكُ بْنُ حَرْبٍ فَهَؤُلَاءِ ثَلَاثَةٌ مِنْ أَجِلَّةِ رُوَاةِ الْحَدِيثِ قَدْ رَوَوْا عَنْ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ هَذَا الْخَبَرَ.

### باسی فەرمانکردن بە دەستنوێژگرتنەوە لە خواردنی گۆشتی وشتر

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا دەستنوێژ بگرم لە خواردنی گۆشتی مەڕ؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت دەستنوێژ بگرە وە ئەگەر ویستت دەستنوێژ مەگرە، وتی: ئایا دەستنوێژ بگرم لە خواردنی گۆشتی وشتر؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: دەستنوێژی گرت لە گۆشتی وشتر، وتی: لە پەچا و مۆڵگەی مەڕ نوێژ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: لە پەچای وشتر نوێژ بکەم؟ فەرمووی: نەخێر.

ئەبو بەکر دەڵێ: هیچ جیاوازییەکم لە نێوان زانایانی فەرموودەناسدا نەبینیوە کە ئەم فەرموودەیە ڕاستە لە ڕووی گواستنەوەوە، هەروەها ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە لە جەعفەری کوڕی ئەبو سەور، ئەشعەسی کوڕی ئەبو شەعسای موحاریبی و سەماکی کوڕی حەڕب، ئەو سیانەش لە گەورەپیاوانی فەرموودەناسن، ئەم فەرموودەیان لە جەعفەری کوڕی ئەبو سەورەوە گێڕاوەتەوە.

---

(١) صحيح.

**٣٢** - عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: «لَا». قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِهَا؟ قَالَ: «لَا»(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَمْ نَرَ خِلَافًا بَيْنَ عُلَمَاءِ أَهْلِ الْحَدِيثِ أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ أَيْضًا صَحِيحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ بِعَدَالَةِ نَاقِلِيهِ.

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئایا لە پەچای وشتر نوێژ بکەم؟ فەرمووی: نەخێر، وتی: ئایا لە خواردنی گۆشتەکەی دەستنوێژ بگرم؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: ئایا لە پەچای مەڕ نوێژ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ وتی: ئایا لە خواردنی گۆشتەکەی دەستنوێژ بگرم؟ فەرمووی: نەخێر.

ئەبو بەکر دەڵێ: بەهەمان شێوە جیاوازییەك بەدی ناکەین لە نێوانی زانایانی فەرموودەناس، کە ئەم فەرموودەیە بەهەمان شێوە ڕاستە لە ڕووی گواستنەوە و دادپەروەری ئەوانەی گێڕاویانەتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ مِنْ مَسِّ الذَّكَرِ

**٣٣**- عَنْ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ ﵂، أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا مَسَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ» سَمِعْتُ يُونُسَ بْنَ عَبْدِ الْأَعْلَى الصَّدَفِيَّ يَقُولُ: أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنْ مَالِكٍ قَالَ: «أَرَى الْوُضُوءَ مِنْ مَسِّ الذَّكَرِ اسْتِحْبَابًا وَلَا أُوجِبُهُ»، ثنا عَلِيُّ بْنُ سَعِيدٍ النَّسَوِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ عَنِ الْوُضُوءِ مِنْ مَسِّ الذَّكَرِ، فَقَالَ: «أَسْتَحِبُّهُ وَلَا أُوجِبُهُ»(٢).

## باسی ئەو کەسەی دەستی بەر ئەندامی نێرینەی دەکەوێ چاکتر وایە دەستنوێژ بگرێتەوە

واتە: بوسرەی کچی صەفوان ﵂ دەگێڕێتەوە ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستی بەر ئەندامی نێرینەی کەوت با دەستنوێژ بگرێ. گوێم

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

لە یونسی کوڕی عەبدولئەعلای صەدەفی بوو دەیوت: ئیبنو وەهب هەواڵی پێ داین لە مالیکەوە وتی: ئەوەی دەستی بەر ئەندامی نێرینەی کەوت پێم چاکە دەستنوێژ بگرێتەوە، بەڵام پێویستی ناکەم لەسەری، عەلی کوڕی سەعیدی نەسەوی بۆی باس کردین وتی: پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرد دەربارەی دەستنوێژی ئەو کەسەی دەستی بەر ئەندامی نێرینەی دەکەوێت، وتی: پێم چاکە دەستنوێژ بگرێتەوە بەڵام پێویستی ناکەم لەسەری.

**٣٤-** عَنْ أَبِي بَكْر قَالَ وَسَمِعْتُ مُحَمَّد بْنِ يَحْيَى يَقُولُ نَرَى الوُضُوء مَنْ مَسَّ الذكَر استِحْبَاباً لا إيجابا بحدِيث عَبْدِ الله بنِ بَدْر، عَنْ قَيْس بن طلق عَنْ أبيه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَكَانَ الشَّافِعِيُّ رَحِمَهُ اللَّهُ يُوجِبُ الْوُضُوءَ مِنْ مَسِّ الذَّكَرِ اتِّبَاعًا بِخَبَرِ بُسْرَةَ بِنْتِ صَفْوَانَ لَا قِيَاسًا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَبِقَوْلِ الشَّافِعِيِّ أَقُولُ: لِأَنَّ عُرْوَةَ قَدْ سَمِعَ خَبَرَ بُسْرَةَ مِنْهَا لَا كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ عُلَمَائِنَا أَنَّ الْخَبَرَ وَاهٍ لِطَعْنِهِ فِي مَرْوَانَ[1].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: وە گوێم لە موحەممەدی کوڕی یەحیا بوو دەیوت: پێمان وایە دەستنوێژگرتنەوە لە دەستلێدانی ئەندامی نێرینە، چاکە، بەڵام واجب نییە، بە ڵگەی فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی بەدر لە قەیسی کوڕی تەلق، لە باوکی، لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەبو بەکر دەڵێ: شافیعی ﵀ دەستنوێژ پێویست دەکات بۆ ئەو کەسەی دەستی بەر ئەندامی نێرینەی دەکەوێت، چونکە شوێنی فەرموودەکەی بوسرەی کچی صەفوان کەوتووە نەك بە قیاس. ئەبو بەکر وتی: منیش هەمان قسەی شافیعی دەڵێم، چونکە عوڕوە فەرموودەکەی بوسرەی لە خۆیەوە بیستووە نەك وەك هەندێ لە زانایانمان لێیان تێکچووە وا دەزانن فەرموودەکە لاوازە لەبەر تانەدانی لە مەڕوان.

---

(١) حديث عبدالله بن بدر، عن قيس بن طلق بن علي الحنفي، عن أبيه، عن النبي ﷺ قال: ((وهل هو إلا مضغة منه؟ أو بضعة منه؟)). أخرجه أبو داود (١٨٢)، والترمذي (٨٥)، والنسائي (١٠١/١)، وفي الكبرى له (١٥٨) من طريق عبدالله بن بدر بهذا الإسناد. وأخرجه: أحمد (٢٢/٤ و٢٣)، وأبو داود (١٨٣)، وابن ماجه (٤٨٣)، وابن الجارود (٢١)، والطحاوي (٧٥/١ و ٧٦) والطبراني في الكبير (٨٢٣٣) و (٨٢٣٤)، والدار قطني ١٤٨/١ و١٤٩ و ١٥٠ من طرق عن قيس بن طلق بهذا الإسناد. انظر إتحاف المهرة ٣٧٠/٦ (٦٦٦١)، وانظر: الأم (٤٤/٢) ط. دار الوفاء، وكذلك انظر: حديث السابق رقم (٣٣)، وفي الكلام عن حديث طلق بن علي وحديث بسرة انظر دلك مفصلا في كتابي أثر اختلاف الأسانيد والمتون في اختلاف الفقهاء: ٢٣٠ - ٢٤٨.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُحْدِثَ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ الْوُضُوءُ قَبْلَ وَقْتِ الصَّلَاةِ

**٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ فَقُرِّبَ إِلَيْهِ طَعَامٌ فَقَالُوا: أَلَا نَأْتِيكَ بِوَضُوءٍ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلَاةِ»(١)

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بێدەستنوێژ پێش کاتی هاتنی نوێژ دەستنوێژی لەسەر پێویست (واجب) نابێت

**واتە:** ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو دەرچوو، خواردنی نزیك کرایەوە، وتیان: ئایا ئاوی دەستنوێژت بۆ نەهێنین؟ فەرمووی: بێگومان کاتێك فەرمانم پێ کراوە بە دەستنوێژ ئەگەر هەستام بۆ نوێژ.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ اللَّوَاتِي لَا تُوجِبُ الْوُضُوءَ

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى أَنَّ خُرُوجَ الدَّمِ مِنْ غَيْرِ مَخْرَجِ الْحَدَثِ لَا يُوجِبُ الْوُضُوءَ

**٣٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ الرِّقَاعِ مِنْ نَخْلٍ، فَأَصَابَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ امْرَأَةَ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَافِلًا أَتَى زَوْجُهَا وَكَانَ غَائِبًا، فَلَمَّا أُخْبِرَ الْخَبَرَ حَلَفَ لَا يَنْتَهِي حَتَّى يُهَرِيقَ فِي أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ دَمًا، فَخَرَجَ يَتْبَعُ أَثَرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْزِلًا فَقَالَ: «مَنْ رَجُلٌ يَكْلَؤُنَا لَيْلَتَنَا هَذِهِ؟» فَانْتَدَبَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَرَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَا: نَحْنُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «فَكُونَا بِفَمِ الشِّعْبِ» قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ قَدْ نَزَلُوا إِلَى الشِّعْبِ مِنَ الْوَادِي، فَلَمَّا أَنْ خَرَجَ الرَّجُلَانِ إِلَى فَمِ الشِّعْبِ قَالَ الْأَنْصَارِيُّ لِلْمُهَاجِرِيِّ: أَيُّ اللَّيْلِ أَحَبُّ إِلَيْكَ أَنْ أَكْفِيَكَهُ أَوَّلَهُ أَوْ آخِرَهُ؟ قَالَ: بَلِ اكْفِنِي أَوَّلَهُ قَالَ: فَاضْطَجَعَ الْمُهَاجِرِيُّ فَنَامَ، وَقَامَ الْأَنْصَارِيُّ يُصَلِّي قَالَ: وَأَتَى زَوْجُ الْمَرْأَةِ، فَلَمَّا رَأَى شَخْصَ الرَّجُلِ عَرَفَ أَنَّهُ رَبِيئَةُ الْقَوْمِ قَالَ: فَرَمَاهُ بِسَهْمٍ فَوَضَعَهُ فِيهِ قَالَ: فَنَزَعَهُ فَوَضَعَهُ وَثَبَتَ قَائِمًا يُصَلِّي، ثُمَّ رَمَاهُ بِسَهْمٍ آخَرَ فَوَضَعَهُ فِيهِ قَالَ: فَنَزَعَهُ فَوَضَعَهُ وَثَبَتَ قَائِمًا يُصَلِّي، ثُمَّ عَادَ لَهُ الثَّالِثَةَ فَوَضَعَهُ فِيهِ فَنَزَعَهُ فَوَضَعَهُ، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، ثُمَّ أَهَبَّ صَاحِبَهُ، فَقَالَ: اجْلِسْ فَقَدْ

---

(١) إسناده صحيح.

أُثْبِتُ فَوَثَبَ، فَلَمَّا رَآهُمَا الرَّجُلُ عَرَفَ أَنَّهُ قَدْ نَذَرَ بِهِ فَهَرَبَ، فَلَمَّا رَأَى الْمُهَاجِرِيُّ مَا بِالْأَنْصَارِيِّ مِنَ الدَّمَاءِ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ، أَفَلَا أَهْبَبْتَنِي أَوَّلَ مَا رَمَاكَ؟ قَالَ: كُنْتُ فِي سُورَةٍ أَقْرَأُهَا فَلَمْ أُحِبَّ أَنْ أَقْطَعَهَا حَتَّى أُنْفِدَهَا، فَلَمَّا تَابَعَ عَلَيَّ الرَّمْيَ رَكَعْتُ فَأَذَنْتُكَ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْلَا أَنْ أُضَيِّعَ ثَغْرًا أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحِفْظِهِ لَقَطَعَ نَفْسِي قَبْلَ أَنْ أَقْطَعَهَا أَوْ أُنْفِدَهَا «هَذَا حَدِيثُ مُحَمَّدِ بْنِ عِيسَى»[١].

## کۆباسی ئەو کردەوانەی کە دەستنوێژگرتن پێویست (واجب) ناکەن.
## باسی فەرمووودەیەك کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەرچوونی خوێن لە جگە لە هەردوو دەرچەی پێش و پاش دەستنوێژ ناشکێنێت

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە جەنگی (ذَاتِ الرِّقَاعِ) (کە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچی بوو)، لەلای باخێکی دارخورما پیاوێك لە موسوڵمانان ژنی پیاوێکی هاوبەشدانەرانی کوشت، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە قافڵە ئەوێی بەجێ هێشت مێردەکەی هاتەوە، پێشتر لەوێ نەبوو، کاتێ ئەو هەواڵەیان پێی دا سوێندی خوارد واز نەهێنێ هەتا خوێنی کەسێك دەڕێژێ لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ، دەرچوو بە شوێنپێی پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزییە جێگایەك، فەرمووی: چی پیاوێ ئەم شەو پاسەوانیمان دەکات؟ پیاوێك لە موهاجیرەکان و پیاوێك لە ئەنصارەکان ئامادەیی خۆیان دەربڕی، وتیان: ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بچن چاودێری ئەو تولەڕێیە بکەن، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی لە تولەڕێیەکەوە دابەزینە ناو شیوەکە، کاتێ ئەو دوو پیاوە دەرچوون بۆ دەم تولەڕێیەکە، ئەنصارییەکە بە موهاجیرەکەی وت: حەز دەکەی سەرەتای شەو پشوو بدەیت یان کۆتاییەکەی؟ وتی: سەرەتای شەو موهاجیرەکە ڕاکشا و لێی خەوت، ئەنصارییەکەیش هەستا و دەستی کرد بە نوێژکردن، وتی: مێردی ژنەکە هات، کاتێ کە پیاوە ئەنصارییەکەی بینی زانی ئەمە لەو قەومەیە، تیرێکی تێ هاویشت و پێکای، ئەویش تیرەکەی لە خۆی کردەوە و بەپێوە نوێژی دەکرد، پاشان تیرێکی دیکەی تێ هاویشت پێکای، ئەویش تیرەکەی لابرد و بەپێوە

---

(١) إسناده ضعيف.




نوێژی دەکرد، پاشان سێیەم تیری تێ هاویشت پێکای، ئەویش لایبرد و فڕێی دا، پاشان چووە ڕکووع و ئینجا سوژدەی برد، پاشان هاوەڵەکەی ئاگادار کردەوە و وتی: دابنیشە، کەسێك تیری لێ داوم، کاتێ پیاوەکە بینیانی زانی هاوڕێیەکەی ئاگادار کردۆتەوە، هەڵهات، کاتێ موهاجیرەکە ئەو خوێنەی بینی بە ئەنصارییەکەوە، وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوا، یەکەم جار تیری تێت هاویشت بۆ بانگمت نەکرد؟ وتی: من سورەتێکم دەخوێند حەزم نەکرد بیپچڕێنم هەتا تەواوی نەکەم، کاتێ تیربارانی کردم چوومە ڕکووع ئاگادارتم کردەوە، سوێند بە خوا ئەگەر لەبەر پارێزگاری ئەم شوێنە نەبووایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووم بیپارێزم، یان ڕووحم دەردەچوو پێش ئەوەی سورەتەکە تەواو بکەم یان سورەتەکەم تەواو دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ وَطْءَ الْأَنْجَاسِ لَا يُوجِبُ الْوُضُوءَ

٣٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَا نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ، وَقَالَ الْمَخْزُومِيُّ: كُنَّا نَتَوَضَّأُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَا نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ، وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَا نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ، عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: كُنَّا لَا نَكُفُّ شَعْرًا وَلَا ثَوْبًا فِي الصَّلَاةِ، وَلَا نَتَوَضَّأُ مِنْ مَوْطِئٍ [١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پیسی ڕێگاوبان بەر جلوبەرگ بکەوێت دەستنوێژ پێویست (واجب) ناکاتەوە

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد بەڵام دەستنوێژمان نەدەگرت لەوەی پیسی ڕێگاوبان بەر جلوبەرگمان بکەوتایە. مەخزومی وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژمان دەگرت بەڵام دەستنوێژمان نەدەگرت لەوەی پیسی ڕێگاوبان بەر جلوبەرگمان بکەوتایە. زوهری وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین دەستنوێژمان نەدەگرت لەوەی پیسی ڕێگاوبان بەر جلوبەرگمان بکەوتایە. (دواتر بە سەنەدی خۆی هێنای) لە ڕێگەی شەقیقەوە وتی: عەبدوڵا ﷺ وتی: ئێمە

---

(١) هذا الحديث أعله المصنف للشك الذي حصل من الأعمش.




لەنێو نوێژدا دەستکاری قژ و جلوبەرگمان نەدەکرد، وە دەستنوێژمان نەدەگرتەوە لەوەی شتێکی پیس بەر جلوبەرگمان بکەوتایە.

## بَابُ إِسْقَاطِ إِيجَابِ الْوُضُوءِ مِنْ أَكْلِ مَا مَسَّتْهُ النَّارُ أَوْ غَيَّرَتْهُ

**٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ عَظْمًا - أَوْ قَالَ لَحْمًا - ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ غَيْرُ مُتَّصِلِ الْإِسْنَادِ غَلَطْنَا فِي إِخْرَاجِهِ؛ فَإِنَّ بَيْنَ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، وَبَيْنَ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، وَهْبُ بْنُ كَيْسَانَ، وَكَذَلِكَ رَوَاهُ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ، وَعَبْدَةُ بْنُ سُلَيْمَانَ[١].

## باسی هەڵگرتنی واجببوونی دەستنوێژگرتنەوە لە خواردنێك ئاگری بەرکەوتبێت یان گۆڕیبێتی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ گۆشتی ئێسکێکی خوارد -یان وتی: گۆشتێك- پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی حەمادی کوڕی زەید سەنەدەکەی (مُتَّصِل) نییە، هەڵەمان کرد ئێمە لە هێنانیدا هەڵەمان کرد، چونکە لە نێوان هیشامی کوڕی عوڕوە و نێوان موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاء وەهبی کوڕی کەیسان هاتووە، بەهەمان شێوە یەحیای کوڕی سەعیدی قەتان و عەبدەی کوڕی سولەیان گێڕاویانەتەوە.

**٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكَلَ خُبْزًا وَلَحْمًا أَوْ عِرْقًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نان و گۆشتی خوارد، یان گۆشتی سەر ئێسکی کڕاندەوە، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرت.

**٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكَلَ عَرْقًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ[٣].

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.




واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی سەر ئێسکێکی کڕاندەوە و خواردی، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّحْمَ الَّذِي تَرَكَ النَّبِيُّ ﷺ الْوَضُوءَ مِنْ أَكْلِهِ كَانَ لَحْمَ غَنَمٍ لَا لَحْمَ إِبِلٍ

٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو گۆشتەی کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی خواردنیدا دەستنوێژی نەگرتەوە گۆشتی مەڕ بوو نەك گۆشتی وشتر

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە شانی مەڕێکی خوارد، پاشان نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ تَرْكَ النَّبِيِّ ﷺ الْوَضُوءَ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ أَوْ غَيَّرَتْ نَاسِخٌ لِوُضُوئِهِ كَانَ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ أَوْ غَيَّرَتْ

٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ مِنْ ثَوْرِ أَقِطٍ، ثُمَّ رَآهُ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی: وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ لە دەستنوێژگرتنەوە لەو خواردنەی ئاگری بەرکەوتووە یان گۆڕیویەتی نەسخی دەستنوێژگرتنەوەی کردووە لەوەی کە پێشتر دەستنوێژی بۆ دەگرتەوە لەو خواردنەی ئاگری بەرکەوتبوو یان گۆڕیبووی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی دەستنوێژی گرت لە خواردنی پارچە کەشکێك، پاشان بینی لە شانی بەرخێکی دەخوارد، ئینجا نوێژی کرد و دەستنوێژی نەگرتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: آخِرُ الْأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَرْكُ الْوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ[1].

واته: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: کۆتا فەرمان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وازهێنان بوو لە دەستنوێژگرتن لەو خواردنەی ئاگری بەرکەتووە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ غَسْلِ الْيَدَيْنِ، وَالْمَضْمَضَةِ مِنْ أَكْلِ اللَّحْمِ «إِذِ الْعَرَبُ قَدْ تُسَمِّي غَسْلَ الْيَدَيْنِ وُضُوءًا»

**٤٤-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ كَتِفًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَمَسَّ مَاءً.[2]

## باسی مۆڵەتدان لە وازهێنان لە شۆردنی هەردوو دەست و ئاووەردانە دەم بەهۆی خواردنی گۆشت، چونکە عەرەب هەندێ جار بە شۆردنی هەردوو دەستیش دەڵێن: (وُضُوء)

واته: دایکی سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە شانێکی خوارد پاشان نوێژی کرد و دەستی بەر ئاو نەکەوت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَلَامَ السَّيِّئَ وَالْفُحْشَ فِي الْمَنْطِقِ لَا يُوجِبُ وُضُوءًا

**٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَاللَّاتِ، فَلْيَقُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ بِشَيْءٍ»[3].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَمْ يَأْمُرِ النَّبِيُّ ﷺ الْحَالِفَ بِاللَّاتِ وَلَا الْقَائِلِ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ بِإِحْدَاثِ وُضُوءٍ، فَالْخَبَرُ دَالٌّ عَلَى أَنَّ الْفُحْشَ فِي الْمَنْطِقِ، وَمَا زُجِرَ الْمَرْءُ عَنِ النُّطْقِ بِهِ لَا يُوجِبُ وُضُوءًا خِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْكَلَامَ السَّيِّئَ يُوجِبُ الْوُضُوءَ.

---

(١) هذا حديث معلول ولا يصح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی وتەی خراپ و ناشرین دەستنوێژ پێویست (واجب) ناکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوێندی خوارد و لە سوێندەکەیدا وتی: بە لات، با بڵێ: هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە جگە لە خوا، هەر کەسێکیش بە هاوەڵەکەی وت: بێ با قومارت لەگەڵ بکەم، ئەوە با شتێك ببەخشێ بەئەندازەی ئەوەی بۆ قومارەکە دایناوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەو کەسەی سوێندی خوارد بە لات، هەروەها ئەو کەسەش وتی: بێ با قومارت لەگەڵ بکەم پێغەمبەر ﷺ فەرمانی نەکردووە دەستنوێژ تازە بکەنەوە، جا فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەربڕینی وتەی نابەجێ هەروەها ئەوەیشی کە بەندە سەرزەنشتکراوە بیڵێ، دەستنوێژ پێویست (واجب) ناکات بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وایە قسەی ناشرین دەستنوێژ پێویست دەکات.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْمَضْمَضَةِ مِنْ شُرْبِ اللَّبَنِ

٤٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا، ثُمَّ مَضْمَضَ[١].

## باسی چاکتر وایە لەدوای خواردنەوەی شیر ئاو وەربدرێتە نێو دەم

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ شیری خواردەوە، پاشان ئاوی وەردایە دەمی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَضْمَضَةَ مِنْ شُرْبِ اللَّبَنِ اسْتِحْبَابٌ لِإِزَالَةِ الدَّسَمِ مِنَ الْفَمِ وَإِذْهَابِهِ، لَا لِإِيجَابِ الْمَضْمَضَةِ مِنْ شُرْبِهِ

٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا فَمَضْمَضَ، وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا» وَقَالَ الصَّنْعَانِيُّ: فِي حَدِيثِهِ: «أَوْ إِنَّهُ دَسَمٌ»، وَقَالَ بُنْدَارٌ: «إِنَّهُ دَسَمٌ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاو وەردانە دەم لە خواردنەوەی شیر کارێکی چاکە بەهۆی لابردن و نەهێشتنی چەوری لەنێو دەم، نەك لەبەر پێویست (واجب) بوونی ئاو وەردانە دەم لە خواردنەوەی**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ شیری خواردەوە، پاشان ئاوی وەردایە دەمی و فەرمووی: (بەڕاستی ئەو شیرە چەوری تێدایە). صەنعانی (لە فەرموودەکەیدا) وتوویەتی: (یان ئەو شیرە چەورە). وە بوندار وتوویەتی: (ئەو شیرە چەورە).

**بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَرَّقَ بِهِ بَيْنَ نَبِيِّهِ ﷺ، وَبَيْنَ أُمَّتِهِ فِي النَّوْمِ «مِنْ أَنَّ عَيْنَيْهِ إِذَا نَامَتَا لَمْ يَكُنْ قَلْبُهُ يَنَامُ، فَفَرَّقَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ فِي إِيجَابِ الْوُضُوءِ مِنَ النَّوْمِ عَلَى أُمَّتِهِ دُونَهُ عَلَيْهِ السَّلَامُ»**

٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَنَامُ عَيْنَايَ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»[١].

**باسی ئەوەی خوا جیاوازی پێ کردووە لە نێوان پێغەمبەرەکەی ﷺ و لە نێوان ئوممەتەکەی لە کاتی خەو لەوەی ئەو ئەگەر چاوەکانی خەویان لێ بکەوێت دڵی ناخەوێ، بۆیە نێوان ئەو و ئوممەتەکەی لە یەکدی جیا کردۆتەوە لە پێویست (واجب) بوونی دەستنوێژگرتنەوە بەهۆی خەوەوە (واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەرچی خەویشی لێ بکەوێ دەستنوێژی ناشکێ، بە پێچەوانەی ئوممەتەکەی)**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چاوەکانم دەخەوێ بەڵام دڵم ناخەوێ.

٤٩- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ، سَأَلَ عَائِشَةَ ﷺ كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَتْ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُصَلِّي أَرْبَعًا، فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا» قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ ﷺ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد: نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو لە ڕەمەزاندا؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد: چوار ڕکاتی دەکرد پرسیار مەکە نە جوانی و درێژییان، پاشان چوار ڕکاتی دیکەی دەکرد پرسیار مەکە لە جوانی و درێژییان، پاشان سێ ڕکاتی دەکرد، عائیشە ﵂ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی ویتر بکەی دەخەویت؟ فەرمووی: (ئەی عائیشە ﵂ چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێت).

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ الْآدَابِ الْمُحْتَاجِ إِلَيْهَا فِي إِتْيَانِ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ إِلَى الْفَرَاغِ مِنْهَا

## بَابُ التَّبَاعُدِ لِلْغَائِطِ فِي الصَّحَارِي عَنِ النَّاسِ

٥٠- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَدَ[١].

## کۆباسی ئەو ئاداب و ڕێکارانەی کە بەندە پێویستی پێیانە لە چوونەسەرئاو و میزکردن و تا لێبوونەوەیان

## باسی دوورکەوتنەوە لە خەڵکی لە کاتی سەرئاوکردن لە دەشتایی و چۆڵەوانی

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچووایە بۆ سەرئاوکردن دوور دەکەوتەوە.

٥١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي قُرَادٍ ﵁ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَرَأَيْتُهُ خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ، وَكَانَ إِذَا أَرَادَ حَاجَةً أَبْعَدَ[٢].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی قوڕاد ﵁ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم بینیم چوو بۆ چۆڵەوانی، جا ئەو ئەگەر بیویستایە سەرئاو بکات دوور دەکەوتەوە.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ التَّبَاعُدِ عَنِ النَّاسِ عِنْدَ الْبَوْلِ

**٥٢-** عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَتَمَشَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَنْتَهِي إِلَى سُبَاطَةِ قَوْمٍ، فَقَامَ يَبُولُ كَمَا يَبُولُ أَحَدُكُمْ، فَذَهَبْتُ أَتَنَحَّى مِنْهُ، فَقَالَ: «ادْنُهْ» فَدَنَوْتُ مِنْهُ حَتَّى قُمْتُ عَقِبَهُ حَتَّى فَرَغَ[١].

## باسی مۆڵەت و ڕێگەپێدان بە دوورنەکەوتنەوە لە خەڵك لە کاتی میزکردن

واتە: ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە لە حوزەیفەوە ﷺ دەڵێ: من خۆمم بینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێم دەکرد تا گەیشتە لای زبڵدانی خەڵکێك، هەستا بەپێوە میزی کرد، وەکوو چۆن هەر یەکێك لە ئێوە (لە سەردەمی نەفامی بەپێوە) میزی دەکرد، منیش ڕۆیشتم خۆم دوور بخەمەوە لێی، فەرمووی: نزیك بەرەوە، منیش نزیك بوومەوە لێی و لە پشتیەوە وەستام هەتا تەواو بوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاسْتِتَارِ عِنْدَ الْغَائِطِ

**٥٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ فِي حَاجَتِهِ هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ[٢].

## باسی چاکتر وایە لە کاتی سەرئاوکردن بەربەست دابنرێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سەرئاوکردندا پێی خۆش بوو بە دیوارێك یان لەنێو باخی دارخورمادا خۆی داپۆشێت. (واتە: بچێتە پاڵ بەرزاییەك یان دارخورمایەك بکاتە بەربەست بۆ خۆی).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلنِّسَاءِ فِي الْخُرُوجِ لِلْبَرَازِ بِاللَّيْلِ إِلَى الصَّحَارِي

٥٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا امْرَأَةً جَسِيمَةً، فَكَانَتْ إِذَا خَرَجَتْ لِحَاجَتِهَا بِاللَّيْلِ أَشْرَفَتْ عَلَى النِّسَاءِ، فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ: انْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ؟ فَإِنَّكِ وَاللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا إِذَا خَرَجْتِ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ سَوْدَةُ لِنَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، وَفِي يَدِهِ عِرْقٌ فَمَا رَدَّ الْعِرْقَ مِنْ يَدِهِ حَتَّى فَرَغَ الْوَحْيُ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ جَعَلَ لَكُنَّ رُخْصَةً أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَوَائِجِكُنَّ»[1].

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەتان لە دەرچوونیان بۆ دەشتایی و چۆڵەوانی لە شەودا بە مەبەستی سەرئاوکردن

وتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: سەودەی کچی زەمعە رضي الله عنها ئافرەتێکی بەخۆوە بوو، کاتێ بە شەو بچوایە بۆ سەرئاوکردن، لەچاو ئافرەتان دەناسرایەوە، عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه بینی وتی: تەماشا بکە چۆن دەردەچیت؟ سوێند بە خوا کاتێ دەردەچی لەبەرچاومان ون نابیت، سەودە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد لە کاتێکدا پەرچە ئێسکێك بەدەستیەوە بوو، ئێسکەکەی دانەنا لە دەستی هەتا وەحی تەواو بوو، ئینجا فەرمووی: بەڕاستی خوا ﷻ مۆڵەتی پێ داون دەربچن بۆ پێویستییەکانتان.

## بَابُ التَّحَفُّظِ مِنَ الْبَوْلِ كَيْ لَا يُصِيبَ الْبَدَنَ وَالثِّيَابَ، وَالتَّغْلِيظُ فِي تَرْكِ غَسْلِهِ إِذَا أَصَابَ الْبَدَنَ أَوِ الثِّيَابَ

٥٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ مَكَّةَ، أَوِ الْمَدِينَةِ فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ»، ثُمَّ قَالَ: «بَلَى كَانَ أَحَدُهُمَا لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَكَانَ الْآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ»، ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ، فَوَضَعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسْرَةً، فَقِيلَ لَهُ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ تَيْبَسَا» أَوْ: «إِلَى أَنْ يَيْبَسَا»[2].

---

١) صحيح.

٢) صحيح.

## باسی خۆپاراستن لە میز بۆ ئەوەی بەر جەستە و جلوبەرگ نەکەوێ، وە سەرزەنشتکردن لە نەشۆردنی ئەگەر بەر جەستە یان جلوبەرگ بکەوێت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای باخێك لە باخەكانی مەككە یان مەدینە تێ پەڕی، گوێی لە دەنگی دوو كەس بوو لەنێو گۆڕەكەیاندا سزا دەدران، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سزا دەدرێن، لەبەر تاوانی گەورە سزا نادرێن، پاشان فەرمووی: بەڵێ، بەڵكوو بەهۆی تاوانی گەورەوە سزا دەدرێن، یەكێكیان خۆی پاك نەدەكردەوە لە میزەكەی، ئەوی دیكەیان قسەی دەهێنا و قسەی دەبرد، پاشان داوای لقە دارخورمایەكی كرد، دواتر كردی بە دوو پارچەوە، لەسەر هەر یەكێكیان پارچەیەكی دانا، پێی وترا: بۆ ئەمەت كرد؟ فەرمووی: بەڵكوو سزایان لەسەر سووك بكرێ هەتا وشك نەبنەوە، یان تا وشك دەبنەوە.

**٥٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَبْرَيْنِ بِمِثْلِهِ[١].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلای دوو گۆڕدا، بەهەمان شێوەی فەرموودەی پێشوو.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي النَّهْيِ عَنِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ عِنْدَ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٥٧-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ بِغَائِطٍ وَلَا بَوْلٍ، وَلَا تَسْتَدْبِرُوهَا، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا» قَالَ أَبُو أَيُّوبَ ﵁: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ نَحْوَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی قەدەغەكردنی ڕووكردنە قیبلە و پشتتێكردنی لە كاتی سەرئاوكردن و میزكردندا بە دەستەواژەی گشتی (عام) هاتووە، بەڵام مەبەستەكەی تایبەتە (خاص)**

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕوو مەكەنە قیبلە لە كاتی سەرئاوكردن و میزكردندا، وە پشتیشی تێ مەكەن، بەڵكوو ڕوو بكەنە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا، ئەبو ئەیوب ﷺ وتی: كاتێ هاتین بۆ شام سەرئاوەكانمان بینی بەرەوڕووی قیبلە دروست كرابوون لە كاتی سەرئاوكردن بەلادا دادەنیشتین و داوای لێخۆشبوونمان لە خوا دەكرد.

**بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرُّخْصَةِ فِي الْبَوْلِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ «بَعْدَ نَهْيِ النَّبِيِّ ﷺ عَنْهُ مُجْمَلًا غَيْرَ مُفَسَّرٍ، قَدْ يَحْسَبُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرْ فِي الْعِلْمِ أَنَّ الْبَوْلَ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ جَائِزٌ لِكُلِّ بَائِلٍ، وَفِي أَيِّ مَوْضِعٍ كَانَ، وَيَتَوَهَّمُ مَنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَلَا يُمَيِّزُ بَيْنَ الْمُفَسَّرِ وَالْمُجْمَلِ أَنَّ فِعْلَ النَّبِيِّ ﷺ فِي هَذَا نَاسِخٌ لِنَهْيِهِ عَنِ الْبَوْلِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ»**

٥٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ بِبَوْلٍ فَرَأَيْتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْبَضَ بِعَامٍ يَسْتَقْبِلُهَا(١).

**باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی مۆڵەت بە میزكردن ڕووبەڕووی قیبلە، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێ كردبوو بە دەستەواژەی (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر)، جا هەندێ لەوانەی كە شارەزا نین لە زانستدا وا دەزانێ میزكردن ڕووبەڕووی قیبلە دروستە بۆ هەموو میزكەرێك، وە لە هەر شوێنێكیشدا بێت، وە ئەوەیشی لە زانست تێ نەگەیشتووە و فەرموودەی (مُفَسَّر) لە (مُجْمَل) جیا ناكاتەوە وا خەیاڵ دەكات كردەوەی پێغەمبەر ﷺ لەم بوارەدا نەسخی قەدەغەكردنەكەی دەكات لە میزكردن بەرەو ڕووی قیبلە**

---

(١) إسناده حسن.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردین لە کاتی میزکردن ڕوو بکەینە قیبلە، ساڵێك پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات بینیم ڕووی کردە قیبلە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْخَبَرَيْنِ اللَّذَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا فِي الْبَابَيْنِ الْمُتَقَدِّمَيْنِ «وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا نَهَى عَنِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ وَاسْتِدْبَارِهَا عِنْدَ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ فِي الصَّحَارِي، وَالْمَوَاضِعِ اللَّوَاتِي لَا سُتْرَةَ فِيهَا، وَأَنَّ الرُّخْصَةَ فِي ذَلِكَ فِي الْكُنُفِ وَالْمَوَاضِعِ الَّتِي فِيهَا بَيْنَ الْمُتَغَوِّطِ وَالْبَائِلِ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ حَائِطٌ أَوْ سُتْرَةٌ»

٥٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ ابْنَةِ عُمَرَ فَصَعِدْتُ عَلَى ظَهْرِ الْبَيْتِ فَأَشْرَفْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ عَلَى خَلَائِهِ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ مُتَوَجِّهًا نَحْوَ الشَّامِ، هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ عَبْدِ الْأَعْلَى، وَفِي خَبَرِ أَبِي هِشَامٍ: مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ.[1]

## باسی فەرموودەیەك شیکەرەوەیە (الْمُفَسِّر) بۆ ئەو دوو فەرموودەیەی کە باسمان کرد لە دوو بەشەکەی پێشوودا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە ڕووکردنە قیبلە و پشتێکردنی لە کاتی سەرئاو و میزکردندا لە دەشت و دەر و چۆڵەوانی، هەروەها ئەو جێگایانەش کە بەربەستیان تێدا نییە، بێگومان مۆڵەتدان بە سەرئاو و میزکردن لە سوچ و ئەو جێگایانەدایە کە لە نێوان ئەو کەسەی سەرئاو دەکات و لە نێوان قیبلەدا دیوار یان بەربەستێك هەبێت

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: چووم بۆ لای حەفصەی کچی عومەر سەرکەوتمە سەربانەکە، ڕوانیمە پێغەمبەر ﷺ سەرئاوی دەکرد پشتی کردبووە قیبلە و ڕووی کردبووە شام.

٦٠- عَنْ مَرْوَانَ الْأَصْفَرِ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ، ثُمَّ جَلَسَ يَبُولُ إِلَيْهَا قُلْتُ: أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَلَيْسَ قَدْ نُهِيَ عَنْ هَذَا؟ قَالَ: بَلَى، إِنَّمَا نُهِيَ عَنْ ذَلِكَ فِي الْفَضَاءِ، فَإِذَا كَانَ بَيْنَكَ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ شَيْءٌ يَسْتُرُكَ فَلَا بَأْسَ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: مەڕوانی ئەصفەر دەڵێ: ئیبنو عومەرم ﷺ بینی وشترەکەی یەخدا ڕووبەڕووی قیبلە، پاشان دانیشت و ڕووبەڕووی میزی کرد، وتم: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان ئایا ئەم کارە قەدەغە نەکراوە؟ وتی: بەڵێ لە کاتێکدا قەدەغە کراوە کە لە چۆڵەوانیدا بێت، جا ئەگەر لە نێوان تۆ و قیبلەدا شتێك هەبوو ببێتە بەربەست هیچ گرفتێکی تێدا نییە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْبَوْلِ قَائِمًا

٦١- عَنْ أَبِي وَائِلٍ، عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ[1].

## باسی مۆڵەتدان بە میزکردن بەپێوە

واتە: ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە لە حوزەیفەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر زبڵدانی خەڵکێك بەپێوە میزی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد.

٦٢- عن أَبِي حَازِمٍ قَالَ: رَأَيْتُ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ ﷺ يَبُولُ قَائِمًا؛ فَإِنَّهُ تُحُدِّثَ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَقَالَ: «قَدْ رَأَيْتُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي فَعَلَهُ»[2].

واتە: ئەبو حازم دەڵێ: سەهلی کوڕی سەعدم ﷺ بینی بەپێوە میزی دەکرد، جا لەسەر ئەو کارە باسی دەکرا و ڕەخنەی لێ دەگیرا، ئەویش وتی: بەڕاستی کەسێکم بینی زۆر لە من چاکتر بوو ئەوەی دەکرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَفْرِيجِ الرِّجْلَيْنِ عِنْدَ الْبَوْلِ قَائِمًا، إِذْ هُوَ أَحْرَى أَنْ لَا يَنْشُرَ الْبَوْلَ عَلَى الْفَخِذَيْنِ وَالسَّاقَيْنِ

٦٣- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى عَلَى سُبَاطَةِ بَنِي فُلَانٍ، فَفَرَجَ رِجْلَيْهِ وَبَالَ قَائِمًا[3].

---

١) صحيح.

٢) إسناده حسن.

٣) إسناده ضعيف (معلول).

باسی چاکتر وایە لە کاتی میزکردندا قاچەکان ئەندازەیەك بڵاو بکرێنەوە چونکە دەبێتە مایەی ئەوەی میز بەر هەردوو ڕان و قاچەکان نەکەوێت

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەر زبڵدانی نەوەکانی فڵانەکەس، قاچەکانی بڵاو کردەوە و بەپێوە میزی کرد.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ تَسْمِيَةِ الْبَائِلِ مُهْرِيقًا لِلْمَاءِ

**٦٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَالَ فِي الشِّعْبِ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ، وَلَمْ يَقُلْ أَهْرَاقَ الْمَاءَ[١].

باسی باش نییە بە میزکەر بوترێ ئاوی ڕێژا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ هەواڵی پێ دام پێغەمبەر ﷺ لەشەوی موزدەلیفە لە شیوەکە میزی کرد، نەیوت: ئاوی ڕشت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْبَوْلِ فِي الطَّسَاسِ

**٦٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ مُسْنِدَةً النَّبِيَّ ﷺ إِلَى صَدْرِي فدَعَا بِطَسْتٍ فَبَالَ فِيهَا، ثُمَّ مَالَ فَمَاتَ[٢].

باسی مۆڵەتدان بە میزکردنە ناو تەشتەکان (لە کاتی پێویست)

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نەخۆشی مردنی پاڵی دابوو بە سنگمەوە داوای تەشتێك ئاوی کرد میزی تێ کرد، پاشان لار بۆیەوە ڕووحی پاکی دەرچوو.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْبَوْلِ فِي الْمَاءِ الرَّاكِدِ الَّذِي لَا يَجْرِي، وَفِي نَهْيِهِ عَنْ ذَلِكَ دِلَالَةٌ عَلَى إِبَاحَةِ الْبَوْلِ فِي الْمَاءِ الْجَارِي

**٦٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الَّذِي لَا يَجْرِي»، ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ، وَقَالَ الْمَخْزُومِيُّ: فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ[1].

## باسی قەدەغەکردن لە میزکردنە نێو ئاوی وەستاو کە لەبەری نەڕوات، ئەو قەدەغەکردنە بەڵگەیە لەسەر ڕێگەپێدانی میزکردنە نێو ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە میز نەکاتە نێو ئاوێك کە ڕێ ناکات، پاشان خۆی پێ بشۆرێت. مەخزومی وتی: لە ئاوێکی وەستاو پاشان خۆی پێ بشوات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّغَوُّطِ عَلَى طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ وَظِلِّهِمُ الَّذِي هُوَ مَجَالِسُهُمْ

**٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اتَّقُوا اللَّعْنَتَيْنِ أَوِ اللَّعَّانَيْنِ». قِيلَ: وَمَا هُمَا؟ قَالَ: «الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ ظِلِّهِمْ»[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّمَا اسْتَدْلَلْتُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: أَوْ ظِلِّهِمْ: الظِّلَّ الَّذِي يَسْتَظِلُّونَ بِهِ إِذَا جَلَسُوا مَجَالِسَهُمْ، بِخَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ فِي حَاجَتِهِ هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ، إِذِ الْهَدَفُ هُوَ الْحَائِطُ، وَالْحَائِشُ مِنَ النَّخْلِ النَّخَلَاتُ الْمُجْتَمِعَاتُ، وَإِنَّمَا سُمِّيَ الْبُسْتَانُ حَائِشًا لِكَثْرَةِ أَشْجَارِهِ، وَلَا يَكَادُ الْهَدَفُ يَكُونُ إِلَّا وَلَهُ ظِلٌّ إِلَّا وَقْتَ اسْتِوَاءِ الشَّمْسِ، فَأَمَّا الْحَائِشُ مِنَ النَّخْلِ فَلَا يَكُونُ وَقْتٌ مِنَ الْأَوْقَاتِ بِالنَّهَارِ إِلَّا وَلَهَا ظِلٌّ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يَسْتَتِرَ الْإِنْسَانُ فِي الْغَائِطِ بِالْهَدَفِ وَالْحَائِشِ وَإِنْ كَانَ لَهُمَا ظِلٌّ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لە پیسیکردنە سەر ڕێگاوبانی موسوڵمانان و سێبەریان کە شوێنی دانیشتنیانە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆتان لەو دوو نەفرینلێکراوە بپارێزن، وترا: ئەو دووانە چین؟ فەرمووی: ئەو کەسەی میز دەکاتە سەر ڕێگای خەڵك یان سێبەریان.

ئەبو بەکر وتی: بۆیە بەڵگەم هێناوە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەی: (أَوْ ظِلِّهِمْ) یان سێبەریان: ئەو سێبەرە بووە کە لە کاتی کۆڕ و مەجلیسەکانیان لێی دادەنیشن، (نەك سێبەری دیکە) بە فەرموودەی عەبدوڵای کوڕی جەعفەر کە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ أَحَبَّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ فِي حَاجَتِهِ هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ». واتە: پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بوو لە کاتی سەرئاوکردنی دیوارێك یان باخە دارخورمایەك بکاتە بەربەست، (الْهَدَفُ) بریتییە لە دیوار، وە (الْحَائِشُ) باخی دارخورمای چڕوپڕە، بۆیە بە باخچە وتراوە: (الحَائِشُ)، چونکە داری چڕوپڕی تێدایە، (الهَدَفُ) دیواریش بەردەوام سێبەری هەیە مەگەر کاتێ کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان دەترازێت، بەڵام (الْحَائِشُ) باخی دارخورمای چڕوپڕ، لە هەر کاتێکی ڕۆژگاردا تەماشای بکەی سێبەری هەیە، پێغەمبەر ﷺ پێی باش بووە مرۆڤ لە کاتی سەرئاوکردن خۆی داپۆشێ بە دیوار و باخی دارخورمای چڕوپڕ ئەگەر چی سێبەریشیان هەبێت (کەواتە: مەبەست لە قەدەغەکردنی تەنها ئەو سێبەرە بووە کە خەڵکی لە ژێریدا سوود وەردەگرن، نەك هەموو سێبەرێك).

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ مَسِّ الذَّكَرِ بِالْيَمِينِ

٦٨- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ»[١].

---

(١) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لەوەی دەستی ڕاست بدرێ لە ئەندامی نێرینە

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە میزی کرد با دەستی ڕاستی نەدات نە ئەندامی نێرینەی.

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ عِنْدَ دُخُولِ الْمُتَوَضَّأ

٦٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الْحُشُوشَ مُحْتَضَرَةٌ، فَإِذَا دَخَلَهَا أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ»[1].

## باسی پەناگرتن بە خوا لە شەیتانی نەفرینلێکراو، کاتێ دەچێتە سەرئاو

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەم باخ و باخاتانەی کە خەڵکی تیایدا سەرئاویان دەکرد (پێش دروستکردنی سەرئاو) جنۆکە و شەیتانەکان تیایدا ئامادە دەبن، ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە نێویەوە با بڵێ: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە نێرینەی شەیتانەکان و لە مێینەکانیان.

## بَابُ أَعْدَادِ الْأَحْجَارِ لِلِاسْتِنْجَاءِ عِنْدَ إِتْيَانِ الْغَائِطِ

٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَبَرَّزَ فَقَالَ: «ائْتِنِي بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ» فَوَجَدْتُ لَهُ حَجَرَيْنِ وَرَوْثَةَ حِمَارٍ، فَأَمْسَكَ الْحَجَرَيْنِ وَطَرَحَ الرَّوْثَةَ، وَقَالَ: «هِيَ رِجْسٌ»[2].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ژمارەی ئەو بەردانەی بەکار دەهێنرێن بۆ خۆپاککردنەوە لە کاتی سەرئاوکردن

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی سەرئاو بکات فەرمووی: سێ بەردم بۆ بێنە، منیش دوو بەردم بینییەوە لەگەڵ تەرسەقولێك، دوو بەردەکەی وەرگرت و تەرسەقولەکەی فڕێ دا و فەرمووی: ئەوە پیسە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْمُحَادَثَةِ عَلَى الْغَائِطِ

**٧١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَخْرُجِ الرَّجُلَانِ يَضْرِبَانِ الْغَائِطَ كَاشِفَيْنِ عَنْ عَوْرَتِهِمَا يَتَحَدَّثَانِ؛ فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ»[١].

## باسی ڕێگریکردن لە قسەکردن لە سەرئاو

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دوو پیاو دەربچن بۆ سەرئاوکردن و عەوڕەتیان دەربکەوێت و پێکەوە گفتوگۆ بکەن، بێگومان خوا ﷻ لەو ڕەفتارە تووڕە دەبێت.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ نَظَرِ الْمُسْلِمِ إِلَى عَوْرَةِ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ

**٧٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلَا تَنْظُرُ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ، وَلَا يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، وَلَا تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لەوەی موسوڵمان تەماشای عەورەتی برا موسوڵمانەکەی بکات

واتە: عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێت پیاو تەماشای عەورەتی پیاو بکات، هەروەها نابێت ئافرەت تەماشای عەورەتی ئافرەت بکات، وە نابێت پیاو لەگەڵ پیاو لەژێر پارچەقوماشێکدا بخەوێت بەبێ جلوبەرگ، هەروەها نابێت ئافرەت لەگەڵ ئافرەت لەژێر پارچەقوماشێکدا ڕابکشێت بەبێ جلوبەرگ.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ رَدِّ السَّلَامِ يُسَلَّمُ عَلَى الْبَائِلِ

**٧٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ[١].

## باسی کەراهەتی هەیە میزکەر لە کاتی میزکردن وەڵامی سەلامی کەسێکی دیکە بداتەوە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێ پەڕی، لە کاتێکدا میزی دەکرد، سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْأَحْجَارِ

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاسْتِطَابَةِ بِالْأَحْجَارِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الِاسْتِطَابَةَ بِالْأَحْجَارِ يُجْزِي دُونَ الْمَاءِ

**٧٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ لَهُ بَعْضُ الْمُشْرِكِينَ وَكَانُوا يَسْتَهْزِئُونَ بِهِ إِنِّي أَرَى صَاحِبَكُمْ يُعَلِّمُكُمْ حَتَّى الْخِرَاءَةَ قَالَ سَلْمَانُ ﷺ: أَجَلْ أُمِرْنَا أَنْ لَا نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ، وَلَا نَسْتَنْجِيَ بِأَيْمَانِنَا، وَلَا نَكْتَفِيَ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ لَيْسَ فِيهَا رَجِيعٌ وَلَا عَظْمٌ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی خۆپاککردنەوە بە بەردەکان.

## باسی فەرمانکردن بە خۆپاککردنەوە بە بەردەکان، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خۆپاککردنەوە بە بەرد لەجیاتی ئاو دروستە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە لە سەلمانەوە ﷺ دەڵێ: یەکێك لە هاوبەشدانەران بەگاڵتەجاڕییەوە پێی وت: من وا دەبینم هاوەڵەکەتان تەنانەت چۆنییەتی سەرئاوکردنیشتان فێر دەکات، سەلمان ﷺ وتی: بەڵێ فەرمانمان پێ کراوە لە کاتی سەرئاوکردن ڕوو نەکەینە قیبلە و بە دەستی ڕاستمان خۆمان پاك نەکەینەوە، سێ بەرد کەمتر بەکار نەهێنین، نابێت یەکێك لەو سێیانە پاشەڕۆ یان ئێسك بێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاسْتِطَابَةِ بِالْأَحْجَارِ وِتْرًا لَا شَفْعاً

٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ»[١].

## باسی فەرمانکردن بەخۆپاککردنەوە بە بەرد بە تاك نەك بە جووت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژی گرت با ئاو وەربداتە لووتی و مش بکات، هەر کەسێکیش بەرد بەکار دەهێنێ (بۆ خۆپاککردنەوە) با بە تاك بەکاری بهێنێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالِاسْتِطَابَةِ وِتْرًا «هُوَ الْوِتْرُ الَّذِي يَزِيدُ عَلَى الْوَاحِدِ، الثَّلَاثُ فَمَا فَوْقَهُ مِنَ الْوِتْرِ، إِذِ الْوَاحِدُ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ الْوِتْرِ، وَالِاسْتِطَابَةُ بِحَجَرٍ وَاحِدٍ غَيْرُ مُجْزِيَةٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ أَنْ لَا يُكْتَفَى بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ فِي الِاسْتِطَابَةِ»

٧٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَجْمِرْ ثَلَاثًا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە خۆپاککردنەوە بە بەرد بە تاك، بریتییە لەو تاکەی لە سەرووی یەکدانەوەیە، جا سێ بێت یان زیاتر بە مەرجێ تاك بێت، چونکە هەندێ جار یەك ناوی تاکی لێ دەنرێ، وە خۆپاککردنەوەش بە یەك بەرد دروست نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە کەمتر لە سێ بەرد بەکار نەهێنرێت بۆ خۆپاککردنەوە

وتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بەردی بەکار هێنا (بۆ خۆپاککردنەوە) با سێ جار بەکاری بهێنێت (یان سێ بەرد بەکار بهێنێ).

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْوِتْرِ فِي الِاسْتِطَابَةِ أَمْرُ اسْتِحْبَابٍ لَا أَمْرُ إِيجَابٍ «وَأَنَّ مَنِ اسْتَطَابَ بِأَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثَةٍ بِشَفْعٍ لَا بِوِتْرٍ غَيْرُ عَاصٍ فِي فِعْلِهِ، إِذْ تَارِكُ الِاسْتِحْبَابِ غَيْرِ الْإِيجَابِ تَارِكُ فَضِيلَةٍ لَا فَرِيضَةٍ»

**٧٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُوتِرْ؛ فَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ، أَمَا تَرَى السَّمَوَاتِ سَبْعًا، وَالْأَرْضَ سَبْعًا، وَالطَّوَافَ سَبْعًا» وَذَكَرَ أَشْيَاءَ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە بەردی تاك بۆ خۆپاککردنەوە فەرمانێکە بۆ بەچاکدانان نەك بۆ واجببوون، هەر کەسێك خۆی پاك بکاتەوە بە سێ بەرد زیاتر بە جووت نەك بە تاك سەرپێچی نەکردووە لەو کارەیدا، چونکە وازهێنان لە کارێ بە چاك دانرابێت ئەوە وازی لە چاکەیەك هێناوە نەك فەرزێك

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بەردی بەکار هێنا (بۆ خۆپاککردنەوە) با ژمارەی بەردەکان تاك بن، چونکە بەڕاستی خوا تاکە و تاکی خۆش دەوێ، ئایا نابینی ئاسمانەکان حەوتن و زەوی حەوتە و تەوافیش حەوت جارە، وە چەند شتی دیکەشی باس کرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الِاسْتِطَابَةِ بِالْيَمِينِ

**٧٨-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، وَإِذَا أَتَى الْخَلَاءَ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَإِذَا تَمَسَّحَ فَلَا يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ»[١].

### باسی قەدەغەکردن لە خۆپاککردنەوە بە دەستی ڕاست

**واتە: ئەبو قەتادە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ئاوی خواردەوە با لەنێو قاپەکەدا هەناسە نەدات، وە ئەگەر چوو بۆ سەرئاو با بەدەستی ڕاستی ئەندامی نێرینەی نەگرێت، وە ئەگەر خۆی پاك کردەوە با بە دەستی ڕاستی خۆی پاك نەکاتەوە.**

**٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيُّ ﵁ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ، وَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادەی ئەنصاری ﵁ دەڵێ: باوکم بۆی باس کردم، ئەو لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە میزی کرد با دەستی ڕاستی بەر ئەندامی نێرینەی نەکەوێت، وە با بەدەستی ڕاستیشی خۆی پاك نەکاتەوە، وە با لەنێو قاپەکەدا هەناسە نەدات (لە کاتی ئاوخواردنەوە).**

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الِاسْتِطَابَةِ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ

**٨٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ مِثْلُ الْوَالِدِ لِوَلَدِهِ، فَلَا يَسْتَقْبِلْ أَحَدُكُمُ الْقِبْلَةَ وَلَا يَسْتَدْبِرْهَا - يَعْنِي فِي الْغَائِطِ - وَلَا يَسْتَنْجِ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ لَيْسَ فِيهَا رَوْثٌ وَلَا رِمَّةٌ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی قەدەغەکردن لە خۆپاککردنەوە بە کەمتر لە سێ بەرد**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی من بۆ ئێوە وەکوو باوك وام بۆ منداڵەکەی، (ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕۆیشت بۆ سەرئاو) با ڕوو نەکاتە قیبلە و پشتی تێ نەکات، -واتە: لە کاتی سەرئاوکردن- هەروەها با خۆی پاك نەکاتەوە بە کەمتر لە سێ بەرد، (ئەو سێ دانە دەبێت) نە پاشەڕۆی تێدا بێت نە ئێسك.

**بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى النَّهْيِ عَنِ الِاسْتِطَابَةِ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ «وَأَنَّ الِاسْتِطَابَةَ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ لَا يَكْفِي دُونَ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ؛ لِأَنَّ الْمُسْتَطِيبَ بِدُونِ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ عَاصٍ فِي فِعْلِهِ وَإِنِ اسْتَنْجَى بَعْدَهُ بِالْمَاءِ، وَالنَّهْيِ عَنِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْعِظَامِ وَالرَّجِيعِ»**

٨١- عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَقَدْ عَلَّمَكُمْ صَاحِبُكُمْ حَتَّى يُوشِكُ أَنْ يُعَلِّمَكُمُ الْخِرَاءَةَ قَالَ: أَجَلْ «نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ، أَوْ نَسْتَنْجِيَ بِأَيْمَانِنَا، أَوْ بِالْعَظْمِ، أَوْ بِالرَّجِيعِ»، وَقَالَ: «لَا يَكْتَفِي أَحَدُكُمْ دُونَ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر قەدەغەکردن لە خۆپاککردنەوە بەبێ سێ بەرد، بێگومان خۆپاککردنەوە بە کەمتر لە سێ بەرد بەس نییە بەبێ خۆپاککردنەوە بە ئاو، چونکە ئەو کەسەی خۆی پاك دەکاتەوە بە کەمتر لە سێ بەرد لە کارەکەیدا سەرپێچی کردووە ئەگەرچی دوای ئەوە بە ئاویش خۆی پاك بکاتەوە، هەروەها قەدەغەی کردووە لە خۆپاککردنەوە بە ئێسك و پاشەڕۆ**

واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: هاوبەشدانەران (بەگاڵتەجارییەوە) وتیان: بێگومان هاوەڵەکەتان هەموو شتی فێر کردوون تەنانەت سەرئاوکردنیش، وتی: بەڵێ، قەدەغەی لێ کردووین لە کاتی سەرئاوکردن ڕوو بکەینە قیبلە یان بە دەستی ڕاستمان سەرئاو بکەین، یان بە ئێسك یان بە پاشەڕۆ. وە فەرموویەتی: بەس نییە بۆ هەر یەکێك لە ئێوە کەمتر لە سێ بەرد بەکار بهێنێ بۆ خۆپاککردنەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي مِنْ أَجْلِهَا زُجِرَ عَنِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْعِظَامِ وَالرَّوْثِ

**٨٢-** عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَلْقَمَةَ: هَلْ كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ شَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ فَقَالَ عَلْقَمَةُ: أَنَا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، فَقُلْتُ: هَلْ شَهِدَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ فَقَالَ: لَا، وَلَكِنْ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَفَقَدْنَاهُ فَالْتَمَسْنَاهُ فِي الْأَوْدِيَةِ وَالشِّعَابِ، فَقُلْنَا: اسْتُطِيرَ أَوِ اغْتِيلَ قَالَ: فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ. فَلَمَّا أَصْبَحْنَا، فَإِذَا هُوَ جَاءٍ مِنْ قِبَلِ حِرَاءَ قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَدْنَاكَ، فَطَلَبْنَاكَ فَلَمْ نَجِدْكَ، فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ قَالَ: «أَتَانِي دَاعِي الْجِنِّ فَذَهَبْتُ مَعَهُ فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ». قَالَ: فَانْطَلَقَ بِنَا فَأَرَانَا نِيرَانَهُمْ قَالَ: وَسَأَلُوهُ الزَّادَ فَقَالَ: «لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرُ مَا يَكُونُ لَحْمًا، وَكُلُّ بَعْرٍ عَلَفًا لِدَوَابِّكُمْ»، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلَا تَسْتَنْجُوا بِهِمَا فَإِنَّهَا طَعَامُ إِخْوَانِكُمْ»[١].

### باسی هۆکاری سەرکۆنەکردن لە خۆپاککردنەوە بە ئێسك و بە پاشەڕۆ

واتە: عامر دەڵێ: پرسیارم کرد لە عەلقەمە: ئایا ئیبنو مەسعود ﷺ لە شەوی جنۆکەدا ئامادە بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەو شەوەی جنۆکەکان پێغەمبەریان ﷺ لەگەڵ خۆیان برد بۆ ئەوەی فێری دروشمەکانی ئایینیان بکات)؟ عەلقەمە وتی: پرسیارم لە ئیبنو مەسعود ﷺ کرد وتم: ئایا هیچ یەکێکتان لە شەوی جنۆکە ئامادە بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتی: نەخێر، بەڵام شەوێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ دیار نەما، گەڕاین بە دوایدا لە شیو و دۆڵ و ڕچەڕێیەکان نەماندۆزیەوە، وتمان: جنۆکە بردوویەتی یان بەنهێنی کوژراوە (واتە: تیرۆر کراوە)، وتی: ئەو شەوە ناخۆشترین شەومان بەسەر کردەوە، کاتێ ڕۆژ بۆیەوە، خۆی لەلای حیرائەوە هاتەوە، وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێمان ون بووی و زۆر گەڕاین بەدواتدا نەتماندۆزیەوە ناخۆشترین شەومان بەسەر کردەوە، فەرمووی: بانگخوازی جنۆکەکان هات بۆ لام لەگەڵیدا ڕۆیشتم و قورئانم بەسەریاندا خوێندەوە، وتی: لەگەڵیاندا دەرچوو ئاگرەکەیانی پێنیشان داین، وتی: وە (جنۆکەکان) پرسیاریان

---

(١) صحيح.

نی کرد لەبارەی خواردەمەنی، فەرمووی: هەموو ئێسکێك کە ناوی خوای لەسەر هێنرابێت بۆتان حەڵاڵە، ئەگەر دەستتان کەوت هەمان ئەو گۆشتەتان بۆ ئامادە دەبێ (کە پێشتر پێوە بووە)، وە هەموو تەپاڵە و پشقلی ئاژەڵەکان خۆراك و ئالیکە بۆ ئاژەڵەکانتان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆتان پاك مەکەنەوە بە ئێسك و بە پیسی ئاژەڵەکان، چونکە ئەوە خواردنی برا جنۆکەکانتانە.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ

## بَابُ ذِكْرِ ثَنَاءِ اللَّهِ ﷻ عَلَى الْمُتَطَهِّرِينَ بِالْمَاءِ

**٨٣-** عَنْ عُوَيْمِ بْنِ سَاعِدَةَ الْأَنْصَارِيِّ ثُمَّ الْعَجْلَانِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِأَهْلِ قُبَاءَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَحْسَنَ عَلَيْكُمُ الثَّنَاءَ فِي الطُّهُورِ»، وَقَالَ: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۝١٠٨﴾ التوبة، حَتَّى انْقَضَتِ الْآيَةُ، فَقَالَ لَهُمْ: «مَا هَذَا الطُّهُورُ؟» فَقَالُوا: مَا نَعْلَمُ شَيْئًا إِلَّا أَنَّهُ كَانَ لَنَا جِيرَانٌ مِنَ الْيَهُودِ، وَكَانُوا يَغْسِلُونَ أَدْبَارَهُمْ مِنَ الْغَائِطِ فَغَسَلْنَا كَمَا غَسَلُوا»[١].

## کۆباسی خۆپاککردنەوە بە ئاو

## باسی ستاییشی خوا ﷻ لەسەر ئەو کەسانەی خۆیان بە ئاو پاك دەکەنەوە

واتە: عوەیمی کوڕی ساعیدەی ئەنصاڕی پاشان عەجلانی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی قوبائی فەرموو: (خوا بەجوانی باسی پاکوخاوێنی ئێوەی کردووە و فەرموویەتی: ﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۝١٠٨﴾، واتە: پیاوانێکی تێدایە حەز دەکەن خۆیان پاك ڕابگرن. تا کۆتایی ئایەتەکە، پێیانی فەرموو: ئەو پاکوخاوێنییە چییە؟ وتیان: هیچ نازانین ئەوە نەبێ دراوسێی جوولەکەمان هەبوو خۆیان لە سەرئاو پاك ڕادەگرت و عەوڕەتیان دەشۆرد، ئێمەیش وەکوو ئەوان دەمانشۆرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ اسْتِنْجَاءِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَاءِ

٨٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا تَبَرَّزَ لِحَاجَةٍ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فَيَتَغَسَّلُ بِهِ(١).

## باسی خۆپاککردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ئاو

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچوایەتە دەرەوە بە مەبەستی سەرئاوکردن ئاوم بۆ دەهێنا خۆی پێ پاك دەکردەوە.**

٨٥ - عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا ذَهَبَ لِحَاجَتِهِ ذَهَبْتُ مَعَهُ بِعُكَّازٍ وَإِدَاوَةٍ، فَإِذَا خَرَجَ مَسَحَ بِالْمَاءِ، وَتَوَضَّأَ مِنَ الْإِدَاوَةِ(٢).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچوایەتە دەرەوە بە مەبەستی سەرئاوکردن منیش لەگەڵ خۆم گۆچانێك و جامێك ئاوم دەبرد، کاتێ دەربچوایە بە ئاو مەسحی (خوفەکانی) دەکرد و لە جامەکەش دەستنوێژی دەگرت.**

٨٦ - عَنْ أَبِي مُعَاذٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا رضي الله عنه يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ اتَّبَعْنَاهُ أَنَا وَغُلَامٌ آخَرُ بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ(٣).

**واتە: ئەبو موعاز دەڵێ: گوێم لە ئەنەس رضي الله عنه بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەربچوایە بۆ سەرئاوکردن، من و منداڵێکی دیکە بە جامێك ئاوەوە شوێنی دەکەوتین.**

٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ الْخَلَاءَ فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلَامٌ نَحْوِي إِدَاوَةً مِنْ مَاءٍ وَعَنَزَةً فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ(٤).

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ سەرئاوکردن من و منداڵێکی وەکوو خۆم جامێك ئاو و جگە لەویشمان هەڵدەگرت، ئەویش بە ئاو خۆی پاك دەکردەوە.**

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.
(٤) صحيح.

## بَابُ تَسْمِيَةِ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ فِطْرَةً

٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﭭ، أَنَّ عَائِشَةَ ﭬ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: « «عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَالسِّوَاكُ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ»، قَالَ عَبْدَةُ فِي حَدِيثِهِ: «وَالْعَاشِرَةُ لَا أَدْرِي مَا هِيَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ» وَفِي حَدِيثِ وَكِيعٍ قَالَ مُصْعَبٌ: «ونَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ»[1].

### باسی ناونانی خۆپاككردنەوە بە ئاو شتێكە لە زگماكی و فیترەتەوە هاتووە

واتە: عەبدوڵای كوڕی زوبەیر ﭭ دەگێڕێتەوە، عائیشە ﭬ بۆی باس كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دە شت لە پاكی سروشت و زگماكەوەیە: كورتكردنەوەی سمێڵ و ئاوەردان لە لووت و بەكارهێنانی سیواك و بەردانەوەی ڕیش و هەڵكێشانی مووی بنباڵ و تاشینی بەر و شۆردنی ئەندامی نێرینە (یاخود سەرئاوكردن یا خۆشۆردن بە ئاو) و بڕینی نینۆك و شۆردنی ئەو شوێنانەی كە عەرەق و پیسی تێدا كۆ دەبێتەوە، -عەبدە لە فەرموودەكەیدا وتی-: دەیەم نازانم چییە مەگەر ئاوەردانە دەم بێت، وە لە فەرموودەی وەكیعدا هاتووە، موصعەب وتی: دەیەمم بیر چوو، وا دەزانم ئاوەردانە دەمە.

## بَابُ دَلْكِ الْيَدِ بِالْأَرْضِ وَغَسْلِهِمَا بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الِاسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ

٨٩- عَنْ إِبْرَاهِيم بنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﭬ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْغَيْضَةَ فَقَضَى حَاجَتَهُ، فَأَتَاهُ جَرِيرٌ بِإِدَاوَةٍ مِنْ مَاءٍ فَاسْتَنْجَى بِهَا، قَالَ: وَمَسَحَ يَدَهُ بِالتُّرَابِ[2].

### باسی دەست بە زەویدا هێنان و شۆردنی دوای خۆپاككردنەوە بە ئاو

واتە: ئیبراهیمی كوڕی جەریر دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە ﭬ، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو باخێكەوە سەرئاوی كرد، جەریر هات بۆ لای جامێ ئاوی لەگەڵ خۆی هێنابوو، خۆی پێ پاك كردەوە، وتی: دەستی بە خۆڵ سڕی.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.



## بَابُ الْقَوْلِ عِنْدَ الْخُرُوجِ مِنَ الْمُتَوَضَّأ

٩٠- عَنْ يُوسُفَ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ: «غُفْرَانَكَ»[1].

### باسی ئەو زیکرەی دوای دەرچوون لە سەرئاو دەوترێ

واتە: یوسفی کوڕی ئەبو بوڕدە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عائیشە ﵂ گوێم لێ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە سەرئاو دەربچوایە دەیفەرموو: داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ ذِكْرِ الْمَاءِ الَّذِي لَا يَنْجُسُ، وَالَّذِي يَنْجُسُ إِذَا خَالَطَتْهُ نَجَاسَةٌ

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي نَفْيِ تَنْجِيسِ الْمَاءِ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٩١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَوَضَّأَ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْ نِسَائِهِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي قَدْ تَوَضَّأْتُ مِنْ هَذَا، فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: «الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ»[2].

### کۆباسی ئەو ئاوەی کە پیس نابێت، وە ئەوەشی پیس دەبێت بەهۆی تێکەڵبوونی لەگەڵ پیسی

### باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەربارەی پیسنەبوونی ئاو، بە دەستەواژەی (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر)، بەدەستەواژەیەکی گشتی (عام) مەبەست پێی تایبەتە (خاص)

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی دەستنوێژ بگرێت، ئافرەتێك لە خێزانەکانی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەو ئاوە دەستنوێژم گرتووە، پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و فەرمووی: هیچ شتێك ئاو پیس ناکات.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.




## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ» بَعْضَ الْمِيَاهِ لَا كُلَّهَا، وَإِنَّمَا أَرَادَ الْمَاءَ الَّذِي هُوَ قُلَّتَانِ فَأَكْثَرُ لَا مَا دُونَ الْقُلَّتَيْنِ مِنْهُ

٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْمَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ»[1].

## باسی فەرموودەیەکی (الْمُفَسِّر) شیکەرەوە بۆ ئەو دەستەواژە (الْمُجْمَل) کورتکراوەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەکەیدا: (الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ)، هەندێ ئاوە نەك هەمووی، بێگومان مەبەستی ئەو ئاوەیە کە قوللەتەین و زیاترە لەو ڕێژەیە نەك کەمتر لە قوللەتەین

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو ئاوەی ئاژەڵ و دڕندەکان دادەبەزنە نێوی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئاو گەیشتە ڕێژەی قوللەتەین[2] ئەوە پیسی هەڵناگرێت.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ اغْتِسَالِ الْجُنُبِ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ « وَفِيهِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ ﷺ: «الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ» لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ عَلَى مَا بَيَّنْتُ قَبْلُ أَرَادَ الْمَاءَ الَّذِي يَكُونُ قُلَّتَيْنِ فَصَاعِدًا «

٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ». قَالَ: كَيْفَ يَفْعَلُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ رضي الله عنه؟ قَالَ: يَتَنَاوَلُهُ تَنَاوُلًا.[3]

---

(١) صحيح.

(٢)) قوللەتەین: ئەندازە کراوە بە ١٦٠ لیتر.

(٣) صحيح.

باسی قەدەغەکردن لەوەی لەشگران لە ئاوی ڕاوەستاودا خۆی بشوات، بەدەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە، وە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ (الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ) دەستەواژەیەکی (عَام) مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتەیە، وەك لە پێشەوە ڕوونم کردەوە، مەبەستی ئەو ئاوەیە کە قوللەتەینە و لە سەرووی ئەو ڕێژەوەیە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە کە لەشی گرانە لە ئاوی ڕاوەستاو خۆی نەشوات، وتیان: چی بکەین ئەی ئەبو هورەیرە ﷺ؟ وتی: ئاوی لێ دەردەهێنێ بە خۆیدا بکات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْوُضُوءِ مِنَ الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي قَدْ بِيلَ فِيهِ، وَالنَّهْيِ عَنِ الشُّرْبِ مِنْهُ بِذِكْرِ لَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ مِنْهُ أَوْ يَشْرَبُ»[١].

باسی قەدەغەکردن لە دەستنوێژشۆردن لە ئاوێکی وەستاو کە میزی تێ کرابێت، وە قەدەغەکردن لە خواردنەوەی، بە باسکردنی دەستەواژەی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خاص) تایبەتە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە میز نەکاتە نێو ئاوێکی وەستاو (کە ڕێ ناکات)، پاشان دەستنوێژی لێ بگرێت یان لێی بخواتەوە.

---

(١) صحيح.

**بَابُ الْأَمْرِ بِغَسْلِ الْإِنَاءِ مِنْ وُلُوغِ الْكَلْبِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِغَسْلِ الْإِنَاءِ مِنْ وُلُوغِ الْكَلْبِ تَطْهِيرًا لِلْإِنَاءِ، لَا عَلَى مَا ادَّعَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ الْأَمْرَ بِغَسْلِهِ أَمْرُ تَعَبُّدٍ، وَأَنَّ الْإِنَاءَ طَاهِرٌ وَالْوُضُوءُ وَالِاغْتِسَالُ بِذَلِكَ الْمَاءِ جَائِزٌ، وَشُرْبُ ذَلِكَ الْمَاءِ طَلْقٌ مُبَاحٌ»**

٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يُغْسَلَ سَبْعَ مَرَّاتٍ، الْأُولَى مِنْهُنَّ بِالتُّرَابِ» وَقَالَ الدَّوْرَقِيُّ: أَوَّلُهَا بِتُرَابٍ.[١]

**باسی فەرمانکردن بە شۆردنی قاپ و قاچاخ ئەگەر سەگ دەمی تێ خست، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە شۆردنی قاپ و قاچاخ ئەگەر سەگ دەمی تێ خست، لەبەر پاکوخاوێنی قاپ و قاچاخەکەیە، نەک وەکوو ئەوەی هەندێ لە زانایان بانگەشەی بۆ دەکەن فەرمانکردن بە شۆردنی بۆ پەرستشە و قاپ و قاچاخەکەش پاکە، وە دەستنوێژ و خۆشۆردن بەو ئاوە دروستە، خواردنەوەیشی بەرەهایی ڕێگەپێدراوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پاکی قاپ و قاچاخی هەر یەکەتان لەوەدایە ئەگەر سەگ دەمی تێ خست و لێی خواردەوە حەوت جار بشۆردرێت، یەکەمین جاریان بە خۆڵ بێت.

٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ».[٢]

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پاکی قاپ و قاچاخی هەر یەکەتان لەوەدایە ئەگەر سەگ دەمی تێ خست و لێی خواردەوە حەوت جار بیشۆرێت.

٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ مِنَ الْإِنَاءِ فَإِنَّ طُهُورَهُ أَنْ يُغْسَلَ سَبْعَ مَرَّاتٍ أَوَّلُهَا بِتُرَابٍ»[٣].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: باوکی قاسم ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سەگ لە قاپ و قاچاخی خواردەوە، ئەوە پاکبوونەوەی ئەوەیە حەوت جار بشۆردرێت یەکەم جاری بە خۆڵ بێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِهْرَاقِ الْمَاءِ الَّذِي وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ، وَغَسْلِ الْإِنَاءِ مِنْ وُلُوغِ الْكَلْبِ «وَفِيهِ دَلِيلٌ عَلَى نَقْضِ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمَاءَ طَاهِرٌ، وَالْأَمْرُ بِغَسْلِ الْإِنَاءِ تَعَبُّدٌ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَأْمُرَ النَّبِيُّ ﷺ بِهَرَاقَةِ مَاءٍ طَاهِرٍ غَيْرِ نَجِسٍ»

٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيُهْرِقْهُ وَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ، وَإِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ أَحَدِكُمْ فَلَا يَمْشِ فِيهِ حَتَّى يُصْلِحَهُ»[١].

## باسی فەرمانکردن بە ڕشتنی ئەو ئاوەی کە سەگ دەمی تێ دەخات، هەروەها شۆردنی ئەو قاپ و قاچاخەی کە سەگ دەمی تێ خستووە، وە بەڵگەی تێدایە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە قاپەکە پاك و خاوێنە و فەرمانکردنیش بە شۆردنی قاپ و قاچاخەکە بۆ پەرستشە، بێگومان ڕەوا نییە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بکات بە ڕشتنی ئاوێکی پاك کە پیس نەبێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سەگ دەمی خستە نێو قاپ و قاچاخی هەر یەکێکتان و لێی خواردەوە با بیڕژێنێ و حەوت جار بیشۆرێت، وە ئەگەر خەتی نەعلی یەکێکتان بڕا با پێیەوە ڕێ نەکات هەتا چاکی دەکات.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ غَمْسِ الْمُسْتَيْقِظِ مِنَ النَّوْمِ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ قَبْلَ غَسْلِهَا

٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلَا يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثًا؛ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لە دەستکردنە نێو قاپی ئاو بۆ ئەو کەسەی لە خەو هەڵدەستێ پێش ئەوەی دەستی بشوات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە نێو قاپی ئاوەکەی هەتا سێ جار دەستی دەشوات، چونکە ئەو نازانێ (شەو لە خەودا) دەستی بەر چی کەوتووە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ مِنْهُ» أَيْ أَنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ أَتَتْ يَدُهُ مِنْ جَسَدِهِ

١٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلَا يَغْمِسْ يَدَهُ فِي إِنَائِهِ أَوْ فِي وَضُوئِهِ حَتَّى يَغْسِلَهَا؛ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ أَتَتْ يَدُهُ مِنْهُ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەیدا: (فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ مِنْهُ) مەبەستی ئەوەیە: دەستی لەکوێی جەستەی بووە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە نێو قاپی ئاوەکەی یان ئاوی دەستنوێژەکەی هەتا دەیشوات، چونکە ئەو نازانێ دەستی لەکوێی جەستەی بووە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَاءَ إِذَا خَالَطَهُ فَرْثُ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ لَمْ يَنْجُسْ

١٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قِيلَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ حَدِّثْنَا مِنْ شَأْنِ سَاعَةِ الْعُسْرَةِ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: خَرَجْنَا إِلَى تَبُوكَ فِي قَيْظٍ شَدِيدٍ، فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا أَصَابَنَا فِيهِ عَطَشٌ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّ رِقَابَنَا سَتَنْقَطِعُ حَتَّى أَنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيَذْهَبُ يَلْتَمِسُ الْمَاءَ فَلَا يَرْجِعُ حَتَّى يَظُنَّ أَنَّ رَقَبَتَهُ سَتَنْقَطِعُ حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ يَنْحَرُ بَعِيرَهُ فَيَعْصِرُ فَرْثَهُ فَيَشْرَبُهُ وَيَجْعَلُ مَا بَقِيَ عَلَى كَبِدِهِ، فَقَالَ أَبُو

---

(١) صحيح.




بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ عَوَّدَكَ فِي الدُّعَاءِ خَيْرًا فَادْعُ لَنَا، فَقَالَ: «أَتُحِبُّ ذَلِكَ؟» قَالَ: نَعَمْ، فَرَفَعَ يَدَيْهُ فَلَمْ يُرْجِعْهُمَا حَتَّى قَالَتِ السَّمَاءُ فَأَظْلَمَتْ، ثُمَّ سَكَبَتْ فَمَلَأُوا مَا مَعَهُمْ، ثُمَّ ذَهَبْنَا نَنْظُرُ فَلَمْ نَجِدْهَا جَازَتِ الْعَسْكَرَ(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَوْ كَانَ مَاءُ الْفَرْثِ إِذَا عُصِرَ نَجِسًا لَمْ يَجُزْ لِلْمَرْءِ أَنْ يَجْعَلَهُ عَلَى كَبِدِهِ فَيَنْجُسَ بَعْضُ بَدَنِهِ، وَهُوَ غَيْرُ وَاجِدٍ لِمَاءٍ طَاهِرٍ يَغْسِلُ مَوْضِعَ النَّجَسِ مِنْهُ، فَأَمَّا شُرْبُ الْمَاءِ النَّجِسِ عِنْدَ خَوْفِ التَّلَفِ إِنْ لَمْ يَشْرَبْ ذَلِكَ الْمَاءَ فَجَائِزٌ إِحْيَاءُ النَّفْسِ بِشُرْبِ مَاءٍ نَجِسٍ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَبَاحَ عِنْدَ الِاضْطِرَارِ إِحْيَاءَ النَّفْسِ بِأَكْلِ الْمَيْتَةِ وَالدَّمِ وَلَحْمِ الْخِنْزِيرِ إِذَا خِيفَ التَّلَفُ إِنْ لَمْ يَأْكُلْ ذَلِكَ، وَالْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ نَجَسٌ مُحَرَّمٌ عَلَى الْمُسْتَغْنِي عَنْهُ مُبَاحٌ لِلْمُضْطَرِّ إِلَيْهِ لِإِحْيَاءِ النَّفْسِ بِأَكْلِهِ، فَكَذَلِكَ جَائِزٌ لِلْمُضْطَرِّ إِلَى الْمَاءِ النَّجِسِ أَنْ يُحْيِيَ نَفْسَهُ بِشُرْبِ مَاءٍ نَجِسٍ إِذَا خَافَ التَّلَفَ عَلَى نَفْسِهِ بِتَرْكِ شُرْبِهِ، فَأَمَّا أَنْ يَجْعَلَ مَاءً نَجِسًا عَلَى بَعْضِ بَدَنِهِ، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّهُ إِنْ لَمْ يَجْعَلْ ذَلِكَ الْمَاءَ النَّجِسَ عَلَى بَدَنِهِ لَمْ يَخَفِ التَّلَفَ عَلَى نَفْسِهِ، وَلَا كَانَ فِي إِمْسَاسِ ذَلِكَ الْمَاءِ النَّجِسِ بَعْضَ بَدَنِهِ إِحْيَاءَ نَفْسِهِ بِذَلِكَ، وَلَا عِنْدَهُ مَاءٌ طَاهِرٌ يَغْسِلُ مَا نَجُسَ مِنْ بَدَنِهِ بِذَلِكَ الْمَاءِ فَهَذَا غَيْرُ جَائِزٍ، وَلَا وَاسِعٍ لِأَحَدٍ فِعْلُهُ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاو ئەگەر ڕیخی ئاژەڵی گۆشتخۆری تێکەڵ ببێت، پیس نابێت

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە بە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وترا: لەبارەی کاتی (الْعُسْرَة)وە بۆمان باس بکە (بۆیە ناو نرا بە (الْعُسْرَة) چونکە خەڵکەکە هیچیان لەلا نەبوو لە خواردن و خواردنەوە و پێداویستی جەنگ) عومەر ﷺ وتی: دەرچووین بۆ تەبووك لە گەرمایەکی زۆر سەختدا دابەزینە جێگایەك، زۆر تینوومان بوو هەتا وا گومانمان برد گەردنمان لە تینوێتیدا دەپچڕێ، پیاوی وا هەبوو دەچوو دەگەڕا بەدوای ئاودا، نەدەگەڕایەوە هەتا گومانی دەبرد گەردنی لە تینوێتیدا دەپچڕێ، تەنانەت پیاوی وا هەبوو وشترەکەی سەر دەبڕی لە تینوێتیدا ڕیخەکەی دەگوشی ئاوەکەی دەخواردەوە، وە ئەوەی دەمایەوە لەسەر سنگی دایدەنا، ئەبو

---

(١) إسناده حسن.

ـەکری صدیق ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا نزای تۆ گیرا دەکات، بۆمان ـرەوە، فەرمووی: ئەوەت پێ خۆشە؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەستەکانی بەرز کردەوە ـستی نەگەڕاندەوە هەتا هەور ئاسمانی داپۆشی، پاشان باران باری، ئەوەی لە لایان ـو پڕیان کرد لە ئاو، پاشان گەڕاینەوە تەماشامان کرد نەمانبینی ئەو پارچە هەورە ـشکرەکەی تێ پەڕاندبێ.

ـەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر ئاوی ڕیخ بگوشرێ پیسە دروست نییە بۆ مرۆڤ بیخاتە ـەر سنگی، بەشێك لە جەستەی پیس دەکات، با ئاوی پاکیشی دەست نەکەوێت ـوێنی ئەو پیسییە پاك بکاتەوە، بەڵام خوادنەوەی ئاوی پیس لە کاتی ترسان لەوەی ـەفس تیا بچێت ئەگەر نەیخوات ئەوە دروستە لەبەر مانەوەی نەفسی ئاوە پیسەکە بخوات، چونکە خوا ڕێگەی داوە لە کاتی ناچاریدا بۆ پارێزگاری لە مانەوەی ـەفس مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەراز بخوات ئەگەر ترسا لەوەی نەفسی ـی بچێت ئەگەر لێی نەخوات، لە کاتێکدا مردارەوەبوو و خوێن و گۆشتی بەراز ـیسن حەرامە لەسەر ئەو کەسەی بێنیازە لێی و ڕێگە دراوە بۆ ئەو کەسەی ناچار و ـەنگەتاوە ئەویش لەبەر ئەوەیە بە خواردنی نەفسی بەزیندوویی بهێڵێتەوە، بەهەمان ـێوە دروستە ئاوی پیس بخواتەوە ئەگەر ترسا لەوەی بە نەخواردنەوەی نەفسی تیا بچێت، بەڵام ئەگەر ئاوی پیسی لەسەر جەستەی دانا زانستی هەبوو ئەگەر ئاوی ـیس نەخاتە سەر جەستەی مەترسی لەناوچوونی نەفسی لێ ناکرێ، هەروەها بوونی ـەو ئاوە پیسە لەسەر هەندێ لە جەستەی بۆ زیندووکردنەوەی نەفسی نەبوو، ئاوی پاکیشی پێ نەبوو ئەو بەشەی جەستەی پێ بشۆرێ کە پیس بووە، ئەوە دروست نییە، وە ڕێگە نەدراوە هیچ کەسێك ئەو کارە بکات.

**بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْوُضُوءِ بِسُؤْرِ الْهِرَّةِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ خَرَاطِيمَ مَا يَأْكُلُ الْمَيْتَةَ مِنَ السِّبَاعِ، وَمِمَّا لَا يَجُوزُ أَكْلُ لَحْمِهِ مِنَ الدَّوَابِّ وَالطُّيُورِ إِذَا مَاسَّ الْمَاءَ الَّذِي دُونَ الْقُلَّتَيْنِ وَلَا نَجَاسَةَ مَرْئِيَّةٌ بِخَرَاطِيمِهَا وَمَنَاخِيرِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَا يُنَجِّسُ الْمَاءَ، إِذِ الْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّ الْهِرَّةَ تَأْكُلُ الْفَأْرَ، وَقَدْ أَبَاحَ النَّبِيُّ ﷺ الْوُضُوءَ بِفَضْلِ سُؤْرِهَا، فَدَلَّتْ سُنَّتُهُ عَلَى أَنَّ خُرْطُومَ مَا يَأْكُلُ الْمَيْتَةَ إِذَا مَاسَّ الْمَاءَ الَّذِي دُونَ الْقُلَّتَيْنِ لَمْ يَنْجُسْ ذَلِكَ خَلَا الْكَلْبِ الَّذِي قَدْ حَضَّ النَّبِيُّ ﷺ بِالْأَمْرِ بِغَسْلِ الْإِنَاءِ مِنْ وُلُوغِهِ سَبْعًا، وَخَلَا الْخِنْزِيرِ الَّذِي هُوَ أَنْجَسُ مِنَ الْكَلْبِ أَوْ مِثْلُهُ»**

١٠٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُمْ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ هِيَ كَبَعْضِ أَهْلِ الْبَيْتِ» يَعْنِي: الْهِرَّةَ[١].

**باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتن لە شوێندەمی پشیلە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی لووتی ئەو دڕندانەی مردارەوەبوو دەخۆن و ئەوانەی گۆشتیان ناخورێ لە چوارپێ و باڵندەکان ئەگەر بەر ئاوێك کەوت لە خوار قوڵڵەتەینەوە بێت، هیچ پیسییەکی دیار بە لووتیەوە نەبوو ئەوە ئەو ئاوە پیس نابێت، بێگومان زانراوە پشیلە مشك ئەخوات، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە بە پاشماوەی شوێندەمی، سوننەتەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لووتی ئەوانەی مردارەوەبوو دەخۆن ئەگەر بەر ئاو کەوت لە خوار قوڵڵەتەینەوە بوو ئەوە پیس نابێت جگە لە سەگ کە پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی فەرمانی کردووە بە شۆردنی قاپوقاچاخ حەوت جار ئەگەر دەمی تێ خست، هەروەها جگە لە بەرازیش کە لە سەگ پیسترە یان وەکوو ئەو وایە**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرمووی: بێگومان پشیلە پیس نییە، ئەوە وەکوو ئەندامێکی خانەوادەکەیە (چونکە هەمیشە لەنێوماڵدایە ناتوانی خۆتی لێ بپارێزی).

١٠٣- عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: كَانَ أَبُو قَتَادَةَ ﵁ يَتَوَضَّأُ مِنَ الْإِنَاءِ وَالْهِرَّةُ تَشْرَبُ مِنْهُ، وَقَالَ عِكْرِمَةُ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْهِرَّةُ مِنْ مَتَاعِ الْبَيْتِ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.
(٢) إسناده ضعيف.

وتە: عیکریمە دەڵێ: ئەبو قەتادە ؓ دەستنوێژی دەگرت لە قاپوقاچاخێکدا، پشیلەش لێی دەخواردەوە، وە عیکریمە وتی: ئەبو هورەیرە ؓ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پشیلە لە پێویستی نێو ماڵە (وەکوو خزمەتکار وایە).

١٠٤- عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ؓ، وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ ؓ دَخَلَ عَلَيْهَا فَسَكَبَتْ لَهُ وُضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ تَشْرَبُ مِنْهُ فَأَصْغَى لَهَا أَبُو قَتَادَةَ الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ قَالَتْ كَبْشَةُ فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا بِنْتَ أَخِي؟ قَالَتْ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ أَوِ الطَّوَّافَاتِ»[1]

وتە: کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیك ؓ دەگێڕێتەوە، خێزانی کوڕەکەی ئەبو قەتادە بوو، ئەبو قەتادە ؓ هات بۆ لای، ئەویش ئاوی دەستنوێژی بۆی ئامادە کرد، پشیلەیەك هات لێی خواردەوە، ئەبو قەتادە قاپەکەی بۆی لار کردەوە تا پشیلەکە لێی خواردەوە. کەبشە دەڵێت: بینیمی تەماشای دەکەم وتی: ئایا سەرت سوڕماوە ئەی کچی برام؟ وتی: وتم: بەڵێ. وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی پشیلە پیس نییە، بەڵکوو ئەو پشیلانە لەوانەن دێن و دەڕۆن و دەسوڕێنەوە لەنێو ماڵەکانتان (هەر وەکوو خزمەتکار).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ سُقُوطَ الذُّبَابِ فِي الْمَاءِ لَا يُنَجِّسُهُ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنْ لَا نَجَاسَةَ فِي الْأَحْيَاءِ، وَإِنْ كَانَ لَا يَجُوزُ أَكْلُ لَحْمِهِ، إِلَّا مَا خَصَّ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ الْكَلْبَ، وَكُلُّ مَا يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ الْكَلْبِ مِنَ السِّبَاعِ إِذِ الذُّبَابُ لَا يُؤْكَلُ، وَهُوَ مِنَ الْخَبَائِثِ الَّتِي أَعْلَمَ اللَّهُ أَنَّ نَبِيَّهُ الْمُصْطَفَى يُحَرِّمُهَا فِي قَوْلِهِ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ١٥٧﴾ الأعراف، وَقَدْ أَعْلَمَ ﷺ أَنَّ سُقُوطَ الذُّبَابِ فِي الْإِنَاءِ لَا يُنَجِّسُ مَا فِي الْإِنَاءِ مِنَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ لِأَمْرِهِ بِغَمْسِ الذُّبَابِ فِي الْإِنَاءِ إِذَا سَقَطَ فِيهِ، وَإِنْ كَانَ الْمَاءُ أَقَلَّ مِنْ قُلَّتَيْنِ

١٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ؓ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءً، وَإِنَّهُ يُتَّقَى بِجَنَاحِهِ الَّذِي فِيهِ الدَّاءُ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَنْتَزِعْهُ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مێش ئەگەر بکەوێتە نێو ئاوەوە پیسی ناکات، وە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی شتی زیندوو پیس نییە ئەگەرچی دروستیش نەبێت گۆشتی بخورێت، جگە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ تایبەتی کردووە وەک سەگ، هەروەها هەر دڕندەیەکیش ناوی سەگی بەسەردا بسەپێت، چونکە مێشولە ناخورێت لە کاتێکدا لەو شتە پیسانەیە کە خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادار کردۆتەوە لە فەرماییشتێکدا قەدەغەی کردووە: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ١٥٧﴾، واتە: ئەوەی پاکوخاوێنە بۆیانی حەڵاڵ کردووە، ئەوەیشی پیسە لەسەریان قەدەغەی کردووە. بێگومان خوا پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاگادار کردۆتەوە لەوەی کەوتنەخوارەوەی مێش بۆ نێو قاپوقاچاخ، ئەوا ئەو خواردن و خواردنەوەی لەنێویدایە پیسی ناکات، لەبەر ئەوەی فەرمانی کردووە مێشەکە لەنێو قاپەکەدا نوقم بکرێ ئەگەر کەوتە نێویەوە، ئەگەرچی ئاوەکەش کەمتر بێت لە قوللەتەین

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مێش کەوتە نێو قاپی یەکێکتانەوە، بێگومان لە یەکێك لە باڵەکانی نەخۆشی هەیە، لە ئەوی دیکەشدا چارەسەر هەیە، وە بەو باڵەش دەپارێزرێ کە نەخۆشی پێوەیە، بۆیە با لەنێویا نوقمی بکات، پاشان دەریبهێنێت.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوَضُوءِ بِالْمَاءِ الْمُسْتَعْمَلِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْمَاءَ إِذَا غُسِلَ بِهِ بَعْضُ أَعْضَاءِ الْبَدَنِ أَوْ جَمِيعُهُ لَمْ يَنْجَسِ الْمَاءُ، وَكَانَ الْمَاءُ طَاهِرًا لَا نَجَاسَةَ عَلَيْهِ»

١٠٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَرِضْتُ فَجَاءَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي، وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ مَاشِيَيْنِ، فَوَجَدَنِي قَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ فَتَوَضَّأَ فَصَبَّهُ عَلَيَّ فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ كَيْفَ أَمْضِي فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ: ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ١٧٦﴾النساء، وَقَالَ مَرَّةً: «حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْكَلَالَةِ»(١).

---

(١) صحيح.

**باسی ڕێگەدان بە دەستنوێژ بە ئاوی بەکارهێنراو، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەگەر هەندێ ئەندامی جەستە یان هەمووی بە ئاو بشۆردرێت ئاوەکە پیس نابێت، وە ئاوەکەش پاکە و هیچ پیسییەکی لەسەر نییە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: نەخۆش کەوتم پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانیم، لەگەڵ ئەبو بەکر ﷺ بەپیادە هاتن، بینیمی بێهۆش کەوتووم، ئەویش دەستنوێژی گرت و ئاوەکەی کرد بەسەرمدا، ئینجا هەستام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی لە ماڵ و سامانەکەم بکەم؟ وەڵامی نەدامەوە هەتا ئایەتی میرات دابەزییە خوارەوە: ﴿إِنِ امْرُؤٌا هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ﴿١٧٦﴾﴾، واتە: ئەگەر پیاوێك مرد و منداڵی نەبوو تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی میراتی برا مردووەکەی دەکەوێ. جارێکی دیکە وتی: هەتا ئایەتی کەلالە دابەزی.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مِنْ فَضْلِ وَضُوءِ الْمُتَوَضِّئِ

**١٠٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَا فِي الْقَوْمِ طَهُورٌ؟» قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ بِفَضْلِ مَاءٍ فِي إِدَاوَةٍ قَالَ: فَصَبَّهُ فِي قَدَحٍ فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ أَتَوْا بَقِيَّةَ الطَّهُورِ، فَقَالَ: تَمَسَّحُوا بِهِ، فَسَمِعَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «عَلَى رِسْلِكُمْ» فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ فِي الْقَدَحِ فِي جَوْفِ الْمَاءِ، ثُمَّ قَالَ: «أَسْبِغُوا الطُّهُورَ»، فَقَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: وَالَّذِي أَذْهَبَ بَصَرِي قَالَ: وَكَانَ قَدْ ذَهَبَ بَصَرُهُ لَقَدْ رَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَرْفَعْ يَدَهُ حَتَّى تَوَضَّئُوا أَجْمَعُونَ قَالَ عَبِيدَةُ: قَالَ الْأَسْوَدُ حَسِبْتُهُ قَالَ: «كُنَّا مِائَتَيْنِ أَوْ زِيَادَةً»(١).

**باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن**
**لە زیادەی ئاوی دەستنوێژی کەسێکی دیکە**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتمان کرد کاتی نوێژ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو خەڵکە ئاوی دەستنوێژیان

---

(١) صحیح.




لەلایە؟ وتی: پیاوێك هات ئاوێکی زیادەی لەگەڵ خۆی هێنا لەنێو جامێکدا، وتی: کردیە نێو پەرداخێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی پێ گرت، وتی: پاشان خەڵکەکە زیادەی ئاوی دەستنوێژەکەیان هێنا، وتی: مەسحی خۆتانی پێ بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێیان بوو، فەرمووی: لەسەرخۆ بن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە نێو ئاوەکە لەنێو پەرداخەکە، پاشان فەرمووی: بەچاکی دەستنوێژ بگرن، جابری کوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما وتی: سوێند بەوەی چاوی لێم سەندەوە -وتی: چاوی لەدەست دابوو- بینیم ئاو بە نێوانی پەنجەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشت دەستی بەرز نەکردەوە هەتا هەموویان دەستنوێژیان گرت، عەبیدە وتی: ئەسوەد وتی: پێم وایە وتی: ئێمە دوو سەد کەس یان زیاتر بووین.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوَضُوءِ مِنْ فَضْلِ وَضُوءِ الْمَرْأَةِ

١٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِ مَيْمُونَةَ[١].

## باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن لە زیادەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیادەی ئاوی دەستنوێژی مەیمونە دەستنوێژی دەگرت.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوَضُوءِ بِفَضْلِ غُسْلِ الْمَرْأَةِ مِنَ الْجَنَابَةِ

١٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اغْتَسَلَتْ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ أَوِ اغْتَسَلَ مِنْ فَضْلِهَا، هَذَا حَدِيثُ وَكِيعٍ « وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ: «فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ فَضْلِهَا». وَقَالَ أَبُو مُوسَى، وَعُتْبَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ: فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ مِنْ فَضْلِهَا، فَقَالَتْ لَهُ: فَقَالَ: «الْمَاءُ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن بە زیادەی ئەو ئاوەی کە ئافرەت غوسلی لەشگرانی پێ دەردەکات

وتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە لەشگرانی خۆی شۆرد، پێغەمبەر ﷺ لە زیادەی ئاوەکەی دەستنوێژی گرت یان خۆی شۆرد، ئەمە فەرموودەی وەکیعە. ئەحمەدی کوڕی مەنیع وتی: پێغەمبەر ﷺ لە زیادەی ئاوەکەی دەستنوێژی گرت. ئەبو موسا و عوتبەی کوڕی عەبدوڵا وتیان: پێغەمبەر ﷺ هات لە زیادەی ئاوەکەی دەستنوێژی گرت، خێزانەکەی پێی وت (ئایا ئەوە پیس نییە)، فەرمووی: هیچ شتێك ئاو پیس ناکات.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ سُؤْرَ الْحَائِضِ لَيْسَ بِنَجَسٍ، وَإِبَاحَةِ الْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ بِهِ «إِذْ هُوَ طَاهِرٌ غَيْرُ نَجِسٍ، إِذْ لَوْ كَانَ سُؤْرُ حَائِضٍ نَجِسًا لَمَا شَرِبَ النَّبِيُّ ﷺ مَاءً نَجِسًا غَيْرَ مُضْطَرٍّ إِلَى شُرْبِهِ»

١١٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُؤْتَى بِالْإِنَاءِ فَأَبْدَأُ فَأَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ، ثُمَّ يَأْخُذُ الْإِنَاءَ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِي، وَآخُذُ الْعِرْقَ فَأَعُضُّهُ، ثُمَّ يَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەرماوەی ئافرەتی حەیزدار پیس نییە، وە ڕێگەدراوە دەستنوێژی پێ بگیرێ و غوسلی پێ دەربکرێ، ئەگەر پیس بووایە پێغەمبەر ﷺ ئاوی پیسی نەدەخواردەوە کە ناچار نەبوو بە خواردنەوەی

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قاپی بۆ دەهێنرا من سەرەتا لێم دەخواردەوە لە کاتێکدا لە حەیزدا بووم، پاشان پێغەمبەر ﷺ قاپەکەی وەردەگرت لێم دەمی دەخستە شوێنی دەمم، وە گۆشتی سەر ئێسکم دەکڕاندەوە پاشان (دەمدا پێی) ئەویش دەمی دەخستە شوێنی دەمم.

---

(١) صحیح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْغُسْلِ وَالْوُضُوءِ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ «إِذْ مَاؤُهُ طَهُورٌ مَيْتَتُهُ حِلٌّ ضِدُّ قَوْلِ مَنْ كَرِهَ الْوُضُوءَ، وَالْغُسْلَ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ، وَزَعَمَ أَنَّ تَحْتَ الْبَحْرِ نَارًا، وَتَحْتَ النَّارِ بَحْرًا حَتَّى عَدَّ سَبْعَةَ أَبْحُرٍ، وَسَبْعَةَ نِيرَانٍ، وَكَرِهَ الْوُضُوءَ وَالْغُسْلَ مِنْ مَائِهِ لِهَذِهِ الْعِلَّةِ زَعَمَ»

**١١١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ وَنَحْمِلُ الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا مِنْهُ عَطِشْنَا أَفَنَتَوَضَّأُ مِنْ مَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الْحَلَالُ مَيْتَتُهُ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە غوسل و دەستنوێژگرتن بە ئاوی دەریا، چونکە ئاوەکەی پاکە و مردارەوەبووەکەیشی حەلاڵە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی بە کەراهەتی دەزانێ لە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگیرێ و غوسلی پێ دەربکرێ، وە پێی وایە لەژێر دەریادا ئاگر هەیە، وە لەژێر ئاگردا دەریا هەیە هەتا حەوت دەریای ژمارد، هەروەها حەوت ئاگریش، ناپەسندی دەستنوێژگرتن و خۆشۆردن بە ئاو بەم هۆیەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە دەچینە نێو دەریا، ئاوێکی کەم لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بگرین تینوومان دەبێت، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاوی دەریا پاکە، مردارەوەبوویشی حەلاڵە.

**١١٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبَحْرِ؟ قَالَ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، وَالْحَلَالُ مَيْتَتُهُ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئاوی دەریا، فەرمووی: ئاوی دەریا پاکە، مردارەوەبوویشی حەلاڵە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْوُضُوءِ وَالْغَسْلِ مِنَ الْمَاءِ الَّذِي يَكُونُ فِي أَوَانِي أَهْلِ الشِّرْكِ وَأَسْقِيَتِهِمْ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْإِهَابَ يَطْهُرُ بِدِبَاغِ الْمُشْرِكِينَ إِيَّاهُ»

**١١٣-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَدَعَا فُلَانًا وَدَعَا عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، فَقَالَ: «اذْهَبَا فَابْغِيَا لَنَا الْمَاءَ» فَانْطَلَقَا فَلَقِيَا امْرَأَةً بَيْنَ سَطِيحَتَيْنِ أَوْ بَيْنَ مَزَادَتَيْنِ عَلَى بَعِيرٍ، فَقَالَا لَهَا: أَيْنَ الْمَاءُ؟ قَالَتْ: عَهْدِي بِالْمَاءِ أَمْسِ هَذِهِ السَّاعَةَ، وَنَفَرُنَا خُلُوفٌ، فَقَالَا لَهَا: انْطَلِقِي، فَقَالَتْ: أَيْنَ؟ قَالَا لَهَا: إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: هَذَا الَّذِي يُقَالُ لَهُ الصَّابِئُ؟ قَالَا لَهَا: هُوَ الَّذِي تَعْنِينَ، فَانْطَلَقَا فَجَاءَا بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَحَدَّثَاهُ الْحَدِيثَ، فَقَالَ: «اسْتَنْزِلُوهَا مِنْ بَعِيرِهَا»، وَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِنَاءٍ فَجَعَلَ فِيهِ أَفْوَاهَ الْمَزَادَتَيْنِ أَوِ السَّطِيحَتَيْنِ قَالَا: ثُمَّ مَضْمَضَ ثُمَّ أَعَادَهُ فِي أَفْوَاهِ الْمَزَادَتَيْنِ أَوِ السَّطِيحَتَيْنِ، ثُمَّ أَطْلَقَ أَفْوَاهَهُمَا، ثُمَّ نُودِيَ فِي النَّاسِ أَنِ اسْقُوا وَاسْتَقُوا وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ».(١)

## باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتن و غوسلدەرکردن لەو ئاوەی کە لە قاپوقاچاخی هاوبەشدانەراندایە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە پێستە ئەگەر هاوبەشداران خۆشەی بکەن پاك دەبێتەوە

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە گەشتێکدا فڵانەکەس و عەلی کوڕی ئەبو تالیبی ﷺ بانگ کرد فەرمووی: بڕۆن بگەڕێن ئاومان بۆ پەیدا بکەن، ئەوانیش ڕۆیشتن تا گەیشتن بە ئافرەتێك بەسەر وشترێکەوە کونەیەك ئاوی لە لا بوو، پێیان وت: کوا ئاوەکە؟ ئەویش وتی: دوێنێ بەیانم داوە لەم شوێنەدا ئاو بە خەڵکانێکی خۆمان بدەم کە جێ ماون، پێی وت: لەگەڵمان بەڕێ بکەوە، وتی: بۆ کوێ؟ وتیان: بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەو پیاوەی کە پێی دەڵێن صابئی؟ وتیان: بەڵێ ئەو کەسەیە تۆ مەبەستتە، هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسەکەیان بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: لەسەر وشترەکەی دایبەزێننە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای قاپێکی کرد دەمی کونەکەی کردەوە و ئاوی تێ کرد، وتیان: پاشان ئاوی وەردایە دەمی پاشان قاپەکەی گەڕاندەوە بۆ

---

(١) صحيح.

دەم کونەکە، پاشان دەمەکەیان کردەوە، دواتر خەڵکەکەی بانگ کرد ئاو پڕ بکەن و بخۆنەوە، فەرموودەکەی بەدوورودرێژی باس کرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْوُضُوءِ مِنَ الْمَاءِ يَكُونُ فِي جُلُودِ الْمَيْتَةِ إِذَا دُبِغَتْ

**١١٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَتَوَضَّأَ مِنْ سِقَاءٍ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ مَيِّتَةٌ قَالَ: «دِبَاغُهُ يَذْهَبُ بِخُبْثِهِ أَوْ نَجَسِهِ أَوْ رِجْسِهِ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتن لەو ئاوەی لەنێو پێستی مردارەوەبوودایە ئەگەر خۆشە کرابێت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی دەستنوێژ بگرێ لەو دەفرانەی کە لە پێستە دروست دەکرێن (وەك: کوندە و مەشکە)، پێی وترا: ئەوە مردارەوەبووە، فەرمووی: خۆشەکردنی پیسییەکەی لادەبات.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَبْوَالَ مَا يُؤْكَلُ لَحْمُهُ لَيْسَ بِنَجَسٍ، وَلَا يَنْجُسُ الْمَاءُ إِذَا خَالَطَهُ « إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِشُرْبِ أَبْوَالِ الْإِبِلِ مَعَ أَلْبَانِهَا، وَلَوْ كَانَ نَجِسًا لَمْ يَأْمُرْ بِشُرْبِهِ، وَقَدْ أَعْلَمَ أَنْ لَا شِفَاءَ فِي الْمُحَرَّمِ، وَقَدْ أَمَرَ بِالِاسْتِشْفَاءِ بِأَبْوَالِ الْإِبِلِ، وَلَوْ كَانَ نَجِسًا كَانَ مُحَرَّمًا، كَانَ دَاءً لَا دَوَاءً، وَمَا كَانَ فِيهِ شِفَاءٌ كَمَا أَعْلَمَ ﷺ لَمَّا سُئِلَ: أَيُتَدَاوَى بِالْخَمْرِ؟ فَقَالَ: إِنَّمَا هِيَ دَاءٌ وَلَيْسَتْ بِدَوَاءٍ «

**١١٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قال: أَنَّ أُنَاسًا أَوْ رِجَالًا مِنْ عُكْلٍ وَعُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ فَتَكَلَّمُوا بِالْإِسْلَامِ، وَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّا أَهْلُ ضِرْعٍ، وَلَمْ نَكُنْ أَهْلَ رِيفٍ فَاسْتَوْحَشُوا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِذَوْدٍ وَرَاعٍ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَخْرُجُوا فِيهَا فَيَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ.[٢]

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی میزی ئەو ئاژەڵەی گۆشتی دەخورێ پیس نییە، ئاویش پیس نابێت ئەگەر تێکەڵی ببێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە خواردنەوەی میزی وشتر لەگەڵ شیرەکەی، ئەگەر پیس بووایە فەرمانی بە خواردنی نەدەکرد، ئەو ڕایگەیاندووە شیفا و چارەسەر لە حەرامکراودا نییە، وە فەرمانی کردووە بە وەرگرتنی چارەسەر لە میزی وشتر، ئەگەر پیس بووایە حەرام دەبوو، وە دەبووە نەخۆشی نەك شیفا و چارەسەر، وە شیفای تێدا نەدەبوو وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا کاتێ پرسیاری لێ کرا: ئایا ئارەق وەکوو شیفا و چارەسەر وەردەگیرێ؟ فەرمووی: بێگومان ئەوە نەخۆشییە و چارەسەر نییە**

وتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: خەڵکانێك یان پیاوانێك لە هۆزی عوکل و عورەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە، موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە خەڵکی دەشتین لە شار نەژیاوین، ژیانی مەدینە زۆر گران بوو بەلایانەوە (نەخۆش کەوتن)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردن بچن بۆ لای ئەو وشترانە کە شوانێك بەخێویان دەکات، فەرمانیشی پێ کردن لە میز و شیرەکانیان بخۆنەوە. بەدوورودرێژیی باسی فەرموودەکەی کرد.

**بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي إِجَازَةِ الْوُضُوءِ بِالْمُدِّ مِنَ الْمَاءِ «أَوْهَمَ بَعْضَ الْعُلَمَاءِ أَنَّ تَوْقِيتَ الْمُدِّ مِنَ الْمَاءِ لِلْوُضُوءِ تَوْقِيتٌ لَا يَجُوزُ الْوُضُوءُ بِأَقَلَّ مِنْهُ»**

**١١٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِمَكُّوكٍ، وَيَغْتَسِلُ بِخَمْسَةِ مَكَاكِيَّ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْمَكُّوكُ فِي هَذَا الْخَبَرِ الْمُدُّ نَفْسُهُ.(١)

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە دەربارەی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن بە (الْمُدّ) گوێلێك ئاو، هەندێ لە زانایان بەهەڵەدا چوون کە پێیان وایە دیاریکردنی گوێلێك لە ئاو بۆ دەستنوێژ دیاریکردنێکە دروست نییە بە کەمتر لەو ئەندازەیە دەستنوێژ بگیرێ**

---

(١) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەگرت بە پێوانەیەك ئاو، خۆیشی دەشۆرد بە پێنج پێوانە. ئەبو بەکر دەڵێ: (الْمَكُّوك) لەم فەرموودەیەدا مشتێکە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ تَوْقِيتَ الْمُدِّ مِنَ الْمَاءِ لِلْوُضُوءِ «أَنَّ الْوُضُوءَ بِالْمُدِّ يُجْزِئُ، لَا أَنَّهُ لَا يَسَعُ الْمُتَوَضِّئَ أَنْ يَزِيدَ عَلَى الْمُدِّ أَوْ يَنْقُصَ مِنْهُ إِذْ لَوْ لَمْ يُجْزِئِ الزِّيَادَةَ عَلَى ذَلِكَ وَلَا النُّقْصَانَ مِنْهُ، كَانَ عَلَى الْمَرْءِ إِذَا أَرَادَ الْوُضُوءَ أَنْ يَكِيلَ مُدًّا مِنْ مَاءٍ فَيَتَوَضَّأَ بِهِ لَا يَبْقِي مِنْهُ شَيْئًا، وَقَدْ يَرْفُقُ الْمُتَوَضِّئُ بِالْقَلِيلِ مِنَ الْمَاءِ فَيَكْفِي بِغَسْلِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ، وَيَخْرُقُ بِالْكَثِيرِ فَلَا يَكْفِي لِغَسْلِ أَعْضَاءِ**

**١١٧**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُجْزِئُ مِنَ الْوُضُوءِ الْمُدُّ، وَمِنَ الْجَنَابَةِ الصَّاعُ» فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: لَا يَكْفِينَا ذَلِكَ يَا جَابِرُ فَقَالَ: قَدْ كَفَى مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ وَأَكْثَرُ شَعَرًا[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِهِ ﷺ: «يُجْزِئُ مِنَ الْوُضُوءِ الْمُدُّ» دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ تَوْقِيتَ الْمُدِّ مِنَ الْمَاءِ لِلْوُضُوءِ أَنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُ لَا أَنَّهُ لَا يَجُوزُ النُّقْصَانُ مِنْهُ وَلَا الزِّيَادَةُ فِيهِ.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دیاریکردنی (الْمُدِّ) گوێلێك لە ئاو بۆ دەستنوێژە، بێگومان دەستنوێژ بە (الْمُدِّ) دروستە، نەك بەو مانایەی گونجاو نییە بۆ دەستنوێژگر زیاتر لە (الْمُدِّ)ێك بەکار بهێنێ، یان کەمتر لەو ڕێژەیە، ئەگەر زیاتر لەو ڕێژەیە و کەمتر لەو ڕێژەیە دروست نەبێت، ئەوە پێویستە لەسەر بەندە ئەگەر ویستی دەستنوێژ بگرێ پێوانەی (الْمُدِّ)ێك لە ئاو دیاری بکات دەستنوێژی پێ بگرێ و هیچی لێ نەهێڵێتەوە، دەگونجێ کەسێك ئاوی کەم بەکار بهێنێت ئەوە بەس بێت بۆی ئەندامەکانی جەستەی پێ بشۆرێت، وە ئاوی زۆریش لەبەردەستی بێت زۆرتر بەکار بهێنێ**

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ دەستنوێژ (الْمُدُّ)ێك ئاو بەسە، بۆ لەشگرانیش صاعێك بەسە، پیاوێك پێی وت: ئەوە بەشمان

---

(١) صحيح.

ـکت ئەی جابر؟ ئەویش وتی: بەشی کەسێکی کردووە لە تۆ زۆر چاکتر بووە و موویشی لە تۆ زیاتر بووە (واتە: پێغەمبەر ﷺ).

ـێنی: (المُدُّ): پێوانەیەکی ناسراو بووە لەو سەردەمەدا، وتراویشە لەبەر ئەوە ناو ـرەوە بە (المُدّ) چونکە مرۆڤ هەردوو دەستی داناوە و پڕی کردووە.

ـبو بەکر لەبارەی فەرموودەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ: (يُجْزِئُ مِنَ الْوُضُوءِ الْمُدُّ) دەڵێ: ـڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەندازەی (الْمُدّ) بۆ دەستنوێژ دروستە، نەك دروست نییە کەمتر لەو ڕێژەیە یان زیاتر لەو ڕێژەیە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْوُضُوءِ بِأَقَلَّ مِنْ قَدْرِ الْمُدِّ مِنَ الْمَاءِ

**١١٨**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِثُلُثَيْ مُدٍّ فَجَعَلَ يَدْلُكُ ذِرَاعَهُ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتن بە کەمتر لە ئەندازەی (الْمُدِّ)ێك ئاو

ـە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوو لەسەر سێی (الْمُدِّ)ێك ـوی بۆ هێنرا دەستی تەڕ دەکرد و دەیهێنا بەسەر باڵیدا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا تَوْقِيتَ فِي قَدْرِ الْمَاءِ الَّذِي يَتَوَضَّأُ بِهِ الْمَرْءُ «فَيَضِيقُ عَلَى الْمُتَوَضِّئِ أَنْ يَزِيدَ عَلَيْهِ أَوْ يَنْقُصَ مِنْهُ، إِذْ لَوْ كَانَ لِقَدْرِ الْمَاءِ الَّذِي يَتَوَضَّأُ بِهِ الْمَرْءُ مِقْدَارٌ لَا يَجُوزُ أَنْ يَزِيدَ عَلَيْهِ وَلَا يَنْقُصَ مِنْهُ شَيْئًا، لَمَا جَازَ أَنْ يَجْتَمِعَ اثْنَانِ وَلَا جَمَاعَةٌ عَلَى إِنَاءٍ وَاحِدٍ، فَيَتَوَضَّئُوا مِنْهُ جَمِيعًا، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ أَنَّهُمْ إِذَا اجْتَمَعُوا عَلَى إِنَاءٍ وَاحِدٍ يَتَوَضَّئُونَ مِنْهُ؛ فَإِنَّ بَعْضَهُمْ أَكْثَرُ حَمْلًا لِلْمَاءِ مِنْ بَعْضٍ»

**١١٩**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُنْتُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَتَوَضَّأُ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ[٢].

---

(١) إسناده ضعيف (معلول).

(٢) هذا الحديث معلول.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەندازەیەكی دیاریكراو نییە لە ئاو بۆ ئەوەی كەسێك دەستنوێژی پێ بگرێ، لەسەر دەستنوێژگر گران بێت لەوە زیاتر یان كەمتر بەكار بهێنرێ، ئەگەر ئەو ئاوەی بەندە دەستنوێژی پێ دەگرێ ئەندازەیەكی دیاریكراو بووایە دروست نەدەبوو دوو كەس یان كۆمەڵێك لەنێو یەك قاپدا دەستنوێژیان بگرتایە، هەموو كەس دەزانێ ئەگەر كۆمەڵێك لە یەك قاپدا دەستنوێژ بگرن هەندێكیان ئاوی زیاتر بەكار دێنن لە هەندێكی دیكە**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو یەك قاپدا (ئاومان دەردەهێنا و) دەستنوێژمان دەگرت.

١٢٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كُنَّا نَتَوَضَّأُ رِجَالًا وَنِسَاءً، وَنَغْسِلُ أَيْدِينَا فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەك قاپدا پیاوان و ئافرەتان دەستنوێژمان دەگرت و دەستمان دەشۆرد.

١٢١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ أَنَّهُ، أَبْصَرَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَصْحَابِهِ يَتَطَهَّرُونَ، وَالنِّسَاءُ مَعَهُمُ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ كُلُّهُمْ يَتَطَهَّرُ مِنْهُ[٢].

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەگێڕێتەوە، ئەو تەماشای پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی كردووە كە دەستنوێژیان دەگرت، ئافرەتان و پیاوان هەموویان لە یەك قاپدا دەستنوێژیان دەگرت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْقَصْدِ فِي صَبِّ الْمَاءِ، وَكَرَاهَةِ التَّعَدِّي فِيهِ، وَالْأَمْرِ بِاتِّقَاءِ وَسْوَسَةِ الْمَاءِ

١٢٢- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ لِلْوُضُوءِ شَيْطَانًا يُقَالُ لَهُ وَلَهَانُ، فَاتَّقُوا وَسْوَاسَ الْمَاءِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف جدا.

## باسی چاکتر وایە بەندە ئاو زۆر بەکار نەهێنێ، باش نییە زیادەڕەوی تێدا بکات، فەرمان کراوە خۆی بپارێزێ لە ختورەی شەیتان

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ شەیتانێکی هەیە پێی دەوترێ (وَلَهَانُ) خۆتان بپارێزن لە ختورەی بەکارهێنانی ئاو بۆ دەستنوێژ.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَوَانِي اللَّوَاتِي يُتَوَضَّأُ فِيهِنَّ أَوْ يُغْتَسَلُ

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ فِي أَوَانِي النُّحَاسِ

**١٢٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ: «صُبُّوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ لَعَلِّي أَسْتَرِيحُ فَأَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ». قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَأَجْلَسْنَاهُ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ مِنْ نُحَاسٍ، وَسَكَبْنَا عَلَيْهِ الْمَاءَ مِنْهُنَّ حَتَّى طَفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ، ثُمَّ خَرَجَ[١].

## کۆباسی ئەو قاپوقاچاخانەی کە بۆ دەستنوێژ یان بۆ خۆشۆردن دەشێ.

## باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژ و غوسلدەرکردن لە قاپوقاچاخی مسدا

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو نەخۆشییەی کە پێیەوە کۆچی دوایی کرد فەرمووی: ئاو بکەن بە سەرمدا لە حەوت کونە دەمەکانیان نەکرابێتەوە، بەڵکوو پشوو بدەم و بچمە نێو خەڵکەکە، عائیشە ﷺ وتی: لەنێو تەشتێکی مسدا دامانیشاند کە هی حەفصە بوو، ئاومان کرد بە سەریدا هەتا ئاماژەی بۆ کردین ئیدی بەسە ئیشی خۆتانتان کرد، پاشان دەرچوو.

---

(١) إسناده صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مِنْ أَوَانِي الزُّجَاجِ «ضِدُّ قَوْلِ بَعْضِ الْمُتَصَوِّفَةِ الَّذِي يَتَوَهَّمُ أَنَّ اتِّخَاذَ أَوَانِي الزُّجَاجِ مِنَ الْإِسْرَافِ، إِذِ الْخَزَفُ أَصْلَبُ وَأَبْقَى مِنَ الزُّجَاجِ»

**١٢٤-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَا بِوَضُوءٍ فَجِيءَ بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ -أَحْسَبُهُ قَالَ: قَدَحُ زُجَاجٍ- فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ فَجَعَلَ الْقَوْمُ يَتَوَضَّئُونَ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ فَحَزَرْتُهُمْ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى الْمَاءِ كَأَنَّهُ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: رَوَى هَذَا الْخَبَرَ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ حَمَّادِ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالُوا: رَحْرَاحٌ مَكَانُ الزُّجَاجِ بِلَا شَكٍّ، نا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، نا أَبُو النُّعْمَانِ، نا حَمَّادٌ بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَقَالَ فِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ بْنِ حَارِثٍ: أُتِيَ بِقَدَحٍ زُجَاجٍ، وَقَالَ فِي حَدِيثِ أَبِي النُّعْمَانِ: بِإِنَاءٍ زُجَاجٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَالرَّحْرَاحُ: إِنَّمَا يَكُونُ الْوَاسِعَ مِنْ أَوَانِي الزُّجَاجِ لَا الْعَمِيقَ مِنْهُ[١].

**باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن لە قاپوقاچاخی شوشە، پێچەوانەی وتەی یەکێك لەو سۆفیانەیە کە وا خەیاڵ دەکات بەکارهێنانی قاپوقاچاخی شوشە لە زیادەڕەوییە، چونکە گۆزە و فەخفوری بەهێزترن و زیاتر دەمێننەوە**

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوی دەستنوێژی کرد پەرداخی بۆ هێنرا ئاوی تێدا بوو -پێم وایە وتی: پەرداخی شوشە بوو- پەنجەکانی خستە نێویەوە خەڵکەکەش یەك لەدوای یەك دەستنوێژیان دەگرت، خەملاندیانم لە نێوان حەفتا بۆ هەشتا کەس دەبوون، تەماشای ئاوەکەم دەکرد لە نێوان پەنجەکانیەوە ڕێی دەکرد. ئەبو بەکر وتی: ئەم فەرموودەیە چەند کەسێك گێڕاویانەتەوە لە حەمادی کوڕی زەید، وتیان: بێگومان (رَحْرَاحٌ) لە جێگای (الزُّجَاج) شوشە هاتووە، ئەبو نوعمان بۆی باس کردین، حەماد بۆی باس کردین بەم شێوەیە، وە لە فەرموودەی سولەیمانی کوڕی حاریسدا وتی: پەرداخێکی شوشەی بۆ هێنرا، هەروەها لە فەرموودەکەی ئەبو نوعمانیش: قاپێکی شوشە. ئەبو بەکر وتی: (الرَّحْرَاحُ): قاپی شوشەی فراوانترە بەڵام قووڵ نییە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مِنَ الرَّكْوَةِ وَالْقَعْبِ

**١٢٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: عَطِشَ النَّاسُ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ يَتَوَضَّأُ مِنْهَا إِذْ جَهَشَ النَّاسُ نَحْوَهُ قَالَ: فَقَالَ: «مَا لَكُمْ؟» قَالُوا: مَا لَنَا مَاءٌ نَتَوَضَّأُ وَلَا نَشْرَبُ إِلَّا مَا بَيْنَ يَدَيْكَ قَالَ: «فَوَضَعَ يَدَيْهِ فِي الرَّكْوَةِ، وَدَعَا بِمَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوَ». قَالَ: «فَجَعَلَ الْمَاءُ يَفُورُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ أَمْثَالَ الْعُيُونِ» قَالَ: فَشَرِبْنَا وَتَوَضَّأْنَا قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرٍ: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ: كُنَّا خَمْسَ عَشْرَةَ مِائَةً، وَلَوْ كُنَّا مِائَةَ أَلْفٍ لَكَفَانَا»[١].

## باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن لەنێو قاپی بچووك و گەورە

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێ: لە ڕۆژی حودەیبیە خەڵکەکە تووشی تینوێتییەکی سەخت بوون، پێغەمبەری خواش ﷺ قاپێکی بچووك ئاوی لەبەردەستدا بوو دەستنوێژی پێ دەگرت، لەپڕ خەڵکەکە پەنایان هێنا بۆ خزمەتی و ڕوویان تێ کرد، فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: هیچ ئاومان لەلا نییە دەستنوێژی پێ بگرین و بیخۆینەوە ئەوە نەبێت لەبەردەستی تۆدایە، وتی: دەستی خستە نێو قاپە بچووکەکە و نزای کرد ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو نزا بکات، وتی: ئاوەکە لە نێوان پەنجەکانیەوە دەڕۆیشت هەر وەکوو کانی، وتی: ئاومان خواردەوە و دەستنوێژمان گرت، وتی: بە جابرم وت: چەند کەس بوون؟ وتی: هەزار و پێنج سەد کەس بووین، ئەگەر سەد هەزاریش بووباین بەشمانی دەکرد.

**١٢٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَعْبٍ صَغِيرٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهُ» فَقُلْتُ لِأَنَسٍ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قُلْتُ: فَأَنْتُمْ؟ قَالَ: «كُنَّا نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِالْوُضُوءِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: قاپێکی بچووك هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی لێ گرت، بە ئەنەسم وت: ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی دەگرت؟ وتی: بەڵێ، وتم: ئەی ئێوە؟ ئێمە بە دەستنوێژێك نوێژەکانمان دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مِنَ الْجِفَانِ وَالْقِصَاعِ

١٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ فَبَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فَبَالَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ وَأَطْلَقَ شِنَاقَ الْقِرْبَةِ، فَصَبَّ فِي الْقَصْعَةِ أَوِ الْجَفْنَةِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ الْوُضُوءَيْنِ، وَقَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ فَتَوَضَّأْتُ، فَجِئْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَأَخَذَنِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ[١].

## باسی ڕێگەپێدانی دەستنوێژگرتن لە مەنجەڵ و تەشتدا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لەلای پوورم مەیمونە شەو مامەوە، بۆ ئەوەی بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن شەونوێژ دەکات، هەستا میزی کرد، پاشان ڕوخسار و دەستەکانی شۆرد، پاشان خەوت، پاشان هەستا و هات بۆ لای جەوەنەکە دەمەکەی کردەوە، ئینجا ئاوی کردە نێو تەشتەکە یان مەنجەڵێك، ئینجا دەستنوێژی گرت لە نێوان دوو دەستنوێژدا (واتە: لە نێوان دەستنوێژێکی سووك و دەستنوێژێکی تەواودا)، هەستا نوێژی کرد منیش هەستام دەستنوێژم گرت، لەلای چەپیەوە ڕاوەستام گرتمی و لە لای ڕاستی دانام.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَغْطِيَةِ الْأَوَانِي الَّتِي يَكُونُ فِيهَا الْمَاءُ لِلْوُضُوءِ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، وَلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

١٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَغْطِيَةِ الْوَضُوءِ، وَإِيكَاءِ السِّقَاءِ، وَإِكْفَاءِ الْإِنَاءِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَوْقَعَ النَّبِيُّ ﷺ اسْمَ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَاءِ الَّذِي يَتَوَضَّأُ بِهِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْعَرَبَ تُوقِعُ الِاسْمَ عَلَى الشَّيْءِ فِي الِابْتِدَاءِ عَلَى مَا يَؤُولُ إِلَيْهِ الْأَمْرُ فِي الْمُتَعَقَّبِ، إِذِ الْمَاءُ قَبْلَ أَنْ يُتَوَضَّأَ بِهِ إِنَّمَا وَقَعَ عَلَيْهِ اسْمُ الْوَضُوءِ؛ لِأَنَّهُ يَؤُولُ إِلَى أَنْ يُتَوَضَّأَ بِهِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## ...سی فەرمانکردن بەداپۆشینی دەفرەکان کەئاویان تێدایەبۆدەستنوێژگرتن، ... دەستەواژەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّر). وە بە دەستەواژەیەکی گشتی (عَام) مەبەستی پێی تایبەتییە (خَاص)

...تە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە داپۆشینی ...وی دەستنوێژەکان و بەستنی دەمی کونەی ئاوەکان و داپۆشینی قاپ و دەفرەکان.

...بو بەکر وتی: هەندێ جار پێغەمبەر ﷺ ناوی دەستنوێژی بەکار هێناوە بۆ ئەو ئاوەی ...ستنوێژی پێ دەگیرێ، ئەمەش لەو شێوەیەیە کە لە چەندین شوێنی کتێبەکانماندا ...ماژەمان پێ کردووە کە عەرەب سەرەتا ناوی شتێك بەکار دەهێنێ بۆ ئەو شتەی ...دواییدا بەکار دێت، چونکە ئاو پێش ئەوەی دەستنوێژی پێ بگیرێت ناوی (الْوَضُوء) ...ی بەسەر سەپێنراوە، چونکە دەستنوێژی پێدەگیرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِتَغْطِيَةِ الْأَوَانِي بِاللَّيْلِ لَا بِالنَّهَارِ جَمِيعًا

**١٢٩-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِقَدَحِ لَبَنٍ مِنَ النَّقِيعِ غَيْرَ مخَمَّرٍ، فَقَالَ: أَلَا خَمَّرْتَهُ، ...وْ تَعْرِضُ عَلَيْهِ بِعُودٍ، قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: إِنَّمَا أَمَرَ بِالْأَبْوَابِ أَنْ يُغْلَقَ لَيْلًا، وَإِنَّمَا أَمَرَ بِالْأَسْقِيَةِ أَنْ يُخَمَّرَ ...يْلًا وَقَالَ الدَّارِمِيُّ: إِنَّمَا أَمَرَ بِالْآنِيَةِ أَنْ تُخَمَّرَ لَيْلًا، وَبِالْأَوْعِيَةِ أَنْ تُوكَأَ لَيْلًا، وَلَمْ يَذْكُرِ الْأَبْوَابَ[1].

## باسی فەرموودەیەکی (الْمُفَسَّر) بۆ ئەو دەستەواژە (الْمُجْمَل)ەی کە باسمان کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەشەو قاپوقاچاخەکان داپۆشرێن نەك بەڕۆژ

واتە: ئەبو حومەید ﵁ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە پەرداخێك شیری (النَّقِيعَ)ەوە سەری نەپۆشرابوو، فەرمووی: خۆزگە سەرت داپۆشیبایە ئەگەر چی بە دارێکیش بووایە. ئەبو حومەید وتی: فەرمانی کردووە دەرگاکان بەشەو دابخرێن، وە

---

(١) صحيح.

قاپوقاچاخەکان بەشەو داپۆشرێن، دارەمی وتی: فەرمانی کردووە قاپوقاچاخەکان بەشەو داپۆشرێن، هەروەها کونەکانیش بەشەو دەمیان ببەسترێ، باسی دەرگاکانی نەکرد.

تێبینی: (النَّقِيعَ): جێگایەك بوو لە دەوروبەری مەدینە ئاوی تێدا کۆ دەبۆیەوە.

**١٣٠** - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: إِنَّمَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِالْأَسْقِيَةِ أَنْ تُوكَأَ لَيْلًا، وَبِالْأَبْوَابِ أَنْ تُغَلَّقَ لَيْلًا[(١)].

واتە: جابری کوڕی عەبدولاّ ﵄ دەڵێ: ئەبو حومەید وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەمی کونەکان بەشەو ببەسترێن، هەروەها دەرگاکانیش دابخرێن.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَسْمِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ تَخْمِيرِ الْأَوَانِي، وَالْعِلَّةُ الَّتِي مِنْ أَجْلِهَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِتَخْمِيرِ الْإِنَاءِ

**١٣١** - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ مُغْلَقًا، وَأَطْفِئْ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَاذْكُرِ اللَّهَ، وَلَوْ بِعُودٍ تَعْرُضُهُ عَلَيْهِ»[(٢)].

## باسی فەرمانکردن بە ناوهێنانی خوا ﷻ لە کاتی داپۆشینی قاپوقاچاخەکان، وە ئەو هۆکارەش کە پێغەمبەر ﷺ لە پێناویدا فەرمانی کردووە بە داپۆشینی قاپوقاچاخەکان

واتە: جابری کوڕی عەبدولاّ ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەرگاکەت دابخە و ناوی خوا بهێنە، چونکە شەیتان دەرگایەکی داخراو ناکاتەوە، چراکەت بکوژێنەوە و ناوی خوا بهێنە، دەمی کونەکەت ببەستە و ناوی خوا بهێنە، قاپ و دەفرەکەت داپۆشە و ناوی خوا بهێنە، ئەگەرچی بە چڵەدارێکیش بێت بیخەیتە سەری.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

١٣٠ - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَغْلِقُوا أَبْوَابَكُمْ، وَأَوْكُوا أَسْقِيَتَكُمْ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ، وَأَطْفِئُوا سُرُجَكُمْ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ غَلَقًا، وَلَا يَحُلُّ وِكَاءً، وَلَا يَكْشِفُ غِطَاءً، وَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ رُبَّمَا أَضْرَمَتْ عَلَى أَهْلِ الْبَيْتِ بَيْتَهُمْ نَارًا، وَكُفُّوا فَوَاشِيَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ إِلَى أَنْ تَذْهَبَ فَجْوَةُ الْعِشَاءِ» قَالَ لَنَا يُوسُفُ: فَحْوَةُ الْعِشَاءِ، وَهَذَا تَصْحِيفٌ، وَإِنَّمَا هُوَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ وَهِيَ: اشْتِدَادُ الظَّلَامِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِتَغْطِيَةِ الْأَوَانِي، وَإِيكَاءِ الْأَسْقِيَةِ، إِذِ الشَّيْطَانُ لَا يَحُلُّ وِكَاءَ السِّقَاءِ، وَلَا يَكْشِفُ غِطَاءَ الْإِنَاءِ لَا أَنَّ تَرْكَ تَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ مَعْصِيَةٌ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَلَا أَنَّ الْمَاءَ يَنْجُسُ بِتَرْكِ تَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا وَجَدَ السِّقَاءَ غَيْرَ مُوكًا شَرِبَ مِنْهُ. فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ ﷺ لَمَّا أَمَرَ بِإِيكَاءِ السِّقَاءِ وَتَغْطِيَةِ الْإِنَاءِ، وَأَعْلَمَ أَنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا وَجَدَ السِّقَاءَ غَيْرَ مُوكًا شَرِبَ مِنْهُ كَانَ فِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّهُ إِذَا وَجَدَ الْإِنَاءَ غَيْرَ مُغَطًّى شَرِبَ مِنْهُ، حَدَّثَنَا بِالْخَبَرِ الَّذِي ذَكَرْتُ مِنْ إِعْلَامِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا وَجَدَ السِّقَاءَ غَيْرَ مُوكًا شَرِبَ مِنْهُ.

واتە: جابر کوڕی عەبدولاڵ ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرمووو: دەرگاکانتان دابخەن و دەمی کونەی ئاوەکانتان ببەستن و سەری خواردنەکانتان دابخەن و ڕووناکییەکان بکوژێننەوە، چونکە شەیتان خواردنی داخراو و گرێی کونە و مەشکەکان ناکاتەوە و سەرقاپی داپۆشراویش لانادات، بێگومان مشك بە هۆی چراکانەوە هەندێ جار ئاگر بەردەداتە ماڵەکان، مەڕ و ماڵات و منداڵەکانتان دەرمەکەن و منداڵەکانتان بهێننە ژوورەوە هەتا تاریکایی شەو دەڕوات، یوسف پێیانی وت: (فَحْوَةُ الْعِشَاءِ) ئەوەش هەڵەکردنە لە خوێندنەوەدا، بەڵکوو (فَجْوَةُ الْعِشَاءِ) بریتییە لە تاریکایی تەواو.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە فەرمانی کردووە بە داپۆشینی قاپوقاچاخەکان و بەستنی دەمی کونەکان، چونکە شەیتان گرێی کونە و مەشکەکان ناکاتەوە، هەروەها سەرقاپەکانیش لانادات، نەك بە مانای وازهێنان لە داپۆشینی سەرقاپەکان سەرپێچی خوا بێت، وە نەك بە واتای ئەوە ئەگەر قاپەکە دانەپۆشرێ ئاوەکە پیسە، پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە شەیتان ئەگەر بینی کونەیەك دەمی نەبەستراوە لێی دەخواتەوە، پێ دەچی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە فەرمانی کردبێت بە بەستنی دەمی کونەکان و داپۆشینی قاپوقاچاخەکان، وە ڕایگەیاندووە

---

(١) صحيح.

کە شەیتان ئەگەر کونەیەکی بینی سەری نەبەسترابوو لێی دەخواتەوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەیتان ئەگەر بینی قاپوقاچاخ سەری دانەپۆشرابوو لێی دەخواتەوە، بۆی باس کردین بەو فەرموودەی کە باسم کرد لە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرە ﷺ ئەگەر کونەیەکی بینی دەمی نەبەسترابوو لێی دەخواتەوە.

**١٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «أَوْكُوا الْأَسْقِيَةَ، وَغَلِّقُوا الْأَبْوَابَ إِذَا رَقَدْتُمْ بِاللَّيْلِ، وَخَمِّرُوا الشَّرَابَ وَالطَّعَامَ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي فَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْبَابَ مُغْلَقًا دَخَلَهُ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ السِّقَاءَ مُوكًأ شَرِبَ مِنْهُ، وَإِنْ وَجَدَ الْبَابَ مُغْلَقًا وَالسِّقَاءَ مُوكًأ لَمْ يَحُلَّ وِكَاءً، وَلَمْ يَفْتَحْ مُغْلَقًا، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ لِإِنَائِهِ مَا يُخَمِّرُ بِهِ فَلْيَعْرِضْ عَلَيْهِ عُودًا» وَإِنَّمَا بَدَأْنَا بِذِكْرِ السِّوَاكِ قَبْلَ صِفَةِ الْوُضُوءِ لِبَدْءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِهِ قَبْلَ الْوُضُوءِ عِنْدَ دُخُولِ مَنْزِلِهِ»[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵای ئەنصاری رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دەمی کونە و مەشکەکان ببەستن و دەرگاکان دابخەن ئەگەر شەو خەوتن، هەروەها خواردنەوە و خواردنەکان داپۆشن، چونکە بەڕاستی شەیتان دێت ئەگەر بینی دەرگا دانەخراوە دەچێتە ژوورەوە، وە ئەگەر بینی کونە و مەشکەکان دەمیان نەبەستراوە لێی دەخواتەوە، وە ئەگەر بینی دەرگا داخراوە و دەمی کونەکان بەستراون ئەوە دەمی هیچ کونە و مەشکەیەك ناکاتەوە، هەروەها هیچ دەرگایەکی داخراویش ناکاتەوە، وە ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە شتێکی بەدی نەکرد قاپەکەی پێ داپۆشێ ئەوە با دارێك لەسەری دابنێت.

(ئەبو بەکر دەڵێ): جا بۆیە سەرەتا بە باسی سیواك دەستمان پێ کرد پێش سیفەتی دەستنوێژ، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێش دەستنوێژ دەستی بە سیواککردن کرد کاتێ چووە ماڵەکەیەوە.

## بَابُ بَدْءِ النَّبِيِّ ﷺ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ دُخُولِ مَنْزِلِهِ

**١٣٤** - عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ رضي الله عنه، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْدَأُ إِذَا دَخَلَ الْبَيْتَ؟ قَالَتْ: بِالسِّوَاكِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچوایتە ماڵەوە سەرەتا سیواکی دەکرد

واتە: میقدامی کوڕی شوڕەیح ﷺ دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: بە عائیشەم ﷺ وت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بهاتایەتە ژوورەوە سەرەتا چی دەکرد؟ وتی: سیواکی دەکرد.

## بَابُ فَضْلِ السِّوَاكِ وَتَطْهِيرِ الْفَمِ بِهِ

١٣٥ - عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی سیواك و پاككردنەوەی دەم و ددان بە سیواك

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سیواك (کەرەستەی) پاککەرەوەی دەم و ددانە و دەبێتە مایەی ڕەزامەندی پەروەردگار.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّسَوُّكِ عِنْدَ الْقِيَامِ مِنَ النَّوْمِ لِلتَّهَجُّدِ

١٣٦ - عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ لِلتَّهَجُّدِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ[٢].

## باسی چاکتر وایە لە کاتی هەستان لە خەو بۆ شەونوێژ سیواك بكرێت

واتە: حوزەیفە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەستایە بۆ شەونوێژ سیواکی دەکرد (دەمی پێی دەشۆرد).

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ الَّتِي يُسْتَاكُ لَهَا عَلَى الصَّلَاةِ الَّتِي لَا يُسْتَاكُ لَهَا إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ

١٣٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَضْلُ الصَّلَاةِ الَّتِي يُسْتَاكُ لَهَا عَلَى الصَّلَاةِ الَّتِي لَا يُسْتَاكُ لَهَا سَبْعِينَ ضِعْفًا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حديث ضحيف.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا اسْتَثْنَيْتُ صِحَّةَ هَذَا الْخَبَرِ لِأَنِّي خَائِفٌ أَنْ يَكُونَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ لَمْ يَسْمَعْ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ وَإِنَّمَا دَلَّسَهُ عَنْهُ.

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئەو نوێژەی سیواکی بۆ دەکرێ بەسەر ئەو نوێژەی سیواکی بۆ ناکرێ ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەزڵی ئەو نوێژەی سیواکی بۆ دەکرێ لەسەر ئەو نوێژەی سیواکی بۆ ناکرێ حەفتا ئەوەندەیە.

ئەبو بەکر دەڵێ: من ڕاستی و دروستی ئەم فەرموودەیەم جیا کردەوە، چونکە من دەترسم موحەممەدی کوڕی ئیسحاق نەیبستبێت لە موحەممەدی کوڕی موسلیم، بەڵکوو تەدلیسی کردبێت لێیەوە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ أَمْرَ نَدْبٍ وَفَضِيلَةٍ لَا أَمْرَ وُجُوبٍ وَفَرِيضَةٍ

١٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قُلْتُ: تَوَضَّأَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ لِكُلِّ صَلَاةٍ طَاهِرًا أَوْ غَيْرَ طَاهِرٍ عَمَّنْ ذَاكَ؟ قَالَ: حَدَّثَتْهُ أَسْمَاءُ بِنْتُ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ حَنْظَلَةَ بْنِ أَبِي عَامِرٍ ﵁ حَدَّثَهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَمَرَ بِالْوَضُوءِ لِكُلِّ صَلَاةٍ طَاهِرًا كَانَ أَوْ غَيْرَ طَاهِرٍ، فَلَمَّا شَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ أَمَرَ بِالسِّوَاكِ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ يَرَى أَنَّ بِهِ قُوَّةً عَلَى ذَلِكَ فَكَانَ لَا يَدَعُ الْوُضُوءَ لِكُلِّ صَلَاةٍ»[1].

## باسی فەرمانکردن بە سیواك لە کاتی هەموو نوێژێك فەرمانێکە بۆ سوننەت و فەزڵ و شکۆ نەك بۆ پێویست (واجب) بوون و فەرزبوون

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: وتم: ئیبنو عومەر ﵄ دەستنوێژی دەگرت بۆ هەموو نوێژێك دەستنوێژی هەبووایە یان دەستنوێژی نەبووایە ئەوەی لەکوێ هێنا؟ وتی: ئەسمائی کچی زەیدی کوڕی خەتاب ﵁بۆی باس کرد، کە

---

(١) اسناده حسن.

عەبدوڵای کوڕی حەنزەلەی کوڕی ئەبو عامر ﷺ بۆی باس کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ: فەرمانی کرد بە دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێك کەسەکە دەستنوێژی هەبووایە یان دەستنوێژی نەبووایە، کاتێ ئەوە گران بوو بەسەریەوە فەرمانی کرد بە سیواککردن بۆ هەموو نوێژێك، ئیبنو عومەر ﷺ هێز و توانای لە خۆیدا دەبینی لەسەر ئەو کارە بۆیە دەستبەرداری دەستنوێژگرتنەوە نەدەبوو لە هەموو نوێژێکدا.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالسِّوَاكِ أَمْرَ فَضِيلَةٍ لَا أَمْرَ فَرِيضَةٍ «إِذْ لَوْ كَانَ السِّوَاكُ فَرْضًا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أُمَّتَهُ شَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ أَوْ لَمْ يَشُقَّ، وَقَدْ أَعْلَمَ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ بِهِ أُمَّتَهُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، لَوْلَا أَنَّ ذَلِكَ يَشُقُّ عَلَيْهِمْ، فَدَلَّ هَذَا الْقَوْلُ مِنْهُ ﷺ أَنَّ أَمْرَهُ بِالسِّوَاكِ أَمْرُ فَضِيلَةٍ، وَأَنَّهُ إِنَّمَا أَمَرَ بِهِ مَنْ يَخِفُّ ذَلِكَ عَلَيْهِ دُونَ مَنْ يَشُقُّ ذَلِكَ عَلَيْهِ»**

**١٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يبلغ بِهِ النَّبِيّ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِتَأْخِيرِ الْعِشَاءِ، وَالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمان بە سیواککردن بۆ فەزڵ و ڕێزە نەك بۆ فەرزبوون، ئەگەر سیواك فەرز بووایە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە ئوممەتەکەی گران بووایە لەسەریان یان گران نەبووایە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە فەرمان دەکات بە ئوممەتەکەی لە کاتی هەموو نوێژێك ئەگەر گران نەبووایە لەسەریان، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانکردنی بە سیواك فەرمانێکە بۆ فەزڵ و ڕێزە، بێگومان تەنها فەرمانی کردووە بەوکەسەی ئاسانە لەسەری ئەو کەسە ناگرێتەوە کە گرانە لەسەری**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوە فەرمانم پێ دەکردن بە دواخستنی نوێژی عیشا (بۆ سێیەکی شەو یان نیوەی شەو) هەروەها بە سیواککردن لە کاتی هەموو نوێژێك.

---

(١) صحيح.

**١٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ فِي الْمُوَطَّأِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ يَشُقَّ عَلَى أُمَّتِهِ لَأَمَرَهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ وَضُوءٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەبەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوە فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لەگەڵ هەموو دەستنوێژێکدا، ئەم فەرموودەیە لە (الْمُوَطَّأ)دا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ: ئەگەر گران نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لە کاتی هەموو دەستنوێژێکدا.

## بَابُ صِفَةِ اسْتِيَاكِ النَّبِيِّ ﷺ

**١٤١** - عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَسْتَنُّ وَطَرَفُ السِّوَاكِ عَلَى لِسَانِهِ وَهُوَ يَقُولُ: عَا عَا.[٢]

## باسی سیفەتی سیواککردنی پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سیواکی دەکرد تەنیشتی سیواکەکەی لەسەر زمانی دانابوو دەیفەرموو: ئع ئع.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْوُضُوءِ وَسُنَنِهِ
## بَابُ إِيجَابِ إِحْدَاثِ النِّيَّةِ لِلْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ

**١٤٢-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ» لَمْ يَقُلْ أَحْمَدُ: وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى»[٣].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.

## کۆباسی دەستنوێژگرتن و سوننەتەکانی

## باسی پێویست (واجب) بوونی نیەتهێنان بۆ دەستنوێژ و غوسڵدەرکردن

ﻭ ته: عەلقەمەی کوڕی وەقاصی لەیسی دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ﻮﻭ دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان کردەوەکان بەپێی ـﺰ و مەبەستن، هەموو کەسێکیش بەپێی نیاز و مەبەستی خۆیەتی، جا هەر کەسێك ـزی کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، هەر کەسێکیش نیازی کۆچکردنەکەی بۆ مەبەستی ﺪنیا بێت بە دەستی بێنێ یان بۆ لای ئافرەتێك مارەی بکات ئەوا کۆچکردنەکەی بۆ لای ئەوەیە کە کۆچی بۆی کردووە.

١٤٣- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنَ وَقَّاصٍ اللَّيْثِيِّ يَقُولُ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ ـﻪِ ﷺ يَقُولُ: «الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى»[1].

ﻭ ته: عەلقەمەی کوڕی وەقاصی لەیسی دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کردەوەکان بەپێی نیاز و مەبەستی ‹کەسەکەیە)، هەموو کەسێکیش بەپێی نیاز و مەبەستی خۆی (حیسابی بۆ دەکرێ).

## بَابُ ذِكْرِ تَسْمِيَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ الْوُضُوءِ

١٤٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: طَلَبَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَضُوءًا فَلَمْ يَجِدُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَاهُنَا مَاءٌ»، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَضَعَ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ الَّذِي فِيهِ الْمَاءُ، ثُمَّ قَالَ: «تَوَضَّئُوا بِسْمِ اللَّهِ»، فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَفُورُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، وَالْقَوْمُ يَتَوَضَّئُونَ حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ آخِرِهِمْ قَالَ ثَابِتٌ: فَقُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ: كَمْ تُرَاهُمْ كَانُوا؟ قَالَ: نَحْوًا مِنْ سَبْعِينَ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) هذا الحديث معلولٌ.

## باسی ناوهێنانی خوا (بسم الله) لە کاتی دەستنوێژگرتن

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گەڕان بەدوای ئاودا دەستیان نەکەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاو لێرەیە، پێغەمبەرم ﷺ بینی دەستی خستە نێو ئەو قاپەی کە ئاوی تێ کردبوو، پاشان فەرمووی: دەستنوێژ بگرن و ناوی خوا بێنن، بینیم ئاو لە نێوان پەنجەکانی هەڵدەقوڵی، خەڵکەکەش دەستنوێژیان دەگرت هەتا کۆتا کەسیان دەستنوێژی گرت. سابت وتی: بە ئەنەسم ﷺ وت: پێت وایە ئەوان چەند کەس دەبوون؟ فەرمووی: نزیك لە حەفتا کەس دەبوون.

## بَابُ الْأَمْرِ بِغَسْلِ الْيَدَيْنِ ثَلَاثًا عِنْدَ الِاسْتِيقَاظِ مِنَ النَّوْمِ قَبْلَ إِدْخَالِهِمَا الْإِنَاءَ

**١٤٥** - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَلَا يَغْمِسَنَّ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثًا؛ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ»[1].

## باسی فەرمانکردن بە شۆردنی هەردوو دەست سێ جار لە کاتی هەستان لە خەو پێش ئەوەی دەستی بخاتە نێو قاپەکە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە نێو قاپی ئاوەکەی هەتا سێ جار دەستی دەشۆرێ، چونکە ئەو نازانێ دەستی بەر چی کەوتووە.

## بَابُ كَرَاهَةِ مُعَارَضَةِ خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ بِالْقِيَاسِ وَالرَّأْيِ ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ يَجِبُ قَبُولُهُ إِذَا عَلِمَ الْمَرْءُ بِهِ، وَإِنْ لَمْ يُدْرِكْ ذَلِكَ عَقْلُهُ وَرَأْيُهُ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب.

---

(١) صحيح.

١٤٦- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ؛ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ أَوْ أَيْنَ طَافَتْ يَدُهُ» فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ حَوْضًا؟ قَالَ: فَحَصَبَهُ ابْنُ عُمَرَ ﷺ وَقَالَ: «أُخْبِرُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَتَقُولُ أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ حَوْضًا». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: ابْنُ لَهِيعَةَ لَيْسَ مِمَّنْ أُخَرِّجُ حَدِيثَهُ فِي هَذَا الْكِتَابِ إِذَا تَفَرَّدَ بِرِوَايَةٍ، وَإِنَّمَا أَخْرَجْتُ هَذَا الْخَبَرَ، لِأَنَّ جَابِرَ بْنَ إِسْمَاعِيلَ مَعَهُ فِي الْإِسْنَادِ»[١].

## باسی کەڕاهەتی بەرپەرچدانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بکرێ بە قیاس و ڕاوبۆچوون، بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە پێویستە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەربگیرێ، ئەگەر موسوڵمان زانی ئەوە فەرموودەیە، ئەگەر چی بە ئەقڵ و بۆچوونیشی دەرکی پێ نەکرد، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: وە بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار نییە کاتێ خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا (بۆیان نییە) کە سەرپشك بن لە کارەکانیدا

واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵا دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە نێو قاپی ئاو هەتا سێ جار دەستی دەشوات، چونکە ئەو نازانێ دەستی بەرچی کەوتووە یان لەکوێ بووە، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەگەر حەوزێ ئاو بوو؟ وتی: بەردی تێوەشاند و وتی: من فەرموودەی پێغەمبەری خوات ﷺ بۆ باس دەکەم تۆش دەڵێی ئەی ئەگەر حەوز بوو. ئەبو بەکر وتی: من فەرموودەی ئیبنو لەهیعە لەم کتێبەمدا باس ناکەم، ئەگەر بەتەنها فەرموودەکەی هێنابوو، جا لەبەر ئەوە ئەم فەرموودەم باس کردووە چونکە جابری کوڕی ئیسماعیلی لەگەڵدایە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە).

## بَابُ صِفَةِ غَسْلِ الْيَدَيْنِ قَبْلَ إِدْخَالِهِمَا الْإِنَاءَ، وَصِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ

١٤٧- عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ قَالَ: دَخَلَ عَلِيٌّ ﷺ الرَّحْبَةَ بَعْدَمَا صَلَّى الْفَجْرَ، ثُمَّ قَالَ لِغُلَامٍ لَهُ: ائْتُونِي بِطَهُورٍ فَجَاءَهُ الْغُلَامُ بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ وَطَسْتٍ قَالَ عَبْدُ خَيْرٍ وَنَحْنُ جُلُوسٌ نَنْظُرُ إِلَيْهِ فَأَخَذَ بِيَمِينِهِ

---

(١) إسناده حسن.

الْإِنَاءَ فَأَكْفَأَ عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ غَسَلَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ الْإِنَاءَ بِيَدِهِ الْيُمْنَى فَأَفْرَغَ عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى فَعَلَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَ عَبْدُ خَيْرٍ: كُلُّ ذَلِكَ لَا يُدْخِلُ يَدَهُ الْإِنَاءَ حَتَّى يَغْسِلَهَا مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى الْإِنَاءَ فَمَلَأَ فَمَهُ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَنَثَرَ بِيَدِهِ الْيُسْرَى ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى ثَلَاثَ مَرَّاتٍ إِلَى الْمِرْفَقِ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى ثَلَاثَ مَرَّاتٍ إِلَى الْمِرْفَقِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فِي الْإِنَاءِ حَتَّى غَمَرَهَا الْمَاءُ، ثُمَّ رَفَعَهَا بِمَا حَمَلَتْ مِنَ الْمَاءِ، ثُمَّ مَسَحَهَا بِيَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا أَوْ جَمِيعًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فِي الْإِنَاءِ. ثُمَّ صَبَّ عَلَى رِجْلِهِ الْيُمْنَى فَغَسَلَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ بِيَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ صَبَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى عَلَى قَدَمِهِ الْيُسْرَى فَغَسَلَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ بِيَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فَمَلَأَ مِنَ الْمَاءِ ثُمَّ شَرِبَ مِنْهُ. ثُمَّ قَالَ: هَذَا طُهُورُ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى طُهُورِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ فَهَذَا طُهُورُهُ»[1].

## باسی چۆنێتی شۆردنی هەردوو دەست پێش ئەوەی بخرێنە نێو قاپوقاچاخ، وە چۆنێتی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عەبدو خەیر دەڵێ: عەلی ﷺ دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد چووە نێو بەر هەیوانەکە دانیشت، پاشان بە خزمەتکارەکەی وت: ئاوی دەستنوێژم بۆ بهێنە. خزمەتکارەکەیش قاپێکی هێنا بۆی ئاوی تێدا بوو، هەروەها تەشتێکیش، عەبدو خەیر وتی: ئێمە دانیشتبووین تەماشامان دەکرد، وتی: بە دەستی ڕاستی قاپەکەی گرت و ئاوی کرد بە سەر دەستی چەپیدا، پاشان هەردوو لەپی دەستی شۆرد، پاشان بە دەستی ڕاستی قاپەکەی هەڵگرت و سێ جار ئاوی کرد بەسەر دەستی چەپیدا، عەبدو خەیر وتی: لە هەموو ئەوانەدا دەستی نەدەکردە نێو قاپەکەوە هەتا چەند جارێك شۆردی، پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو ئاوەکە، ئاوی وەردایە دەم و لووتی و بە دەستی چەپی مشی کرد، سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد، پاشان سێ جار دەستی ڕاستی شۆرد هەتا ئانیشکی، پاشان سێ جار دەستی چەپی شۆرد هەتا ئانیشکی، پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو ئاوەکە هەتا دەستی نوقمی کرد، پاشان بەرزی کردەوە بەو ئاوەی هەڵیگرتبوو، پاشان بە دەستی چەپی سڕی، پاشان بە هەردوو دەستی مەسحی سەری کرد، پاشان دەستی ڕاستی

---

(١) صحيح.

خستە نێو قاپەکە، دواتر بەدەستی چەپی سێ جار ئاوی کرد بەسەر قاچی ڕاستیدا و شۆردی، ئینجا بە دەستی ڕاستی سێ جار ئاوی کرد بەسەر قاچی چەپیدا و شۆردنی، پاشان دەستی خستە نێو قاپەکە و مشتێ ئاوی دەرهێنا و لێی خواردەوە، پاشان وتی: ئەمە شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەری خوایە ﷺ، هەر کەسێك حەز دەکات تەماشای شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات ئەمە دەستنوێژگرتنەکەیەتی.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ، وَالْوُضُوءُ مَرَّةً مَرَّةً

١٤٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ فَغَرَفَ غَرْفَةً فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَرَفَ غَرْفَةً فَغَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ غَرَفَ غَرْفَةً فَغَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى، وَغَرَفَ غَرْفَةً فَغَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى، وَغَرَفَ غَرْفَةً فَمَسَحَ رَأْسَهُ وَبَاطِنَ أُذُنَيْهِ وَظَاهِرَهُمَا وَأَدْخَلَ أُصْبُعَيْهِ فِيهِمَا، وَغَرَفَ غَرْفَةً فَغَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَغَرَفَةً فَغَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى[1].

## باسی ڕێگەدان بە ئاو وەردانە دەم و لووت بە یەك مشت، هەروەها دەستنوێژگرتن بە یەکجار یەکجار

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی دەستنوێژی گرت لەپی پڕ کرد لە ئاو و وەریدایە دەم و لووتی، پاشان لەپی پڕ کرد لە ئاو و ڕوخساری پێ شۆرد، پاشان لەپی پڕ کرد لە ئاو و دەستی ڕاستی پێ شۆرد، پاشان لەپی پڕ کرد لە ئاو و دەستی چەپی پێ شۆرد، دواتر لەپی پڕ کرد لە ئاو و مەسحی سەری کرد، هەروەها نێوەوە و دەرەوەی گوێی بە هەردوو پەنجەی مەسح کرد، ئینجا لەپی پڕ کرد لە ئاو و قاچی ڕاستی پێ شۆرد، پاشان لەپی پڕ کرد لە ئاو و قاچی چەپی پێ شۆرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاسْتِنْشَاقِ عِنْدَ الِاسْتِيقَاظِ مِنَ النَّوْمِ، وَذِكْرُ الْعِلَّةِ الَّتِي مِنْ أَجْلِهَا أَمَرَ بِهِ

١٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَتَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيَاشِيمِهِ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی فەرمانکردن بە ئاووەردانە لووت لە کاتی هەستان لە خەو، وە باسی ئەو هۆکارەی کە لەپێناویدا فەرمانی پێ کردووە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە خەو هەستا و دەستنوێژی گرت با سێ جار ئاو وەربداتە لووتی و مش بکات، چونکە شەیتان لەنێو هەردوو کونەلووتیدا شەو دەکاتەوە.

### بَابُ الْأَمْرِ بِالْمُبَالَغَةِ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِذَا كَانَ الْمُتَوَضِّئُ مُفْطِرًا غَيْرَ صَائِمٍ

١٥٠- عَنْ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْوُضُوءِ قَالَ: «أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَخَلِّلِ الْأَصَابِعَ، وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا»[١].

### باسی فەرمانکردن بە جەختکردنەوە لە زۆر ئاووەردانە لووت، ئەگەر دەستنوێژگر بەڕۆژوو نەبوو

واتە: لەقیتی کوڕی صەبیرە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی دەستنوێژ، فەرمووی: بەچاکی دەستنوێژ بگرە، وە نێوانی پەنجەکانت پاك بکەرەوە، وە زۆر ئاو وەربدە لە لووتت، مەگەر بەڕۆژوو بیت.

### بَابُ تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ فِي الْوُضُوءِ عِنْدَ غَسْلِ الْوَجْهِ

١٥١ - عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَنَّهُ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَاسْتَنْشَقَ ثَلَاثًا، وَمَضْمَضَ ثَلَاثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا، وَرِجْلَيْهِ ثَلَاثًا، وَخَلَّلَ لِحْيَتِهِ وَأَصَابِعَ الرِّجْلَيْنِ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) هذا الحديث صححه ابن خزيمة كما هنا، والترمذي وابن حبان والحاكم، فقد قال الإمام أحمد: ليس في تخليل اللحية شيء صحيح، وأيضا ضعفه ابن معين، وقال أبو حاتم الرازي: لا يثبت عن النبي ﷺ في تخليل اللحية شيء.

## ـاسی دەستهێنان بە نێو ڕیش لە دەستنوێژگرتن لە کاتی شۆردنی ڕوخسار

ـِ تە: شەقیقی کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە لە عوسمانی کوڕی عەفانەوە  ئەو ـەستنوێژی گرت سێ جار ڕوخساری شۆرد و سێ جار ئاوی وەردایە لووتی و دەمی ـِ مەسحی سەر و هەردوو گوێی کرد دەرەوە و نێوەوەیان، سێ جاریش قاچەکانی، ـِ دەستی هێنا بە نێو ڕیشی و پەنجەی پێیەکانی، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەو ـێوەیە دەستنوێژی گرت.

١٥٢ - عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ، تَوَضَّأَ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثًا، وَمَضْمَضَ ـِ سْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَمَسَحَ بِأُذُنَيْهِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، ـِخَلَّلَ أَصَابِعَهُ، وَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ حِينَ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَقَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ كَمَا ـِـتُمُونِي فَعَلْتُ» قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: وَذَكَرَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَلَا أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَهُ[1].

ـِ تە: عامری کوڕی شەقیقی دەگێڕێتەوە، لە شەقیقی کوڕی سەلەمەوە دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەفانم  بینی دەستنوێژی گرت سێ جار لەپی دەستی شۆرد و ـاوی وەردایە دەم و لووتی و سێ جار ڕوخساری شۆرد و مەسحی هەردوو گوێی کرد دەرەوە و نێوەوەیان و سێ جار سێ جار قاچەکانی شۆرد و سێ جار دەستی خستە نێو ڕیشی لە کاتی شۆردنی ڕوخساری و وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەو شێوەیە دەستنوێژی گرت وەکوو چۆن بینیتان من دەستنوێژم گرت. عەبدوڕەحمان (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: وە باسی هەردوو دەستی کرد هەتا ئەنیشکەکانی، نازانم چۆن باسی کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ صَكِّ الْوَجْهِ بِالْمَاءِ عِنْدَ غَسْلِ الْوَجْهِ

١٥٣ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ  قَالَ: دَخَلَ عَلِيٌّ  عَلَيَّ بَيْتِي وَقَدْ بَالَ فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَجِئْنَاهُ بِقَعْبٍ يَأْخُذُ الْمُدَّ أَوْ قَرِيبَهُ حَتَّى وُضِعَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: «يَا ابْنَ عَبَّاسٍ  أَلَا أَتَوَضَّأُ لَكَ وُضُوءَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ؟» فَقُلْتُ: بَلَى فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي قَالَ: فَوَضَعَ لَهُ إِنَاءً فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَمِينِهِ - يَعْنِي الْمَاءَ - فَصَكَّ بِهَا وَجْهَهُ» وَذَكَرَ الْحَدِيثَ[2].

---

(١) انظر حديث (١٥١).

(٢) إسناده حسن.

## باسی چاكتر وایە بەجوانی ئاو بدات لە ڕوخساری لە كاتی شۆردنی ڕوخسار

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: عەلی ﷺ هات بۆماڵەكەم میزی كرد و داوای ئاوی دەستنوێژی كرد، ئێمەش قاپێكمان بۆ هێنا لە دار دروست كرابوو، مشتێ ئاو یان نزیك لە مشتێك ئاوی تێدا بوو، لە بەردەستیدا دانا، وتی: ئەی ئیبنو عەباس ﷺ ئایا دەستنوێژێكت بۆ بگرم وەكوو دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتم: بەڵێ، باوك و دایكم بە قوربانت بن، وتی: قاپێكی بۆ دانرا دەستەكانی شۆرد پاشان ئاوی وەردایە دەم و لووتی و مشی كرد، پاشان بە دەستی ڕاستی ئاوەكەی گرت دای لە ڕوخساری تا هاتە خوارەوە. وە باسی فەرموودەكەی كرد. (ئیبنو خوزەیمە بۆیە تا ئێرەی باس كرد بۆ ئەوەی بیكاتە بەڵگە بۆ سەرباسەكەی).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَجْدِيدِ حَمْلِ الْمَاءِ لِمَسْحِ الرَّأْسِ غَيْرِ فَضْلِ بَلَلِ الْيَدَيْنِ

١٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ الْمَازِنِيِّ ﷺ يَذْكُرُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ فَمَضْمَضَ. ثُمَّ اسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا وَيَدَهُ الْيُمْنَى ثَلَاثًا، وَالْأُخْرَى ثَلَاثًا، وَمَسَحَ رَأْسَهُ بِمَاءٍ غَيْرِ فَضْلِ يَدِهِ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ حَتَّى أَنْقَاهُمَا[١].

## باسی چاكتر وایە ئاوی تازە بەكار بهێنرێ بۆ مەسحی سەر، زیادەی تەڕایی هەردوو دەست بەكارنەهێنرێ

واتە: عەبدوڵای كوڕی زەیدی كوڕی عاصمی مازنی ﷺ باس دەكات ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی دەستنوێژی گرت ئاوی وەردایە دەمی پاشان مشی كرد پاشان سێ جار ڕوخساری شۆرد و سێ جار دەستی ڕاستی شۆرد، ئەوی دیكەشیان سێ جار، هەروەها مەسحی سەری كرد بە ئاوێك زیادەی دەستی نەبوو، وە قاچەكانی شۆرد هەتا پاكی كردنەوە.

---

(١) صحيح.

## ـابُ اسْتِحْبَابِ مَسْحِ الرَّأْسِ بِالْيَدَيْنِ جَمِيعًا لِيَكُونَ أَوْعَبَ لِمَسْحِ جَمِيعِ الرَّأْسِ، وَصِفَةِ الْمَسْحِ، وَالْبَدْءِ بِمُقَدَّمِ الرَّأْسِ قَبْلَ الْمُؤَخَّرِ فِي الْمَسْحِ

ـ١٥ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، وَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ ـمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ[1].

## ـسی چاکتر وایە مەسحی سەر بە هەردوو دەست بکرێ، بۆ ئەوەی مەسحی هەموو سەری لەخۆ بگرێ، وە سیفەتی مەسحکردن سەرەتا لە پێشی سەرەوە دەست پێ دەکات پێش دواوە

ـوتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەردوو دەستی مەسحی سەری کرد، لە پێشەوە بۆ دواوە، لە سەرەتای سەریەوە دەستی پێ کرد، ـپاشان هەردوو دەستی برد بۆ لای پشتەملی، پاشان گەڕاندیەوە تا ئەو شوێنەی دەستی پێ کردبوو.

١٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ، ـثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَبَدَأَ بِالْمُقَدَّمِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ[2].

ـوتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت سێ جار ڕوخساری شۆرد و دوو جار دەستەکانی شۆرد، پاشان مەسحی سەری کرد سەرەتا بە پێشەسەری دەستی پێ کرد، پاشان هەردوو قاچی شۆرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَسْحَ عَلَى الرَّأْسِ إِنَّمَا يَكُونُ بِمَا يَبْقَى مِنْ بَلَلِ الْمَاءِ عَلَى الْيَدَيْنِ، لَا بِنَفْسِ الْمَاءِ كَمَا يَكُونُ الْغَسْلُ بِالْمَاءِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عَبْدِ خَيْرٍ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: «ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فِي الْإِنَاءِ حَتَّى غَمَرَهَا الْمَاءُ، ثُمَّ رَفَعَهَا بِمَا حَمَلَتْ مِنَ الْمَاءِ، ثُمَّ مَسَحَهَا بِيَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا أَوْ جَمِيعًا»

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مەسحی سەر لە کاتی دەستنوێژگرتن بەو ئاوە دەبێت کە دەستی پێ تەڕ دەکات نەک خودی ئاوەکە بکات بەسەریدا (واتە: دەست ناکاتە نێو ئاوەکە و بیکات بە سەریدا وەکوو چۆن دەست و ڕوخساری دەشوات بەڵکوو تەنها دەستی دەکاتە نێو ئاوەکە و تەڕی دەکات پاشان مەسحی سەری پێ دەکات). ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی عەبدو خەیر لە عەلییەوە ﷺ: (ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى فِي الْإِنَاءِ حَتَّى غَمَرَهَا الْمَاءُ، ثُمَّ رَفَعَهَا بِمَا حَمَلَتْ مِنَ الْمَاءِ، ثُمَّ مَسَحَهَا بِيَدِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ كِلْتَيْهِمَا أَوْ جَمِيعًا) پاشان دەستی ڕاستی خستە نێو ئاوەکە هەتا دەستی داپۆشی، پاشان بەرزی کردەوە بەو ئاوەی هەڵیگرتبوو، دواتر بە دەستی مەسحی کرد، ئینجا بە هەردوو دەستی مەسحی سەری کرد

## بَابُ مَسْحِ جَمِيعِ الرَّأْسِ فِي الْوُضُوءِ

**١٥٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ الْمَازِنِيِّ ﷺ قَالَ: مَسَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ فِي وَضُوئِهِ مِنْ نَاصِيَتِهِ إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّ يَدَيْهِ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَمَسَحَ رَأْسَهُ كُلَّهُ[١].

## باسی مەسحکردنی تەواوی سەر لە دەستنوێژگرتندا

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەیدی مازنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی سەری کرد لە دەستنوێژیدا لە پێشەسەریەوە تا پشتەملی، پاشان دەستی گەڕاندەوە بۆ پێشەسەری و مەسحی هەموو سەری کرد.

---

(١) صحيح.

**ـبَ مَسْحِ بَاطِنِ الْأُذُنَيْنِ وَظَاهِرِهِمَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ: «قَدْ أَمْلَيْتُ حَدِيثَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، وَخَبَرَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فِي مَسْحِ الْأُذُنَيْنِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا»**

**ـسی مەسحکردنی ناوەوەی گوێ و دەرەوەی. ئەبو بەکر دەڵێ: (پێشتر ـسی فەرموودەی عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ و فەرموودەی ئیبنو عەبباسم ﷺ کرد دەربارەی مەسحی هەردوو گوێ دەرەوە و ناوەوەیان**

**ـبُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَعْبَيْنِ اللَّذَيْنِ أُمِرَ الْمُتَوَضِّئُ بِغَسْلِ الرِّجْلَيْنِ إِلَيْهِمَا ـعَظْمَانِ النَّاتِئَانِ فِي جَانِبَيِ الْقَدَمِ «لَا الْعَظْمُ الصَّغِيرُ النَّاتِئُ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ، عَلَى مَا يَتَوَهَّمُهُ مَنْ يَتَحَذْلَقُ مِمَّنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ، وَلَا لُغَةَ الْعَرَبِ»**

١٥٨- عَنْ حُمْرَانَ قال: أَنَّ عُثْمَانَ ﷺ دَعَا يَوْمًا وَضُوءًا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ فِي صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ، ـقَالَ: «ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَالْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: فِي ـذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْكَعْبَيْنِ هُمَا الْعَظْمَانِ النَّاتِئَانِ فِي جَانِبَيِ الْقَدَمِ إِذْ لَوْ كَانَ الْعَظْمُ النَّاتِئُ ـلَى ظَهَرِ الْقَدَمِ لَكَانَ لِلرِّجْلِ الْيُمْنَى كَعْبٌ وَاحِدٌ لَا كَعْبَانِ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەودوو قولەپێیەی کە فەرمان کراوە بە دەستنوێژگر هەردوو قاچی تا ئەو شوێنە بشوات، بریتین لەو دوو ئێسکەی کە هەڵتۆقیون کە لە تەنیشتەکانی پێ نەك ئەو ئێسکە بچووکەی لەسەر پێیە، وەك چۆن ئەو کەسەی هەڵخلسیکاوە نە لە زانست تێ دەگات و نە لە زمانی عەرەب بەهەڵەدا چووە وا تێگەیشتووە مەبەستی ئەو ئێسکە بچووکەی لەسەر پێیە**

واتە: حومران دەڵێ: عوسمان ﷺ ڕۆژێك داوای ئاوی دەستنوێژی کرد، فەرموودەکەی باس کرد لە چۆنییەتی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ وتی: پاشان سێ جار قاچی ڕاستی شۆرد تا قولەپێیەکانی و بەهەمان شێوە قاچی چەپیشی.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەدا بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی قولەپێیەکان بریتین لەو دوو ئێسکەی کە لە تەنیشتەکانی پێیە، وە ئەگەر ئەو ئێسکە بچووکە بووایە کە لەسەر پێیە ئەوە قاچی ڕاست یەك قولەپێی دەبوو نەك دووان.

---

(١) إسناده صحيح.

١٥٩- عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ فِي سُوقِ ذِي الْمَجَازِ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، قُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ تُفْلِحُوا، وَرَجُلٌ يَتْبَعُهُ يَرْمِيهِ بِالْحِجَارَةِ قَدْ أَدْمَى كَعْبَيْهِ وَعُرْقُوبَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ لَا تُطِيعُوهُ فَإِنَّهُ كَذَّابٌ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: غُلَامُ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا الَّذِي يَتْبَعُهُ يَرْمِيهِ بِالْحِجَارَةِ؟ قَالُوا: هَذَا عَبْدُ الْعُزَّى أَبُو لَهَبٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ أَيْضًا عَلَى أَنَّ الْكَعْبَ هُوَ الْعَظْمُ النَّاتِئُ فِي جَانِبَيِ الْقَدَمِ إِذِ الرَّمْيَةُ إِذَا جَاءَتْ مِنْ وَرَاءِ الْمَاشِي لَا تَكَادُ تُصِيبُ الْقَدَمَ إِذِ السَّاقُ مَانِعٌ أَنْ تُصِيبَ الرَّمْيَةُ ظَهْرَ الْقَدَمِ[1].

واتە: تاریقی موحاریبی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە بازاڕی (ذِي الْمَجَازِ) تێ پەڕی جلێکی سوری لەبەردا بوو، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە بڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) سەرفراز دەبن، پیاوێکیش دوای کەوتبوو بەردی تێ دەهاوێشت، شادەماری سەر پاژنەی پێی و پاژنەی خوێنی لێ دەچۆڕا، کابرا دەیوت: ئەی خەڵکینە بە گوێی مەکەن چونکە ئەوە درۆزنە، وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە منداڵی نەوەکانی عەبدولموتەلیبە، وتم: ئەی ئەو کەسە کێیە شوێنی کەوتووە و بەردی تێ دەگرێ؟ وتیان: ئەوە عەبدولعوزایە ئەبو لەهەب.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تێدایە (الكعب) بریتییە لەو ئێسکەی کە دەرپەڕیوە لە تەنیشتەکانی پێ، چونکە هاویشتن ئەگەر لە دواوەوەی ئەو کەسەوە هاتبێت کە ڕێ دەکات ئەوە زەحمەتە بەر پێ بکەوێت، چونکە قاچ ڕێگرە لەوەی هاویشتن بدات لە سەرپێ.

١٦٠- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ يَقُولُ: أَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: «أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ ثَلَاثًا، وَاللَّهِ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ» قَالَ: «فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَكُونُ كَعْبُهُ بِكَعْبِ صَاحِبِهِ، وَرُكْبَتُهُ بِرُكْبَةِ صَاحِبِهِ، وَمَنْكِبُهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ» هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ وَكِيعٍ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَبُو الْقَاسِمِ الْجَدَلِيُّ هَذَا هُوَ حُسَيْنُ بْنُ الْحَارِثِ مِنْ جَدِيلَةَ قَيْسٍ، رَوَى عَنْهُ زَكَرِيَّا بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، وَأَبُو مَالِكٍ الْأَشْجَعِيُّ، وَحَجَّاجُ بْنُ أَرْطَاةَ، وَعَطَاءُ بْنُ السَّائِبِ عِدَادُهُ فِي الْكُوفِيِّينَ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ـ‌فِي هَذَا الْخَبَرِ مَا نَفَى الشَّكَّ وَالِارْتِيَابَ أَنَّ الْكَعْبَ هُوَ الْعَظْمُ النَّاتِئُ الَّذِي فِي جَانِبِ الْقَدَمِ الَّذِي ـمَكَّنَ الْقَائِمُ فِي الصَّلَاةِ أَنْ يَلْزَقَهُ بِكَعْبِ مَنْ هُوَ قَائِمٌ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلَاةِ، وَالْعِلْمُ مُحِيطٌ عِنْدَ مَنْ ـكَبَ فِيهِ الْعَقْلُ أَنَّ الْمُصَلِّينَ إِذَا قَامُوا فِي الصَّفِّ لَمْ يُمْكِنْ أَحَدٌ مِنْهُمُ إِلْصَاقَ ظَهْرِ قَدَمِهِ بِظَهْرِ ـدَمِ غَيْرِهِ، وَهَذَا غَيْرُ مُمْكِنٍ وَمَا كَوْنُهُ غَيْرَ مُمْكِنٍ لَمْ يَتَوَهَّمْ عَاقِلٌ كَوْنَهُ.

ـواتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕوخساری ڕووی تێ ـکردین سێ جار فەرمووی: ڕیزەکانتان ڕێك بخەن، سوێند بە خوا ڕیزەکانتان ڕێك ـدەخەن، یان خوا جیاوازی بخاتە نێوان دڵەکانتان (واتە: ناکۆکی و ئاژاوە و ڕق و ـکینە بخاتە نێوانتان). وتی: پیاوم دەبینی قولەپێی دەدا لە قولەپێی هاوەڵەکەی، چۆکی ـدەدا لە چۆکی هاوڵەکەی، شانیشی دەدا لە شانی هاوەڵەکەی.

ـبو بەکر وتی: ئەم فەرموودەیە هەموو گومان و دوودڵییەکی ڕەت کردەوە کە (الكعب) ـریتییە لەو ئێسکەی کە لە تەنیشتی پێوە دەردەچێت کە نوێژخوێن لە نوێژدا دەتوانێ ـبیکێنێت بە (کعب)ی ئەو کەسەی کە لە تەنیشتیەوە ڕاوەستاوە نوێژ دەکات، هەر ـکەسێك عەقڵی هەبێت دەزانێت نوێژخوێنان کاتێ لە ڕیزەکە هەڵدەستن بۆ نوێژ هیچ ـکەس ناتوانێ بان پێی بلکێنێ بە بان پێی تەنیشتەکەی، ئەمەش ناگونجێت، هەر ـشتێکیش نەگونجێت مرۆڤی ئاقڵ دەزانێ نابێت.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ غَسْلِ الْعَقِبَيْنِ فِي الْوُضُوءِ « وَالدَّلِيلَ عَلَى أَنَّ الْفَرْضَ غَسْلُ الْقَدَمَيْنِ لَا مَسْحُهُمَا، إِذَا كَانَتَا بَادِيَتَيْنِ غَيْرَ مُغَطَّيَتَيْنِ بِالْخُفِّ أَوْ مَا يَقُومُ مَقَامَ الْخُفِّ، لَا عَلَى مَا زَعَمَتِ الرَّوَافِضُ أَنَّ الْفَرْضَ مَسْحُ الْقَدَمَيْنِ لَا غَسْلُهُمَا، إِذْ لَوْ كَانَ الْمَاسِحُ عَلَى الْقَدَمَيْنِ مُؤَدِّيًا لِلْفَرْضِ، لَمَا جَازَ أَنْ يُقَالَ لِتَارِكِ فَضِيلَةٍ: وَيْلٌ لَهُ، وَقَالَ ﷺ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ»، إِذَا تَرَكَ الْمُتَوَضِّئُ غَسْلَ عَقِبَيْهِ «

١٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: رَجَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِمَاءٍ بِالطَّرِيقِ تَعَجَّلَ قَوْمٌ عِنْدَ الْعَصْرِ فَتَوَضَّئُوا وَهُمْ عِجَالٌ، فَانْتَهَيْنَا إِلَيْهِمْ وَأَعْقَابُهُمْ بِيضٌ تَلُوحُ لَمْ يَمَسَّهَا الْمَاءُ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ»[1].

---

(١) صحيح.

**باسی هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە شۆردنی هەردوو پاژنەپێ لە دەستنوێژگرتن، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی شۆردنی پێیەکان فەرزە، نەک مەسحکردنیان ئەگەر ڕووت بن و خوفیان لەبەردا نەبێت، یان ئەوەی جێگای خوف دەگرێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی ڕافیزەکان پێیان وایە مەسحکردنی پێیەکان فەرزە نەک شۆردنیان، ئەگەر ئەو کەسەی مەسحی پێیەکانی دەکات فەرزێکی ئەنجام دابێت، چۆن دروست بوو بە وازهێنانی لە سوننەتێک هەڕەشەی سزای لێ بکرێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سزا و لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە شۆردنی پاژنەی پێیان، ئەگەر دەستنوێژگر وازی لە شۆردنی پاژنەی بهێنایە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاینەوە لە مەککەوە بۆ مەدینە، لە ڕێگادا کۆمەڵێك لە خەڵکەکە لە کاتی عەسردا پەلەیان کرد و دەستنوێژیان گرت و پەلەیان بوو، گەیشتینە لایان پاژنەی پێیان ئاوی بەرنەکەوتبوو. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سزا و لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە شۆردنی پاژنەیان، دەستنوێژ بەچاکی بگرن.

**١٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سزا و لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە شۆردنی پاژنەیان.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ غَسْلِ بُطُونِ الْأَقْدَامِ فِي الْوُضُوءِ «فِيهِ أَيْضًا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمَاسِحَ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمَيْنِ غَيْرُ مُؤَدٍّ لِلْفَرْضِ، لَا كَمَا زَعَمَتِ الرَّوَافِضُ أَنَّ الْفَرْضَ مَسْحُ ظُهُورِهِمَا لَا غَسْلُ جَمِيعِ الْقَدَمَيْنِ»

**١٦٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ الزُّبَيْدِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ وَبُطُونِ الْأَقْدَامِ مِنَ النَّارِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**ـەسی هەڕەشەکردن لەوازهێنان لەشۆردنی ژێرپێیەکان لەکاتی دەستنوێژگرتن، ھەروەها بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك مەسحی بانپێی ـکات فەرزەکەی بەجێ نەهێناوە، بە پێچەوانەی ڕافیزەکان کە پێیان وایە مەسحکردنی بانپێیەکان فەرزە نەك شۆردنی هەموو پێ**

ـ تە: عەبدوڵای کوڕی حارسی کوڕی جەزئی زوبەیدی ﷺ دەگێڕێتەوە ئەو گوێی لێ ـوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: سزا و لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن ـ شۆردنی پاژنەیان و ژێرپێیان.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَسْحَ عَلَى الْقَدَمَيْنِ غَيْرُ جَائِزٍ، لَا كَمَا زَعَمَتِ الرَّوَافِضُ، وَالْخَوَارِجُ

**١٦٤-** حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَدْ تَوَضَّأَ وَتَرَكَ عَلَى ظَهْرِ قَدَمِهِ ـثْلَ مَوْضِعِ الظُّفْرِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مەسحکردن لەسەر پێیەکان دروست نییە، بە پێچەوانەی بۆچوونی ڕافیزەکان و خەواریجەکان کە پێیان وایە دروستە**

ـ تە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی ـگرتبوو بەئەندازەی نینۆکێك بانپێی نەشۆردبوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بەچاکی دەستنوێژ بگرە.

---

(١) حديث صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ اللَّهَ ﷻ وَعَلَا أَمَرَ بِغَسْلِ الْقَدَمَيْنِ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ المائدة، لَا بِمَسْحِهِمَا، عَلَى مَا زَعَمَتِ الرَّوَافِضُ، وَالْخَوَارِجُ وَالدَّلِيلُ عَلَى صِحَّةِ تَأْوِيلِ الْمُطَّلِبِيِّ رَحِمَهُ اللَّهُ أَنَّ مَعْنَى الْآيَةِ عَلَى التَّقْدِيمِ وَالتَّأْخِيرِ عَلَى مَعْنَى: اغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ فَقَدَّمَ ذِكْرَ الْمَسْحِ عَلَى ذِكْرِ الرِّجْلَيْنِ، كَمَا قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ، وَابْنُ عَبَّاسٍ، وَعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ: وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ قَالُوا: رَجَعَ الْأَمْرُ إِلَى الْغَسْلِ.**

**١٦٥** - «عَنْ شَدَّادِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَبُو عَمَّارٍ، وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو أُمَامَةَ: نا عَمْرُو بْنُ عَنْبَسَةَ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي صِفَةِ إِسْلَامِهِ، وَقَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْوُضُوءِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: ثُمَّ يَغْسِلُ قَدَمَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ كَمَا أَمَرَهُ اللَّهُ إِلَّا خَرَجَتْ خَطَايَا قَدَمَيْهِ مِنْ أَطْرَافِ أَصَابِعِهِ مَعَ الْمَاءِ»[1].

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە شۆردنی هەردوو پێیەکان لە فەرماییشتی: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ نەك بە مەسحکردنیان وەك چۆن ڕافیزە و خەواریجەکان بۆچوونیان وایە، وە بەڵگەش لەسەر ڕاستی لەیەکدانەوەی موتەلیبی ڕەحمەتی خوای لێ بێت (واتە: ئیمام شافیعی)، مانای ئایەتەکە لەسەر پێشخستن و دواخستنە (واتە: پێشخستنی مەسحی سەر بەسەر شۆردنی پێیەکاندا) بە مانای: ﴿وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ المائدة، باسی مەسحی پێش خستووە بەسەر باسی (شۆردنی) قاچەکان هەر وەکوو چۆن ئیبنو مەسعود وتی: هەروەها ئیبنو عەباس و عوڕوەی کوڕی زوبەیریش ﷺ: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ۝٦﴾ وتویانە: فەرمانی خوا بۆ شۆردنەکە دەگەڕێتەوە**

واتە: شەدادی کوڕی عەبدوڵا باوکی عەمار - ئەو هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ بینی بوو- دەڵێ: ئەبو ئومامە وتی: عەمری کوڕی عەنبەسە ﷺ بۆی باس کردین. فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد لە چۆنیەتی موسوڵمانبوونی وتی: وتم: ئەی

---

(١) صحيح.

ـیعەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی دەستنوێژ، فەرموودەکەی بەدرێژی ـــ کرد و وتی: پاشان قاچەکانی دەشۆرێت هەتا قولەپێکانی وەکوو چۆن خوا ـەرمانی پێ کردووە ئیللا ئەو هەڵە و گوناهەی بە قاچەکانی کردوویەتی لە نێوان ـجەکانیەوە لەگەڵ ئاوەکە دەردەچن. (لێرەدا ئیبنو خوزەیمە تەنها ئەو بەشەی ـەرموودەکەی هێناوە کە پەیوەستە بە سەرباسەکەیەوە).

**بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الرِّجْلَيْنِ، وَتَرْكِ غَسْلِهِمَا فِي الْوُضُوءِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْمَاسِحَ لِلْقَدَمَيْنِ التَّارِكَ لِغَسْلِهِمَا مُسْتَوْجِبٌ لِلْعِقَابِ بِالنَّارِ، إِلَّا أَنْ يَعْفُوَ اللَّهُ وَيَصْفَحَ، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عِقَابِهِ»**

١٦٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: تَخَلَّفَ عَنَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ سَافَرْنَاهُ فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ ـحَضَرَتْنَا الصَّلَاةُ صَلَاةُ الْعَصْرِ، وَنَحْنُ نَتَوَضَّأُ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ أَرْجُلَنَا، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ عَفَّانَ بْنِ مُسْلِمٍ[1].

**باسی هەڕەشەکردن لە مەسحکردن لەسەر هەردوو پێ و وازهێنان لە شۆردنیان لە کاتی دەستنوێژ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هەر کەسێك واز لە شۆردنی پێیەکانی بهێنێ لە کاتی دەستنوێژگرتن، شیاوی ئەوەیە بە ئاگر سزا بدرێت، مەگەر خوا لێی خۆش بێت، پەنا دەگرین لە سزای**

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەرێك دوا کەوت ـیان کاتێ گەیشت پێیان نوێژی عەسرمان دواخستبوو کاتی زۆر نەمابوو، لەو کاتەدا ـێمە دەستنوێژمان دەگرت و مەسحی پێیەکانمان دەکرد، بەدەنگی بەرز هاواری ـێ کردین دوو جار یان سێ جار (فەرمووی): سزا و لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کەمتەرخەمی دەکەن لە شۆردنی پشتی پاژنەیان و ژێرپێیان.

---

(١) صحيح.

## بَابُ غَسْلِ أَنَامِلِ الْقَدَمَيْنِ فِي الْوُضُوءِ «وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ الْفَرْضَ غَسْلُهُمَا لَا مَسْحُهُمَا»

**١٦٧**- عَنْ شَقِيقٍ وَهُوَ ابْنُ سَلَمَةَ أَبُو وَائِلٍ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ يَتَوَضَّأُ ثَلَاثًا ثَلَاثًا وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظَاهِرَهُمَا وَبَاطِنَهُمَا، وَغَسَلَ قَدَمَيْهِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، وَغَسَلَ أَنَامِلَهُ، وَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ وَغَسَلَ وَجْهَهُ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ كَالَّذِي رَأَيْتُمُونِي فَعَلْتُ[١].

## باسی شۆردنی سەری پەنجەی قاچەكان لە دەستنوێژگرتندا، وە بەڵگەشی تێدایە شۆردنی فەرزە نەك مەسحكردنی

واتە: شەقیق كە كوڕی سەلەمەیە باوكی وائیل دەڵێ: عوسمانی كوڕی عەفانم ﷺ بینی دەستنویژی دەگرت سێ جار سێ جار و مەسحی سەری كرد و مەسحی گوێیەكانی كرد دەرەوە و نێوەوەیان، سێ جار سێ جار قاچەكانیشی شۆرد و پەنجەكانیشی شۆرد و دەستی خستە نێو ڕیشی و ڕوخساریشی شۆرد، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەوشێوەیەی كرد كە من كردم.

## بَابُ تَخْلِيلِ أَصَابِعِ الْقَدَمَيْنِ فِي الْوُضُوءِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: «قَدْ ذَكَرْنَا خَبَرَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي تَخْلِيلِ أَصَابِعِ الْقَدَمَيْنِ ثَلَاثًا»

**١٦٨** - عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَخْبِرْنِي عَنِ الْوُضُوءِ قَالَ: «أَسْبِغِ الْوُضُوءَ، وَخَلِّلِ الْأَصَابِعَ، وَبَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا»[٢].

---

(١) انظر حديث رقم (١٥١).

(٢) صحيح.

ـسی دەستهێنان بەنێوان پەنجەکانی پێدا لە کاتی دەستنوێژدا، ئەبو بەکر
ڕتی: بێگومان باسی فەرمووودەی عوسمانی کوڕی عەفانمان ﷺ کرد لە
پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی دەستهێنان بەنێوان پەنجەکانی پێدا سێ جار

ـ تە: عاصمی کوڕی لەقیتی کوڕی صەبرە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ دەربارەی دەستنوێژ، فەرمووی: بەچاکی دەستنوێژ بگرە، وە نێوانی پەنجەکانت پاك بکەرەوە و زۆر ئاو وەربدە لە لووتت، مەگەر کاتێك بەڕۆژوو بیت.

## بَابُ صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ ثَلَاثًا ثَلَاثًا

١٦٩- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ فِي صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ ثَلَاثًا ثَلَاثًا[1].

## باسی چۆنییەتی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ سێ جار سێ جار

واتە: ئەبو بەکر وتی: فەرمووودەی عوسمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ هاتووە، دەربارەی چۆنییەتی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ سێ جار سێ جار (ئەندامەکانی جەستەی شۆردووە).

## بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ

١٧٠ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ[2].

## باسی ڕێگەدان بە دەستنوێژگرتن دوو جار دوو جار

واتە: عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت دوو جار دوو جار (ئەندامەکانی جەستەی شۆردووە).

---

[1] صحيح.

[2] صحيح.

**بَابُ إِبَاحَةِ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ غَاسِلَ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً مُؤَدٍّ لِفَرْضِ الْوُضُوءِ، إِذْ غَاسِلُ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً وَاقِعٌ عَلَيْهِ اسْمُ غَاسِلٍ، وَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ بِغَسْلِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ بِلَا ذِكْرِ تَوْقِيتٍ، وَفِي وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ مَرَّةً مَرَّةً، وَمَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَثَلَاثًا ثَلَاثًا وَغَسْلِ بَعْضِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ شَفْعًا، وَبَعْضَهُ وِتْرًا دِلَالَةٌ عَلَى أَنَّ هَذَا كُلَّهُ مُبَاحٌ، وَأَنَّ كُلَّ مَنْ فَعَلَ فِي الْوُضُوءِ مَا فَعَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ فِي بَعْضِ الْأَوْقَاتِ مُؤَدٍّ لِفَرْضِ الْوُضُوءِ؛ لِأَنَّ هَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، لَا مِنَ اخْتِلَافِ الَّذِي بَعْضُهُ مُبَاحٌ وَبَعْضُهُ مَحْظُورٌ»**

**١٧١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً[١].

**باسی ڕێگەدان بە دەستنوێژگرتن یەك جار یەك جار، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی یەك جار ئەندامەکانی دەستنوێژ دەشوات فەرزەکانی دەستنوێژی بەجێ هێناوە، چونکە ئەو کەسەی یەك جار ئەندامەکانی دەستنوێژی دەشوات بۆ دەستنوێژ ناوی شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژی بەسەردا دەسەپێت، خوا فەرمانی کردووە بە شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ بەبێ ژماردن، جا لە دەستنوێژگرتنی پێغەمبەر ﷺ یەك جار یەك جار و دوو جار دوو جار و سێ جار سێ جار، وە شۆردنی هەندێ لە ئەندامەکانی دەستنوێژ بە جووت، هەندێکی دیکەشی بە تاك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم کارە ڕێگەپێدراوە، وە هەر کەسێك لە دەستنوێژدا ئەوە بکات کە پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ کاتەکانیدا کردوویەتی ئەوە فەرزی دەستنوێژی بەجێ هێناوە، چونکە ئەوە لە جیاوازی ڕێگەپێدراوە، نەك لەو جیاوازییەی هەندێکی ڕێگەپێدراوە و هەندێکی قەدەغەیە**

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی یەك جار یەك جار دەستنوێژی گرت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ غَسْلِ بَعْضِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ شَفْعًا، وَبَعْضِهِ وِتْرًا

١٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَيَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ، وَرِجْلَيْهِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَأُرَاهُ قَالَ: وَاسْتَنْثَرَ[1].

## باسی ڕێگەدان بە شۆردنی هەندێك لە ئەندامەكانی دەستنوێژ لە كاتی دەستنوێژ بە جووت، هەندێكیشی بە تاك

واتە: عەبدوڵای كوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت سێ جار ڕوخساری شۆرد، دوو جاریش دەستەكانی شۆرد، دوو جاریش قاچەكانی و مەسحی سەریشی كرد، وا دەزانم وتی: ئاوی لە لووتی وەردا و مشی كرد.

١٦١- عَنْ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ ﷺ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بْنِ يَحْيَى: هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ: نَعَمْ «فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ[2].

واتە: عەمری كوڕی یەحیای مازنی دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە ئەو بە عەبدوڵای كوڕی زەیدی كوڕی عاصمی ﷺ وت: -كە یەكێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و باپیرەی عەمری كوڕی یەحیایە-: ئایا دەتوانی نیشانم بدەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەستنوێژی دەگرت؟ عەبدوڵای كوڕی زەید وتی: بەڵێ، داوای ئاوی دەستنوێژی كرد، دوو جار ئاوی بە هەردوو دەستی ڕاستیدا كرد، پاشان سێ جار ئاوی وەردایە لووتی و مشی كرد، ئینجا سێ جار ڕوخساری شۆرد، پاشان دوو جار دوو جار دەستەكانی شۆرد هەتا ئانیشكەكانی، پاشان بە هەردوو دەستی مەسحی سەری كرد

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لە پێشەوە بۆ دواوە، لە سەرەتای سەریەوە دەستی پێ کرد دواتر هەردوو دەستی برد بۆ لای پشتەملی، پاشان گەڕاندیەوە تا ئەو شوێنەی دەستی پێ کردبوو، پاشان قاچەکانی شۆرد.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي غَسْلِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ أَكْثَرَ مِنْ ثَلَاثٍ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ فَاعِلَهُ مُسِيءٌ ظَالِمٌ أَوْ مُتَعَدٍّ ظَالِمٌ»

**١٧٤** - عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنِ الْوُضُوءِ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، فَقَالَ: «مَنْ زَادَ فَقَدْ أَسَاءَ وَظَلَمَ أَوِ اعْتَدَى وَظَلَمَ»

## باسی هەڕەشەکردن لە شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ زیاتر لە سێ جار، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بکەرەکەی خراپە و ستەمی کردووە یان دەستدرێژکەر و ستەمکارە

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب دەگێڕێتەوە لە باوکی لە باپیریەوە ﷺ، دەشتەکییەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد دەربارەی دەستنوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار سێ جار دەستنوێژی گرت و فەرمووی: هەر کەسێك لەوە زیاتر بکات ئەوە باشی نەکردووە و ستەمی کردووە، یان زیادەڕەوی و ستەمی کردووە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ

**١٧٥**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا خَصَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ دُونَ النَّاسِ إِلَّا ثَلَاثَةَ أَشْيَاءَ: أَمَرَنَا أَنْ نُسْبِغَ الْوُضُوءَ، وَلَا نَأْكُلَ الصَّدَقَةَ، وَلَا نُنْزِيَ الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانكردن بە دەستنوێژگرتن بەچاكترین شێوە

واتە: عەبدوڵای كوڕی عوبەیدوڵای كوڕی عەباس دەڵێ: ئێمە لە لای ئیبنو عەباس ﷺ دانیشتبووین، وتی: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی بە هیچ شتێك تایبەت نەكردووە لە خەڵكی جگە لە سێ شت نەبێت: فەرمانی پێ كردین بەچاكی دەستنوێژ بگرین و زەكات و صەدەقە نەخۆین، گوێدرێژیش نەخەینە سەر ئەسپ بۆ ئەوەی بێچووی لێی هەبێت.

**١٧٦-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَهُوَ ابْنُ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: الصَّفْقَةُ بِالصَّفْقَتَيْنِ رِبًا. وَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ[١].

واتە: عەبدوڕەحمانی كوڕی عەبدوڵا كە ئیبنو مەسعودە دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە ﷺ دەڵێ: مامەڵەیەك لە دوو مامەڵەدا حەڵاڵ نییە، (بۆ نموونە بڵێ: ئەم مەڕە بە هەزار دیناری حازر و بە دوو هەزاری قەرز دەفرۆشم)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردووین بە دەستنوێژگرتن بەچاكی.

## بَابُ ذِكْرِ تَكْفِيرِ الْخَطَايَا، وَالزِّيَادَةِ فِي الْحَسَنَاتِ بِإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ

**١٧٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ فِي الْحَسَنَاتِ»، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ»، ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[٢].

## باسی سڕینەوەی گوناهەكان و پاداشتی زیاتر بەهۆی دەستنوێژگرتن بەچاكی لە كاتی ناڕەحەتی

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی خوا گوناهەكانی پێ دەسڕێتەوە و چاكەكانی پێ زۆر دەكات؟ وتیان:

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستنوێژگرتن بەچاکی لە کاتی ناڕەحەتی (سەرما بێت یان ئازاری جەستە)، چاوەڕوانیکردنی نوێژ لەدوای نوێژ. پاشان بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد. (ئیبنو خوزەیمە بۆیە تا ئێرەی باس کرد بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگە بۆ سەرباسەکەی).

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّيَامُنِ فِي الْوُضُوءِ أَمْرُ اسْتِحْبَابٍ لَا أَمْرُ إِيجَابٍ

١٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِأَيَامِنِكُمْ»

## باسی فەرمانکردن بە دەستپێکردن بە لای ڕاست لە کاتی دەستنوێژگرتن، فەرمانێکە بۆ بەچاکدانان نەك بۆ پێویستبوون (واجب)

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر جلوبەرگتان لەبەر کرد و دەستنوێژتان گرت بە لای ڕاستان دەست پێ بکەن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْبَدْءِ بِالتَّيَامُنِ فِي الْوُضُوءِ أَمْرُ اسْتِحْبَابٍ وَاخْتِيَارٍ، وَلَا أَمْرُ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ

١٧٩ - عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُحِبُّ التَّيَامُنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي طُهُورِهِ وَنَعْلِهِ وَتَرَجُّلِهِ. قَالَ شُعْبَةُ: ثُمَّ سَمِعْتُ الْأَشْعَثَ بِوَاسِطَ يَقُولُ: «يُحِبُّ التَّيَامُنَ ذَكَرَ شَأْنَهُ كُلَّهُ» قَالَ: ثُمَّ سَمِعْتُهُ بِالْكُوفَةِ يَقُولُ: «يُحِبُّ التَّيَامُنَ مَا اسْتَطَاعَ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە دەستپێکردن بە لای ڕاست لە دەستنوێژدا فەرمانێکی بۆ سوننەت و بەچاکدانان و بە ویست و ئارەزووە، فەرمانێك نییە بۆ فەرز و پێویستبوون (واجب)

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ـ ـە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو بەلای ڕاست دەست ـێ بکات ئەوەندەی لە توانایدا بووایە لە دەستنوێژ و لە نەعللەپێکردن و قژداهێنانیدا. ـوعبە وتی: پاشان لە واسیت گوێم لە ئەشعەس بوو دەیوت: لای ڕاستی پێ خۆش ـو نە هەموو کاروبارەکانیدا. وتی: پاشان گوێم لێ بوو لە کوفە دەیوت: حەزی لە ـای ڕاست بوو ئەوەندەی لە توانایدا بووایە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْعِمَامَةِ

١٨٠ - عَنْ بِلَالٍ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ، وَفِي حَدِيثِ أَبِي ـعَاوِيَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ وَالْخِمَارِ[١].

## باسی مۆڵەتدان بە مەسحکردن لەسەر مێزەر لە کاتی دەستنوێژگرتندا

واتە: بیلال ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ (لە کاتی دەستنوێژدا) مەسحی ـەسەر خوفەکانی و مێزەرەکەی دەکرد. وە لە فەرموودەکەی ئەبو موعاویەدا ﵁ هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوفەکانی و مێزەرەکەی کرد.

١٨١- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، وَعَلَى عِمَامَتِهِ[٢].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەیەی زەمری دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد، هەروەها لەسەر مێزەرەکەیشی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ
## بَابُ ذِكْرِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ مِنْ غَيْرِ ذِكْرِ تَوْقِيتٍ لِلْمُسَافِرِ وَلِلْمُقِيمِ بِذِكْرِ أَخْبَارٍ مُجْمَلَةٍ غَيْرِ مُفَسَّرَةٍ

**١٨٢**- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ(١).

## کۆباسی مەسحکردن لەسەر خوفەکان
## باسی مەسحکردن لەسەر خوفەکان بەبێ باسی دیاریکردنی کات بۆ گەشتیار و نیشتەجێ بە باسی کۆمەڵە فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك فەرموودەی (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس ﵁ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەو مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد.

**١٨٣** - عَنْ بِلَالٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ(٢).

واتە: بیلال ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی دەستنوێژدا) مەسحی لەسەر خوفەکانی دەکرد.

**١٨٤**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّهُ رَأَى سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ، وَهُوَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ فَقَالَ: إِنَّكُمْ تَفْعَلُونَ ذَلِكَ، فَاجْتَمَعْنَا عِنْدَ عُمَرَ فَقَالَ سَعْدٌ لِعُمَرَ: أَفْتِ ابْنَ أَخِي فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَ عُمَرُ: كُنَّا وَنَحْنُ مَعَ نَبِيِّنَا ﷺ نَمْسَحُ عَلَى خِفَافِنَا لَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَلَوْ جَاءَ مِنَ الْغَائِطِ؟ قَالَ: نَعَمْ(٣).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، ئەو سەعدی کوڕی مالیکی بینی، مەسحی لەسەر خوفەکانی دەکرد، وتی: ئێوە شتی وا دەکەن، دواتر لەلای عومەر کۆ بووینەوە سەعد بە عومەری وت: فتوا بۆ برازاکەم بدە دەربارەی مەسح لەسەر خوفەکان، عومەر وتی:

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

(٣) صحیح.

ـەمە لەگەڵ پێغەمبەرمان ﷺ مەسحمان دەکرد لەسەر خوفەکانمان هیچ گرفتێکمان ـیـە نەدەبینی، ئیبنو عومەر وتی: ئەگەر لە سەرئاویش بگەڕێتەوە؟ وتی: بەڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ مَسْحِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الْخُفَّيْنِ فِي الْحَضَرِ

١٨٠- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رضي الله عنهما قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَبِلَالٌ رضي الله عنه الْأَسْوَاقَ فَذَهَبَ لِحَاجَتِهِ قَالَ: ثُمَّ خَرَجَا قَالَ أُسَامَةُ: فَسَأَلْتُ بِلَالًا مَا صَنَعَ؟ قَالَ بِلَالٌ: ذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ، وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الْأَسْوَاقُ حَائِطٌ بِالْمَدِينَةِ، قَالَ: سَمِعْتُ يُونُسَ يَقُولُ: لَيْسَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ خَبَرٌ أَنَّهُ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ فِي الْحَضَرِ غَيْرُ هَذَا.

## باسی مەسحکردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر خوفەکان لە کاتی نیشتەجێبووندا

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و بیلال رضي الله عنه چوونە نێو باخەوە ئەو ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن، وتی: پاشان هەردووکیان هاتنە دەرەوە، ئوسامە وتی: پرسیارم لە بیلال کرد چی کرد؟ بیلال وتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ سەرئاوکردن، پاشان دەستنوێژی گرت ڕوخسار و دەستەکانی شۆرد و مەسحی سەری کرد و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد.

ئەبو بەکر وتی: (الْأَسْوَاقُ) باخەکانی مەدینەیە، وتی: گوێم لە یونس بوو دەیوت: فەرموودەیەك نییە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی ئەوەی ئەو مەسحی لەسەر خوفەکان کردبێت لە شوێنی نیشتەجێبوون جگە لەم فەرموودەیە نەبێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ مَسْحِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الْخُفَّيْنِ بَعْدَ نُزُولِ سُورَةِ الْمَائِدَةِ «ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ قَبْلَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ»

**١٨٦** - عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: رَأَيْتُ جَرِيرًا ﷺ بَالَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ قَدْ فَصَلَّى، فَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ مِثْلَ هَذَا، هَذَا حَدِيثُ الصَّنْعَانِيِّ، وَلَمْ يَقُلِ الْآخَرُونَ: رَأَيْتُ جَرِيرًا وَفِي حَدِيثِ أَبِي أُسَامَةَ قَالَ إِبْرَاهِيمُ: وَكَانَ أَصْحَابُنَا يُعْجِبُهُمْ حَدِيثُ جَرِيرٍ، لِأَنَّ إِسْلَامَهُ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ، وَفِي حَدِيثِ وَكِيعٍ كَانَ يُعْجِبُهُمْ حَدِيثُ جَرِيرٍ، إِسْلَامُهُ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ(١).

### باسی مەسحکردنی پێغەمبەر ﷺ تەنها دوای دابەزینی سورەتی مائیدە بوو، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وایە پێغەمبەر ﷺ پێش دابەزینی سوورەتی مائیدە مەسحی لەسەر خوفەکان کردوە

واتە: هەمام دەڵێ: جەریرم ﷺ بینی میزی کرد، پاشان داوای ئاوی کرد، دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد پاشان هەستا نوێژی کرد، لەو بارەوە پرسیاری لێ کرا، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وەکوو ئەوەی کرد. ئەمە فەرموودەی صەنعانییە (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە)، ئەوانی دیکە ئەوەیان نەوتوود: جەریرم بینی، وە لە فەرموودەکەی ئەبو ئوسامە هاتووە ئیبراهیم وتی: هاوەڵانمان فەرموودەکەی جەریریان بەدڵ بوو، چونکە دوای دابەزینی سورەتی مائیدە موسوڵمان بوو، وە لە فەرموودەی وەکیعدا هاتووە فەرموودەکەی جەریریان بەلاوە خۆش بوو. چونکە دوای دابەزینی سوورەتی مائیدە موسوڵمان ببوو.

**١٨٧** - عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، أَنَّ جَرِيرًا ﷺ بَالَ وَتَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ فَعَابُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقِيلَ لَهُ: ذَلِكَ قَبْلَ الْمَائِدَةِ؟ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ إِسْلَامِي بَعْدَ الْمَائِدَةِ(٢).

واتە: ئەبو زورعەی کوڕی عەمری کوڕی جەریر دەگێڕێتەوە، جەریر ﷺ میزی کرد و دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد، خەڵکەکە ڕەخنەیان لێ گرت،

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

ری: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی مەسحی لەسەر خوفەکان کرد. پێی وترا: ئەوە پێش دابەزینی سورەتی مائیدە بوو؟ وتی: بەڕاستی موسوڵمانبوونی من دوای دابەزینی سورەتی مائیدە بوو.

١٨٨- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَسْلَمْتُ قَبْلَ وَفَاةِ النَّبِيِّ ﷺ بِأَرْبَعِينَ يَوْمًا(١).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: چل ڕۆژ پێش مردنی پێغەمبەر ﷺ موسوڵمان بووم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْمُوقَيْنِ

١٨٩- عَنْ بِلَالٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّــهُ مَسَحَ عَلَى الْمُوقَيْنِ وَالْخِمَارِ(٢).

## باسی مۆڵەتدان بە مەسحکردن لەسەر (الْمُوقَيْن): (جۆرە خوفێکە، جا وشەی (الْمُوقَيْن) وشەیەکی فارسییە) (الموق) بریتییە لە (الجرموق). وەکو خوف وایە لە سەرووی خوفەوە لەپێ دەکرێت بەتایبەت لە ناوچە ساردەکان)

واتە: بیلال ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لەسەر (الْمُوقَيْن) و مێزەر مەسحی کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلْأَلْفَاظِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الرُّخْصَةَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلَابِسِهَا عَلَى طَهَارَةٍ، دُونَ لَابِسِهَا مُحْدِثًا غَيْرَ مُتَطَهِّرٍ

١٩٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَتَمْسَحُ عَلَى خُفَّيْكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا وَهُمَا طَاهِرَتَانِ»(٣).

---

(١) إسناده قوي.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**باسی فەرموودەیەكی شیكەرەوە (الْمُفَسِّر) بۆ ئەو دەستەواژە كورت و ناڕوونانەی (الْمُجْمَل) كە لەپێشەوە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر مۆڵەتدان بە مەسحكردن لەسەر خوفەكان بۆ ئەو كەسەیە كە بە دەستنوێژەوە خوفەكە لەپێ دەكات نەك ئەوەی بەبێ دەستنوێژ لەپێی دەكات**

واتە: موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا مەسح لەسەر خوفەكانت دەكەی؟ فەرمووی: من بەدەستنوێژەوە كردوومەتە پێیەكانم (واتە: بەبێ دەستنوێژ لەپێم نەكردوون).

١٩١- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ سَمِعَهُ مِنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَتَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ؟ قَالَ: «إِنِّي أَدْخَلْتُ رِجْلَيَّ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ»[1].

واتە: عوروەی كوڕی موغیرە دەگێڕێتەوە، گوێی لێ بوو لە باوكیەوە ﷺ دەیوت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا مەسح دەكەی لەسەر خوفەكان؟ فەرمووی: من بەدەستنوێژەوە كردوومەتە پێیەكانم.

١٩٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ رَخَّصَ لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمًا وَلَيْلَةً إِذَا تَطَهَّرَ فَلَبِسَ خُفَّيْهِ أَنْ يَمْسَحَ عَلَيْهِمَا[2].

واتە: عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكرە دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بێگومان ئەو مۆڵەتی دا بە گەشتیار سێ ڕۆژ و سێ شەو (مەسح لەسەر خوفەكان بكات لە كاتی دەستنوێژگرتنەوە)، وە بۆ كەسی نیشتەجێش لەماڵەوە ڕۆژ و شەوێك مەسحیان لەسەر بكات، ئەگەر (یەكەم جار) دەستنوێژی گرت و خوفەكانی لەپێ كرد.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

**ـبَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ لَابِسَ أَحَدِ الْخُفَّيْنِ قَبْلَ غَسْلِ كِلَا الرِّجْلَيْنِ، إِذَا لَبِسَ الْخُفَّ الْآخَرَ ـعْدَ غَسْلِ الرِّجْلِ الْأُخْرَى غَيْرُ جَائِزٍ لَهُ الْمَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ إِذَا أَحْدَثَ «إِذْ هُوَ لَابِسٌ ـحَدَ الْخُفَّيْنِ قَبْلَ كَمَالِ الطَّهَارَةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا رَخَّصَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ ـذَا لَبِسَهُمَا عَلَى طَهَارَةٍ، وَمَنْ ذَكَرْنَا فِي هَذَا الْبَابِ صِفَتَهُ هُوَ لَابِسٌ أَحَدَ الْخُفَّيْنِ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ، إِذْ هُوَ غَاسِلٌ إِحْدَى الرِّجْلَيْنِ لَا كِلْتَيْهِمَا عِنْدَ لُبْسِهِ أَحَدَ الْخُفَّيْنِ»**

١٩٣- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ ﷺ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ؟ قُلْتُ: ـنـتُ أَنْبِطُ الْعِلْمَ قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ فِي طَلَبِ ـعـمٍ إِلَّا وَضَعَتْ لَهُ الْمَلَائِكَةُ أَجْنِحَتَهَا رِضَاءً بِمَا يَصْنَعُ» قَالَ: قَدْ جِئْتُكَ أَسْأَلُكَ، عَنِ الْمَسْحِ عَلَى ـخُفَّيْنِ قَالَ: «نَعَمْ كُنَّا فِي الْجَيْشِ الَّذِي بَعَثَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَنَا أَنْ نَمْسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ إِذَا ـحْنُ أَدْخَلْنَاهُمَا عَلَى طُهُورٍ، ثَلَاثًا إِذَا سَافَرْنَا، وَلَيْلَةً إِذَا أَقَمْنَا، وَلَا نَخْلَعَهُمَا مِنْ غَائِطٍ وَلَا بَوْلٍ، وَلَا ـخـلَعُهُمَا إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ»، وَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ بِالْمَغْرِبِ بَابًا مَفْتُوحًا لِلتَّوْبَةِ ـسِيرَتُهُ سَبْعُونَ سَنَةً لَا يُغْلَقُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: ذَكَرْتُ لِلْمُزَنِيِّ خَبَرَ عَبْدِ الرَّزَّاقِ، فَقَالَ: حَدَّثَ بِهَذَا أَصْحَابُنَا؛ فَإِنَّهُ لَيْسَ لِلشَّافِعِيِّ حُجَّةٌ أَقْوَى مِنْ هَذَا.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك یەکێك لە خوفەکان لەپێ بکات پێش ئەوەی هەردوو قاچی بشوات، ئەگەر خوفەکەی دیکەی لەپێ کرد دوای شۆردنی قاچەکەی دیکەی دروست نییە بۆی مەسح لەسەر خوفەکان بکات، ئەگەر دەستنوێژی شکا، چونکە ئەو یەکێك لە دوو خوفەکەی لەپێ کرد پێش ئەوەی دەستنوێژ بەتەواوی بگرێت، پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا مۆڵەتی داوە مەسح لەسەر خوفەکان بکرێ، ئەگەر بەدەستنوێژەوە لەپێیانی کرد، وە ئەوەی لەم بەشەدا باسمان کرد ئەوەیە کە یەك تاکی خوفەکەی لەپێ بکات بەبێ دەستنوێژ، چونکە ئەو تەنها یەك پێی شۆردووە نەك هەردووکیان لە کاتێ لەپێکردنی یەکێك لە خوفەکان**

---

(١) صحيح.

واتە: زیڕی کوڕی حوبەیش دەڵێ: هاتم بۆ لای صەفوانی کوڕی عەسالی موڕادی ﷺ وتی: چی تۆی هێناوە؟ وتم: هاتووم زانست وەربگرم، وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك لە ماڵ دەربچێت بەدوای زانستدا بگەڕێت فریشتەکان باڵەکانیان بۆی ڕادەخەن لەبەر ڕەزامەندیان بۆ ئەو شتەی بەدوایدا دەگەڕێت، وتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم دەربارەی مەسح لەسەر خوفەکان، وتی: بەڵێ، ئێمە لەگەڵ ئەو سوپایەدا بووین کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی فەرمانی پێ کردین مەسح لەسەر خوفەکان بکەین ئەگەر بەدەستنوێژەوە لەپێمان کردن، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەگەر لە گەشتدا بووین، شەوێکیش ئەگەر نیشتەجێ بووین، بۆ سەرئاو و میزکردن داینەکەنین، هەروەها دایاننەکەنین مەگەر بۆ جەنابەت، وە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە خۆرئاوا دەرگایەکی کراوە هەیە بۆ تەوبە و داوای لێخۆشبوون ماوەی حەفتا ساڵ ڕێگا بە ڕۆیشتن فراوانە، داناخرێ (بە ڕووی کەسدا) هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت.

ئەبو بەکر وتی: فەرموودەکەی عەبدوڕەزاقم بۆ موزەنی باس کرد، وتی: هاوەڵانمان ئەم فەرموودەیان باس کرد، شافیعی بەڵگەیەکی نییە لەمە بەهێزتر بێت.

## بَابُ ذِكْرِ تَوْقِيتِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلْمُقِيمِ وَالْمُسَافِرِ

١٩٤- عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتِ: ائْتِ عَلِيًّا فَاسْأَلْهُ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنِّي، فَأَتَى عَلِيًّا فَسَأَلَهُ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُ بِذَاكَ يَمْسَحُ الْمُقِيمُ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَالْمُسَافِرُ ثَلَاثًا[1].

### باسی دیاریکردنی کاتی مەسحکردن لەسەر خوفەکان بۆ نیشتەجێ و گەشتیار

واتە: شوڕەیحی کوڕی هانیئ دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە ﵂ کرد دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان، وتی: بچۆ بۆ لای عەلی چونکە ئەو لەو بوارە لە من شارەزاترە، ئەویش هات بۆ لای عەلی پرسیاری لێ کرد دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان،

---

(١) صحیح.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد بەوە، نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێك مەسح دەکات، گەشتیاریش سێ ڕۆژ و سێ شەو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ أَمْرُ إِبَاحَةٍ «أَنَّ الْمَسْحَ يَقُومُ مَقَامَ غَسْلِ الْقَدَمَيْنِ، إِذَا كَانَ الْقَدَمُ بَادِيًا غَيْرَ مُغَطًّى بِالْخُفِّ، وَإِنَّ خَالِعَ الْخُفِّ وَإِنْ كَانَ لَبِسَهُ عَلَى طَهَارَةٍ، إِذَا غَسَلَ قَدَمَيْهِ كَانَ مُؤَدِّيًا لِلْفَرْضِ غَيْرَ عَاصٍ، إِلَّا أَنَّ يَكُونَ تَارِكًا لِلْمَسْحِ رَغْبَةً عَنْ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ»

١٩٥ - عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: رَخَّصَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لِلْحَاضِرِ، يَعْنِي: فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە مەسحکردن لەسەر خوفەکان فەرمانێکە تەنها بۆ ڕێگەپێدانە (واجب نییە)، بێگومان مەسحکردن جێگرەوەی شۆردنی پێیەکانە، ئەگەر پێ لەنێو خوفدا نەبێت، بێگومان ئەو کەسەی خوفەکەی دادەکەنێ ئەگەر چی بەدەستنوێژەوە لەپێی کردبوو، ئەگەر قاچەکانی شۆرد ئەوە فەرزی بەجێ هێناوە و سەرپێچی نەکردووە مەگەر ئەو کەسە واز لە مەسح بهێنی وەك پشتکردن لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێ داین بە مەسحکردن لەسەر خوفەکان سێ ڕۆژ بۆ گەشتیار و شەو و ڕۆژێك بۆ نیشتەجێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الرُّخْصَةَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ إِنَّمَا هِيَ مِنَ الْحَدَثِ الَّذِي يُوجِبُ الْوُضُوءَ دُونَ الْجَنَابَةِ الَّتِي تُوجِبُ الْغُسْلَ

١٩٦- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ فَقَالَ:«كُنَّا نَكُونُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَنَا أَنْ لَا نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ -يَعْنِي فِي السَّفَرِ- إِلَّا مِنْ جَنَابَةٍ، وَلَكِنْ مِنْ غَائِطٍ، وَبَوْلٍ، وَنَوْمٍ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مۆڵەتدان بە مەسح لەسەر خوفەکان بێگومان بۆ ئەو بێدەستنوێژییەیە کە دەستنوێژ پێویست (واجب) دەکات نەك بۆ لەشگرانی کە خۆشۆردن پێویست (واجب) دەکات

واتە: زیری کوڕی حوبەیش دەڵێ: هاتم بۆ لای صەفوانی کوڕی عەسالی موڕادی ﷺ، پرسیارم لێ کرد لەبارەی مەسحکردن لەسەر خوفەکان، وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین فەرمانی پێ کردین ئەگەر لە گەشتدا بووین خوفەکانمان دانەکەنین بۆ ماوەی سێ ڕۆژ و سێ شەو، نە بۆ سەرئاوکردن نە بۆ میزکردن نە بۆ خەو، بەڵام تەنها بۆ لەشگرانی دایبکەنین.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ رَغْبَةً عَنِ السُّنَّةِ

**١٩٧**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي»[١].

## باسی هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە مەسحکردن لەسەر خوفەکان وەك پشتکردن لە سوننەت

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پشت بکات لە سوننەتم ئەوە لە من نییە (واتە: لەسەر ڕێگای من نییە).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ

**١٩٨**- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَيْسَ فِي خَبَرِ أَبِي عَاصِمٍ: وَالنَّعْلَيْنِ، إِنَّمَا قَالَ: مَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ, وَقَالَ ابْنُ رَافِعٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَالَ فَتَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ.

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حديث معلول.

## باسی مۆڵەتدان بە مەسحکردن لەسەر گۆرەوی و نەعلەکان

ـ تە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت
ـ مەسحی لەسەر گۆرەوی و نەعلەکانی کرد (زۆر گرنگە سیفەتی گۆرەوی ئەو
ـەردەمە بزانرێ و ئەوە بکرێ بە پێوەر نەك هەموو گۆرەوییەك، چونکە گۆرەوی
ـەیە تەنکە هەیە ئەستوورە).

ـبو بەکر وتی: لە فەرموودەکەی ئەبو عاصمدا: دەستەواژەی (وَالنَّعْلَيْنِ) نەهاتووە،
ـەکوو وتی: مەسحی لەسەر گۆرەوییەکانی کرد، ئیبنو ڕافیع دەڵێ: پێغەمبەری خوا
ﷺ میزی کرد ئینجا دەستنوێژی گرت و مەسحی لەسەر گۆرەوی و نەعلەکانی کرد.

### بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَسْحِ عَلَى النَّعْلَيْنِ مُجْمَلَةً، غَلَطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهَا بَعْضُ مَنْ أَجَازَ الْمَسْحَ عَلَى النَّعْلَيْنِ فِي الْوُضُوءِ الْوَاجِبِ مِنَ الْحَدَثِ

**١٩٩** - عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: رَأَيْنَاكَ تَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ نَرَ أَحَدًا يَفْعَلُهُ غَيْرَكَ
قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ تَلْبَسُ هَذِهِ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ قَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُهَا
وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، وَيَمْسَحُ عَلَيْهَا(١).

### باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی مەسح لەسەر نەعلەکان بەناڕوونی (مُجْمَلَ)، هەندێ لەوانە هەڵەیان کردووە کە کردوویانە بە بەڵگە و ڕێگەیان داوە بە مەسح لەسەر نەعلەکان لە دەستنوێژی پێویست (واجب) بۆ بێدەستنوێژ

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی جورەیج دەگێڕێتەوە، بە ئیبنو عومەر رضي الله عنهما وترا: بینیمان شتێکت کرد نەمانبینیوە هیچ یەکێك لە هاوەڵان کردبێتیان جگە لە تۆ، وتی: ئەوە چییە؟ وتیان: بینیمان نەعلی (السِّبْتِيَّةَ)ت لەپێ دەکرد، وتی: بێگومان من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نەعلە (السِّبْتِيَّةَ)یانەی لەپێ دەکرد و دەستنوێژیشی دەگرت پێیەوە و مەسحی لەسەریان دەکرد.

---

(١) صحيح.

## باب ذكر الدليل على أن مسح النبي ﷺ على النعلين كان في وضوء متطوع به لا في وضوء واجب عليه من حدث يوجب الوضوء

٢٠٠- عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه أَنَّهُ دَعَا بِكُوزٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا خَفِيفًا، ثُمَّ مَسَحَ عَلَى نَعْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِلطَّاهِرِ مَا لَمْ يُحْدِثْ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مەسحکردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێڵاوەکان لە دەستنوێژگرتنی سوننەتدا بووە (بۆ نوێکردنەوەی دەستنوێژ)، نەك لە دەستنوێژێك بە هۆی سەرئاوکردنەوە واجب بووبێ لەسەری

واتە: عەلی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، ئەو داوای گۆزەیەك ئاوی کرد، پاشان دەستنوێژی گرت بە دەستنوێژێکی سووك، پاشان مەسحی لەسەر نەعلەکانی کرد، دواتر وتی: دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەیە بوو بۆ ئەو کەسەی دەستنوێژی هەیە و نەشکاوە.

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَسْحِ عَلَى الرِّجْلَيْنِ مُجْمَلَةً، غَلَطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهَا بَعْضُ مَنْ لَمْ يَنْعِمِ الرِّوِيَّةَ فِي الْأَخْبَارِ، وَأَبَاحَ لِلْمُحْدِثِ الْمَسْحَ عَلَى الرِّجْلَيْنِ

٢٠١ - عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ وَيَمْسَحُ الْمَاءَ عَلَى رِجْلَيْهِ[2].

## باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە دەربارەی مەسح لەسەر پێیەکان بەناڕوونی (مُجْمَل)، هەندێ لەوانەی کە نیعمەتی گێڕانەوەیان پێ نەبەخشراوە لە فەرموودەکاندا هەڵەیان کردووە کە کردوویانە بە بەڵگە و ڕێگەی داوە بە بێدەستنوێژ مەسح لەسەر قاچەکانی بکات

واتە: عەبادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خو ﷺ دەستنوێژی دەگرت و بە ئاویش مەسحی لەسەر پێیەکانی دەکرد.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## ـبُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَسْحَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الْقَدَمَيْنِ كَانَ وَهُوَ طَاهِرٌ لَا مُحْدِثٌ

٢٠٢ - عَنْ عَبْدِ الْمَلَكِ بْنِ مَيْسَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي النَّزَّالُ بْنُ سَبْرَةَ قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ عَلِيٍّ ﷺ الظُّهْرَ، ـ خَرَجْنَا إِلَى الرَّحْبَةِ قَالَ: فَدَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَأَخَذَهُ فَمَضْمَضَ - قَالَ مَنْصُورٌ: أُرَاهُ قَالَ: ـ ستَنْشَقَ - وَمَسَحَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ وَرَأْسَهُ وَقَدَمَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ فَضْلَهُ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ نَاسًا ـكرَهُونَ أَنْ يَشْرَبُوا وَهُمْ قِيَامٌ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُ، وَقَالَ: هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ ـحدِثْ، هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ زَائِدَةَ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ مەسحی لەسەر پێیەکانی کردووە دەستنوێژی هەبووە نەك بەبێدەستنوێژی مەسحی کردبێ

ـ تە: عەبدولمەلیکی کوڕی مەیسەرە دەڵێ: نەزالی کوڕی سەبرە بۆی باس کردم وتی: ـەگەڵ عەلی ﷺ نوێژی نیوەڕۆمان کرد، پاشان ڕۆیشتینە بەر هەیوانەکە، داوای قاپێ ـاوی کرد، ئاوەکەی وەرگرت و لە دەمی وەردا -مەنصور وتی: پێم وایە وتی: ئاوی ـە لووتیشی وەردا- وە مەسحی ڕوخسار و هەردوو باڵی و سەری و قاچەکانی کرد، ـاشان بەپێوە زیادەی ئاوی دەستنوێژەکەی خواردەوە، دواتر وتی: خەڵکانێك پێیان ـاش نییە بەپێوە ئاو بخۆنەوە، بێگومان من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کرد وەکوو ئەوەی من کردم، وە وتی: ئەمەیش دەستنوێژی ئەو کەسەیە کە دەستنوێژی نەشکاوە. ئەمە دەستەواژەی فەرموودەکەی زائیدەیە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي اسْتِعَانَةِ الْمُتَوَضِّئِ بِمَنْ يَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ لِيَطْهَرَ «خِلَافَ مَذْهَبِ مَنْ يَتَوَهَّمُ مِنَ الْمُتَصَوِّفَةِ أَنَّ هَذَا مِنَ الْكِبْرِ»

٢٠٣- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ يَقُولُ: سَكَبْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ تَوَضَّأَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ فَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی مۆڵەتدان بەوەی دەستنوێژگر کەسێکی دیکە یارمەتی بدات بەوەی ئاو بکات بە دەستیدا بۆ دەستنوێژەکەی، بە پێچەوانەی مەزهەبی هەندێ لەو سۆفیانەی کە بەهەڵەدا چوون، وا دەزانن ئەوە لە خۆبەزلزانینەوەیە

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت لە جەنگی تەبوك ئاوم کرد بە دەستیدا و مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد.

### بَابُ الرُّخْصَةِ فِي وُضُوءِ الْجَمَاعَةِ مِنَ الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ

**٢٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّكُمْ تَعُدُّونَ الْآيَاتِ عَذَابًا، وَإِنَّا كُنَّا نَعُدُّهَا بَرَكَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَدْ كُنَّا نَأْكُلُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نَسْمَعُ تَسْبِيحَ الطَّعَامِ قَالَ: وَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِإِنَاءٍ فَوَضَعَ يَدَهُ فِيهِ فَجَعَلَ الْمَاءُ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ الْمُبَارَكِ، وَالْبَرَكَةُ مِنَ اللَّهِ» حَتَّى تَوَضَّأْنَا كُلُّنَا»[1].

### باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتنی کۆمەڵێك لە یەك قاپدا

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێوە نیشانە نائاساییەکانتان بە سزا دادەنا، (واتە: ئەوانەی لە دەرەوەی سوننەتی گەردوونن، وەك ئەوەی خەڵکێکی زۆر بە خواردنێکی کەم تێر بخۆن، جا ئەو نیشانە نائاساییانە هەندێکیان بۆ ترساندنە وەکوو خۆرگیران و مانگگیران هەندێکی دیکەشیان بۆ فەڕ و بەرەکەتە وەك پەرداخێك شیر زۆرێك لە هاوەڵان تێریان لێی خوارد وەکوو خۆیشی مایەوە)، بێگومان ئێمە خواردنمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەخوارد گوێمان لە تەسبیحاتی خواردنەکە بوو، وتی: پێغەمبەر ﷺ قاپێك ئاوی بۆ هێنرا دەستی خستە نێو ئاوەکە، ئاوەکە بە نێوان پەنجەکانیدا هەڵدەقوڵی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێن بۆ دەستنوێژگرتنی پیرۆز و بەرەکەت لە لایەن خوای گەورەوە، تا هەمووومان دەستنوێژمان گرت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي وُضُوءِ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ مِنَ الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ

٢٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ، قَالَ: رَأَيْتُ الرِّجَالَ وَالنِّسَاءَ يَتَوَضَّئُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ .

## باسی مۆڵەتدان بە دەستنوێژگرتنی پیاوان و ئافرەتان لەنێو یەك قاپدا

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوان و ئافرەتانم دەبینی لەنێو یەك قاپ دەستنوێژیان دەگرت.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ فُضُولِ التَّطْهِيرِ وَالِاسْتِحْبَابِ مِنْ غَيْرِ إِيجَابٍ
## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ لِذِكْرِ اللَّهِ، وَإِنْ كَانَ الذِّكْرُ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ مُبَاحًا

٢٠٦ - عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذِ بْنِ عُمَرَ بْنِ جُدْعَانَ ﭬ، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَوَضَّأَ، ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: «إِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ إِلَّا عَلَى طُهْرٍ»(٢).

## کۆباسی فەزڵ و گەورەیی دەستنوێژ و بەچاکدانانی بەبێ پێویست (واجب) بوون
## باسی یادکردنی خوا بەدەستنوێژەوە چاکترە، ئەگەرچی یادکردنی خوا بەبێدەستنوێژیش ڕێگەپێدراوە

واتە: موهاجری کوڕی قونفوزی کوڕی عومەری کوڕی جەدعان ﭬ دەگێڕێتەوە ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا دەستنوێژی دەگرت، سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە هەتا دەستنوێژی تەواو کرد، پاشان عوزری بۆی هێنایەوە، فەرمووی: من پێم باش نەبوو یادی خوا بکەم تەنها بەدەستنوێژەوە نەبێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ كَرَاهِيَةَ النَّبِيِّ ﷺ لِذِكْرِ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ كَانَتْ إِذِ الذِّكْرُ عَلَى طَهَارَةٍ أَفْضَلُ لَا أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَذْكُرَ اللَّهَ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ

**٢٠٧** - عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبووە (بە کەراهەتی دانا) یادی خوا بکات بەبێدەستنوێژی، چونکە یادی خوا بەدەستنوێژەوە چاکترە، نەك بەومانایەی دروست نییە یادی خوا بکات بەبێدەستنوێژی، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکانیدا یادی خوای دەکرد

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کاتەکانیدا یادی خوای دەکرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَهُوَ أَفْضَلُ الذِّكْرِ عَلَى غَيْرِ وُضُوءٍ

**٢٠٨** - عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَمَةَ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ أَنَا وَرَجُلَانِ: رَجُلٌ مِنَّا، وَرَجُلٌ مِنْ بَنِي أَسَدٍ أَحْسَبُ، فَبَعَثَهُمَا وَجْهًا وَقَالَ: إِنَّكُمَا عِلْجَانِ فَعَالِجَا عَنْ دِينِكُمَا، ثُمَّ دَخَلَ الْمَخْرَجَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَخَذَ حَفْنَةً مِنْ مَاءٍ فَتَمَسَّحَ بِهَا ثُمَّ جَاءَ، فَقَرَأَ الْقُرْآنَ قِرَاءَةً فَأَنْكَرْنَا ذَلِكَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْتِي الْخَلَاءَ فَيَقْضِي الْحَاجَةَ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيَأْكُلُ مَعَنَا الْخُبْزَ وَاللَّحْمَ، وَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَلَا يَحْجُبُهُ عَنِ الْقُرْآنِ شَيْءٌ لَيْسَ الْجَنَابَةَ» أَوْ إِلَّا الْجَنَابَةُ قَالَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ الْمِقْدَامِ الْعِجْلِيَّ يَقُولُ: حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ، عَنْ شُعْبَةَ بِهَذَا الْحَدِيثِ قَالَ شُعْبَةُ: «هَذَا ثُلُثُ رَأْسِ مَالِي»(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ كُنْتُ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الْبُيُوعِ أَنَّ بَيْنَ الْمَكْرُوهِ وَبَيْنَ الْمُحَرَّمِ فُرْقَانًا، وَاسْتَدْلَلْتُ عَلَى الْفَرْقِ بَيْنَهُمَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا، وَحَرَّمَ عَلَيْكُمْ ثَلَاثًا، كَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَحَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ» فَفَرَّقَ

---

(١) صحيح.

(٢) هذا الحديث اختلف أهل العلم به، فقد صححه الترمذي وابن خزيمة وابن حبان والحاكم، إلا أن جهابذة المحدثين ضعفوا هذا الحديث.

ـ ـَكْرُوهِ، وَبَيْنَ الْمُحَرَّمِ بِقَوْلِهِ فِي خَبَرِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ: «كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ إِلَّا عَلَى طُهْرٍ» ـ يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا كَرِهَ ذَلِكَ إِذِ الذِّكْرُ عَلَى طُهْرٍ أَفْضَلُ لَا أَنَّ ذِكْرَ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ مُحَرَّمٌ، ـ ـنَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يُقْرَأُ الْقُرْآنَ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ» وَالْقُرْآنُ أَفْضَلُ الذِّكْرِ، «وَقَدْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَذْكُرُ ـ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ» عَلَى مَا رُوِّينَا عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَقَدْ يَجُوزُ أَنْ تَكُونَ كَرَاهَتُهُ لِذِكْرِ ـ إِلَّا عَلَى طُهْرٍ ذِكْرُ اللَّهِ الَّذِي هُوَ فَرْضٌ عَلَى الْمَرْءِ دُونَ مَا هُوَ مُتَطَوَّعٌ بِهِ، فَإِذَا كَانَ ذِكْرُ اللَّهِ ـرْضًا لَمْ يُؤَدِّ الْفَرْضَ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ حَتَّى يَتَطَهَّرَ، ثُمَّ يُؤَدِّي ذَلِكَ الْفَرْضَ عَلَى طَهَارَةٍ؛ لِأَنَّ رَدَّ السَّلَامِ ـرْضٌ عِنْدَ أَكْثَرِ الْعُلَمَاءِ، فَلَمْ يَرُدَّ ﷺ وَهُوَ عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ حَتَّى تَطَهَّرَ، ثُمَّ رَدَّ السَّلَامَ، فَأَمَّا مَا كَانَ ـمَرْءُ مُتَطَوِّعًا بِهِ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَلَوْ تَرَكَهُ فِي حَالَةٍ هُوَ فِيهَا غَيْرُ طَاهِرٍ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ إِعَادَتُهُ فَلَهُ ـ يَذْكُرَ اللَّهَ مُتَطَوِّعًا بِالذِّكْرِ، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ مُتَطَهِّرٍ.

## باسی مۆڵەتدان بە خوێندنەوەی قورئان بەبێدەستنوێژی، لە کاتێکدا چاکترین زیکر و یادکردنە

واتە: عەمری کوڕی مورە دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵای کوڕی سەلیمە بوو دەیوت: چوومە ژوورەوە بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ من و دوو پیاوی دیکە: پیاوێکیان لە ئێمە بوو ( واتە: لە نەوەکانی موراد لە کوفە)، پێم وایە پیاوەکەی دیکەیان لە نەوەکانی ئەسەد بوو، وەکوو کاربەدەست ناردنی و وتی: هەردووکتان دوو کەسی بەهێز و بەتوانان، ئەو کردەوەی پەسەندە لە ئایینەکەتان ئەنجامی بدەن، پاشان چوو سەرئاوی کرد، ئینجا دەرچوو، گوێلێ ئاوی هەڵگرت و هەندێ ئەندامی جەستەی پێی شۆرد، پاشان هات، قورئانی خوێند بەخوێندێك، ئێمەش ئینکاری ئەوەمان کرد، عەلی وتی: پێغەمبەر ﷺ دەچووە سەرئاو کاری خۆی دەکرد، پاشان دەردەچوو لەگەڵمان نان و گۆشتی دەخوارد و قورئانی دەخوێند، هیچ شتێك نەدەبووە بەربەست لەبەردەم قورئانخوێندنیدا مەگەر لەشی گران بووایە، وتی: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی میقدامی عیجلی بوو دەیوت: سەعیدی کوڕی ڕەبیع بۆی باس کردم لە شوعبەوە بەم فەرموودەیە، شوعبە وتی: ئەمە سێیەکی دەستمایەکەمە.

ئەبو بەکر دەڵێ: من لە کتێبی (الْبُيُوعِ) ڕوونم کردۆتەوە لە نێوان (الْمَكْرُوه) ناپەسەند و لە نێوان (الْمُحَرَّم) حەڕام کراو جیاوازی هەیە، بەڵگەشم هێناوەتەوە بۆ جیاوازی

نێوانیان بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا، وَحَرَّمَ عَلَيْكُمْ ثَلَاثًا، كَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَحَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ) واتە: بەڕاستی خوا ﷻ سێ شتی پێ ناپەسەندە بۆتان و سێ شتیشی لێ قەدەغە کردوون، پێی ناپەسەندە بۆتان: وتی وتی و پرسیارکردنی زۆر و بە فیرۆدانی ماڵ و سامان، وە قەدەغەی لێ کردوون لە سەرپێچی دایکان و زیندەبەچاڵکردنی کچان و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و نەبەخشینی تەنانەت زەکاتیش. جیاوازی کردووە لە نێوان (الْمَكْرُوه) ناپەسەند و لە نێوان (الْمُحَرَّم) حەڕام کراو بەوەی فەرموویەتی لە فەرموودەی موهاجیری کوڕی قونفوز: (پێم ناپەسەندە یادی خوا بکەم مەگەر بەدەستنوێژەوە) هەندێ جار دروستە ئەوە ببێت، بۆیە پێی ناپەسەند بووە زیکر و یادی خوا بکات بەبێدەستنوێژی، چونکە زیکر و یادکردن بەدەستنوێژەوە چاکترە. نەك یادی خوا بەبێدەستنوێژی حەڕام بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ قورئانی دەخوێند بەبێدەستنوێژی، قورئانیش چاکترین زیکر و یادکردنە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکانیدا یادی خوای دەکرد، وەك گێڕاومانەوە لە عائیشەوە، دەگونجێ بۆ ئەوە پێی ناپەسەند بووبێت یادی خوا بکات مەگەر لەسەر پاکی، ئەو زیکر و یادکردنەوەیەی کە فەڕزە لەسەر بەندە، جا ئەگەر زیکری خوا فەڕز بوو بەبێدەستنوێژی ئەو زیکرە نەدەکرا هەتا دەستنوێژ دەگرێ، پاشان ئەو فەڕزە دەستنوێژ واجب بکات، چونکە وەڵامدانەوەی سەلام لای زۆرینەی زانایان فەڕزە، پێغەمبەر ﷺ بەبێدەستنوێژی وەڵامی نەداوەتەوە هەتا دەستنوێژی گرتووە، ئینجا وەڵامی سڵاوەکەی داوەتەوە، بەڵام ئەگەر بەندە لە چوارچێوەی زیاد لە فەڕزەکان زیکر و یادی خوای کرد ئەگەر لە حاڵەتێکدا وازی لێی هێنا بێدەستنوێژ بوو لەسەری نییە دووبارەی بکاتەوە، بۆی هەیە یادی خوا بکات جگە لە فەڕزەکان با دەستنوێژیشی نەبێت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ لِلدُّعَاءِ، وَمَسْأَلَةِ اللَّهِ لِيَكُونَ الْمَرْءُ طَاهِرًا عِنْدَ الدُّعَاءِ وَالْمَسْأَلَةِ

٢٠٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْحَرَّةِ بِالسُّقْيَا الَّتِي كَانَتْ لِسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتُونِي بِوَضُوءٍ». فَلَمَّا تَوَضَّأَ

... سْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ قَالَ: «أَبِي إِبْرَاهِيمُ كَانَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَدَعَاكَ لِأَهْلِ مَكَّةَ، وَأَنَا ... عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ أَدْعُوكَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ، أَنْ تُبَارِكَ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ مِثْلَ مَا بَارَكْتَ ... مَكَّةَ مَعَ الْبَرَكَةِ بَرَكَتَيْنِ»[1].

## باسی چاکتر وایە دەستنوێژ بگیرێ بۆ پاڕانەوە و داواکردن لە خوا، بۆ ئەوەی بەندە پاك و بەدەستنوێژ بێت لە کاتی پاڕانەوە و داواکردن

... تە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین هەتا ... یشتین بە ناوچەی (الْحَرَّة) و (السُّقْيَا)، (یەکێك بووە لە بیرەکانی مەدینە) کە هی ... ەعدی کوڕی ئەبو وەقاس ﷺ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاوی دەستنوێژم ... بهێنن، کاتێ دەستنوێژی گرت هەستا ڕووی کردە قیبلە، پاشان تەکبیری کرد، پاشان ... دوعای کرد و) فەرمووی: ئیبراهیمی باپیرە گەورەم بەندە و خۆشەویستی تایبەتی ... بوو داوای لێ کردی فەڕ و بەرەکەت بخەیتە مەککە، منیش موحەممەدم بەندە و ... غەمبەرت، داوات لێ دەکەم بۆ خەڵکی مەدینە، بەرەکەت بخەیتە مود و صاعیانەوە ... کێشانە و پێوانەیان)، وەك چۆن فەڕ و بەرەکەتت خستە نێو خەڵکی مەککە، لەگەڵ فەڕ و بەرەکەتێکدا دوو فەڕ و بەرەکەتی تێ بخە بۆیان (بەرەکەتی دوعای من لەگەڵ بەرەکەتی دوعای ئیبراهیم). (الْحَرَّة): (جێگایەك بوو لە نزیك مەدینە).

**٢١٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى بِأَرْضِ سَعْدٍ، فَذَكَرَ الْقِصَّةَ[2].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، پاشان لە خاکی سەعد نوێژی کرد، ئینجا باسی فەرموودەکەی کرد.

---

(١) إسناده.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ وُضُوءِ الْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ النَّوْمَ

٢١١- عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «يَنَامُ وَيَتَوَضَّأُ إِنْ شَاءَ»

## باسی چاکتر وایە لەشگران دەستنوێژ بگرێت ئەگەر ویستی بخەوێت

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە ئەو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا یەکێك لە ئێمە بەلەشگرانییەوە بخەوێت؟ فەرمووی: بخەوێت و دەستنوێژ بگرێت ئەگەر ویستی.

٢١٢ - «عَنْ سُفْيَانَ بِهَذَا الْإِسْنَادِ، فَقَالَ: إِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ»[٢].

واتە: سوفیان بەم سەنەدە هێناویەتی دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا یەکێك لە ئێمە بەلەشگرانییەوە بخەوێت؟ فەرمووی: ئەگەر ویستی بخەوێت با دەستنوێژ بگرێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوَضُوءَ الَّذِي أُمِرَ بِهِ الْجُنُبُ لِلنَّوْمِ كَوُضُوءِ الصَّلَاةِ، إِذِ الْعَرَبُ قَدْ تُسَمِّي غَسْلَ الْيَدَيْنِ وُضُوءًا

٢١٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ»[٣].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو دەستنوێژەی کە لەشگران فەرمانی پێ کراوە بۆ خەو بیگرێت وەك دەستنوێژی نوێژ وایە، چونکە عەرەب هەندێ جار بە شۆردنی دەستیش هەر دەڵێن: (وُضُوء)

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە بەلەشگرانییەوە بخەوتایە، دەستنوێژی دەگرت وەك دەستنوێژگرتنی بۆ نوێژ.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ غَسْلِ الذَّكَرِ مَعَ الْوُضُوءِ إِذَا أَرَادَ الْجُنُبُ النَّوْمَ

٢١٤ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ، يَقُولُ: سَأَلَ عُمَرُ ﷺ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تُصِيبُنِي الْجَنَابَةُ بِاللَّيْلِ فَمَا أَصْنَعُ؟ قَالَ: «اغْسِلْ ذَكَرَكَ وَتَوَضَّأْ، ثُمَّ ارْقُدْ»[1].

## باسی چاکتر وایە لەگەڵ دەستنوێژدا ئەندامی نێرینە بشۆردرێت ئەگەر لەشگران ویستی بخەوێت

واتە: عەبدوڵای کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر ﷺ بوو دەیوت: عومەر ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وتی: من لە شەودا لەشگران دەبم چی بکەم؟ فەرمووی: ئەندامی نێرینەت بشۆرە و دەستنوێژ بگرە، پاشان بخەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ لِلْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ الْأَكْلَ

٢١٥ - عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ تَوَضَّأَ[2].

## باسی چاکتر وایە لەشگران دەستنوێژ بگرێت ئەگەر ویستی نان بخوات

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە نان بخوات یان بخەوێت لەشی گران بووایە دەستنوێژی دەگرت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ عِنْدَ النَّوْمِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْمَرْءُ جُنُبًا لِيَكُونَ مَبِيتُهُ عَلَى طَهَارَةٍ

**٢١٦** - عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَيْدَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ»، ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ إِنَّ الْعَرَبَ تَقُولُ: إِذَا فَعَلْتَ كَذَا، تُرِيدُ إِذَا أَرَدْتَ فِعْلَ ذَلِكَ الشَّيْءِ كَقَوْلِهِ جَلَّ وَعَلَا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴿٦﴾﴾ المائدة، وَمَعْنَاهُ إِذَا أَرَدْتُمُ الْقِيَامَ إِلَى الصَّلَاةِ».

## باسی چاکتر وایە لە کاتی خەوتن دەستنوێژ بگیرێت، ئەگەر چی بەندە لەشگرانیش نەبێت، بۆ ئەوەی خەوتنی لەسەر پاکێتی بێت

واتە: سەعدی کوڕی عوبەیدە دەڵێ: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستت بچیتە سەر جێگای نوستنەکەت دەستنوێژ بگرە بەوشێوەیەی دەستنوێژگرتنت بۆ نوێژ، پاشان ڕاکشێ لەسەر لای ڕاستت. پاشان فەرموودەکەی باس کرد.

ئەبو بەکر وتی: ئەم دەستەواژەیە: (إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ) لەو شێوازەیە کە دەڵێین عەرەب دەڵێ: (إِذَا فَعَلْتَ كَذَا) واتە: ئەگەر فڵانە شتت کرد، مەبەستی ئەوەیە: هەر کات ویستت ئەو کارە بکەیت، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴿٦﴾﴾ مانای ئەوەیە: ئەگەر ویستتان هەستن بۆ نوێژ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُضُوءَ الَّذِي أُمِرَ بِهِ الْجُنُبُ لِلْأَكْلِ كَوُضُوءِ الصَّلَاةِ سَوَاءً

**٢١٧** - عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْجُنُبِ هَلْ يَأْكُلُ أَوْ يَنَامُ؟ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

ـسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو دەستنوێژەی کە فەرمان کراوە بە لەشگران
ێی هەستێت کاتێ ویستی نان بخوات وەك دەستنوێژگرتنە بۆ نوێژ

ـ ـە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ـەـگران ئایا خواردن بخوات یان بخەوێت؟ فەرمووی: ئەگەر دەستنوێژی گرت وەك ـستنوێژگرتنی بۆ نوێژ (با خواردن بخوات یان بخەوێ).

بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْوُضُوءِ لِلْجُنُبِ
عِنْدَ إِرَادَةِ الْأَكْلِ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ وَفَضِيلَةٍ وَإِبَاحَةٍ

٢١٩ - عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَطْعَمَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ يَدَيْهِ ثُمَّ طَعِمَ[1].

ـاسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە دەستنوێژ بۆ لەشگران کاتێ ویستی نان بخوات، فەرمانێکە بۆ سوننەت و ڕێنیشاندان و چاکە و ڕێگەپێدان (بۆ فەڕز و واجب نییە)

ـ ـە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە نان بخوات، لەشیشی گران بووایە، دەستەکانی دەشۆرد پاشان خواردنی دەخوارد.

بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جَمِيعَ مَا ذَكَرْتُ مِنَ الْأَبْوَابِ مِنْ وُضُوءِ الِاسْتِحْبَابِ عَلَى مَا ذَكَرْتُ، أَنَّ الْأَمْرَ بِالْوُضُوءِ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ وَفَضِيلَةٍ، لَا أَمْرُ فَرْضٍ وَإِيجَابٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ، خَبَرُ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلَاةِ».

باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەموو ئەوانەی باسم کرد لە بەشەکاندا لە چوارچێوەی دەستنوێژگرتنی پەسەند بەچاکدانانە بەو شێوەی کە باسم کرد، فەرمانکردن بە دەستنوێژ لە هەموو ئەوانەدا فەرمانێکە بۆ سوننەت و ڕێنیشاندان و فەزڵ و چاکەی، فەرمانێك نییە بۆ فەڕز و پێویست (واجب) بوون،

---

(١) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەوبارەوە فەرموودەی ئیبنو عەباس ﵄ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلَاةِ) واتە: بێگومان تەنها لە کاتێکدا فەرمانم پێ کراوە بە دەستنوێژ، کاتێ هەستم بۆ نوێژ

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوُضُوءِ عِنْدَ مُعَاوَدَةِ الْجِمَاعِ بِلَفْظٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

٢١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ أَرَادَ الْعَوْدَ فَلْيَتَوَضَّأْ».

## باسی بەچاکدانانی دەستنوێژگرتن لە کاتی دووبارە جیماعکردن بە دەستەواژەی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك شیکراوە و ڕوون (مُفَسَّر)

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە چووە لای خێزانی بۆ سەرجێیی، پاشان ویستی (دووبارە) بگەڕێتەوە بۆ لای ئەوە با دەستنوێژ بگرێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُضُوءَ لِلْمُعَاوَدَةِ لِلْجِمَاعِ كَوُضُوءِ الصَّلَاةِ

٢٢٠- عَنْ عَاصِمٍ الْأَحْوَلِ قَالَ: إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، يَعْنِي: الَّذِي يُجَامِعُ ثُمَّ يَعُودُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ[٢].

## باسی بەڵگەهێنانەوە لەسەر ئەوەی دەستنوێژگرتن بۆ ئەو کەسەی دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ سەرجێیی وەکوو دەستنوێژی نوێژ بێت

واتە: عاصمی ئەحوەل دەڵێ: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ویستی (دووبارە) بگەڕێتەوە بۆ سەرجێیی (جووتبوون لەگەڵ خێزانی) ئەوە دەستنوێژ بگرێ وەك دەستنوێژگرتنی بۆ نوێژ. واتە: ئەو کەسەی سەرجێیی دەکات، پاشان ویستی بگەڕێتەوە پێش ئەوەی خۆی بشوات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِالْوُضُوءِ عِنْدَ إِرَادَةِ الْجِمَاعِ أَمْرُ نَدْبٍ وَإِرْشَادٍ «إِذِ الْمُتَوَضِّئُ بَعْدَ الْجِمَاعِ يَكُونُ أَنْشَطَ لِلْعَوْدَةِ إِلَى الْجِمَاعِ، لَا أَنَّ الْوُضُوءَ بَيْنَ الْجِمَاعَيْنِ وَاجِبٌ، وَلَا أَنَّ الْجِمَاعَ قَبْلَ الْوُضُوءِ وَبَعْدَ الْجِمَاعِ الْأَوَّلِ مَحْظُورٌ»

٢٢٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمُ الْعَوْدَ فَلْيَتَوَضَّأْ فَإِنَّهُ أَنْشَطُ لَهُ فِي الْعَوْدِ»[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە دەستنوێژ، لە کاتی ویستنی جیماعکردن، فەرمانێکە بۆ سوننەت و ڕێنیشاندان، چونکە ئەو کەسەی دەستنوێژ دەگرێ لەدوای جیماع چالاکترە بۆ گەڕانەوە بۆ جیماعکردن، نەك بەو مانایەی دەستنوێژ لە نێوان دوو جیماعدا پێویستە یان واجبە، وە نەك بەو مانایەی جیماعکردن پێش دەستنوێژ و دوای جیماعی یەکەم حەرامە**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی دووبارە بگەڕێتەوە (بۆ سەرجێییکردن) با دەستنوێژ بگرێ، چونکە ئەوە چالاکتری دەکات بۆ گەڕانەوە.

## بَابُ فَضْلِ التَّهْلِيلِ وَالشَّهَادَةِ لِلنَّبِيِّ ﷺ بِالرِّسَالَةِ وَالْعُبُودِيَّةِ «وَأَنْ لَا يُطْرَى كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ، إِذَا شَهِدَ لَهُ بِالْعُبُودِيَّةِ مَعَ الشَّهَادَةِ لَهُ بِالرِّسَالَةِ عِنْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الْوُضُوءِ»

٢٢٤ - عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الْإِبِلِ فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِيٍّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا يُحَدِّثُ النَّاسَ، فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلًا عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ». قَالَ: فَقُلْتُ: مَا أَجْوَدَ هَذِهِ فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَيَّ يَقُولُ: الَّذِي قَبْلَهَا أَجْوَدُ فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُكَ جِئْتَ آنِفًا قَالَ: « مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ، فَيَبْلُغَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەزڵ و گەورەیی تەهلیل (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) و شایەتیدان بۆ پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەرایەتی و پەرستشی خوا، وە ڕۆ نەچێت لە وەسف و پیاهەڵدانیدا و سنوور نەبەزێنێت وەکوو چۆن نەصاڕاکان لە پیاهەڵدانی عیسای کوڕی مەریەم ڕۆچوون و سنووریان بەزاند، ئەگەر شایەتی بۆی دا بە پەرستشی خوا لەگەڵ پێغەمبەرایەتی لە کاتی لێبوونەوە لە دەستنوێژ**

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: ئێمە شوانی وشترمان دەکرد (بەنۆرە، چەند ماڵێك کۆ دەبوونەوە وشترەکانیان تێکەڵ دەکرد هەر یەکەیان ڕۆژێك شوانی دەکرد ئەوانی دیکەش دەچوون بە لای کاروباری خۆیانەوە) ڕۆژێك سەرلەئێوارە وشترەکانم گەڕاندەوە، گەیشتم بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستابوو قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد. گەیشتم بە بەشێك لە وتەکەی دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێك بەچاکی دەستنوێژ بگرێت. پاشان هەستێت دوو ڕکات نوێژ بکات بەدڵ و ڕوخساری ڕوو لە خوا بکات ئاگای لێی بێت ئیللا بەهەشتی بۆ پێویست (واجب) دەبێت. وتی: وتم: ئەم وتەیە چەند چاك و بەسوودە، کەسێك لە دەوروبەرمدا وتی: ئەوەی لە پێشەوە فەرمووی چاکترە. تەماشام کرد عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بوو وتی: من بینیتم کەمێك پێش ئێستا هاتیت، فەرمووی: هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت بەچاکی، پاشان بڵێ: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە ئیللا هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە کامەیانەوە ویستی هەبێت دەچێتە ژوورەوە.

**٢٢٣** - عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ للَّهِ وَرَسُولُهُ إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت بەچاکی، پاشان بڵێ: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی نییە جگە لە خوا، وە بێگومان موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە ئیللا دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە کامەیانەوە ویستی هەبێت دەچێتە ژوورەوە.

---

(١) صحيح.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ غُسْلِ الْجَنَابَةِ

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْغُسْلِ فِي الْجِمَاعِ مِنْ غَيْرِ إِمْنَاءٍ «قَدْ نُسِخَ بَعْضُ أَحْكَامِهَا»

٢٢٤- عن زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ حَدَّثَ أَنَّهُ، سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُجَامِعُ ثُمَّ لَا يُنْزِلُ قَالَ: «لَيْسَ عَلَيْهِ غُسْلٌ»، ثُمَّ قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَسَأَلْتُ بَعْدَ ذَلِكَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ، وَطَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﷺ فَقَالُوا: مِثْلَ ذَلِكَ قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: وَحَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ أَنَّهُ سَأَلَ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[1].

### كۆباسی غوسلدەرکردنی لەشگرانی

### باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراونەتەوە مۆڵەتیان تێدایە دەربارەی وازهێنان لە غوسلدەرکردن لە جیماعکردن بەبێ ئاوهاتنەوە، بێگومان هەندێ لە حوکمەکانی نەسخ کراونەتەوە (واتە: هەڵوەشێنراوەتەوە)

وتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ باسی کرد ئەو پرسیاری لە عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ کرد دەربارەی پیاوێك جیماع بکات و ئاوی نەیەتەوە؟ وتی: غوسلی لەسەر نییە، پاشان عوسمان وتی: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە، وتی: دوای ئەو پرسیارم کرد لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زوبەیری کوڕی عەوام و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ بە هەمان شێوەی ئەویان وت، ئەبو سەلەمە وتی: عوروەی کوڕی زوبەیر بۆی باس کردم ئەو پرسیاری لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری کرد بە هەمان شێوەی وت لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

## بَابُ ذِكْرِ نَسْخِ إِسْقَاطِ الْغُسْلِ فِي الْجِمَاعِ مِنْ غَيْرِ إِمْنَاءٍ

٢٢٥- عَنْ سَهْلٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: - وَقَدْ كَانَ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ وَكَانَ فِي زَمَانِهِ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً - حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، أَنَّ الْفُتْيَا الَّتِي كَانُوا يَقُولُونَ الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ رُخْصَةٌ رَخَّصَهَا رَسُولُ اللَّهِ

---

(١) صحيح.

ﷺ فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالْغُسْلِ بَعْدَهَا(١) عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ الْفُتْيَا فِي الْمَاءِ مِنَ الْمَاءِ رُخْصَةً فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ، ثُمَّ نُهِيَ عَنْهَا(٢).

## باسی هەڵوەشاندنەوە و نەسخبوونەوەی غوسلدەرکردن لە جیماع بەبێ ئاو هاتنەوە

واتە: سەهلی ئەنصاڕی ﷺ دەڵێ: -ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی لەو سەردەمەدا تەمەنی پازدە ساڵ بوو- باوکم بۆی باس کردم ئەو فتوایەی کە فتوایان پێ دەدا بریتی بوو لەوەی دەیانوت: ئاو لە ئاوە، (واتە: جیماع بەبێ ئاو هاتنەوە خۆشۆردن پێویست (واجب) ناکات. ئەوە مۆڵەت و مۆڵەتێك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای ئیسلام دای، پاشان دوای ئەوە فەرمانی کرد بە خۆشۆردن. هەروەها لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: ئەوسا فتوایان بەوە دەدا ئاو بە ئاو هاتنەوە پێویست دەبێ، ئەوە مۆڵەتێك بوو لە سەرەتای ئیسلام، پاشان قەدەغەی لێ کرا (وە فەرمان کرا بە خۆشۆردن).

**٢٢٦** - «عَنِ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا كَانَ قَوْلُ الْأَنْصَارِ الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ رُخْصَةً فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ ثُمَّ أُمِرْنَا بِالْغُسْلِ»(٣).

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: بێگومان وتەی ئەنصارەکان: ئاو لە ئاوە مۆڵەتێك بوو لە سەرەتای ئیسلام پاشان فەرمان کرا بە خۆشۆردن.

## بَابُ ذِكْرِ إِيجَابِ الْغُسْلِ بِمَمَاسَةِ الْخِتَانَيْنِ أَوِ الْتِقَائِهِمَا، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَمْنَى

**٢٢٧**- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ أَنَّهُمْ كَانُوا جُلُوسًا فَذَكَرُوا مَا يُوجِبُ الْغُسْلَ، فَقَالَ مَنْ حَضَرَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ: إِذَا مَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ وَجَبَ الْغُسْلُ، وَقَالَ مَنْ حَضَرَهُ مِنَ الْأَنْصَارِ: لَا حَتَّى يَدْفُقَ قَالَ أَبُو مُوسَى: أَنَا آتِيكُمْ بِالْخَبَرِ، فَقَامَ إِلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهَا فَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ وَأَنَا أَسْتَحِي مِنْهُ، فَقَالَتْ: لَا تَسْتَحِ أَنْ تَسْأَلَ عَنْ شَيْءٍ تَسْأَلُ عَنْهُ أُمَّكَ

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

ـبِ ـذَـتَكَ فَإِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ. قَالَ: قُلْتُ: مَا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ قَالَتْ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ قَالَ رَسُولُ ـ ﷺ: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، وَمَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ وَجَبَ الْغُسْلُ»[١].

## باسی پێویست (واجب) بوونی غوسلدەرکردن بە بەریەککەوتنی ئەندامی نێرینە بە ئەندامی مێینە، ئەگەرچی ئاویش نەیەتەوە

ـ تە: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەوان دانیشتبوون باسی ئەو شتانەیان ـکرد کە غوسلدەرکردن پێویست دەکات، ئەوەی لە کۆچکەران ئامادە بوو وتی: ـگەر ئەندامی نێرینە بەر ئەندامی مێینە کەوت ئەوە غوسل پێویست دەبێت، ئەوەیشی ـ ئەنصارەکان ئامادە بوو وتی: نەخێر وا نییە هەتا ئاوی نەیەتەوە واجب نابێ، ئەبو موسا وتی: من دەڕۆم هەواڵتان بۆ دەهێنم، هەستا ڕۆیشت بۆ لای عائیشە و سڵاوی ی کرد، پاشان وتی: من دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم دەربارەی شتێك و شەرم ـدەکەم، عائیشە وتی: شەرم مەکە پرسیار لە شتێك بکەی، کە دەتوانی پرسیار لە دایکت ـکەی کە تۆی لێ بووە، چونکە بێگومان منیش دایکی تۆم، وتی: وتم: چی شتێك غوسلدەرکردن پێویست دەکات؟ وتی: پرسیارەکە لە کەسێکی شارەزا کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لە نێوان هەر چوار پەلیدا دانیشت بۆ سەرجێییکردن، پاشان ئەندامی نێرینەی بەر ئەندامی مێینەی کەوت ئەوە غوسلدەرکردن پێویست دەبێت.

## بَابُ إِيجَابِ إِحْدَاثِ النِّيَّةِ لِلاغْتِسَالِ مِنَ الْجَنَابَةِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْجُنُبَ إِذَا دَخَلَ نَهْرًا نَاوِيًا لِلسِّبَاحَةِ فَمَاسَّ الْمَاءُ جَمِيعَ بَدَنِهِ، وَلَمْ يَنْوِ غُسْلًا وَلَا أَرَادَهُ إِذَا فُرِضَ الْغُسْلُ، وَلَا تَقَرُّبًا إِلَى اللَّهِ ﷻ أَوْ صُبَّ عَلَيْهِ مَاءٌ وَهُوَ مُكْرَهٌ، فَمَاسَّ الْمَاءُ جَمِيعَ جَسَدِهِ أَنَّ فَرْضَ الْغُسْلِ سَاقِطٌ عَنْهُ»

**٢٢٨-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی پێویستبوونی نییەتهێنان بۆ خۆشۆردن لە لەشگرانی، وە بەڵگەش بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەیە کە پێی وایە لەشگران ئەگەر بچێتە ناو ڕووبارێك بۆ خۆشۆردن و مەلەوانی و ئاو بەر هەموو جەستەی بکەوێت، نییەتی غوسلدەرکردن و نزیکبوونەوە لە خوا ﷻ نەبوو، یان بەزۆر ئاو کرا بەسەریدا و سەرجەم جەستەی ئاوی بەرکەوت، ئەوا فەرزی غوسلدەرکردنی لەسەر نامێنێت

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: کردەوەکـ بەپێی نیاز و مەبەستن، بێگومان هەموو کەسێکیش بەپێی نیاز و مەبەستی خۆیەتی.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ جِمَاعَ نِسْوَةٍ لَا يُوجِبُ أَكْثَرَ مِنْ غُسْلٍ وَاحِدٍ

**٢٢٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی سەرجێییکردن لەگەڵ چەند هاوسەرێکدا تەنها یەکجار غوسلدەرکردن پێویست (واجب) دەکات

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەسوڕایەوە بەسەر هەموو خێزانەکانیدا و سەرجێی لەگەڵ دەکردن یەك جاریش غوسلی دەردەکرد.

**٢٣٠-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَطِيفُ عَلَى نِسَائِهِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەك شەودا دەسوڕایەوە بەسەر هەموو خێزانەکانیدا سەرجێیی لەگەڵ دەکردن یەکجار غوسلی دەردەکرد.

**٢٣١-** عَنْ قتادة، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ مِنَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ، وَهُنَّ إِحْدَى عَشْرَةَ، قَالَ: فَقُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ: وَهَلْ كَانَ يُطِيقُ ذَلِكَ؟ قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ أُعْطِي قُوَّةَ ثَلَاثِينَ رَجُلًا[٣].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.

- ته: قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ دەسوڕایەوە
ــسەر هەموو خێزانەکانیدا لە کاتێکی شەو و ڕۆژدا سەرجێیی لەگەڵ دەکردن یەك
حــ غوسلی دەردەکرد، کە ئەوانیش یانزە ئافرەت بوون، وتی: بە ئەنەسم ﷺ وت:
-- دەیتوانی لەگەڵ هەموویان کۆ بێتەوە لەو ماوەیەدا؟ وتی: ئێمە لەنێو یەکدیدا
قــەمان لەسەر ئەوە دەکرد ئەو هێز و توانای سی (٣٠) پیاوی پێ بەخشراوە.

## بَابُ صِفَةِ مَاءِ الرَّجُلِ الَّذِي يُوجِبُ الْغُسْلَ، وَصِفَةُ مَاءِ الْمَرْأَةِ الَّذِي يُوجِبُ عَلَيْهَا الْغُسْلَ إِذَا لَمْ يَكُنْ جِمَاعٌ يَكُونُ فِيهِ الْتِقَاءُ الْخِتَانَيْنِ

**٢٣٣-** عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيُّ، أَنَّ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: كُنْتُ قَاعِدًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَهُ حَبْرٌ مِنْ أَحْبَارِ الْيَهُودِ، فَقَالَ: سَلَامٌ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ ﷺ، فَدَفَعْتُهُ دَفْعَةً كَادَ يُصْرَعُ مِنْهَا، فَقَالَ: لِمَ تَدْفَعُنِي؟ فَقُلْتُ: أَلَا تَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ الْيَهُودِيُّ: إِنَّمَا نَدْعُوهُ بِاسْمِهِ الَّذِي سَمَّاهُ بِهِ أَهْلُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اسْمِي مُحَمَّدٌ الَّذِي سَمَّانِي بِهِ أَهْلِي». قَالَ الْيَهُودِيُّ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيَنْفَعُكَ إِنْ حَدَّثْتُكَ؟» قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَيَّ، فَنَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعُودٍ مَعَهُ، فَقَالَ: «سَلْ»، فَقَالَ الْيَهُودِيُّ: أَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي الظُّلْمَةِ دُونَ الْجِسْرِ». قَالَ: فَمَنْ أَوَّلُ النَّاسِ إِجَازَةً؟ قَالَ: «فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ». قَالَ: فَمَا تُحْفَتُهُمْ حِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: «زِيَادَةُ كَبِدِ النُّونِ». قَالَ: فَمَا غِذَاؤُهُمْ عَلَى أَثَرِهِ؟ قَالَ: «يُنْحَرُ لَهُمْ ثَوْرُ الْجَنَّةِ الَّذِي كَانَ يَأْكُلُ مِنْ أَطْرَافِهَا». قَالَ: فَمَا شَرَابُهُمْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: «مِنْ عَيْنٍ فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلًا». قَالَ: صَدَقْتَ، وَجِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنْ شَيْءٍ لَا يَعْلَمُهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ إِلَّا نَبِيٌّ أَوْ رَجُلٌ أَوْ رَجُلَانِ، قَالَ: «يَنْفَعُكَ إِنْ حَدَّثْتُكَ؟» قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَيَّ قَالَ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنِ الْوَلَدِ قَالَ: «مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ، وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ، فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلَا مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ، وَإِذَا عَلَا مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ» قَالَ الْيَهُودِيُّ: صَدَقْتَ وَإِنَّكَ لَنَبِيٌّ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَأَلَنِي هَذَا عَنِ الَّذِي سَأَلَنِي عَنْهُ، وَمَا لِي عِلْمٌ بِشَيْءٍ مِنْهُ حَتَّى أَتَانِي اللَّهُ بِهِ»[1].

---

(١) صحيح.

**باسی چۆنییەتی ئاوی پیاو کە غوسلدەرکردن پێویست (واجب) دەکات لەسەری وە چۆنییەتی ئاوی ئافرەت کە غوسلدەرکردن پێویست (واجب) دەکات لەسەری ئەگەر جیماعیش نەبێت تەنها هەردوو ئەندامەکە بگەن بە یەکدی**

واتە: ئەبو ئەسمائی ڕەحەبی دەگێڕێتەوە سەوبانی ﵁ مەولای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کرد وتی: من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووم، زانایەك لە زاناکانی جوولەکە هات بۆ لای، وتی: سەلامی خوات لەسەر ئەی موحەممەد ﷺ. وتی: منیش بەجۆرێك پاڵم پێوە نا خەریك بوو بکەوێت، وتی: بۆ پاڵم پێوە دەنێی؟ وتم: بۆ ناڵێی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ جوولەکەکە وتی: بەو ناوەوە بانگی دەکەم کە خانەوادەکەی ناویان لێ ناوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من ناوم موحەممەدە کە خانەوادەکەم ناوی لێ ناوم، کابرای جوولەکە وتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا سوودت پێ دەگەیەنێ ئەگەر هەواڵت پێ بدەم؟ وتی: ئەوەی دەیڵێی گوێی بۆ دەگرم، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دارەکەی دەستی خەتی بەسەر زەوییەکەدا کێشا و فەرمووی: پرسیار بکە، جوولەکەکە وتی: لە ڕۆژێکدا ئەم زەوییە دەگۆڕێ بۆ زەوییەکی دیکە و ئاسمانەکانیش دەگۆڕێن خەڵکی لەکوێ دەبن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوان لە تاریکاییەکدان لەلای پردی سیراط، وتی: کێ یەکەم کەس تێ دەپەڕێ؟ فەرمووی: ئەو هەژارانەی لەپێناوی خوادا کۆچیان کردووە. جوولەکەکە وتی: کاتێ دەچنە بەهەشتەوە چی دیارییەکیان پێ دەدرێ؟ فەرمووی: زیادەی جگەری نەهەنگ، وتی: ئەی بەدوای ئەوەدا چییان پێ دەدرێ؟ فەرمووی: گای بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕدرێ کە لە تەنیشتەکانی دەخۆن، وتی: چی لەسەری دەخۆنەوە؟ فەرمووی: کانیاوێکە لە بەهەشت ناو دەبرێ بە سەلسەبیل، وتی: ڕاستت کرد، هەروەها هاتووم پرسیارت لێ بکەم دەربارەی شتێك هیچ کەسێك لەسەر زەوید نایزانێ جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ یان پیاوێك یان دوو پیاو، فەرمووی: ئایە سوودت پێ دەگەیەنێ ئەگەر هەواڵت پێ بدەم؟ وتی: بە گوێیەکانم گوێی بۆ دەگرم. هاتووم پرسیارت لێ دەکەم دەربارەی منداڵ، فەرمووی: ئاوی پیاو سپییە و ئاوی ئافرەتیش زەردە، کاتێ کۆ دەبنەوە ئەگەر ئاوی پیاوەکە سەر کەوت بەسەر ئاوی

ـرەتەکەدا به ئیزنی خوا نێرینه دەبێ، وه ئەگەر ئاوی ئافرەت سەرکەوت بەسەر ـوی پیاودا به ئیزنی خوا مێینه دەبێ، جووله‌کەکه وتی: بێگومان ڕاستت فەرموو ـڕاستی تۆ پێغەمبەری، پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ـڕاستی ئەم پیاوە پرسیاری لێ کردم لەوەی که کردی من هیچ زانیارییەکم دەربارەی ـبوو، هەتا خوا ﷻ زانیارییەکەی پێ گەیاندم.

**بَابُ إِيجَابِ الْغُسْلِ مِنَ الْإِمْنَاءِ، وَإِنْ كَانَ الْإِمْنَاءُ مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ «يَلْتَقِي فِيهِ الْخِتَانَانِ أَوْ يَتَمَاسَّانِ، كَانَ الْإِمْنَاءُ مِنْ مُبَاشَرَةٍ أَوْ جِمَاعٍ دُونَ الْفَرْجِ، أَوْ مِنْ قُبْلَةٍ أَوْ مِنِ احْتِلَامٍ، كَانَ الْإِمْنَاءُ فِي الْيَقَظَةِ بَعْدَ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ قَبْلَ تَبَوُّلِ الْجُنُبِ قَبْلَ الِاغْتِسَالِ أَوْ بَعْدَهُ، أَوْ بَعْدَ مَا يَبُولُ ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْإِمْنَاءَ إِذَا كَانَ بَعْدَ الْجَنَابَةِ، وَبَعْدَ الِاغْتِسَالِ قَبْلَ تَبَوُّلِ الْجُنُبِ أَوْجَبَ ذَلِكَ الْمَنِيُّ غُسْلًا ثَانِيًا، وَإِنْ كَانَ الْإِمْنَاءُ بَعْدَ مَا تَبَوَّلَ الْجُنُبُ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ بَعْدَ الْبَوْلِ مَا يُوجِبُ ذَلِكَ الْإِمْنَاءُ زَعَمَ غُسْلًا»**

**٢٣٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ»[1].

**باسی غوسلدەکردن لە ئاوهاتنەوە پێویست دەبێت، ئەگەرچی ئاوهاتنەوەکەش بەبێ جیماعیش بێت، هەردوو ئەندامەکە بگەن بەیەکدی یان لەیەك بخشێن، جا ئاوهاتنەوەکەش بە هۆی دەستبازییەوە بوو، یان جیماعکردن جگە لە جووتبوون لە داوێن، یان بە هۆی ماچکردنەوە بوو، یان بە لەشگرانبوون لە خەودا، جا یەکسانە ئاوهاتنەوەکە لە کاتی بەخەبەربوون بێت دوای غوسلدەرکردن لە لەشگرانی، پێش ئەوەی لەشگران میز بکات، پێش خۆشۆردن یان دوای خۆشۆردن، یان دوای ئەوەی میز دەکات، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە هاتنەخوارەوەی مەنی، ئەگەر دوای لەشگرانبوون بوو، وە دوای خۆشۆردن بوو، پێش ئەوەی لەشگران میز بکات، ئەوە هاتنەخوارەوەی ئەو مەنییە غوسلی دووەم پێویست دەکات، وە ئەگەر هاتنەخوارەوەی مەنی دوای میزکردنی لەشگرانەکە بوو، پاشان خۆی بشوات لەدوای میزکردنەکە، ئەوە پێی دەوترێ غوسلدەرکردن**

---

(١) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بێگومان تەنها ئاو لە ئاوە (واتە: ئاوی یەکەم: ئاوی خۆشۆردنە، ئاوی دووەم: ئاوی مەنییە. مانای ئەوەیە غوسل پێویست نابێت مەگەر بە ئاوهاتنەوە، کەواتە جیاکردن بەبێ ئاوهاتنەوە غوسل پێویست ناکات ئەمەش لە سەرەتای ئیسلامەوە بوو).

**٢٣٤**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ»

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعید دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خو ﷺ فەرموویەتی: بێگومان تەنها ئاو لە ئاوە.

## بَابُ ذِكْرِ إِيجَابِ الْغُسْلِ عَلَى الْمَرْأَةِ فِي الِاحْتِلَامِ إِذَا أَنْزَلَتِ الْمَاءَ

**٢٣٥**- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ ﷺ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَتْهُ عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي الْمَنَامِ مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ قَالَ: «إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ». قَالَتْ: قُلْتُ: فَضَحْتِ النِّسَاءَ، وَهَلْ تَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَرِبَتْ يَمِينُكِ وَفِيمَا يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا إِذًا» هَذَا حَدِيثُ وَكِيعٍ، غَيْرَ أَنَّ الدَّوْرَقِيَّ لَمْ يَقُلْ إِذًا وَانْتِهَاءُ حَدِيثِ مَالِكٍ عِنْدَ قَوْلِهِ: إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ، وَلَمْ يَذْكُرْ مَا بَعْدَهَا مِنَ الْحَدِيثِ»[٢].

## باسی پێویست (واجب) بوونی خۆشۆردن لەسەر ئافرەت لە ئاوهاتنەوەی لە خەودا، ئەگەر ئاوی بینی

واتە: دایکی سەلەمە ﷺ دەڵێ: دایکی سولەیم هات پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد سەبارەت بە ئافرەت لە خەودا شتێ ببینێ وەکوو چۆن پیاو خەو دەبینێ (لەشی گران دەبێت)، فەرمووی: ئەگەر ئافرەت ئاوی (مەنی) بینی با خۆی بشوات، وتی: وتم: ئافرەتانت ڕیسوا کرد؟ ئایا ئافرەت لە خەودا ئاوی دێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، دەستت بە خۆڵدا بچێ، ئەی کەواتە ئیدی منداڵەکەی بەچی لە ئەو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ـجێت. ئەمە فەرموودەی وەکیعە، بەڵام دەورەقی باسی نەکردووە (ناوی نەهێناوە)، ـ فەرموودەکەی مالیك لەو فەرمایشتەیدا کۆتایی هاتووە: ئەگەر ئاوی بینی. وە ـ ی ئەوە باسی فەرموودەکەی نەکردووە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنْ لَا وَقْتَ فِيمَا يَغْتَسِلُ بِهِ الْمَرْءُ مِنَ الْمَاءِ، فَيُضَيِّقُ الزِّيَادَةَ فِيهِ أَوِ النُّقْصَانَ مِنْهُ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ الْوَاجِبَ عَلَى الْمُغْتَسِلِ إِمْسَاسُ الْمَاءِ جَمِيعَ الْبَدَنِ قَلَّ الْمَاءُ أَوْ كَثُرَ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عَائِشَةَ ﵂ «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»**

٢٣٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، فَأَقُولُ: أَبْقِ لِي أَبْقِ لِي[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەندازەی ئاو دیاری ناکرێ بۆ ئەو کەسەی غوسل دەردەکات، تا ئاوی زیادە گرفت دروست بکات یان ئاوی کەم، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خۆی دەشوات ئاو بەر هەموو جەستەی بکەوێت کەم بێت یان زۆر، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی عائیشە ﵂: من و پێغەمبەر ﷺ لەنێو یەك تەشتدا (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من و پێغەمبەر ﷺ لەنێو یەك تەشتدا (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد، دەموت: بەشی من بهێڵەرەوە بەشی من بهێڵەرەوە.

## بَابُ الِاسْتِتَارِ لِلِاغْتِسَالِ مِنَ الْجَنَابَةِ

٢٣٧- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ بِأَعْلَى مَكَّةَ فَأَتَيْتُهُ، فَجَاءَ أَبُو ذَرٍّ بِقَصْعَةٍ فِيهَا مَاءٌ قُلْتُ: إِنِّي لَأَرَى فِيهَا أَثَرَ الْعَجِينِ قَالَتْ: فَسَتَرَهُ أَبُو ذَرٍّ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ سَتَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَبَا ذَرٍّ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، وَذَلِكَ فِي الضُّحَى[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی دانانی پەردە بە مەبەستی خۆشۆردن لە لەشگرانی

واتە: دایکی هانیئ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە لەبەرزاییەکانی مەککە بوو هاتم بۆ لای، ئەبو زەڕ تەشتێکی هێنا ئاوی تێدا بوو. وتم: من شوێنەواری هەویری تێدا دەبینم، وتی: ئەبو زەڕ پەردەی بۆ کرد، ئەویش خۆی شۆرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ پەردەی بۆ ئەبو زەڕ کرد ئەویش خۆی شۆرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەشت ڕکاتی کرد، کاتەکەش کاتی چێشتەنگاو بوو.

## بَابُ إِبَاحَةِ الِاغْتِسَالِ مِنَ الْقِصَاعِ، وَالْمَرَاكِنِ، وَالطَّاسِ

**٢٣٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كُنْتُ أُنَازِعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الطَّسَّ الْوَاحِدَ نَغْتَسِلُ مِنْهُ[١].

## باسی ڕێگەدان بە خۆشۆردن لە تەشتەکان و لەگەنەکان و هاوشێوەی ئەوانەش

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو یەك تەشت (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد من تەشتەکەم بۆ لای خۆم ڕادەکێشا (واتە: من ئاوم لێ دەردەهێنا ئەویش ئاوی لێ دەردەهێنا، هەردووکمان بەشدار بووین).

**٢٣٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ يُوضَعُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلِي هَذَا الْمِرْكَنُ فَنَشْرَعُ فِيهِ جَمِيعًا[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەم تەشتە دادەنرا بۆ من و پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکمان ئاومان لێی دەردەکرد و پێکەوە خۆمان پێی دەشۆرد.

**٢٤٠-** عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اغْتَسَلَ هُوَ وَمَيْمُونَةُ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ فِي قَصْعَةٍ فِيهَا أَثَرُ الْعَجِينِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: دایکی هانیئ ﷺ دەڵێ: مەیمونە و پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەنێو تەشتێکدا هەویریان دەردەهێنا و) خۆیان پێ شۆرد شوێنەواری هەویری پێوە دیار بوو.

## بَابُ صِفَةِ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ

**٢٤١**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي خَالَتِي مَيْمُونَةُ ﷺ، قَالَتْ: «أَدْنَيْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُسْلَهُ مِنَ الْجَنَابَةِ، قَالَتْ: فَغَسَلَ كَفَّيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ كَفَّهُ الْيُمْنَى فِي الْإِنَاءِ فَأَفْرَغَ بِهَا عَلَى فَرْجِهِ فَغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ الْأَرْضَ فَدَلَكَهَا دَلْكًا شَدِيدًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ مِلْءَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى عَنْ مَقَامِهِ ذَلِكَ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِالْمِنْدِيلِ فَرَدَّهُ»[1].

## باسی چۆنییەتی غوسلدەرکردن لە لەشگرانی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پوورم مەیمونە ﷺ بۆی باس کردم وتی: ئاوم نزیک کردەوە لە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی غوسلی لەشگرانی پێ دەربکات، وتی: دوو جار یان سێ جار هەردوو لەپی دەستەکانی شۆرد، پاشان لەپی دەستە ڕاستی خستە نێو قاپەکە، ئاوی کرد بەسەر عەوڕەتیدا و بە دەستی چەپی شۆردی، دواتر بە دەستی چەپی دای لە زەوییەکە و بەتوندی دەستی لە زەوییەکە خشاند، پاشان دەستنوێژی گرت وەک دەستنوێژگرتنی بۆ نوێژ، پاشان سێ جامۆڵەکە ئاوی کرد بە سەریدا پڕ هەردوو لەپ دەبوون، پاشان سەرجەم جەستەی شۆرد، ئینجا لەو جێگایە هەستا، ئینجا قاچەکانی شۆرد، پاشان دەستەسڕم بۆی هێنا ڕەتی کردەوە.

## بَابُ تَخْلِيلِ أُصُولِ شَعْرِ الرَّأْسِ بِالْمَاءِ قَبْلَ إِفْرَاغِ الْمَاءِ عَلَى الرَّأْسِ، وَحَثْيِ الْمَاءِ عَلَى الرَّأْسِ بَعْدَ التَّخْلِيلِ حَثَيَاتٍ ثَلَاثٍ

**٢٤٢**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يَصُبُّ مِنَ الْإِنَاءِ عَلَى يَدِهِ الْيُمْنَى فَيُفْرِغُ عَلَيْهَا فَيَغْسِلُهَا، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى شِمَالِهِ فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، وَيَتَوَضَّأُ كَوُضُوئِهِ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ

---

(١) صحيح.

يُدْخِلُ كَفَّهُ فِي الْإِنَاءِ فَيَقُولُ بِيَدِهِ فِي شَعْرِهِ هَكَذَا يُخَلِّلُهُ بِيَدِهِ حَتَّى إِذَا رَأَى أَنَّهُ قَدْ مَسَّ الْمَاءُ بَشَرَتَهُ حَتَّى الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ، وَأَفْضَلَ فِي الْإِنَاءِ فَضْلًا يَصُبُّهُ عَلَيْهِ بَعْدَمَا يَفْرُغُ[١].

## باسی دەستهێنان بە نێو قژی سەردا بە ئاو پێش ئاوکردن بە سەردا، وە سێ جار ئاوکردن بە سەردا بە هەردوو لەپ دوای دەستخستنە نێوی

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خۆی بشۆردایە لە لەشگرانی ئاوی دەکرد بە دەستی ڕاستیدا و دەیشۆرد، پاشان ئاوی دەکرد بە دەستی چەپیدا عەورەتی دەشۆرد، وە دەستنوێژی دەگرت وەك دەستنوێژگرتنی بۆ نوێژ، پاشان لەپی دەستی دەخستە نێو قاپەکە و بەو شێوەیە دەستی دەخستە نێو قژی دەستی دەهێنا و دەبرد هەتا هەستی دەکرد ئاو گەیشتووە بەتەواوی پێستی سەری، ئینجا بە هەردوو لەپی دەستی سێ جار ئاوی دەکرد بە سەریدا، وە هەر ئاوێکی زیادە دوای ئەوە بمایەتەوە دەیکرد بە سەریدا.

## بَابُ اكْتِفَاءِ صَاحِبِ الْجُمَّةِ وَالشَّعْرِ الْكَثِيرِ بِإِفْرَاغِ ثَلَاثِ حَثَيَاتٍ مِنَ الْمَاءِ عَلَى الرَّأْسِ فِي غُسْلِ الْجَنَابَةِ

**٢٤٣**- عَنْ جَعْفَرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ لِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: سَأَلَنِي ابْنُ عَمِّكَ الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقُلْتُ: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُفِيضُ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثًا». فَقَالَ: إِنَّ شَعْرِي كَثِيرٌ، فَقُلْتُ: «كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ شَعْرِكَ وَأَطْيَبَ»[٢].

## باسی ئەو کەسەی قژی تا سەرشانی هاتووە و زۆرە، ئەوەندە بەسە سێ مشت ئاو بکات بە سەریدا لە غوسلدەرکردنی لەشگرانی

واتە: جەعفەر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ پێمی وت: کوڕە مامەکەت پرسیاری لێ کردم حەسەنی کوڕی موحەممەد دەربارەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

غوسلدەرکردن لە لەشگرانی، وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار ئاوی کرد بە سەریدا. وتی: من قژم زۆرە، وتم: قژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قژی تۆ زۆرتر و خاوێنتر بووە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ بَدْءِ الْمُغْتَسِلِ بِإِفَاضَةِ الْمَاءِ عَلَى الْمَيَامِنِ قَبْلَ الْمَيَاسِرِ

**٢٤٤**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُحِبُّ التَّيَامُنَ فِي شَأْنِهِ حَتَّى فِي تَرَجُّلِهِ، وَنَعْلِهِ وَطُهُورِهِ[١].

## باسی چاکتر وایە ئەو کەسەی خۆی دەشوات سەرەتا ئاو بکات بە ئەندامەکانی لای ڕاستیدا، پێش لای چەپی

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ (دەسپێکردن بە) لای ڕاستی پێ خۆش بوو لە کاروبارەکانیدا تەنانەت لە قژداهێنانی و نەعللەپێکردنی و دەستنوێژ و خۆشۆردنیدا.

**٢٤٥**- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْتَسِلُ مِنْ حِلَابٍ، فَيَأْخُذُ بِكَفَّيْهِ فَيَجْعَلُهُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَيَأْخُذُ بِكَفَّيْهِ فَيَجْعَلُهُ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ، ثُمَّ يَأْخُذُ بِكَفَّيْهِ فَيَجْعَلُهُ فِي وَسَطِ رَأْسِهِ[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەشۆرد لە قاپی شیردۆشیندا بە هەردوو لەپی ئاوی دەردەهێنا و دەیکرد بە لای ڕاستیدا، پاشان بە هەردوو لەپی ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بەلای چەپیدا، دواتر بە هەردوو لەپی ئاوی هەڵدەگرت و دەیکرد بە نێوەڕاستی سەریدا.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَرْكِ الْمَرْأَةِ نَقْضَ ضَفَائِرِ رَأْسِهَا فِي الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ

**٢٤٦**- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي فَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِينَ عَلَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ فَتَطْهُرِينَ» أَوْ قَالَ: «فَإِذَا أَنْتِ قَدْ تَطَهَّرْتِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە ئافرەت لە کاتی غوسڵدەرکردنی لەشگرانی پەلکەکانی قژی نەکاتەوە

واتە: دایکی سەلەمە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکم پرچم دەهۆنمەوە ئایا بۆ خۆشۆردنی لەشگرانی شی بکەمەوە؟ فەرمووی: بەڵکوو ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بکەیت بە سەرتدا، پاشان دەیکەیت بەسەر هەموو جەستەتدا پاك دەبیتەوە، یان فەرمووی: ئەوە تۆ پاك بوویتەوە.

**٢٤٧-** عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: بَلَغَ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄ يَأْمُرُ نِسَاءَهُ أَنْ يَنْقُضْنَ رُءُوسَهُنَّ إِذَا اغْتَسَلْنَ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَقَالَتْ: يَا عَجَبَاهْ، لِابْنِ عَمْرٍو هَذَا لَقَدْ كَلَّفَهُنَّ تَعَبًا، أَفَلَا يَأْمُرُهُنَّ أَنْ يَحْلِقْنَ رُءُوسَهُنَّ؟ لَقَدْ كُنْتُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَغْتَسِلُ مِنَ الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ نَشْرَعُ فِيهِ جَمِيعًا فَمَا أَزِيدُ عَلَى ثَلَاثِ حَفَنَاتٍ[1].

واتە: عوبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێ: هەواڵ گەیشت بە عائیشە ﵂ کە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵄ فەرمانی بە خێزانەکانی دەکرد پەلکەکانیان شی بکەنەوە ئەگەر غوسلی لەشگرانییان دەرکرد، عائیشە وتی: چەند سەیرە ئەوەی ئیبنو عومەر دەیکات، بەڕاستی ماندووی کردوون، ئایا بۆ فەرمانیان پێ ناکات سەریان بتاشن؟ بێگومان من و پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو یەك تەشت (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد، هەردووکمان پێکەوە ئاومان لێی دەردەکرد سێ گوێل زیاترم بەکار نەدەهێنا.

## بَابُ غُسْلِ الْمَرْأَةِ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ غُسْلَهَا كَغُسْلِ الرَّجُلِ سَوَاءً

**٢٤٨** - عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أَسْمَاءَ ﵂ سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْمَحِيضِ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَسَأَلَتْهُ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ قَالَ: «تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا فَتَطْهُرَ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ حَتَّى يَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهَا» فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی غوسلدەرکردنی ئافرەت لە لەشگرانی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی غوسلدەکردنی وەکوو غوسلدەرکردنی پیاو وایە

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە ئەسماء ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی غوسلدەرکردن لە سوڕی مانگانە، -هەندێ لە فەرموودەکەی باس کرد- (ئەوەی کە پەیوەستە بە سەرباسەکەوە)، وە پرسیاری لێ کرد دەربارەی چۆنییەتی غوسلدەرکردن لە سوڕی مانگانە؟ فەرمووی: با، هەریەکێکتان ئاوەکەی هەڵبگرێ خۆی پێ پاك بکاتەوە، دواتر بەچاکترین شێوە دەستنوێژ بگرێ، پاشان ئاو بکات بەسەر سەریدا و دەست بهێنێ بە نێویدا هەتا ئاو دەگاتە بێخی سەری، ئینجا ئاو بکات بە سەریدا، عائیشە ﷺ وتی: چاکترینی ئافرەتان ئافرەتانی ئەنصارە شەرمنی و حەیا ڕێگرییان لێ ناکات لە ئایین تێ بگەن.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ دُخُولِ الْمَاءِ بِغَيْرِ مِئْزَرٍ لِلْغُسْلِ

**٢٤٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يُدْخَلَ الْمَاءُ إِلَّا بِمِئْزَرٍ[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لە چوونە نێو حەمام بەبێ دەرپێی کورت بۆ خۆشۆردن

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە پیاو بچێتە حەمامەوە مەگەر بە دەرپێی کورتەوە. (مەبەستی پێی حەمامی گشتییە، سەرەتا ڕێگری لە پیاوان و ئافرەتان کرد نەچنە حەمامە گشتییەکان، دواتر مۆڵەتی دا بە پیاوان، بۆیە مۆڵەتی نەدا بە ئافرەتان چونکە هەموو جەستەیان عەورەتە، مەگەر لە حاڵەتی ناچاری وەك ئەوەی نەخۆش بۆ چارەسەر بچێتە حەمامی گەرم، یان خوێنی زەیسانی نەمابێت بۆ ئەوە بچێت خۆی پاکەوە بکات، یان لەشی گران بێت و ئاو سارد بێت نەتوانێ گەرمی بکات).

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ اغْتِسَالِ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ وَهُمَا جُنُبَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ

٢٥٠- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَقَالَ بُنْدَارٌ: مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الْجَنَابَةِ[1].

## باسی خۆشۆردنی پیاو و ئافرەت بە ئاو لەنێو یەك تەشتدا لە کاتێکدا هەردووکیان لەشیان گران بێت

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو یەك تەشتدا (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد و لەشگرانیمان دەردەکرد.

## بَابُ إِفْرَاغِ الْمَرْأَةِ الْمَاءَ عَلَى يَدِ زَوْجِهَا لِيَغْسِلَ يَدَيْهِ قَبْلَ إِدْخَالِهِمَا الْإِنَاءَ إِذَا أَرَادَ الِاغْتِسَالَ مِنَ الْجَنَابَةِ

٢٥١- عَنْ مُعَاذَةَ وَهِيَ الْعَدَوِيَّةُ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَتَغْتَسِلُ الْمَرْأَةُ مَعَ زَوْجِهَا مِنَ الْجَنَابَةِ مِنَ الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ جَمِيعًا؟ قَالَتِ: «الْمَاءُ طَهُورٌ وَلَا يُجْنِبُ الْمَاءَ شَيْءٌ، لَقَدْ كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْإِنَاءِ الْوَاحِدِ، قَالَتْ: أَبْدَأُهُ فَأُفْرِغُ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَغْمِسَهُمَا فِي الْمَاءِ[2].

## باسی ژن ئاو بکات بەسەر دەستی مێردەکەی بۆ ئەوەی دەستی بشوات، پێش ئەوەی دەستی بخاتە نێو تەشتەکە، ئەگەر ویستی غوسلی لەشگرانی دەربکات

واتە: موعازەی عەدەوییە دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە رضي الله عنها: ئایا دروستە ژن لەگەڵ مێردەکەیدا غوسل دەربکات لەنێو یەك قاپدا پێکەوە (ئاوی لێ دەربهێنن)؟ وتی: بەڵێ، ئاو پاکە بە هیچ لەشگران نابێت، من و پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەوە لەنێو یەك قاپدا (ئاومان دەردەهێنا و) خۆمان پێ دەشۆرد. وتی: سەرەتا من ئاوم دەکرد بە دەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێش ئەوەی دەستی بخاتە نێو ئاوەکە.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالِاغْتِسَالِ إِذَا أَسْلَمَ الْكَافِرُ

**٢٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْلًا، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ سَيِّدُ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ - فَذَكَرَ حَدِيثًا طَوِيلًا - وَقَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَطْلِقُوا ثُمَامَةَ فَانْطَلَقَ إِلَى نَخْلٍ قَرِيبٍ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ثُمَّ ذَكَرَ بَقِيَّةَ الْحَدِيثِ»[١].

## باسی فەرمانكردن بە بێباوەڕ ئەگەر موسوڵمان بوو خۆی بشوات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كۆمەڵە سوارێكی نارد، پیاوێكیان هێنا لە نەوەكانی حەنیفە پێی دەوترا: سومامەی كوڕی ئوسال گەورەی خەڵكی یەمامە بوو، بەستیانەوە بە كۆڵەكەیەك لە كۆڵەكەكانی نێو مزگەوتەكە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لای -گێڕەرەوەی فەرموودەكە فەرموودەكەی بەدووروودرێژی باس كرد- وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سومامە ئازاد بكەن، پاشان (كە ئازاد كرا) ڕۆیشت بۆ نێو باخە خورمایەك لە نزیك مزگەوت، خۆی شۆرد، پاشان هاتە نێو مزگەوتەوە، وتی: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە بێگومان موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە. -پاشان باسی پاشماوەی فەرموودەكەی كرد-.

**٢٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ ثُمَامَةَ الْحَنَفِيَّ أُسِرَ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَغْدُو إِلَيْهِ فَيَقُولُ: «مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟» فَيَقُولُ: إِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ، وَإِنْ تَمُنَّ تَمُنَّ عَلَى شَاكِرٍ، وَإِنْ تُرِدِ الْمَالَ نُعْطِكَ مِنْهُ مَا شِئْتَ، وَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ يُحِبُّونَ الْفِدَاءَ وَيَقُولُونَ: مَا يُصْنَعُ بِقَتْلِ هَذَا؟ فَمَنَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمًا فَأَسْلَمَ، فَحَلَّهُ وَبَعَثَ بِهِ إِلَى حَائِطِ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَغْتَسِلَ فَاغْتَسَلَ وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَقَدْ حَسُنَ إِسْلَامُ أَخِيكُمْ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، سومامەی حەنەفی بە دیل گیرا، پێغەمبەر ﷺ سەرلەبەیانی سەردانی دەکرد، دەیفەرموو: چیت لە لایە ئەی سومامە؟ ئەویش دەیوت: ئەگەر بمکوژی کەسێکی بەناوبانگ دەکوژی داوای خوێنەکەی دەکرێت، وە ئەگەر منەت بکەیت و لێی ببوریت کەسێکی سوپاسگوزار دەبووری، ئەگەر ماڵ و سامانیشت بووێ چیت دەوێ پێت دەدرێ، جا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێیان خۆش بوو بە ماڵ و سامان ئازادی بکەن، وە دەیانوت: چیمان دەست دەکەوێت بە کوشتنی ئەمە؟ پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بێبەرانبەر ئازادی کرد ئەویش موسوڵمان بوو، لە پایەکە کردیەوە ناردی بۆ لای باخچەکەی ئەبو تەلحە فەرمانی پێ کرد خۆی بشۆرێ، ئەویش خۆی شۆرد و دوو ڕکات نوێژی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی هاوەڵەکەتان بەچاکی موسوڵمان بوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ غُسْلِ الْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ بِالْمَاءِ وَالسِّدْرِ

**٢٥٤-** عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ ﷺ أَنَّهُ أَسْلَمَ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ[١].

## باسی چاکتر وایە بێباوەڕ ئەگەر موسوڵمان بوو بە ئاو و سیدر خۆی بشوات

واتە: قەیسی کوڕی عاصم ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو موسوڵمان بوو، دواتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد بە ئاو و (گەڵای داری) سیدر خۆی بشوات.

**٢٥٥-** عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ ﷺ أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَخْلَاهُ، فَأَسْلَمَ فَأَمَرَهُ أَنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ[٢].

واتە: قەیسی کوڕی عاصم ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ جیای کردەوە بەتەنها قسەی لەگەڵ کرد، پاشان موسوڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد بە ئاو و (گەڵای داری) سیدر خۆی بشوات.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ غُسْلِ التَّطْهِيرِ وَالِاسْتِحْبَابِ مِنْ غَيْرِ فَرْضٍ وَلَا إِيجَابٍ
## بَابُ اسْتِحْبَابِ الِاغْتِسَالِ مِنَ الْحِجَامَةِ، وَمِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ

**٢٥٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يُغْتَسَلُ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنَ الْجَنَابَةِ، وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ، وَغُسْلِ الْمَيِّتِ، وَالْحِجَامَةِ[١].

## کۆباسی غوسلدەرکردن بە مەبەستی پاکبوونەوە و بەباشزانین، بەبێئەوەی کە فەرز و پێویست (واجب) بێت
## باسی بەباشزانینی خۆشۆردن لە کەڵەشاخکردن و لە شۆردنی مردوو

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆ چوار شت یان لەبەر چوار شت خۆ دەشۆردرێ: بۆ لەشگرانی و ڕۆژی هەینی و شۆردنی مردوو و کەڵەشاخکردن.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ اغْتِسَالِ الْمُغْمَى عَلَيْهِ بَعْدَ الْإِفَاقَةِ مِنَ الْإِغْمَاءِ

**٢٥٧-** عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﵂، فَقُلْتُ: أَلَا تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟» فَقُلْنَا: لَا هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ». قَالَتْ: فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟» فَقُلْنَا: لَا، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: «ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ» فَفَعَلْنَا قَالَتْ: فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: «أَصَلَّى النَّاسُ؟» فَقُلْنَا: لَا، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## باسی باشتر وایە ئەو کەسەی بێهۆش دەبێت دوای ئەوەی هۆشی هاتەوە خۆی بشوات

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵای (کوڕی عوتبە) دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای عائیشە ﵂ وتم: ئایا باسی نەخۆشی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ ناکەی؟ وتی: بەڵێ، کاتێ نەخۆشییەکەی قورس بوو، فەرمووی: ئایا خەڵکی نوێژیان کردووە؟ وتمان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی: ئاوم بۆ بخەنە نێو تەشتێکەوە، وتی: ئێمەش ئەوەمان کرد، خۆی شۆرد، پاشان ویستی هەستێت بێهۆش کەوت، پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە، فەرمووی: ئایا خەڵکی نوێژیان کردووە؟ وتمان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، فەرمووی: ئاوم بۆ بخەنە نێو تەشتێکەوە، ئێمەش ئەوەمان کرد، خۆی شۆرد، پاشان ویستی هەستێت بێهۆش کەوت، پاشان بەهۆش خۆی هاتەوە، فەرمووی: ئایا خەڵکی نوێژیان کردووە؟ وتمان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن، وتی: خەڵکەکەش لە مزگەوت لە چاوەڕوانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون بۆ نوێژی عیشا. پاشان فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اغْتِسَالَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْإِغْمَاءِ لَمْ يَكُنِ اغْتِسَالَ فَرْضٍ وَوُجُوبٍ، وَإِنَّمَا اغْتَسَلَ اسْتِرَاحَةً مِنَ الْغَمِّ الَّذِي أَصَابَهُ فِي الْإِغْمَاءِ لِيُخَفَّفَ بَدَنَهُ وَيَسْتَرِيحَ

٢٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ: صُبُّوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ لَعَلِّي أَسْتَرِيحُ فَأَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَجْلَسْنَاهُ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ مِنْ نُحَاسٍ، وَسَكَبْنَا عَلَيْهِ الْمَاءَ مِنْهُنَّ حَتَّى طَفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ، ثُمَّ خَرَجَ[1].

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خۆشۆردنی پێغەمبەر ﷺ لە بێهۆشبوونی لەو خۆشۆردنانە نەبوو کە فەرز و پێویستن، بەڵکوو بۆ ئەوە خۆی شۆرد پشوو بدات لەو بێتاقەتییەی تووشی بووبوو لە بێهۆشی، بۆ ئەوەی جەستەی سووک بێت و پشوو بدات**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشییەکەیدا کە پێیەوە کۆچی دوایی کرد فەرمووی: ئاو بکەن بە سەرمدا لە حەوت کونە دەمەکانیان نەکرابێتەوە بەڵکوو پشوو بدەم و قسە بۆ خەڵکی بکەم، عائیشە وتی: لەنێو تەشتێکی مسدا داماننیشاند کە هی حەفصە بوو، ئاومان کرد بە سەریدا هەتا ئاماژەی بۆ کردین ئیدی بەسە ئیشی خۆتانتان کرد، پاشان دەرچوو.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ اغْتِسَالِ الْجُنُبِ لِلنَّوْمِ

**٢٥٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ كَيْفَ كَانَ نَوْمُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ، وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ[1].

**باسی چاکتر وایە لەشگران بۆ خەوتن خۆی بشوات**

واتە: عەبدوڵای کوڕی قەیس دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەخەوت کە لەشی گران بووایە؟ وتی: هەموو ئەوانەی دەکرد، هەندێ جار خۆی دەشۆرد و دەخەوت هەندێ جاریش دەستنوێژی دەگرت و دەخەوت.

## بَابُ ذِكْرِ دَلِيلٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ كَانَ يَأْمُرُ بِالْوُضُوءِ قَبْلَ نُزُولِ سُورَةِ الْمَائِدَةِ

**٢٦٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَنْبَسَةَ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي أَوَّلِ مَا بُعِثَ وَهُوَ بِمَكَّةَ، وَهُوَ حِينَئِذٍ مُسْتَخْفٍ فَقُلْتُ مَا أَنْتَ؟ قَالَ: «أَنَا نَبِيٌّ». قُلْتُ: وَمَا النَّبِيُّ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: آللَّهُ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: بِمَ أَرْسَلَكَ؟ قَالَ: «بِأَنْ نَعْبُدَ اللَّهَ، وَنُكَسِّرَ الْأَوْثَانَ، وَدَارَ الْأَوْثَانِ، وَنَوْصِلَ الْأَرْحَامُ». قُلْتُ: نِعْمَ مَا أَرْسَلَكَ بِهِ، قُلْتُ: فَمَنْ تَبِعَكَ عَلَى هَذَا؟ قَالَ: « عَبْدٌ وَحُرٌّ - يَعْنِي

---

(١) صحيح.

أَبَا بَكْرٍ وَبِلَالًا - فَكَانَ عَمْرٌو يَقُولُ: رَأَيْتُنِي وَأَنَا رُبْعُ الْإِسْلَامِ - أَوْ رَابِعُ الْإِسْلَامِ - قَالَ: فَأَسْلَمْتُ قَالَ: أَتَّبِعُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا، وَلَكِنِ الْحَقْ بِقَوْمِكَ فَإِذَا أُخْبِرْتَ أَنِّي قَدْ خَرَجْتُ فَاتَّبِعْنِي» قَالَ: فَلَحِقْتُ بِقَوْمِي، وَجَعَلْتُ أَتَوَقَّعُ خَبَرَهُ وَخُرُوجَهُ حَتَّى أَقْبَلَتْ رُفْقَةٌ مِنْ يَثْرِبَ، فَلَقِيتُهُمْ فَسَأَلْتُهُمْ عَنِ الْخَبَرِ، فَقَالُوا: قَدْ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَقُلْتُ: وَقَدْ أَتَاهَا؟ قَالُوا: نَعَمْ قَالَ: فَارْتَحَلْتُ حَتَّى أَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: أَتَعْرِفُنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ أَنْتَ الرَّجُلُ الَّذِي أَتَانِي بِمَكَّةَ» فَجَعَلْتُ أَتَحَيَّنُ خَلْوَتَهُ، فَلَمَّا خَلَا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَلِّمْنِي مِمَّا عَلَّمَكَ اللَّهُ وَأَجْهَلُ. قَالَ: «سَلْ عَمَّا شِئْتَ». قُلْتُ: أَيُّ اللَّيْلِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: «جَوْفُ اللَّيْلِ الْآخِرِ، فَصَلِّ مَا شِئْتَ؛ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الصُّبْحَ، ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَتَرْتَفِعُ قَيْدَ رُمْحٍ أَوْ رُمْحَيْنِ، فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ، وَتُصَلِّي لَهَا الْكُفَّارُ، ثُمَّ صَلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى يَعْدِلَ الرُّمْحَ ظِلُّهُ، ثُمَّ أَقْصِرْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ وَتُفْتَحُ أَبْوَابُهَا، فَإِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَلِّ مَا شِئْتَ؛ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ وَتُصَلِّي لَهَا الْكُفَّارُ، وَإِذَا تَوَضَّأْتَ فَاغْسِلْ يَدَيْكَ فَإِنَّكَ إِذَا غَسَلْتَ يَدَيْكَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ أَطْرَافِ أَنَامِلِكَ، ثُمَّ إِذَا غَسَلْتَ وَجْهَكَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ وَجْهِكَ، ثُمَّ إِذَا مَضْمَضْتَ وَاسْتَنْثَرْتَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ مَنَاخِرِكَ، ثُمَّ إِذَا غَسَلْتَ يَدَيْكَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ ذِرَاعَيْكَ، ثُمَّ إِذَا مَسَحْتَ بِرَأْسِكَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ أَطْرَافِ شَعْرِكَ، ثُمَّ إِذَا غَسَلْتَ رِجْلَيْكَ خَرَجَتْ خَطَايَاكَ مِنْ رِجْلَيْكَ، فَإِنْ ثَبَتَّ فِي مَجْلِسِكَ كَانَ ذَلِكَ حَظَّكَ مِنْ وُضُوئِكَ، وَإِنْ قُمْتَ فَذَكَرْتَ رَبَّكَ وَحَمِدْتَ وَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلًا عَلَيْهِمَا بِقَلْبِكَ كُنْتَ مِنْ خَطَايَاكَ كَيَوْمِ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ» قَالَ: قُلْتُ يَا عَمْرُو اعْلَمْ مَا تَقُولُ فَإِنَّكَ تَقُولُ أَمْرًا عَظِيمًا قَالَ: «وَاللَّهِ لَقَدْ كَبِرَتْ سِنِيَّ وَدَنَا أَجَلِي، وَإِنِّي لَغَنِيٌّ عَنِ الْكَذِبِ، وَلَوْ لَمْ أَسْمَعْهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ مَا حَدَّثْتُهُ، وَلَكِنِّي قَدْ سَمِعْتُهُ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بە دەستنوێژگرتن پێش دابەزینی سورەتی مائیدە

واتە: عەمری کوڕی عەنبەسە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم جار کە پەیامی بۆ هات، هاتم بۆ خزمەتی لە مەککە، ئەو کاتە بانگەوازی بەنهێنی دەکرد، وتم: تۆ کێی؟

---

(١) صحيح.

فەرمووی: من پێغەمبەرم؟ وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ چییە؟ فەرمووی: نێردراوی خوایە، وتی: ئایا خوا تۆی ڕەوانە کردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: بەچی ڕەوانەی کردوویت؟ فەرمووی: بەوەی خوا بپەرستین و بتەکان بشکێنین و هەروەها ئەو خانووانەش کە بتەکانیان تێدایە، پەیوەندی خزمایەتیش پتەو بکەین، وتم: بە چاکترین شت نێردراوی، وتم: کێ شوێنت کەوتووە لەسەر ئەو پەیامە؟ فەرمووی: کۆیلەیەك و ئازادێك -واتە: ئەبو بەکر و بیلال- عەمر دەیوت: بینیم من چوارەمین کەس بووم لە ئیسلام، وتی: موسوڵمان بووم، وتی: شوێنت بکەوم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: نەخێر، بەڵام پەیوەندی بکە بە قەومەکەتەوە، ئەگەر هەواڵت پێ گەیشت من دەرچووم (بۆ کۆچکردن) شوێنم بکەوە، وتی: چووم بۆ نێو قەومەکەی خۆم و چاوەڕوانی هەواڵی ئەو و دەرچوونیم دەکرد، تا گەیشتم بە هەندێك لە دۆست و هاوڕێکانم لە خەڵکی یەسریب، پرسیارم لێ کردن لەو بارەیەوە، وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە کۆچی کردووە بۆ مەدینە، وتم: هاتووە بۆ یەسریب؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دواتر ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە خزمەتی، وتم: ئایا دەمناسیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بەڵێ، تۆ ئەو پیاوەی کە لە مەککە هاتی بۆ لام، دواتر چاوەڕوانم دەکرد لای چۆڵ بێت، کاتێ کە لای چۆڵ بوو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خوا فێری کردووی و من نایزانم فێرم بکە، فەرمووی: پرسیار لە هەر شتێك بکە کە دەتەوێ، وتم: چی کاتێکی شەو نزیکترینە بۆ وەرگرتنی نزا و پاڕانەوە؟ فەرمووی: نیوەی کۆتایی شەو، ئەگەر ویستت نوێژ بکە، چونکە نوێژکردن لەو کاتەدا فریشتەکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن و دەینووسن (یان پیاوچاکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن) تا نوێژی بەیانی دەکەی، پاشان واز لە نوێژکردن بهێنە تا خۆر دەردەچێت و بەرز دەبێتەوە بە ئەندازەی ڕمێك یان دوو ڕم، چونکە خۆر دەردەچێت لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان، ئەو کاتەش کاتی نوێژی بێبڕواکانە، پاشان ئەوەندەی لە تواناتدایە نوێژ بکە تا سێبەری ڕم یەکسان دەبێ، پاشان دەست هەڵگرە لە نوێژ چونکە لەو کاتەدا دۆزەخ گڕ دەگرێت و دەرگاکانی دەکرێتەوە، جا ئەگەر خۆر ترازا ئەوەندەی دەتەوێ نوێژ بکە، چونکە نوێژکردن لەو کاتەدا فریشتەکان ئامادەی دەبن و شایەتی بۆ دەدەن و دەینووسن تا نوێژی عەسر دەکەی، پاشان دەست هەڵ بگرە لە نوێژ تا

خۆر ئاوا دەبێت، چونکە ئاوا دەبێت لە نێوان هەردوو شاخی شەیتان، ئەو کاتەش کاتی نوێژی بێبڕواکانە، وە ئەگەر دەستنوێژت گرت هەردوو دەستت بشۆرە، چونکە ئەگەر دەستەکانت شۆرد گوناهەکانت لەسەر پەنجەکانتەوە دەردەچێت، پاشان ئەگەر ڕوخسارت شۆرد گوناهەکانت لە ڕوخسارتەوە دەردەچێت، پاشان ئەگەر ئاوت وەردایە دەمت و مشت کرد گوناهەکانت لە کونە لووتتەوە دەردەچێت، پاشان ئەگەر دەستەکانت شۆرد گوناهەکانت لە هەردوو باڵتەوە دەردەچێت، دواتر ئەگەر مەسحی سەرت کرد گوناهەکانت لە دەوروبەری قژتەوە دەردەچێت، پاشان ئەگەر قاچەکانت شۆرد گوناهەکانت لە هەردوو قاچتەوە دەردەچێت، ئەگەر لە جێگای خۆت مایتەوە ئەوە بەشی تۆیە لە دەستنوێژەکەت، وە ئەگەر هەستایت و یادی خوات کرد و دوو ڕکات نوێژت کرد دڵت لەلای بوو ئەوە وەکوو ئەوە وایە ئەو ڕۆژە لە دایك بووبیت، وتی: وتم: ئەی عەمر بزانە چی دەڵێی چونکە تۆ قسەیەکی گەورە دەکەی، وتی: سوێند بە خوا تەمەنم گەورە بووە و کەوتوومەتە نێو ساڵەوە و مەرگم نزیك بووەتەوە هیچ پێویستییەکم بەوە نییە درۆ بکەم، ئەگەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەمبیستایە جارێك یان دوو جار باسم نەدەکرد، بەڵام من زیاتر لەوە لێم بیستووە.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ التَّيَمُّمِ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ فِي السَّفَرِ، وَعِنْدَ الْمَرَضِ الَّذِي يُخَافُ فِي إِمْسَاسِ الْمَاءِ مَوَاضِعَ الْوُضُوءِ وَالْبَدَنِ فِي غُسْلِ الْجَنَابَةِ لِلْمَرِيضِ الْمَخُوفِ أَوِ الْأَلَمِ الْمُوجِعِ أَوِ التَّلَفِ

## بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ مِنْ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ بِلَا تَيَمُّمٍ عِنْدَ عَدَمِ الْمَاءِ قَبْلَ نُزُولِ آيَةِ التَّيَمُّمِ

**٢٦١-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ قِلَادَةً مِنْ أَسْمَاءَ فَهَلَكَتْ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي طَلَبِهَا، فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلَاةُ فَصَلَّوْا بِغَيْرِ وُضُوءٍ، فَلَمَّا أَتَوَا النَّبِيَّ ﷺ شَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ، فَنَزَلَتْ آيَةَ التَّيَمُّمِ « قَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ: «جَزَاكَ اللَّهُ خَيْرًا، فَوَاللَّهِ مَا نَزَلَ بِكَ أَمْرٌ قَطُّ إِلَّا جَعَلَ اللَّهُ لَكَ مِنْهُ مَخْرَجًا، وَجَعَلَ لِلْمُسْلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةً»[1].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی تەیەموم لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو لە سەفەردا، وە لە کاتی ئەو نەخۆشییەی مەترسی ئەوەی لێ بکرێ ئاو بەر شوێنی دەستنوێژ و جەستەی بکەوێت لە غوسلدەرکردنی لەشگرانی نەخۆشییەکەی زیاد بکات، یان تووشی ئازارێکی بەئێش بێت یان لەناوچوون

### باسی پێش دابەزینی ئایەتی تەیموم ڕێگەدراو بوو نوێژ بەبێ تەیەموم بکرێ، لە کاتی نەبوونی ئاو

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، ئەو ملوانکەیەکی لە ئەسماء وەرگرت ونی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکێکی لە هاوەڵانی نارد بۆ دۆزینەوەی، کاتی نوێژ هات بەبێ دەستنوێژ نوێژیان کرد، کاتێ گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەیان بۆی باس کرد، ئینجا ئایەتی تەیەموم دابەزی، ئوسەیدی کوڕی حوزەیر وتی: خوا پاداشتت بداتەوە، سوێند بە خوا هەر شتێك تووشی تۆ بووبێ ئیللا خوا دەرچەیەکی بۆت کردۆتەوە و کردوویەتی بە خێر و بەرەکەت بۆ موسوڵمانان.

### بَابُ الرُّخْصَةِ فِي النُّزُولِ فِي السَّفَرِ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ لِلْحَاجَةِ تَبْدُو مِنْ مَنَافِعِ الدُّنْيَا

٢٦٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁ فَقَالُوا: أَلَا تَرَى إِلَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ ﵂؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبِالنَّاسِ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[١].

### باسی مۆڵەتدان بەوەی بەندە لە کاتی گەشتکردنی دابەزێتە ناوچەیەك ئاوی تێدا نەبێ، بەهۆی سوودێکی دنیایی

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لە یەکێك لە گەشتەکانیدا تا گەیشتینە (الْبَيْدَاء) (کە جێگایەکە لە نێوان مەککە و مەدینە)، یان

---

(١) صحيح.

(ذات الجيش)، ملوانەکەکەم پچڕا پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە بە مەبەستی دۆزینەوەی، خەڵکەکەش لەگەڵی مانەوە، لە ناوچەیەك بوون ئاوی تێدا نەبوو، ئاویشیان پێ نەبوو، خەڵکەکە هاتن بۆ لای ئەبو بەکری صدیق ﷺ وتیان: ئایا نابینی عائیشە ﷺ چی کرد؟ پێغەمبەری خوای ﷺ هێشتەوە و لەگەڵ خەڵکەکە نە لەسەر ئاوێکن و نە ئاویشیان پێیە، ئەبو بەکر هات پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لەسەر ڕانم بوو خەوی لێ کەوتبوو، ئینجا بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد.

## بَابُ ذِكْرِ مَا كَانَ اللَّهُ ﷻ فَضَّلَ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ قَبْلَهُ، وَفَضَّلَ أُمَّتَهُ عَلَى الْأُمَمِ السَّالِفَةِ قَبْلَهُمْ بِإِبَاحَتِهِ لَهُمُ التَّيَمُّمَ بِالتُّرَابِ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ

**٢٦٣-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « فُضِّلَتْ هَذِهِ الْأُمَّةُ عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ: جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَجُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ، وَأُعْطِيتُ هَذِهِ الْآيَاتِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مِنْ بَيْتِ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ لَمْ يُعْطَ مِنْهُ أَحَدٌ قَبْلِي وَلَا أَحَدٌ بَعْدِي[1].

## باسی ئەوەی کە خوا ﷻ فەزڵ و ڕێزی پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ داوە بەسەر پێغەمبەرانی پێش خۆی، وە فەزڵی ئوممەتەکەی داوە بەسەر ئوممەتەکانی پێشوو، بەوەی ڕێگەی داوە پێیان بە خۆڵ تەیەموم بکەن لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەم ئوممەتە فەزڵ دراوە بەسەر خەڵکیدا بە سێ شت: هەموو زەویمان بۆ کراوە بە مزگەوت و بە پاکەوەکەر، ڕیزەکانیشمان وەکوو ڕیزی فریشتەکانی لێ کراوە، ئەو ئایەتانەیشم پێ دراوە لە کۆتایی سورەتی بەقەرە لە گەنجینەیەك لەژێر عەرش، پێش من بە هیچ کەسێك نەبەخشراوە، دوای منیش بە کەس نابەخشرێ.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَا وَقَعَ عَلَيْهِ اسْمُ التُّرَابِ فَالتَّيَمُّمُ بِهِ جَائِزٌ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ «وَإِنْ كَانَ التُّرَابُ عَلَى بِسَاطٍ أَوْ ثَوْبٍ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَى الْأَرْضِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ خَبَرَ أَبِي مُعَاوِيَةَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ مُخْتَصَرٌ» جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ طَهُورًا «أَيْ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ إِذَا كَانَ الْمُحْدِثُ غَيْرَ مَرِيضٍ مَرَضًا يَخَافُ إِنْ مَاسَّ الْمَاءَ التَّلَفَ أَوِ الْمَرَضَ الْمُخَوِّفَ أَوِ الْأَلَمَ الشَّدِيدَ، لَا أَنَّهُ جَعَلَ الْأَرْضَ طَهُورًا، وَإِنْ كَانَ الْمُحْدِثُ صَحِيحًا وَاجِدًا لِلْمَاءِ، أَوْ مَرِيضًا لَا يَضُرُّ إِمْسَاسُ الْبَدَنِ الْمَاءَ»**

**٢٦٤-** عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ: جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا، وَجُعِلَ تُرَابُهَا لَنَا طَهُورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، وَجُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ، وَأُوتِيتُ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، مِنْ بَيْتِ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ لَمْ يُعْطَ مِنْهُ أَحَدٌ قَبْلِي، وَلَا أَحَدٌ بَعْدِي»(١).

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر شتێك ناوی خۆڵی بەسەردا بسەپێت تەیەمومکردن پێی دروستە لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو، ئەگەرچی خۆڵەکە لەسەر ڕاخەر یان جلوبەرگ بێت، یا لەسەر زەویش نەبێت، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی موعاویە کە بەکورتی باسمان کرد: (جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ طَهُورًا)، واتە: لە کاتی نەبوونی ئاو، ئەگەر بێدەستنوێژ نەخۆش نەبوو بە نەخۆشییەك بترسێ لەوەی بەکارهێنانی ئاو دەبێتە هۆی لەناوچوونی، یان تووشی ئازارێکی بەئێشی بکات، نەك بەو مانایەی خوا زەوی کردووە بە پاکەوەکەر ئەگەرچی بێدەستنوێژ لەشی ساغ بوو ئاوی دەست کەوت، یان نەخۆش بوو بەڵام بەرکەوتنی ئاو زیانی پێ نەدەگەیاند**

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەزڵ دراوین بەسەر خەڵکیدا بە سێ شت: هەموو زەویمان بۆ کراوە بە مزگەوت، خۆڵەکەیشی بۆمان کراوە بە پاکەوەکەر، ڕیزەکانیشمان وەکوو ڕیزی فریشتەکانی لێ کراوە، ئەو ئایەتانەیشم پێ دراوە لە کۆتایی سوڕەتی بەقەڕە لە گەنجینەیەك لەژێر عەرش، پێش من بە هیچ کەسێك نەبەخشراوە، دوای منیش بە کەس نابەخشرێ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ التَّيَمُّمِ بِتُرَابِ السِّبَاخِ «ضِدُّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ مِنْ أَهْلِ عَصْرِنَا أَنَّ التَّيَمُّمَ بِالسَّبِخَةِ غَيْرُ جَائِزٍ، وَقَوْلُ هَذِهِ الْمَقَالَةِ يَقُودُ إِلَى أَنَّ التَّيَمُّمَ بِالْمَدِينَةِ غَيْرُ جَائِزٍ، إِذْ أَرْضُهَا سَبِخَةٌ، وَقَدْ خَبَّرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهَا طَيْبَةٌ أَوْ طَابَةٌ»

**٢٦٥-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمْ أَعْقِلْ أَبَوَيَّ قَطُّ إِلَّا وَهُمْ يَدِينَانِ الدِّينَ، وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلَّا يَأْتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَرَفَيِ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَّةً - فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ - وَقَالَ فِي الْخَبَرِ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ أُرِيتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ، أُرِيتُ سَبِخَةً ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لَابَتَيْنِ وَهُمَا الْحَرَّتَانِ» فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي هِجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: « فَفِي قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «أُرِيتُ سَبِخَةً ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لَابَتَيْنِ»، وَإِعْلَامِهِ إِيَّاهُمْ أَنَّهَا دَارُ هِجْرَتِهِمْ، وَجَمِيعُ الْمَدِينَةِ كَانَتْ هِجْرَتَهُمْ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ جَمِيعَ الْمَدِينَةِ سَبِخَةٌ، وَلَوْ كَانَ التَّيَمُّمُ غَيْرَ جَائِزٍ بِالسَّبِخَةِ وَكَانَتِ السَّبِخَةُ عَلَى مَا تَوَهَّمَ بَعْضُ أَهْلِ عَصْرِنَا أَنَّهُ مِنَ الْبَلَدِ الْخَبِيثِ بِقَوْلِهِ: {وَالَّذِي خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا}الأعراف: ٥٨، لَكَانَ قَوْدُ هَذِهِ الْمَقَالَةِ أَنَّ أَرْضَ الْمَدِينَةِ خَبِيثَةٌ لَا طَيِّبَةٌ، وَهَذَا قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ الْعِنَادِ لَمَّا ذَمَّ أَهْلَ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: إِنَّهَا خَبِيثَةٌ فَاعْلَمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمَّاهَا طَيْبَةً أَوْ طَابَةً، فَالْأَرْضُ السَّبِخَةُ هِيَ طَيِّبَةٌ عَلَى مَا خَبَّرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ الْمَدِينَةَ طَيْبَةٌ، وَإِذَا كَانَتْ طَيِّبَةً وَهِيَ سَبِخَةٌ، فَاللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَمَرَ بِالتَّيَمُّمِ بِالصَّعِيدِ الطَّيِّبِ فِي نَصِّ كِتَابِهِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْمَدِينَةَ طَيْبَةٌ أَوْ طَابَةٌ مَعَ إِعْلَامِهِ إِيَّاهُمْ أَنَّهَا سَبِخَةٌ، وَفِي هَذَا مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ التَّيَمُّمَ بِالسِّبَاخِ جَائِزٌ.

## باسی ڕێگەدراوە تەیەموم بکرێ بە خۆڵی زەوییەکی شۆرەکات، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی لە خەڵکی ئەم سەردەمە پێی وایە تەیەمومکردن لە زەوی شۆرەکات دروست نییە، جا وتەی خاوەنی ئەم بۆچوونە ئەوە دەگەیەنێ تەیەموم لە مەدینە نا دروستە، چونکە زەوییەکەی شۆرەکاتە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە ئەو زەوییە (طَيْبَة)یە یان (طَابَة)یە واتە: پاکە

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە، عائیشە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: لەوەتەی دایك و باوکم ناسیوە دیندار و خواناس بوون، ڕۆژێك تێ نەدەپەڕی کە

---

(١) صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژدا سەردانیهان نەکات، -دواتر بەدرێژی فەرموودەکەی باس کرد- لە فەرموودەکەدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من لە خەونمدا شوێنی کۆچی ئێوەم پێ نیشان دراوە، زەوییەکی شۆرەکاتە بۆ کشتوکاڵ ناشێ، چونکە خوێدارە و دارخورمای زۆرە و لە نێوان دوو زنجیرە چیای بەردیندایە -دواتر بەدرێژی فەرموودەکەی باس کرد- سەربارەت بە هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە.

ئەبو بەکر وتی: لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (أُرِيتُ سَبِخَةً ذَاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لَابَتَيْنِ)، واتە: من لە خەونمدا زەوییەکی شۆرەکاتم بینی کۆچکردنی ئێوەم پێ نیشان دراوە، (کە شوێنێکە بۆ کشتوکاڵ ناشێ) لە نێوان دوو زنجیرە چیای بەردیندایە، وە ئاگاداری کردنەوە ئەو شوێنە جێگای کۆچکردنیانە، هەموو مەدینە شوێنی کوچکردنیانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەموو مەدینە بۆ کشتوکاڵ ناشێ و هیچ سەوز ناکات، چونکە شۆرەکاتە، ئەگەر تەیەموم دروست نەبووایە لە زەوییەك کە هیچ سەوز ناکات و خوێدارە وەك بەهەڵەدا چووە هەندێ لە خەڵکی سەردەمەکەمان ئەو زەوییەی هیچ سەوز ناکات و خوێدارە لە زەوییە پیسەکانە وەك خوا فەرموویەتی: (وَالَّذِي خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا)، واتە: وە ئەوەی پیس و بێخێرە دڕك و داڵ نەبێ لێی ناڕوێ و دەرنایە، بەڵام نێوەڕۆکی ئەم وتەیە ئەوەیە زەوی مەدینە پیسە پاك نییە، ئەمەش وتەی هەندێ لە سەرکەش و کەللەڕەقەکانە کاتێ کە سەرکۆنەی خەڵکی مەدینەی کردووە وتوویەتی: ئەو شارە پیسە، باش بزانە پێغەمبەر ﷺ ناوی ناو بە (طَيْبَة)یە یان (طَابَة) جا زەوی خوێدار کە مەدینەیە (طَيْبَة)یە وەك پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە مەدینە (طَيْبَة) جا ئەگەر (طَيْبَة) زەوییەکی خوێدار بێت، ئەوە خوا ﷻ فەرمانی کردووە بە تەیەمومکردن بە خۆڵی پاك لە کتێبەکەیدا، پێغەمبەریش ﷺ ڕایگەیاندوە مەدینە (طَيْبَة)یە یان (طَابَة) یە، لەگەڵ ئەوەی پێی ڕاگەیاندوون ئەو زەوییە خوێدارە، لەمەشدا ئەوە دەرکەوتووە تەیەمومکردن لەسەر زەوی خوێدار دروستە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّيَمُّمَ ضَرْبَةٌ وَاحِدَةٌ لِلْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ لَا ضَرْبَتَانِ، مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَسْحَ الذِّرَاعَيْنِ فِي التَّيَمُّمِ غَيْرُ وَاجِبٍ

**٢٦٦-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي التَّيَمُّمِ: «ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ»[١].

## باسى بەڵگە لەسەر ئەوەى تەيەموم بريتييە لە: يەك جار دەستلێدان لە زەوى، بۆ ڕوخسار و بۆ هەردوو لەپى دەست، نەك دوو جار، لەگەڵ ئەوەى بەڵگە لەسەر مەسحكردنى باڵەكان لە تەيەموم پێويست (واجب) نييە

واتە: عەمارى كوڕى ياسر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەرى خوا ﷺ دەربارەى تەيەموم فەرمووى: يەك جار دەستلێدانە (لە زەوى بۆ مەسحى) ڕوخسار و هەردوو لەپى دەست.

**٢٦٧-** عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي التَّيَمُّمِ قَالَ: «ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ».[٢]

واتە: عەمارى كوڕى ياسر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەرى خوا ﷺ دەربارەى تەيەموم فەرمووى: يەك جار دەستلێدانە (لە زەوى بۆ مەسحى) ڕوخسار و هەردوو لەپى دەست.

## بَابُ النَّفْخِ فِي الْيَدَيْنِ بَعْدَ ضَرْبِهِمَا عَلَى التُّرَابِ لِلتَّيَمُّمِ

**٢٦٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، أَنَّ رَجُلًا أَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: لَا تُصَلِّ، فَقَالَ عَمَّارٌ: أَمَا تَذْكُرُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ أَنَا وَأَنْتَ فِي سَرِيَّةٍ فَأَجْنَبْنَا، فَلَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فِي التُّرَابِ فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ»، «وَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ عَلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَ فِيهَا، وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی فووکردنە هەردوو دەست دوای لێدانیان لەسەر خۆڵ، بە مەبەستی تەیەموم

واتە: عەبدورەحمانی کوڕی ئەبزا دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب ﷺ وتی: من لەشگران بووم و ئاوم دەست ناکەوێت، عومەر ﷺ وتی: نوێژ مەکە، عەمار وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئایا بیرت نایەت من و تۆ لە سوپایەکدا بووین لەشگران بووین، ئاومان دەست نەکەوت، تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆم وەردایە نێو خۆڵ، پاشان نوێژم کرد، کاتێك هاتین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، فەرمووی: بەڵکوو ئەوەندەت بەس بوو، وە پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی دا بە زەویدا، پاشان فووی پێدا کردن، پاشان مەسحی ڕوخسار و دەستەکانی پێ کرد.

## بَابُ نَفْضِ الْيَدَيْنِ مِنَ التُّرَابِ بَعْدَ ضَرْبِهِمَا عَلَى الْأَرْضِ قَبْلَ النَّفْخِ فِيهِمَا، وَقَبْلَ مَسْحِ الْوَجْهِ وَالْيَدَيْنِ لِلتَّيَمُّمِ

**٢٦٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ ﷺ فَقَالَ: إِنَّا نَجْنُبُ، وَلَيْسَ مَعَنَا مَاءٌ - فَذَكَرَ قِصَّتَهُ مَعَ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ وَقَالَ - وَقَالَ: يَعْنِي عَمَّارًا فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا وَهَكَذَا، وَضَرَبَ بِيَدَيْهِ إِلَى التُّرَابِ، ثُمَّ نَفَضَهُمَا، ثُمَّ نَفَخَ فِيهِمَا وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ»(١).

## باسی دەستدان لەیەکتر یاخود تەکاندنیان دوای ئەوەی کە دەیاندا لە زەوی، پێش ئەوەی فوویان پێدا بکات، وە پێش مەسحکردنی ڕوخسار و هەردوو دەست بۆ تەیەموم

واتە: سەعیدی کوڕی عەبدورەحمان دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عومەر ﷺ وتی: ئێمە لەشگران دەبین ئاومان پێ نییە -باسی چیرۆکەکەی خۆی کرد لەگەڵ عەماری کوڕی یاسر ﷺ و وتی:) واتە: عەمار وتی: هاتم بۆ خزمەت

---

(١) صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێ دا فەرمووی: بەڵکوو ئەوەندەت بەسە بەم شێوەیە ئاوا و ئاوا دەستەکانت بدەی بە زەویدا، بە هەردوو دەستی دای لە خۆڵەکە، پاشان تەکاندنی (بۆ ئەوەی گڵی زۆر هەڵنەگرێ)، پاشان فووی پێیاندا کرد و مەسحی ڕوخسار و هەردوو دەستی کرد.

**٢٧٠-** عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ، وَأَبِي مُوسَى ﷺ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلًا أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الْمَاءَ شَهْرًا يَتَيَمَّمُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا يَتَيَمَّمُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ لِعُمَرَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حَاجَةٍ فَأَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَضْرِبَ بِكَفَّيْكَ عَلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ تَمْسَحَهُمَا، ثُمَّ تَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَكَ وَكَفَّيْكَ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَوْلُهُ فِي هَذَا الْخَبَرِ: ثُمَّ تَمْسَحَهُمَا هُوَ النَّفْضُ بِعَيْنِهِ وَهُوَ مَسْحُ إِحْدَى الرَّاحَتَيْنِ بِالْأُخْرَى لِيَنْفُضَ مَا عَلَيْهِمَا مِنَ التُّرَابِ.

واتە: شەقیق دەڵێ: من دانیشتبووم لەگەڵ عەبدوڵا و ئەبو موسا ﷺ، ئەبو موسا وتی: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان ئایا هەواڵم بدەرێ ئەگەر پیاوێك مانگێ لەشی گران بوو ئاوی دەست نەکەوت دەکرێت تەیموم بکات؟ عەبدوڵا وتی: با تەیەموم نەکات، ئەبو موسا وتی: قسەکەی عەمارت نەبیست کە بە عومەری وت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ پێویستییەك، لەشگران بووم ئاوم دەست نەکەوت، خۆم گەوزاند لە خۆڵدا وەك چۆن ئاژەڵ خۆی دەگەوزێنێتەوە، پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەنها ئەوەندەت بەس بوو لەپی هەردوو دەستت بدەی لە زەوی، پاشان بیانسڕی (واتە: بیانتەکێنی)، پاشان مەسحی ڕوخسار و لەپی دەستەکانتی پێ بکەیت.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی لەم فەرموودەدا: (ثُمَّ تَمْسَحَهُمَا)، مەبەستی ئەوەیە هەردوو دەستی بتەکێنێ بۆ ئەوەی ئەو خۆڵەی بەسەر دەستیەوەیە بڕوات.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْجُنُبَ يُجْزِيهِ التَّيَمُّمُ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ فِي السَّفَرِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ التَّيَمُّمَ لَيْسَ كَالْغُسْلِ فِي جَمِيعِ أَحْكَامِهِ، إِذِ الْمُغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ غُسْلٌ ثَانٍ إِلَّا بِجَنَابَةٍ حَادِثَةٍ، وَالتَّيَمُّمُ فِي الْجَنَابَةِ عِنْدَ الْإِعْوَازِ مِنَ الْمَاءِ يَجِبُ عَلَيْهِ غُسْلٌ عِنْدَ وُجُودِ الْمَاءِ»

٢٧١- عَنْ عِمْرَانِ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّا سَرَيْنَا ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى إِذَا كَانَ السَّحَرُ قَبْلَ الصُّبْحِ وَقَعْنَا تِلْكَ الْوَقْعَةِ، وَلَا وَقْعَةَ أَحْلَى عِنْدَ الْمُسَافِرِ مِنْهَا، فَمَا أَيْقَظَنَا إِلَّا حَرُّ الشَّمْسِ - فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ - وَقَالَ: ثُمَّ نادَى بِالصَّلَاةِ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ انْفَتَلَ مِنْ صَلَاتِهِ، فَإِذَا رَجُلٌ مُعْتَزِلٌ لَمْ يُصَلِّ مَعَ الْقَوْمِ، فَقَالَ لَهُ: «مَا مَنَعَكَ يَا فُلَانُ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ الْقَوْمِ؟» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَصَابَتْنِي جنابَةٌ وَلَا مَاءَ، فَقَالَ: «عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ»، ثُمَّ سَارَ وَاشْتَكَى إِلَيْهِ النَّاسُ فَدَعَا فُلَانًا - قَدْ سَمَّاهُ أَبُو رَجَاءٍ وَنَسِيَهُ عَوْفٌ - وَدَعَا عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَقَالَ لَهُمَا: «اذْهَبَا فَابْغِيَا لَنَا الْمَاءَ» فَانْطَلَقَا فَتَلَقَّيَا امْرَأَةً بَيْنَ سَطِيحَتَيْنِ أَوْ مَزَادَتَيْنِ عَلَى بَعِيرٍ - فَذَكَرَ الْحَدِيثَ - وَقَالَ: ثُمَّ نُودِيَ فِي النَّاسِ أَنِ اسْقُوا وَاسْتَقُوا، فَسُقِيَ مَنْ شَاءَ وَاسْتَقَى مَنْ شَاءَ قَالَ: وَكَانَ آخِرُ ذَلِكَ أَنْ أَعْطَى الَّذِي أَصَابَتْهُ الْجَنَابَةُ إِنَاءً مِنْ مَاءٍ، وَقَالَ: «اذْهَبْ فَأَفْرِغْهُ عَلَيْكَ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: «فَفِي هَذَا الْخَبَرِ أَيْضًا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمُتَيَمِّمَ إِذَا صَلَّى بِالتَّيَمُّمِ، ثُمَّ وَجَدَ الْمَاءَ فَاغْتَسَلَ إِنْ كَانَ جُنُبًا، أَوْ تَوَضَّأَ إِنْ كَانَ مُحْدِثًا، لَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ إِعَادَةُ مَا صَلَّى بِالتَّيَمُّمِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَأْمُرِ الْمُصَلِّيَ بِالتَّيَمُّمِ لَمَّا أَمَرَهُ بِالِاغْتِسَالِ بِإِعَادَةِ مَا صَلَّى بِالتَّيَمُّمِ. وَفِي الْخَبَرِ أَيْضًا دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ الْمُغْتَسِلَ بِالْجَنَابَةِ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ الْوُضُوءُ قَبْلَ إِفَاضَةِ الْمَاءِ عَلَى الْجَسَدِ غَيْرَ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمَّا أَمَرَ الْجُنُبَ بِإِفْرَاغِ الْمَاءِ عَلَى نَفْسِهِ، وَلَمْ يَأْمُرْهُ بِالْبَدْءِ بِالْوَضُوءِ وَغَسْلِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ، ثُمَّ إِفَاضَةِ الْمَاءِ عَلَى سَائِرِ الْبَدَنِ، كَانَ فِي أَمْرِهِ إِيَّاهُ مَا بَانَ، وَصَحَّ أَنَّ الْجُنُبَ إِذَا أَفَاضَ عَلَى نَفْسِهِ كَانَ مُؤَدِّيًا لِمَا عَلَيْهِ مِنْ فَرْضِ الْغُسْلِ، وَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ بَدْءَ الْمُغْتَسِلِ بِالْوُضُوءِ، ثُمَّ إِفَاضَةُ الْمَاءِ عَلَى سَائِرِ الْبَدَنِ اخْتِيَارٌ وَاسْتِحْبَابٌ لَا فَرْضٌ وَإِيجَابٌ.

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی لەشگران تەیەمومی بەسە لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو لە سەفەردا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی تەیەموم وەکو غوسلدەرکردن نییە لە هەموو ئەحکامەکانیدا، چونکە ئەو کەسەی خۆی دەشوات لە لەشگرانی خۆشۆردنی دووەمی لەسەر پێویست نابێت مەگەر بە لەشگرانییەکی دیکە، تەیەمومکردن لە کاتی دەستنەکەوتنی ئاو غوسلی لەسەر پێویست (واجب) دەبێت لە کاتی بوونی ئاودا**

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بوین، شەوێك ڕێمان دەکرد هەتا کۆتایی شەو پێش بەیانی، پاشان پشومان دا، هیچ پشوویەك ئەوەندەی ئەوە خۆش نەبوو بەلای گەشتیارەوە، بەخەبەر نەهاتینەوە هەتا گەرمای خۆر بەخەبەری کردینەوە، -بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان بانگ درا بۆ نوێژ و نوێژی بە خەڵکەکە کرد، پاشان نوێژەکەی تەواو کرد پیاوێکی بینی کەناری گرتبوو نوێژی لەگەڵ خەڵکەکە نەدەکرد، پێی فەرموو: چی ڕێگری لێ کردووی ئەی فڵان کەس نوێژ لەگەڵ خەڵکەکەدا بکەیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی لەشگرانی بووم و ئاویش نییە، فەرمووی: پێویستە لەسەرت خۆڵی پاك بەکار بهێنیت، بێگومان ئەوە بەسە بۆت، پاشان پێغەمبەر ﷺ کەوتە ڕێ، خەڵکەکە سکاڵای تینوێتییان بردە لای، وتی: فڵانە کەسی بانگ کرد - ئەبو ڕەجاء ناوی دەزانی بەڵام عەوف ناویانی بیر چووبوو- وە بانگی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی کرد پێیانی فەرموو: بڕۆن بگەڕێن ئاومان بۆ پەیدا بکەن، ئەوانیش ڕۆیشتن گەیشتن بە ئافرەتێك بەسەر وشترێکەوە کونەیەك ئاوی لە لا بوو، -باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان لەنێو خەڵکەکە بانگ کرا ئاو پڕ بکەن و بخۆنەوە، هەر کەسە و بە ویستی خۆی ئاوی خواردەوە و شتومەکەکانی پڕ کرد، وتی: کۆتا کەس ئاوی پێدرا ئەو پیاوە بوو کە لەشی گران بوو، فەرمووی: بڕۆ ئەو ئاوە بکە بە خۆتدا.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی تەیەموم دەکات ئەگەر بە تەیەمومەوە نوێژی کرد پاشان ئاوی دەست کەوت و خۆی شۆرد و غوسلی دەرکرد، یان ئەگەر بێدەستنوێژ بوو، دەستنوێژی گرت، پێویست نییە لەسەری

ئەو نوێژەی بە تەیەموم کردوویەتی دووبارەی بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی کرد بەو کەسەی بە تەیەموم نوێژی کرد خۆی بشوات فەرمانی پێ نەکرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە. هەروەها فەرموودەکە بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی بەهۆی لەشگرانییەوە خۆی دەشوات پێویست (واجب) نییە لەسەری پێش ئەوەی ئاو بکات بەسەر جەستەیدا دەستنوێژ بگرێ، جگە لە ئەندامەکانی دەستنوێژ نەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی کرد بە کابرای لەشگران ئاو بکات بە خۆیدا، فەرمانی پێ نەکرد سەرەتا دەستنوێژ بگرێ و ئەندامەکانی دەستنوێژ بشوات، پاشان ئاوکردن بەسەر هەموو جەستەدا شتێکی ڕوون و ئاشکرایە لە فەرمانەکەی بەو پیاوە، جا لەشگران ئەگەر ئاوی کرد بە جەستەیدا ئەوە فەڕزی لەشگرانی لەسەر لا دەچێت، لەمەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی دەستنوێژ پێش غوسلدەرکردن، پاشان ئاوکردن بەسەر هەموو جەستەدا بۆ بەباشزانینە (واتە: سوننەتە) نەك فەڕز بێت یان پێویست (واجب) بێت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّيَمُّمِ لِلْمَجْدُورِ وَالْمَجْرُوحِ، وَإِنْ كَانَ الْمَاءُ مَوْجُودًا إِذَا خَافَ إِنْ مَاسَّ الْمَاءُ الْبَدَنَ التَّلَفَ أَوِ الْمَرَضَ أَوِ الْوَجَعَ الْمُؤْلِمَ

**٢٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَرْفَعُهُ فِي قَوْلِهِ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ ﴿٤٣﴾﴾ النساء، الْآيَةَ، قَالَ: «إِذَا كَانَتْ بِالرَّجُلِ الْجِرَاحَةُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ الْقُرُوحُ أَوِ الْجُدَرِيُّ فَيَجْنُبُ فَيَخَافُ إِنِ اغْتَسَلَ أَنْ يَمُوتَ فَلْيَتَيَمَّمْ»(١).

## باسی مۆڵەتدان بە تەیەمومکردنی کەسێك ئاوسانی هەبێت، یان برینداری هەبێت، ئاویش لەبەردەست بێت، ئەگەر ترسا لەوەی ئاو بەرجەستەی بکەوێت لەناو بچێت، یان نەخۆش بکەوێت، یان تووشی ئازارێکی بەئێش بێت

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما بە مەرفوعی هێناویەتی لە فەرماییشتی خوا ﷻ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ ﴿٤٣﴾﴾ النساء، واتە: ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لە گەشتێکدا بوون. دەڵێ: ئەگەر پیاو لەپێناو خوا بریندار بوو یان چڵك و خوێنی هەبوو، یان هەر

---

(١) إسناده ضعيف.

برینێکی دیکە، لەشی گران بوو ترسا لەوەی ئەگەر خۆی بشوات دەمرێ ئەوە با تەیەموم بکات.

**٢٧٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَجُلًا أَجْنَبَ فِي شِتَاءٍ فَسَأَلَ فَأُمِرَ بِالْغُسْلِ، فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مَا لَهُمْ؟ قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ - ثَلَاثًا - قَدْ جَعَلَ اللَّهُ الصَّعِيدَ أَوِ التَّيَمُّمَ طَهُورًا»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە زستاندا لەشی گران بوو، فەرمانی پێ کرا بە غوسلدەرکردن، ئەویش خۆی شۆرد و مرد، ئەوە باس کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیان بوو بەسەریەوە کوشتیان خوا بیانکوژێ -سێ جار وای فەرموو پێیان- خوا ﷻ خۆڵی پاك یان تەیەمومی کردووە بە پاککەرەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّيَمُّمِ فِي الْحَضَرِ لِرَدِّ السَّلَامِ، وَإِنْ كَانَ الْمَاءُ مَوْجُودًا

**٢٧٤**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِي الْجُهَيْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الْأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو جُهَيْمٍ: «أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ فَرَدَّ عَلَيْهِ»[2].

## باسی چاکتر وایە تەیەموم بکات لە شوێنی نیشتەجێبوون ئەگەرچی ئاویش لەبەردەست بوو

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: من و عەبدوڵای کوڕی یەسار مەولای مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای ئەبو جوهەیمی کوڕی حارسی کوڕی صەمەی ئەنصاری، ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای بیری جەمەل (بۆ سەرئاوکردن)، پیاوێك پێی گەیشت سڵاوی لێ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) في إسناده مقال صححه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم، وضعفه الدار قطني.

(٢) صحيح.

وەڵامی نەدایەوە هەتا ڕووی کردە دیوارەکە (بۆ تەیەمومکردن)، مەسحی ڕوخسار و هەردوو دەستی کرد، پاشان وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ تَطْهِيرِ الثِّيَابِ بِالْغَسْلِ مِنَ الْأَنْجَاسِ

## بَابُ حَتِّ دَمِ الْحَيْضَةِ مِنَ الثَّوْبِ، وَقَرْصِهِ بِالْمَاءِ وَرَشِّ الثَّوْبِ بَعْدَهُ

**٢٧٥-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَ: «حُتِّيهِ، ثُمَّ اقْرُصِيهِ بِالْمَاءِ، ثُمَّ انْضَحِيهِ»[١].

## کۆباسی پاککردنەوە و شۆردنی جلوبەرگ لە پیسییەکان

## باسی کڕاندنی خوێنی سوڕی مانگانە ئەگەر بە جلەوە بوو، وە ئاوپێداکردن و دانەلەپ بە تەنیشتی پەنجەکان و ئاوپرژێنکردنی لەدوای ئەوە

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە خوێنی سوڕی مانگانە بەر جلوبەرگ بکەوێت؟ فەرمووی: بیکرێنە و پاشان ئاوی پێدا بکە و بە تەنیشت پەنجەکانت بیدە لەپەوە و بە ئاو پاکی بکەرەوە، پاشان ئاوپرژێنی بکە و نوێژی پێوە بکە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّضْحَ الْمَأْمُورَ بِهِ هُوَ نَضْحُ مَا لَمْ يُصِبِ الدَّمُ مِنَ الثَّوْبِ

**٢٧٦-** عَنْ أَسْمَاء بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄، أَنَّهَا سَمِعَتِ امْرَأَةً تَسْأَلُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِحْدَانَا إِذَا طَهُرَتْ كَيْفَ تَصْنَعُ بِثِيَابِهَا الَّتِي كَانَتْ تَلْبَسُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ رَأَتْ فِيهِ شَيْئًا فَلْتَحُكُّهُ، ثُمَّ لِتَقْرُصْهُ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، وَتَنْضَحُ فِي سَائِرِ الثَّوْبِ مَاءً وَتُصَلِّي فِيهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو ئاوپرژێنەی کە هاتووە بۆ ئەوەیە کە خوێن بەر جلوبەرگ نەکەوتبێت

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە ئافرەتێك بوو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد وتی: هەر یەکێك لە ئێمە ئەگەر پاك بۆیەوە چی لە جلوبەرگەکەی بکات کە لەبەری دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر شتێکی بینی پێیەوە با بیکرێنێ، پاشان بە تەنیشت پەنجەکانت بیداتە لەپەوە و ئاو بەو جێگایەدا بکات و هەموو جلەکەی ئاوپرژێن بکات و نوێژی پێوە بکات.

## بَابُ اسْتِحْبَابَ غَسْلِ دَمِ الْحَيْضِ مِنَ الثَّوْبِ بِالْمَاءِ وَالسِّدْرِ، وَحَكِّهِ بِالْأَضْلَاعِ «إِذْ هُوَ أَحْرَى أَنْ يَذْهَبَ أَثَرُهُ مِنَ الثَّوْبِ إِذَا حُكَّ بِالضِّلَعِ، وَغُسِلَ بِالسِّدْرِ مَعَ الْمَاءِ، مِنْ أَنْ يُغْسَلَ بِالْمَاءِ بَحْتًا»

٢٧٧- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﷺ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَ: «اغْسِلِيهِ بِالْمَاءِ وَالسِّدْرِ، وَحُكِّيهِ بِضِلْعٍ»(١).

## باسی چاکتر وایە خوێنی سوڕی مانگانە بەر جلوبەرگ کەوت بە ئاو و سیدر بشۆردرێ، وە بە دار بکرێندرێ، چونکە کڕاندنی بە دار و شۆردنی بە سیدر لەگەڵ ئاودا زووتر شوێنەوارەکەی بە جلەکەوە ناهێڵێ، لەوەی تەنها بە ئاو بشۆردرێ

واتە: دایکی قەیسی کچی میحصەن ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە خوێنی سوڕی مانگانە کە بەر جلوبەرگ دەکەوێت، فەرمووی: بە ئاو و سیدر بیشۆرە و بە دار بیکرێنە.

تێبینی: (ضلْع): لە بنچینەدا بۆ پەراسوو بەکار هاتووە، مەبەستی پێی دارە، چونکە لەو دەچێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاقْتِصَارَ مِنْ غَسْلِ الثَّوْبِ الْمَلْبُوسِ فِي الْمَحِيضِ عَلَى غَسْلِ أَثَرِ الدَّمِ مِنْهُ جَائِزٌ «وَإِنْ لَمْ يُحَكَّ مَوْضِعُ الدَّمِ بِضِلْعٍ، وَلَا قُرِصَ مَوْضِعُهُ بِالْأَظْفَارِ، وَإِنْ لَمْ يُغْسَلْ بِسِدْرٍ أَيْضًا، وَلَا رُشَّ مَا لَمْ يُصِبِ الدَّمُ مِنَ الثَّوْبِ، وَأَنَّ جَمِيعَ مَا أُمِرَ بِهِ مِنْ قَرْصٍ بِالْأَظْفَارِ، وَحَكٍّ بِالْأَضْلَاعِ، وَغَسْلٍ بِالسِّدْرِ، أَمْرُ اخْتِيَارٍ وَاسْتِحْبَابٍ، وَأَنَّ غَسْلَ الدَّمِ مِنَ الثَّوْبِ مُطَهِّرٌ لِلثَّوْبِ وَتُجْزِئُ الصَّلَاةُ فِيهِ»

**٢٧٨-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: - أَوْ قِيلَ لَهَا - كَيْفَ كُنْتُنَّ تَصْنَعْنَ بِثِيَابِكُنَّ إِذَا طَمِثْتُنَّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ: إِنْ كُنَّا لَنَطْمِثُ فِي ثِيَابِنَا، وَفِي دُرُوعِنَا فَمَا نَغْسِلُ مِنْهَا إِلَّا أَثَرَ مَا أَصَابَهُ الدَّمُ، وَإِنَّ الْخَادِمَ مِنْ خَدَمِكُمُ الْيَوْمَ لَيَتَفَرَّغُ يَوْمَ طُهْرِهَا لِغَسْلِ ثِيَابِهَا[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دروستە بۆ ئافرەت کاتێ دەکەوێتە حەیزەوە تەنها ئەو شوێنە لە جلەکەی بشوات کە خوێنی بەرکەوتووە، ئەگەرچی شوێنی خوێنەکەیش نە کرێنێ بە دار، یان جێگاکەی بە تەنیشتی پەنجەکان نەداتە لەپەوە و بە نینۆکەکانی نەیکرێنێ، هەروەها ئەگەر بە سیدریش نەیشوات و ئەو شوێنەی خوێنی بەرکەوتووە ئاوپرژێنی نەکات، بێگومان هەموو ئەوانەی فەرمانی پێ کراوە لە دانەلەپ بە تەنیشتی پەنجەکان و کراندنی بە دار و شۆردنی بە سیدر فەرمانێکە بۆ ویست و ئارەزوو و بەباشزانینە (بۆ واجببوون نییە)، بێگومان شۆردنی خوێن لە جلوبەرگ پاککەرەوەی جلوبەرگە و پاکە و نوێژی پێوە دروستە

واتە: دایکی سەلەمە ﵂ دەڵێ: -یان پێی وترا- ئێوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ چیتان لە جلوبەرگەکانتان دەکرد ئەگەر خوێنی سوڕی مانگانەی بەر بکەوتایە، وتی: ئێمە کاتێ خوێنی سوڕی مانگانە بەر جلوبەرگ و پۆشاکمان بکەوتایە تەنها ئەو جێگایەمان دەشۆرد کە خوێنی بەرکەوتبوو، بەڵام ئەمڕۆ خزمەتکارێك لە خزمەتکارەکانتان ئەو ڕۆژەی کە پاك دەبێتەوە بەتەنها خەریکی شۆردنی جلوبەرگەکانی دەبێت.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي غَسْلِ الثَّوْبِ مِنْ عَرَقِ الْجُنُبِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ عَرَقَ الْجُنُبِ طَاهِرٌ غَيْرُ نَجِسٍ»

**٢٧٩-** عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ الرَّجُلِ يَأْتِي أَهْلَهُ ثم يَلْبَسُ الثَّوْبَ فَيَعْرَقُ فِيهِ نَجِسًا ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: قَدْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ تُعِدُّ خِرْقَةً أَوْ خِرَقًا، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ مَسَحَ بِهَا الرَّجُلُ الْأَذَى عَنْهُ، وَلَمْ يَرَ أَنَّ ذَلِكَ يُنَجِّسُهُ[١].

## باسی مۆڵەت دراوە جلوبەرگ نەشۆردێ لە ئارەقی لەشگران، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئارەقی لەشگران پاكە و پیس نییە

**واتە:** قاسمی كوڕی موحەممەد دەڵێ: پرسیارم كرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی (حوكمی) پیاوێك كە لەگەڵ خێزانەكەی جووت ببێت دواتر جل لەبەر بكات و تیایدا ئارەق بكات ئایا ئەو جلە پیسە؟ عائیشە وتی: ئافرەت پارچە قوماشێك یان چەند پارچەیەكی دادەنا، ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانی جووت ببووایە خۆی پێی دەسڕی و پیسییەكەی لە خۆی لا دەبرد، پێی وا نەبوو جلوبەرگ بە ئارەقی لەشگران پیس ببێت.

**٢٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: تَتَّخِذُ الْمَرْأَةُ الْخِرْقَةَ، فَإِذَا فَرَغَ زَوْجُهَا نَاوَلَتْهُ فَيَمْسَحُ عَنْهُ الْأَذَى، وَمَسَحَتْ عَنْهَا ثُمَّ صَلَّيَا فِي ثَوْبَيْهِمَا[٢].

**واتە:** عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ئافرەت پارچە قوماشی كۆنەی دادەنا، ئەگەر پیاوەكەی لە جیاعكردن ببووایەتەوە دەیدا پێی، دواتر ئەویش پیسییەكەی لە خۆی لا دەبرد و ئینجا ژنەكەیشی خۆی پێی دەسڕی، پاشان هەردووكیان بەجلەكانیانەوە نوێژیان دەكرد.

---

(١) صحیح.

(٢) صحیح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ عَرَقَ الْإِنْسَانِ طَاهِرٌ غَيْرُ نَجِسٍ

٢٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ فُلَانٍ فَتَبْسُطُ لَهُ نِطَعًا، فَيَقِيلُ عَلَيْهِ، فَتَأْخُذُ مِنْ عَرَقِهِ فَتَجْعَلُهُ فِي طِيبِهَا(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئارەقی مرۆڤ پاکە و پیس نییە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەچوو بۆ ماڵی دایکی سولەیم ڕاخەرێکی بۆی ڕادەخست لە پێستە دروست کرابوو، ئەویش لەسەری پشووی دەدا، (دایکی سولەیمیش) لە ئارەقەکەی دەبرد دەیخستە نێو بۆنی خۆشەوە.

## بَابُ غَسْلِ بَوْلِ الصَّبِيَّةِ مِنَ الثَّوْبِ

٢٨٢- عَنْ لُبَابَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَتْ: بَالَ الْحُسَيْنُ ﷺ فِي حِجْرِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقُلْتُ: هَاتِ ثَوْبَكَ هَاتِ أَغْسِلْهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا يُغْسَلُ بَوْلُ الْأُنْثَى، وَيُنْضَحُ بَوْلُ الذَّكَرِ»(٢).

## باسی شۆردنی میزی کۆرپەلەی کچ کاتێ بەر جلوبەرگ دەکەوێت

واتە: لوبابەی کچی حاریس ﷺ دەڵێ: حوسەین ﷺ میزی کردە کۆشی پێغەمبەر ﷺ، وتم: جلەکانتم پێ بدە با بیشۆرم، فەرمووی: بێگومان میزی کۆرپەلەی مێینە دەشۆردرێ، میزی کورپەلەی نێرینە ئاوپرژێن دەکرێت.

٢٨٣- عن أَبِي السَّمْحِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ خَادِمَ النَّبِيِّ ﷺ وَجِيءَ بِالْحَسَنِ، أَوِ الْحُسَيْنِ فَبَالَ عَلَى صَدْرِهِ، فَأَرَادُوا أَنْ يَغْسِلُوهُ، فَقَالَ: «رُشُّوهُ رَشًّا؛ فَإِنَّهُ يُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ، وَيُرَشُّ بَوْلُ الْغُلَامِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو سەمح ﷺ دەڵێ: من خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووم، حەسەن یان حوسەینیان بۆی هێنا، ئەویش میزی کرد بەسەر سنگیدا، ویستیان جلەکەی بشۆرن، فەرمووی: ئاوپڕژێنی بکەن، چونکە میزی کچی کۆرپەلە دەشۆردرێت، هی کوڕی کۆرپەلەش تەنها ئاوپڕژێن دەکرێ (مەبەستی منداڵی شیرەخۆرە).

## بَابُ غَسْلِ بَوْلِ الصَّبِيَّةِ، وَإِنْ كَانَتْ مُرْضَعَةً «وَالْفَرْقُ بَيْنَ بَوْلِهَا، وَبَيْنَ بَوْلِ الصَّبِيِّ الْمُرْضَعِ»

٢٨٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي بَوْلِ الْمُرْضَعِ: «يُنْضَحُ بَوْلُ الْغُلَامِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ». قَالَ قَتَادَةُ: هَذَا مَا لَمْ يَطْعَمَا الطَّعَامَ، فَإِذَا طَعِمَا غُسِلَا جَمِيعًا[1].

## باسی شۆردنی میزی کچی کۆرپەلە ئەگەرچی شیرەخۆریش بوو، جیاوازیش لە نێوان میزی ئەو و میزی کوڕی شیرەخۆر

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی میزی کۆرپەلەی شیرەخۆرەوە فەرمووی: جلوبەرگ لە میزی کوڕ ئاوپڕژێن دەکرێت، وە لە میزی کچ دەشۆردرێت، لە ڕیوایەتی قەتادە هاتووە دەڵێ: ئەمە ئەگەر خواردن نەخۆن، ئەگەر خواردنیان خوارد هی هەموویان دەشۆردرێت.

## بَابُ نَضْحِ بَوْلِ الْغُلَامِ، وَرَشِّهِ قَبْلَ أَنْ يَطْعَمَ

٢٨٥ - عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ الْأَسَدِيَّةِ ﷺ قَالَتْ: دَخَلْتُ بِابْنٍ صَبِيٍّ لِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّهُ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## باسی ئاوپرژێنی میزی کوڕی کۆرپەلە، وە ئاورشێنکردنی پێش ئەوەی خواردن بخوات

واتە: دایکی قەیسی کچی میحصەنی ئەسەدی ﷺ دەڵێ: کوڕێکی کۆرپەلەی خۆمم هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هێشتا خواردنی نەدەخوارد، میزی کرد بە کۆشیدا، ئەویش داوای ئاوی کرد دواتر ئاوپرژێنی کرد.

ڕوونکردنەوە: (النَضْحِ) و (وَالرَّشِّ): بریتییە لە تەڕکردنێك لە کاتی گوشیندا ئاوی لێ نەتکێت.

**٢٨٦-** عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ الْأَسَدِيَّةِ ﷺ أَنَّهَا جَاءَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ، فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي حِجْرِهِ، فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ[١].

واتە: دایکی قەیسی کچی میحصەنی ئەسەدی ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کوڕێکی بچووکی لەگەڵ خۆی هێنابوو خواردنی نەدەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ داینیشاند لە کۆشیدا، کوڕەکە میزی کردە کۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوی کرد ئینجا ئاوپرژێنی کرد و نەیشۆرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ غَسْلِ الْمَنِيِّ مِنَ الثَّوْبِ

**٢٨٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهُ مَنِيٌّ غَسَلَهُ، ثُمَّ يَخْرُجُ إِلَى الصَّلَاةِ» وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى بُقْعَةٍ مِنْ أَثَرِ الْغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ «هَذَا لَفْظُ الصَّنْعَانِيِّ»، وَفِي حَدِيثِ ابْنِ الْمُبَارَكِ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْسِلُ ثَوْبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَنِيِّ، فَيَخْرُجُ وَفِي ثَوْبِهِ أَثَرُ الْمَاءِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی چاکتر وایە کە مەنی بە جلەوە بوو بشۆردرێ

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر مەنی بەر جلەکەی بکەوتایە دەیشۆرد، پاشان دەردەچوو بۆ نوێژ، منیش تەماشای جێگای شوێنەواری شۆردنەکەم دەکرد بە جلەکەیەوە. ئەمە دەستەواژەی صەنعانییە، وە لە فەرموودەی ئیبنو موبارەکدا هاتووە عائیشە دەڵێ: من جلەکانی پێغەمبەری خوام ﷺ دەشۆرد لە مەنی، دواتر دەردەچوو لە کاتێکدا شوێنەواری ئاو بە جەلەکانیەوە بوو.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمَنِيَّ لَيْسَ بِنَجَسٍ «وَالرُّخْصَةُ فِي فَرْكِهِ إِذَا كَانَ يَابِسًا مِنَ الثَّوْبِ، إِذِ النَّجَسُ لَا يُزِيلُهُ عَنِ الثَّوْبِ الْفَرْكُ دُونَ الْغَسْلِ، وَفِي صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الثَّوْبِ الَّذِي قَدْ أَصَابَهُ مَنِيٌّ بَعْدَ فَرْكِهِ يَابِسًا مَا بَانَ، وَثَبَتَ أَنَّ الْمَنِيَّ لَيْسَ بِنَجَسٍ»**

**٢٨٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا كَانَتْ تَفْرُكُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ(١).

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی مەنی پیس نییە، وە مۆڵەتدان بە کڕاندنی، ئەگەر بە جلەوە وشك بوو، چونکە پیسی بە کڕاندن لە جلوبەرگ لاناچێت مەگەر بە شۆردن، وە نوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ بەو جلەی کە مەنی پێوە بوو دوای کڕاندنی بەوشکی شتێکی ئاشکرا و دیارە، وە چەسپاوە کە مەنی پاکە و پیس نییە**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، ئەو مەنی بە جلوبەرگی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەکڕاند.

**٢٨٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَقَدْ كُنْتُ آخُذُ الْجَنَابَةَ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْحَصَاةِ(٢).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من بە بەرد شوێنەواری لەشگرانیم لە جلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لا دەبرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٢٩٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا كَانَتْ تَحُتُّ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، ئەو مەنی لە جلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە لەپەوە و دەکڕاند، ئەویش نوێژی دەکرد.

## بَابُ نَضْحِ الثَّوْبِ مِنَ الْمَذْيِ إِذَا خَفِيَ مَوْضِعُهُ فِي الثَّوْبِ

**٢٩١-** عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ أَلْقَى مِنَ الْمَذْيِ شِدَّةً وَعَنَاءً، وَكُنْتُ أُكْثِرُ الِاغْتِسَالَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «إِنَّمَا يُجْزِيكَ الْوُضُوءُ». قُلْتُ: فَكَيْفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوْبِي مِنْهُ؟ قَالَ: «يَكْفِيكَ أَنْ تَأْخُذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ تَنْضَحُ بِهِ مِنْ ثَوْبِكَ حَيْثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَ».[٢]

## باسی ئاوپرژێنکردنی جلوبەرگ بەهۆی مەزییەوە ئەگەر شوێنەکەی نەدۆزرایەوە

واتە: سەهلی کوڕی حونەیف ﵁ دەڵێ: من مەزیم زۆر بوو، زۆریش ماندووی کردبووم، وە زۆر خۆم لێی دەشۆرد، پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەیەوە، فەرمووی: تەنها ئەوەندەت بەسە دەستنوێژی بۆ بگریتەوە، وتم: ئەی چی بکەم ئەگەر جلەکانم بەری کەوت؟ فەرمووی: ئەوەندەت بەسە مشتێ ئاو هەڵبگری و ئەو شوێنەی بەر جلەکەت کەوتووە پێی ئاوپرژێن بکەی.

تێبینی: (الْمَذِي): ئاوێکی سپی تەنکی لینجە لە کاتی ورووژانی ئارەزوودا دێتە دەرەوە بەبێ چێژوەرگرتن و فیچکەکردن.

---

(١) لم أقف عليه بهذا المتن والإسناد عند غير المصنف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ وَطْءِ الْأَذَى الْيَابِسِ بِالْخُفِّ وَالنَّعْلِ «وَالدَّلِيلَ عَلَى أَنَّ ذَلِكَ لَا يُوجِبُ غَسْلَ الْخُفِّ وَلَا النَّعْلِ، وَأَنَّ تَطْهِيرَهُمَا يَكُونُ بِالْمَشْيِ عَلَى الْأَرْضِ الطَّاهِرَةِ بَعْدَهَا.

**٢٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمُ الْأَذَى بِخُفِّهِ أَوْ نَعْلِهِ فَطَهُورُهُمَا التُّرَابُ»[١].

## باسی پیسی وشك بەر خوف و نەعل بكەوێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەو پیسییە ئەگەر بەر خوف یان نەعل كەوت پێویست ناكات بشۆردرێ، بێگومان پاككردنەوەیان بە ڕێكردن دەبێت لەسەر زەوییەكی پاك و خاوێن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیسی بەر خوف یان نەعلی هەر یەكێكتان كەوت ئەوە بە خۆڵ پاك دەبێتەوە.

## بَابُ النَّهِيِ عَنِ الْبَوْلِ فِي الْمَسَاجِدِ وَتَقْذِيرِهَا

**٢٩٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا فِي الْمَسْجِدِ وَأَصْحَابُهُ مَعَهُ إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُهُ: مَهْ مَهْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: «لَا تُزْرِمُوهُ دَعُوهُ»، ثُمَّ دَعَاهُ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَا الْمَسْجِدَ لَا يَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنَ الْقَذَرِ وَالْبَوْلِ - أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ- إِنَّمَا هُوَ لِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَذِكْرِ اللَّهِ، وَالصَّلَاةِ»، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِرَجُلٍ مِنَ الْقَوْمِ: «قُمْ فَأْتِنَا بِدَلْوٍ مِنَ الْمَاءِ فَشُنَّهُ عَلَيْهِ» فَأَتَى بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَشَنَّهُ عَلَيْهِ[٢].

## باسی قەدەغەكردن لە میزكردنە نێو مزگەوتەكان و پیسكردنیان بەهۆی میزەوە

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لە مزگەوتدا دانیشتبوو، لەناكاو دەشتەكییەك هاتە ژوورەوە، میزی كردە نێو مزگەوت،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەمە چییە وەکوو سەرزەنشتکردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێی مەبڕن و وازی لێ بێنن، پاشان بانگی کرد فەرمووی: بەڕاستی ئەم مزگەوتانە ناگونجێن بۆ شوێنی پیسی و سەرئاوکردن، -یان هەر وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی - بەڵکوو بۆ قورئانخوێندن و یادی خوا و نوێژکردن دروست کراوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو لە خەڵکەکە: هەستە سەتڵێك ئاومان بۆ بهێنە، ئەویش سەتڵێ ئاوی هێنا و کردی بە شوێنەکەیدا.

## بَابُ سَلْتِ الْمَنِيِّ مِنَ الثَّوْبِ بِالْإِذْخِرِ إِذَا كَانَ رَطْبًا

**٢٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْلُتُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِهِ بِعِرْقِ الْإِذْخِرِ، ثُمَّ يُصَلِّي فِيهِ وَيَحُتُّهُ مِنْ ثَوْبِهِ يَابِسًا، ثُمَّ يُصَلِّي فِيهِ»(١).

## باسی مەنی کاتێ بەر جلوبەرگ دەکەوێ
## ئەگەر تەڕ بوو و بە دار (الْإِذْخِرِ) لا ببرێت

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنی لەسەر جلوبەرگەکەی بە پەلی داری (الْإِذْخِرِ) لا دەبرد، پاشان نوێژی پێوە دەکرد، وە بەوشکی دەیکرِاند، پاشان نوێژی پێوە دەکرد. (الْإِذْخِر: ڕووەکێکە بە زۆری لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێ بۆنێکی خۆشی هەیە بەکار دەهێنرێ بۆ نێو ماڵان).

**٢٩٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَأَى الْجَنَابَةَ فِي ثَوْبِهِ جَافَّةً فَحَتَّهَا(٢).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر مەنی بە جلوبەرگەکەیەوە ببینیایە وشك بۆتەوە دەیکرِاند.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ قَطْعِ الْبَوْلِ عَلَى الْبَائِلِ فِي الْمَسْجِدِ قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنْهُ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ صَبَّ دَلْوٍ مِنْ مَاءٍ يُطَهِّرُ الْأَرْضَ، وَإِنْ لَمْ يَحْفِرْ مَوْضِعَ الْبَوْلِ فَيَنْقُلُ تُرَابَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ عَلَى مَا زَعَمَ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ، إِذِ اللَّهُ ﷻ أَنْعَمَ عَلَى عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ بِأَنْ بَعَثَ فِيهِمْ نَبِيَّهُ ﷺ مُيَسِّرًا لَا مُعَسِّرًا»

**٢٩٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَوَثَبَ إِلَيْهِ بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُزْرِمُوهُ» ثُمَّ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لە بڕینی میزی ئەو کەسەی کە لەنێو مزگەوت میز دەکات پێش ئەوەی تەواو ببێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەتڵێک ئاو پیاکردن بەو شوێنەدا زەوییەکە پاك دەکاتەوە، ئەگەرچی جێگای میزەکەیش چاڵ نەکرێت و خۆڵەکەی لە مزگەوت دەربکرێت، وەك چۆن هەندێك لە زانا عێراقییەکان ڕایان وایە، چونکە خوا ﷻ ناز و نیعمەتی ڕشتووە بەسەر بەندە بڕوادارەکانیدا بەوەی پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون ئاسانکارە و هیچ قورسی ناکات لەسەریان

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، دەشتەکییەك میزی کردە نێو مزگەوت، هەندێ لە خەڵکەکە بۆی ڕۆیشتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێی مەبڕن، پاشان داوای سەتڵێك ئاوی کرد، دواتر کردی بە شوێنەکەیدا.

**٢٩٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَخْبَرَ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَثَارَ النَّاسُ إِلَيْهِ لِيَمْنَعُوهُ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعُوهُ، أَهْرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ، أَوْ سَجْلًا مِنْ مَاءٍ، فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتیەوە کابرایەکی دەشتەکی میزی کردە نێو مزگەوت، خەڵکەکە بۆی ڕۆیشتن بۆ ئەوەی ڕیگری لێ بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فەرموو: وازی لێ بێنن تا میزەکەی تەواو دەکات، پاشان سەتڵێك یان دۆڵکەیەك ئاو بکەن بەشوێنی میزەکەیدا، چونکە ئێوە نێردراون ئاسانکار بن، نەنێردراون قورس و گرانی بکەن.

**٢٩٨-** وَفِي حَدِيثِ سُفْيَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِي دِينِكُمْ يُسْرًا[١].

واتە: وە لە فەرموودەی سوفیانی کوڕی حوصەیندا ﷺ هاتووە فەرمووی: بەڕاستی لە ئایینەکەتاندا ئاسانکاری هەیە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ نَضْحِ الْأَرْضِ مِنْ رَبْضِ الْكِلَابِ عَلَيْهَا

**٢٩٩-** عن مَيْمُونَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَصْبَحَ ذَاتَ يَوْمٍ وَهُوَ وَاجِمٌ يُنْكَرُ مَا يُرَى مِنْهُ، فَسَأَلْتُهُ عَمَّا أَنْكَرْتُ مِنْهُ، فَقَالَ لَهَا: «وَعَدَنِي جِبْرِيلُ أَنْ يَلْقَانِي اللَّيْلَةَ، فَلَمْ أَرَهُ أَمَا وَاللَّهِ مَا أَخْلَفَنِي» قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَكَانَ «فِي بَيْتِي جَرْوٌ كَلْبٌ تَحْتَ نَضَدٍ لَنَا، فَأَخْرَجَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ نَضَحَ مَكَانَهُ بِالْمَاءِ بِيَدِهِ»، فَلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ لَقِيَهُ جِبْرِيلُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَعَدْتَنِي، ثُمَّ لَمْ أَرَكَ»، فَقَالَ جِبْرِيلُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ صُورَةٌ وَلَا كَلْبٌ»[٢].

## باسی چاکتر وایە ئاوپرژێنی ئەو شوێنە بکرێ کە سەگ تیایدا ماوەتەوە

واتە: مەیمونە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدام کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکی زۆر ناخۆش و خەماوی بەڕێ کرد، ئەوەندە خەمبار بوو تەنانەت نەیدەتوانی قسە بکات، پرسیارم لێ کرد لەوەی پێم ناخۆش بوو، کە بۆ چی خەمبارە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەڕاستی جبریل پەیمانی پێدا بووم ئەمشەو چاوی پێم بکەوێت، بەڵام چاوی پێم نەکەوت، سوێند بە خوا ئەو پەیمانی خۆی لەگەڵمدا ناشکێنێ، مەیمونە وتی: لە ماڵەکەمدا توتکە سەگێك لەژێر بۆفیەکەماندا بوو، دەری کردە دەرەوە، پاشان ئاوی هێنا شوێنەکەی ئاوپرژێن کرد، کاتێ شەو داهات جبریل چاوی پێ کەوت،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: تۆ پەیمانت پێ دام ئەمشەو چاوت پێم بکەوێ، وتی: بەڵێ: بەڵام ئێمە ناچینە ماڵێکەوە سەگ یان وێنەی تێدا بێت.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مُرُورَ الْكِلَابِ فِي الْمَسَاجِدِ لَا يُوجِبُ نَضْحًا وَلَا غَسْلًا

**٣٠٠-** عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ عُمَرُ رضي الله عنه يَقُولُ فِي الْمَسْجِدِ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: اجْتَنِبُوا اللَّغْوَ فِي الْمَسْجِدِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما: كُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكُنْتُ فَتًى شَابًّا عَزَبًا، وَكَانَتِ الْكِلَابُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ، وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ، وَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَعْنِي تَبُولُ خَارِجَ الْمَسْجِدِ، وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَمَا بَالَتْ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی تێپەڕینی سەگ بە نێو مزگەوتدا، پێویست بەوە ناکات شوێنەکەی ئاوپڕژێن بکرێ یان بشۆردرێ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: عومەر رضي الله عنه بەدەنگی بەرز لە مزگەوت دەیوت: دوور بکەونەوە لە قسەی پڕوپووچ لەنێو مزگەوت. عەبدوڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: من لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەنێو مزگەوت دەمامەوە، وە من کوڕێکی گەنجی تازەپێگەیشتوو بووم، هەروەها سەگەکان میزیان دەکرد و دەهاتن و دەڕۆیشتن لەنێو مزگەوتدا هیچ ئاوێك بە شوێنیاندا نەدەکرا. (واتە: شوێنپێیەکانیان نەدەشۆردران و ئاویان پێدا نەدەکرا).

ئەبو بەکر دەڵێ: مانای ئەوەیە: لە دەرەوەی مزگەوت میزیان دەکرد و دەهاتن و دەڕۆیشتن لەنێو مزگەوتدا دوای میزکردنیان.

---

(١) صحيح.



# كِتَابُ الصَّلَاةِ

# پەڕتووکی نوێـژ



## كِتَابُ الصَّلَاةِ «الْمُخْتَصَرُ مِنَ الْمُخْتَصَرِ مِنَ الْمُسْنَدِ الصَّحِيحِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى الشَّرْطِ الَّذِي اشْتَرَطْنَا فِي كِتَابِ الطَّهَارَةِ»

## پەرتووکی نوێژ، پوختەیەك لە پوختكراوەی ئەو فەرموودانەی سەنەدیان دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەرجەی كە داماننا لە پەرتووكی پاكوخاوێنی

### بَابُ بَدْءِ فَرْضِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

**٣٠١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ، عَنْ مَالِكِ بْنِ صَعْصَعَةَ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « بَيْنَمَا أَنَا عِنْدَ الْبَيْتِ بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ إِذْ سَمِعْتُ قَائِلًا يَقُولُ: خُذْ بَيْنَ الثَّلَاثَةِ، فَأُوتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهَا مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ ». قَالَ: «فَشُرِحَ صَدْرِي إِلَى كَذَا وَكَذَا» - قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ: مَا يَعْنِي بِهِ؟ قَالَ: إِلَى أَسْفَلِ بَطْنِهِ - « فَاسْتُخْرِجَ قَلْبِي، فَغُسِلَ بِمَاءِ زَمْزَمَ، ثُمَّ أُعِيدَ مَكَانَهُ ثُمَّ حُشِيَ إِيمَانًا وَحِكْمَةً، ثُمَّ أُوتِيتُ بِدَابَّةٍ أَبْيَضَ يُقَالُ لَهُ الْبُرَاقُ فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ، يَقَعُ خُطَاهُ أَقْصَى طَرْفِهِ، فَحُمِلْتُ عَلَيْهِ ثُمَّ انْطَلَقْتُ حَتَّى أَتَيْنَا السَّمَاءَ الدُّنْيَا، وَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ، فَقِيلَ: مِنْ هَذَا؟ قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّد ﷺ، قِيلَ: وَبُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَفُتِحَ لَنَا قَالَ: مَرْحَبًا بِهِ وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ، فَأَتَيْتُ عَلَى آدَمَ، فَقُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَنْ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا أَبُوكَ آدَمُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالِابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ». قَالَ: « ثُمَّ انْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّانِيَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ: قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ، قِيلَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَفُتِحَ لَنَا قَالَ: مَرْحَبًا بِهِ وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ، فَأَتَيْتُ عَلَى يَحْيَى، وَعِيسَى فَقُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَنْ هَذَانِ؟ قَالَ يَحْيَى، وَعِيسَى - قَالَ سَعِيدٌ: إِنِّي حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ فِي حَدِيثِهِ: ابْنَيِ الْخَالَةِ - فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِمَا فَقَالَا: مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ». قَالَ: « ثُمَّ انْطَلَقْنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ: قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ ﷺ قَالَ: وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: فَفُتِحَ لَنَا، وَقَالَ: مَرْحَبًا بِهِ وَلَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ قَالَ: فَأَتَيْتُ عَلَى يُوسُفَ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالنَّبِيِّ الصَّالِحِ وَالْأَخِ الصَّالِحِ، ثُمَّ انْطَلِقَنا إِلَى السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ، فَكَانَ نَحْوٌ مَنْ كَلَامِ جِبْرِيلَ وَكَلَامِهِمْ، فَأَتَيْتُ عَلَى إِدْرِيسَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ، ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى السَّمَاءِ الْخَامِسَةِ، فَأَتَيْتُ عَلَى هَارُونَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ،

فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ، ثُمَّ انْطَلَقْنَا إِلَى السَّمَاءِ السَّادِسَةِ، فَأَتَيْتُ عَلَى مُوسَى صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِمْ أَجْمَعِينَ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ، فَلَمَّا جَاوَزْتُ بَكَى قَالَ: ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، فَحَدَّثَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ أَنَّ نَبْقَهَا مِثْلُ قِلَالِ هَجَرَ وَوَرَقَهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيَلَةِ، وَحَدَّثَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ رَأَى أَرْبَعَةَ أَنْهَارٍ يَخْرُجُ مَنْ أَصْلِهَا نَهْرَانِ ظَاهِرَانِ وَنَهْرَانِ بَاطِنَانِ، فَقُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَا هَذِهِ الْأَنْهَارُ؟ قَالَ: أَمَّا النَّهَرَانِ الْبَاطِنَانِ، فَنَهْرَانِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ: فَالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ، ثُمَّ رُفِعَ لَنَا الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ، قُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ إِذَا خَرَجُوا مِنْهَا لَمْ يَعُودُوا فِيهِ آخِرَ مَا عَلَيْهِمْ قَالَ: ثُمَّ أُوتِيتُ بِإِنَاءَيْنِ أَحَدُهُمَا خَمْرٌ، وَالْآخَرُ لَبَنٌ يُعْرَضَانِ عَلَيَّ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقِيلَ: أَصَبْتَ أَصَابَ اللَّهُ بِكَ أُمَّتَكَ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَفُرِضَتْ عَلَيَّ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسُونَ صَلَاةً فَأَقْبَلْتُ بِهِنَّ حَتَّى أَتَيْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ: بِمَا أُمِرْتَ؟ قُلْتُ: بِخَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ إِنِّي قَدْ بَلَوْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ قَبْلَكَ، وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَسَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ فَرَجَعْتُ، فَخَفَّفَ عَنِّي خَمْسًا فَمَا زِلْتُ أَخْتَلِفُ بَيْنَ رَبِّي وَبَيْنَ مُوسَى يَحُطُّ عَنِّي وَيَقُولُ لِي مِثْلَ مَقَالَتِهِ حَتَّى رَجَعْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ قَالَ: إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ قَدْ بَلَوْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ، فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَسَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ «. قَالَ: «لَقَدِ اخْتَلَفْتُ إِلَى رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ لَكِنِّي أَرْضَى وَأُسَلِّمُ، فَنُودِيتُ إِنِّي قَدْ أَجَزْتُ أَوْ أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي وَجَعَلْتُ بِكُلِّ حَسَنَةٍ عَشْرَ أَمْثَالِهَا»[1].

## باسی دەستپێكی فەرزبوونی پێنج نوێژەكە

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە لە مالیكی كوڕی صەعصەعە پیاوێك بوو لە قەومەكەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە كاتێكدا من لەلای كەعبە بووم لە نێوان خەوتوو و بەخەبەردا بووم، گوێم لە كەسێك بوو وتی: یەكێك لەو سیانە بگرە، تەشتێكی ئاڵتوونی بۆ لام هێنا ئاوی زەمزەمی تێدا بوو، فەرمووی: سنگمی هەڵدڕی تا فڵانە شوێن، -قەتادە وتی: مەبەستی چی بوو؟ وتی: هەتا خوار سكی- دڵمی دەرهێنا و بە ئاوی زەمزەم شۆردرا، پاشان پڕكرا لە ئیمان و حیكمەت و دانایی، پاشان ئاژەڵێكی سپییان بۆ هێنام لە بوڕاق لە گوێدرێژ بەرزتر بوو لە ئیستر بچووكتر بوو، بە

---

(١) صحيح.

هەنگاوێك دەگەیشتە ئەو جێگایە تا چاو بڕ بکات، سواری ئەو بوڕاقە کرام، پاشان دەرچووین (لەگەڵ جبریلدا) تا گەیشتین بە ئاسمانی دنیا، جبریل داوای کرد دەرگا بکرێتەوە، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریل، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد ﷺ، وترا: نێردراوە بە دوایدا؟ وتی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، وتی: بەخێر بێت، چاکترین کەس هاتووە، دواتر چاوم کەوت بە ئادەم وتم: ئەی جبریل ئەوە کێیە؟ وتی: ئەوە ئادەمی باوکتە، فەرمووی: منیش سڵاوم لێ کرد، وتی: بەخێر بێیت ئەی کوڕی چاك و ئەی پێغەمبەری چاك، وتی: پاشان دەرچووین هەتا گەیشتین بە ئاسمانی دووەم، جبریل داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە، وترا: کێیە؟ وتی: جبریلە، وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد ﷺ، وترا: نێردراوە بە دوایدا؟ وتی: بەڵێ، دەرگامان بۆ کرایەوە، وتی: بەخێر بێت، چاکترین کەس هاتووە، هاتم بۆ لای یەحیا و عیسا، وتم: ئەم دووانە کێن؟ وتی: یەحیا و عیسایە -سەعید وتی: پێم وایە لە فەرموودەکەیدا وتی: پورزای یەکدین- منیش سڵاوم لێ کردن، وتیان: بە خێر بێی برای چاك و پێغەمبەری چاك، وتی: پاشان ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ئاسمانی سێیەم، جبریل داوای کرد دەرگای بۆ بکرێتەوە، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جبریلە. وترا: کێت لەگەڵدایە؟ وتی: موحەممەد ﷺ، وتی: نێردراوە بە دوایدا؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەرگامان بۆ کرایەوە، وتی: بەخێر بێت چاکترین کەس هاتووە، وتی: کاتێ چوومە ژوورەوە یوسفم بینی، سڵاوم لێ کرد (وەڵامی سڵاوەکەمی دایەوە پاشان) وتی: بەخێر بێی پێغەمبەری چاك و برای چاك، پاشان ڕۆیشتین بۆ ئاسمانی چوارەم، بەهەمان شێوە جبریل قسەی کرد و ئەوانیش قسەیان لەگەڵی کرد، هاتم بۆ لای ئیدریس، سڵاوم لێ کرد ئەویش وتی: بەخێر بێی برای چاك و پێغەمبەری چاك، پاشان ڕۆیشتین بۆ ئاسمانی پێنجەم، هاتم بۆ لای هارون سڵاوم لێ کرد، وتی: بەخێر بێی برای چاك و پێغەمبەری چاك، پاشان ڕۆیشتین بۆ ئاسمانی شەشەم، هاتم بۆ لای موسا سڵاوم لێ کرد وتی: بەخێر بێی برای چاك و پێغەمبەری چاك، کاتێ تێم پەڕاند گریا، پاشان بەرز کرامەوە بۆ (سِدرةُ المُنتَهی)، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کرد میوەکەی وەکوو گۆزەی هەجرە (هەجر شوێنێکە لە نزیك مەدینە) گەڵاکانی وەکوو گوێی فیل وا بوو، وە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کرد، ئەو چوار ڕووباری بینی، دوو ڕووباریان

ڕوپۆش كرابوون، دووانەكەی دیكەشیان بەدەرەوە بوون، پرسیارم لە جبریل كرد ئەو ڕوبارانە چین؟ وتی: ئەو دوو ڕووبارەی كە ڕوپۆشن ئەوە دوو ڕوباری بەهەشتن، ئەو دووانەش كە بەدەرەوەن، ڕوباری فوڕات و نیلە، پاشان (بيت المعمور)م (واتە: ماڵی ئاوەدانكراو) بۆ بەرز كرایەوە، وتم: ئەی جبریل ئەوە چییە؟ وتی: ئەوە (بيت المعمور) ە، هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تێدا دەكەن، ئەگەر لێی دەرچن جارێكی دیكە بۆی ناگەڕێنەوە (لەبەر زۆری فریشتەكان)، پاشان وتی: دوو قاپم بۆ خرایە ڕوو قاپێكیان ئارەق بوو ئەوی دیكەیان شیر بوو، شیرەكەم هەڵبژارد، وترا: پێكات تۆ و ئوممەتەكەت لەسەر ئیسلام دەڕۆن، پاشان پەنجا نوێژم لەسەر فەڕز كرا لە هەموو ڕۆژێكدا، وەرمگرت تا تێ پەڕیم بە لای موسادا وتی: بەچی فەرمانت پێ كراوە؟ وتم: پەنجا نوێژم لەسەر فەڕز كرا لە هەموو ڕۆژێكدا، وتی: بێگومان ئوممەتەكەی تۆ ناتوانن پەنجا نوێژ لە ڕۆژێكدا ئەنجام بدەن، من پێش تۆ خەڵكیم تاقی كردۆتەوە و لەگەڵ نەوەكانی ئیسڕائیلدا ژیاوم، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای لێ بكە هەتا بۆت سووك و ئاسان بكات، منیش گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم (داوام لێ كرد بۆم سووك بكات)، پێنج نوێژی لێی كەم كردەوە، بەردەوام لە نێوان پەروەردگارم و موسادا دەهاتم دەڕۆیشتم بۆمی كەم دەكردەوە، ئەویش هەمان قسەی دەكرد هەتا بە پێنج نوێژ گەڕامەوە بۆ هەموو ڕۆژێك، وتی: ئوممەتەكەت ناتوانن پێنج نوێژ بكەن لە هەموو ڕۆژێكدا من پێش تۆ خەڵكیم تاقی كردۆتەوە و لەنێو نەوەكانی ئیسڕائیلدا ژیاوم، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای ئاسانكردنی لێ بكە بۆ ئوممەتەكەت، فەرمووی: وتم: ئەوەندە داوام لە پەروەردگارم كرد شەرم دەكەم بگەڕێمەوە، بەڵام ڕازی بووم و ملكەچ بووم، كاتێ تێم پەڕاند بانگكەرێك بانگی كردم، بەڕاستی فەڕزی خۆمم جێگیر كرد، كارئاسانیم كرد بۆ بەندەكانم، بۆ هەر چاكەیەك دە ئەوەندە.

٣٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ مَالِكَ بْنَ صَعْصَعَةَ حَدَّثَهُمْ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَدَّثَهُمْ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ. وَقَالَ قَتَادَةُ: فَقُلْتُ لِلْجَارُودِ وَهُوَ إِلَى جَنْبِي: مَا يَعْنِي بِهِ؟ قَالَ: مِنْ ثُغْرَةِ نَحْرِهِ إِلَى شِعْرَتِهِ، وَقَدْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ قُصَّتِهِ إِلَى شِعْرَتِهِ» فَذَكَرَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

---

(١) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، کە مالیکی کوڕی صەعصەعە بۆی باس کردن، پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردن لەبارەی ئەو شەوەی شەوڕەوی پێ کرا، بەدرێژی فەرموودەکەی باس کرد. قەتادە وتی: بە جاڕودم وت کە لەتەنیشتم بوو: مەبەستی لەوە چی بوو؟ وتی: لە گەردنەوە هەڵی دڕی تا بان شەرمگای، گوێم لێی بوو دەیوت: لە مووی سەر سنگیەوە تا بان شەرمگای، موحەممەدی کوڕی یەحیا فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

## بَابُ ذِكْرِ فَرْضِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ مِنْ عَدَدِ الرَّكْعَةِ بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ، بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٣٠٣-** عن عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: إِنَّ الصَّلَاةَ أَوَّلُ مَا افْتُرِضَتْ رَكْعَتَينِ فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ، وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ[١].

## باسی فەرزبوونی پێنج نوێژەکە لە ژمارەی ڕکاتەکان بە دەستەواژەی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، بە دەستەواژەی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: بەڕاستی یەکەم جار نوێژ فەرز کرا دوو ڕکات بوو پاشان بۆ نوێژی گەشت جێگیر کرا، نوێژی نیشتەجێییش زیاد کرا.

**٣٠٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً»[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: خوا ﷻ چوار ڕکات نوێژی فەرز کردووە بۆ نیشتەجێ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ، لە گەشتیش دوو ڕکات، لە کاتی ترسیش یەك ڕکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ قَوْلَهَا: إِنَّ الصَّلَاةَ أَوَّلُ مَا افْتُرِضَتْ رَكْعَتَانِ أَرَادَتْ بَعْضَ الصَّلَاةِ دُونَ جَمِيعِهَا «أَرَادَتِ الصَّلَوَاتِ الْأَرْبَعَةِ دُونَ الْمَغْرِبِ، وَكَذَلِكَ أَرَادَتْ، ثُمَّ زِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ ثَلَاثُ صَلَوَاتٍ خَلَا الْفَجْرِ وَالْمَغْرِبِ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ قَوْلَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ فَرَضَ اللَّهُ الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، إِنَّمَا أَرَادَ خَلَا الْفَجْرِ وَالْمَغْرِبِ، وَكَذَلِكَ أَرَادُوا فِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ خَلَا الْمَغْرِبِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ فِي كُتُبِنَا مِنْ أَلْفَاظِ الْعَامِّ الَّتِي يُرَادُ بِهَا الْخَاصُّ»**

**٣٠٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﭫ قَالَتْ: فَرْضُ صَلَاةِ السَّفَرِ وَالْحَضَرِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ زِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ رَكْعَتَانِ رَكْعَتَانِ، وَتُرِكَتْ صَلَاةُ الْفَجْرِ لِطُولِ الْقِرَاءَةِ، وَصَلَاةُ الْمَغْرِبِ لِأَنَّهَا وِتْرُ النَّهَارِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لَمْ يُسْنِدْهُ أَحَدٌ أَعْلَمُهُ غَيْرُ مَحْبُوبِ بْنِ الْحَسَنِ[1].

**باسی فەرموودەیەك شیكەرەوەی (مُفَسِّر) دەستەواژە كورت و ناڕوونەكەیە (مُجْمَل) كە باسم كرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە وتەكەی عائیشەیە: بەڕاستی یەكەم جار نوێژ فەرز كرا دوو ڕكات بوو. مەبەستی هەندێ نوێژ بوو نەك هەمووی، مەبەستی چوار نوێژەكەیە جگە لە ئێوارە، بەهەمان شێوە مەبەستی لە وتەكەی: پاشان نوێژ زیاد كرا لە كاتی نیشتەجێبوون. سێ نوێژ بوو جگە بەیانی و مەغریب، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی وتەی ئیبنو عەباس ﭭ: خوا ﷻ چوار ڕكات نوێژی فەرز كردووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەتان ﷺ، مەبەستی پێی جگە لە بەیانی و ئێوارەیە، بەهەمان شێوە مەبەستیان نوێژ لە سەفەر دوو ڕكاتە جگە لە ئێوارەیە، ئەمەش لەو شێوازەیە كە لە پەڕاوەكانماندا هێناومانە لە دەستەواژەی (الْعَامِّ) گشتی كە مەبەست پێی (الْخَاصُّ) تایبەتە**

واتە: عائیشە ﭫ دەڵێ: نوێژی فەرز لە گەشت و نیشتەجێ دوو ڕكات دوو ڕكات بوو، كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە نیشتەجێ بوو، نوێژی نیشتەجێیی زیاد كرا دوو ڕكات دوو ڕكات، نوێژی بەیانی وەكوو خۆی مایەوە چونكە قورئانی زۆر تێدا دەخوێنرێ، وە نوێژی ئێوارەش چونكە ویتری ڕۆژە.

---

(١) هذا حديث معلول.




ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە (غَرِيبٌ) ئەوەی من بزانم کەس نەیگەیاندووە جگە لە مەحبوبی کوڕی حەسەن.

## بَابُ فَرْضِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ «وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنْ لَا فَرْضَ مِنَ الصَّلَاةِ إِلَّا الْخَمْسَ، وَأَنَّ كُلَّ مَا سِوَى الْخَمْسِ مِنَ الصَّلَاةِ فَتَطَوُّعٌ لَيْسَ شَيْءٌ مِنْهَا فَرْضٌ إِلَّا الْخَمْسَ فَقَطْ»

**٣٠٦-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ ثَائِرُ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا» قَالَ: أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الزَّكَاةِ؟ قَالَ: فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَرَائِعِ الْإِسْلَامِ قَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لَا أَتَطَوَّعُ شَيْئًا، وَلَا أُنْقِصُ شَيْئًا مِمَّا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ» أَوْ «دَخَلَ الْجَنَّةَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ»[1].

## باسی فەرزبوونی پێنج نوێژەکە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هیچ نوێژێك فەرز نییە جگە لەو پێنج فەرزە نەبێت، وە هەر نوێژێك جگە لەو پێنج نوێژە زیادە و سوننەتە و فەرز نییە

واتە: تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قژی بژ و ئاڵۆز بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ خوا چی فەرز کردووە لەسەرم لە نوێژ؟ فەرمووی: پێنج نوێژ مەگەر نوێژێکی زیادە بکەیت (واتە: نوێژی سوننەت)، وتی: هەواڵم بدەرێ خوا چی فەرز کردووە لەسەرم لە زەکات؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ دا بە دروشمەکانی ئیسلام، وتی: سوێند بەوەی شکۆداری کردووی لەوە زیاتر ناکەم و لەوەش کەمتر ناکەم کە خوا فەرزی کردووە لەسەرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرفراز بوو بە سەری باوکی ئەگەر ڕاست بکات، (دیارە ئەوە لەنێو عەرەبدا سوێند نەبوو، بەڵکوو وشەیەك بووە عەرەب عادەتیان پێوە گرتووە لە کاتی قسەکردنیاندا مەبەستیان حەقیقەتی سوێندخواردن نەبووە بە مەخلوق، چونکە سوێندخواردن بە جگە لە خوا دروست نییە و حەرامە).

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ إِقَامَ الصَّلَاةِ مِنَ الْإِيمَانِ

**٣٠٧-** عَنْ أَبِي جَمْرَةَ الضُّبَعِيِّ وَهُوَ نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ إِنَّ جَرَّةً لِي أَنْتَبِذُ فِيهَا فَأَشْرَبُ مِنْهُ، فَإِذَا أَطَلْتُ الْجُلُوسَ مَعَ الْقَوْمِ خَشِيتُ أَنْ أَفْتَضِحَ مَنْ حَلَاوَتِهِ قَالَ: قَدِمَ وَفْدُ عَبْدِ الْقَيْسِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِالْوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلَا نَدَامَى». فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ مُضَرَ، وَإِنَّا لَا نَصِلُ إِلَيْكَ إِلَّا فِي الْأَشْهُرِ الْحُرُمِ، فَحَدِّثْنَا جُمَلًا مِنَ الْأَمْرِ إِذَا أَخَذْنَا عَمِلْنَا بِهِ، أَوْ إِذَا أَحَدُنَا عَمِلَ بِهِ دَخَلَ بِهِ الْجَنَّةَ، وَنَدْعُو إِلَيْهِ مَنْ وَرَاءَنَا قَالَ: « آمُرُكُمْ بِأَرْبَعٍ وَأَنْهَاكُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: الْإِيمَانُ بِاللَّهِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مَا الْإِيمَانُ بِاللَّهِ؟ « قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: «شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْمَغَانِمِ، وَأَنْهَاكُمْ عَنِ النَّبِيذِ فِي الدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيرِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ»[1].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەجێهێنانی نوێژ لە ئیمانەوەیە

واتە: ئەبو حەمزەی زوبعی کە ناوی نەصری کوڕی عیمرانە وتی: بە ئیبنو عەباسم ﷺ وت: گۆزەیەکم هەیە شلەمەنی تێدا دەگرمەوە و لێی دەخۆمەوە، ئەگەر دانیشتنەکەم لەگەڵ خەڵکدا درێژە پێ بدەم دەترسم لەوەی لە چێژ و لەزەتی ئەوەندە بخۆمەوە (سەرخۆش بم و) ڕیسوا بم، وتی: وەفدی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم وەفدە بەخێر بێن هەرگیز ریسوا و پەشیمان نەبن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانی ئێمە و تۆدا هاوبەشدانەرانی موزەر هەیە، ئێمە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت مەگەر لە مانگەکانی حەرامدا نەبێت، جا شتێکمان پێ بڵێ هەواڵ بدەین بە خەڵکانی دوای خۆمان و پێی بچینە بەهەشتەوە، وە بانگەوازی خەڵکی دیکەی پێ بکەین، فەرمووی: فەرمانتان پێ دەکەم بە چوار شت وە ڕێگریتان لێ دەکەم لە چوار شت، (فەرمانی پێ کردن) بە بڕواهێنان بە خوا، ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خوا چییە؟ وتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و دەرکردنی زەکات و بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان، وە پێنجیەکی غەنیمەت و دەستکەوتەکانتان بدەن

---

(١) صحيح.

بە من، وە ڕێگریتان لێ دەکەم لە گرتنەوەی شلەمەنی یاخود گیراوە لەنێو کولەکە و دەفرێك لە دار هەڵکۆڵدرابێت و گۆزە و قاپی بۆیەکراو بە زفت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ إِقَامَ الصَّلَاةِ مِنَ الْإِسْلَامِ «إِذِ الْإِيمَانُ وَالْإِسْلَامُ إِسْمَانِ بِمَعْنًى وَاحِدٍ» خَبَرُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ فِي مَسْأَلَةِ جِبْرِيلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْإِسْلَامِ قَدْ أَمْلَيْتُهُ فِي كِتَابِ الطَّهَارَةِ.

**٣٠٨-** عن عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدِ بْنِ الْعَاصِ يُحَدِّثُ طَاوُسًا، أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَلَا تَغْزُو؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ ﷺ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ، وَحَجُّ الْبَيْتِ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بەجێهێنانی نوێژ لە ئیسلامەوەیە، چونکە ئیمان و ئیسلام دوو ناون بە یەك مانا هاتوون، فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەربارەی پرسیاری جبریل لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیسلام، لە کتێبی پاك وخاوێنی باسم کرد بەڵگەیە لەسەر ئەوە

واتە: عیکریمەی کوڕی خالیدی کوڕی عاص بۆ تاوسی باس کرد پیاوێك بە عەبدوڵای کوڕی عومەری ﷺ وت: ئایا بۆ غەزا ناکەی؟ عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئیسلام بونیاد نراوە لەسەر پێنج شت: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتدان و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجکردنی ماڵی خوا ﷻ.

**٣٠٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَحَجُّ الْبَيْتِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام بونیاد نراوە لەسەر پێنج شت: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، وە ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتدان و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجکردنی ماڵی خوا ﷻ.

## بَابٌ فِي فَضَائِلِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

**٣١٠-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدًا ﵁ وَنَاسًا مَنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُونَ: كَانَ رَجُلَانِ أَخَوَانِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَ أَحَدُهُمَا أَفْضَلَ مِنَ الْآخَرِ، فَتُوُفِّيَ الَّذِي هُوَ أَفْضَلُهُمَا، ثُمَّ عَمَّرَ الْآخَرُ بَعْدَهُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ تُوُفِّيَ، فَذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَضِيلَةُ الْأَوَّلِ عَلَى الْآخَرِ، فَقَالَ: «أَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَانَ لَا بَأْسَ بِهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَمَا يُدْرِيكُمْ مَاذَا بَلَغَتْ بِهِ صَلَاتُهُ؟ إِنَّمَا مَثَلُ الصَّلَاةِ كَمَثَلِ نَهَرٍ جَارٍ بِبَابِ رَجُلٍ غَمْرٍ عَذْبٍ يَقْتَحِمُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ فَمَا تَرَوْنَ ذَلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ لَا تَدْرُونَ مَاذَا بَلَغَتْ بِهِ صَلَاتُهُ»(١).

## باسی فەزڵ و گەورەیی پێنج نوێژە فەڕزەکە

واتە: عامری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﵁ دەڵێ: گوێم لە سەعد ﵁ و خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیانوت: دوو برا هەبوون لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکیان لەوی دیکە چاکتر بوو، ئەوەیان کە چاکتر بوو کۆچی دوایی کرد، پاشان ئەوی دیکەیان دوای ئەو چل شەو ژیا پاشان کۆچی دوایی کرد، جا لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسی چاکەی یەکەم بەسەر ئەوی دیکەوە کرا، فەرمووی: ئایا نوێژی نەدەکرد؟ وتیان: بەڵێ، نوێژی دەکرد، ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ گرفێکی نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە چووزانن نوێژەکەی چەندە پلەوپایەی بەرز کردۆتەوە (لەو چل ڕۆژەدا)؟ بێگومان نموونەی نوێژ وەکوو ڕووبارێکی سازگار و شیرین وایە بە بەردەم دەرگای پیاوێکدا بڕوات هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی پێ بشوات، ئایا پیسی و چڵکنی پێیەوە دەمێنێ؟ ئێوە نازانن نوێژەکە ئەوی (دووەمی) گەیاندووە بە چ پلەوپایەیەك.

---

(١) صحیح.

٣١١- عن أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنِّي أَصَبْتُ حَدًّا فَأَقِمْهُ عَلَيَّ قَالَ: «هَلْ تَوَضَّأْتَ حِينَ أَقْبَلْتَ؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «اذْهَبْ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ عَفَا عَنْكَ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تاوانێکم کردووە سنووری شەرعیم بەسەردا بسەپێنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا، دواتر قامەت بۆ نوێژ کرا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، کاتێ سەلامی دایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تاوانێکم کردووە سنووری شەرعیم بەسەردا بسەپێنە؟ فەرمووی: ئایا دەستنوێژت گرت کاتێ هاتیت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆ بێگومان خوا لێت خۆش بوو.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْحَدَّ الَّذِي أَصَابَهُ هَذَا السَّائِلُ فَأَعْلَمَهُ ﷺ أَنَّ اللَّهَ قَدْ عَفَا عَنْهُ بِوُضُوئِهِ وَصَلَاتِهِ كَانَ مَعْصِيَةً ارْتَكَبَهَا دُونَ الزِّنَا الَّذِي يُوجِبُ الْحَدَّ « إِذْ كُلُّ مَا زَجَرَ اللَّهُ عَنْهُ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ حَدٍّ، وَلَيْسَ اسْمُ الْحَدِّ إِنَّمَا يَقَعُ عَلَى مَا يُوجِبُ جَلْدًا أَوْ رَجْمًا أَوْ قَطْعًا قَطُّ قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ذِكْرِ الْمُطَلَّقَةِ:** ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۝١﴾ **الطلاق، قَالَ:** ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۝٢٢٩﴾ **البقرة، فَكُلُّ مَا زَجَرَ اللَّهُ عَنْهُ فَاسْمُ الْحَدِّ وَاقِعٌ عَلَيْهِ، إِذِ اللَّهُ ﷻ قَدْ أَمَرَ بِالْوُقُوفِ عِنْدَهُ فَلَا يُجَاوَزُ وَلَا يُتَعَدَّى «**

٣١٢- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ لَهُ أَنَّهُ أَصَابَ مِنَ امْرَأَةٍ إِمَّا قُبْلَةً، أَوْ مَسًّا بِيَدٍ، أَوْ شَيْئًا كَأَنَّهُ يَسْأَلُ عَنْ كَفَّارَتِهَا قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ۝١١٤﴾ هود، قَالَ: فَقَالَ الرَّجُلُ: أَلِي هَذِهِ؟ قَالَ: «هِيَ لِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو گوناهەی ئەو پرسیارکەرە کردی و داوای کرد حەدەکەی بسەپێت بەسەریدا، پێغەمبەریش ﷺ ئاگاداری کردەوە بێگومان خوا لێی خۆش بووە بەهۆی دەستنوێژگرتن و نوێژکردنی، دیارە ئەوە گوناهێك بوو ئەنجامی داوە گوناهەکە لە خواری زیناکردنەوە بووە، بێگومان زینا حەد لەسەر خاوەنەکەی پێویست دەکات، جا هەر گوناهێك سەرکۆنە کرابێت دەگونجێ ناوی حەدی بەسەردا بسەپێت، مەرج نییە ناوی حەد تەنها بۆ جەڵد یان ڕەجم یان ڕێگر بەکار بێت، خوا ﷻ دەربارەی تەڵاقدراو فەرموویەتی: ﴿ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ﴿١﴾ ﴾، واتە: ئەو ژنانە دەرمەکەن لە ماڵەکانی خۆیان، ئافرەتانیش با دەرنەچن لە ماڵەکانیان مەگەر کارێکی خراپی ئاشکرا بکەن، وە ئەوانە سنوورانێکی خوایین، هەر کەسێك لە سنووری خوا دەربچێت ئەوە بێگومان ستەمی لە خۆی کردووە، وە فەرمووی: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ﴿٢٢٩﴾ ﴾، واتە: ئەوانە سنووری خوان لێیان دەرمەچن. جا هەر گوناهێك خوا سەرکۆنەی کردبێت ناوی حەدی بەسەردا دەچەسپێت، خوا فەرمانی کردووە بە وەستان لەسەر ئەو گوناهە نە سنوور تێ دەپەڕێنرێ و نە دەستدرێژی دەکرێتە سەریان**

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەی کرد ئەو ماچی ئافرەتێکی کردووە، یان دەستی پێدا هێناوە، یان شتێ لەو جۆرە، وەکوو ئەوەی پرسیار لەبارەی کەفارەتەکەی بکات، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: وە نوێژ ئەنجام بدە لەمسەر و ئەوسەری ڕۆژدا و بەشێك لە شەودا چونکە بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لا دەبەن، ئەوە پەند و ئامۆژگارییە بۆ پەندوەرگران، وتی: پیاوەکە وتی: ئەوە تەنها بۆ من بوو؟ فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کاری پێ دەکات لە ئوممەتەکەم هەتا ڕۆژی دوایی.

**٣١٣**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي لَقِيتُ امْرَأَةً فِي الْبُسْتَانِ فَضَمَمْتُهَا إِلَيَّ وَبَاشَرْتُهَا وَقَبَّلْتُهَا، وَفَعَلْتُ بِهَا كُلَّ شَيْءٍ إِلَّا أَنِّي لَمْ أُجَامِعْهَا، فَسَكَتَ النَّبِيُّ

ﷺ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾﴾هود، فَدَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَرَأَهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ عُمَرَ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَلَهُ خَاصَّةً أَوْ لِلنَّاسِ كَافَّةً؟ فَقَالَ: «لَا، بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً»[1].

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من گەیشتم بە ئافرەتێك لەنێو باخێكدا، گرتمە خۆم و ماچم كرد و هەموو شتێكم لەگەڵیدا كرد جگە لە زینا، پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، دواتر خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾﴾، واتە: بەڕاستی كردەوە چاكەكان كردەوە خراپەكان لا دەبەن، ئەوە پەند و ئامۆژگارییە بۆ پەندوەرگران. پێغەمبەر ﷺ بانگی كرد، ئایەتەكەی بەسەریدا خوێندەوە، عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە تایبەتە بەو پیاوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵكوو بۆ هەموو خەڵكە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ إِنَّمَا تُكَفِّرُ صَغَائِرَ الذُّنُوبِ دُونَ كَبَائِرِهَا

٣١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ».[2]

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژە فەرزەكان دەبنە هۆی سڕینەوەی گوناهە بچووكەكان نەك گەورەكان

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پێنج نوێژەكە و هەینی دەبنە كەفارەتی ئەو گوناهانەی لە نێوانیاندا كراوە بە مەرجێ تاوانی گەورەی تێدا ئەنجام نەدرابێ.

٣١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يُخْبِرَانِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ ثُمَّ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يَسْكُتُ، فَأَكَبَّ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا يَبْكِي حَزِينًا لِيَمِينِ رَسُولِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَأْتِي بِالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، وَيَصُومُ رَمَضَانَ، وَيَجْتَنِبُ الْكَبَائِرَ السَّبْعَ إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى إِنَّهَا لَتَصْطَفِقُ، ثُمَّ تَلَا: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾النساء[1].

واتە: ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دانیشت پاشان فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، سێ جار فەرمووی، پاشان بێدەنگ بوو، هەر پیاوێك لە ئێمە کەوتین دەگریاین خەمبار بووین بەو سوێندەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان فەرمووی: هەر بەندەیەك پێنج نوێژەکەی بکات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و دوور بکەوێتەوە لە حەوت تاوانە گەورەکە ئیللا دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا تەنانەت بەهەشت لە خۆشیدا دەلەزێت و دەجولێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێنەوە: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر دوور بکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی کە لێتان قەدەغە کراوە ئەوە تاوانە بچووکەکانتان بۆ دەپۆشین.

## بَابُ فَضِيلَةِ السُّجُودِ فِي الصَّلَاةِ وَحَطِّ الْخَطَايَا بِهَا مَعَ رَفْعِ الدَّرَجَاتِ فِي الْجَنَّةِ

٣١٦- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمَرِيُّ قَالَ: لَقِيتُ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ لَهُ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَنْفَعُنِي اللَّهُ بِهِ أَوْ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ قَالَ: فَسَكَتَ عَنِّي ثَلَاثًا، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً»[2].

## باسی ڕێزی شکۆی سوژدەبردن لە نوێژدا و سڕینەوەی گوناهەکان بەهۆیەوە، لەگەڵ بەرزکردنەوەی پلەوپایەکان لە بەهەشت

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەلحەی یەعمەری دەڵێ: گەیشتم بە سەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ پێم وت: فەرموودەیەکم بۆ باس بکە بەڵکوو بەهۆیەوە

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

خوا ﷻ سوودم پێ بگەیەنێ، یان بچمە بەهەشتەوە، سێ جار وتم، بەڵام ئەو بێدەنگ بوو، پاشان ڕووی بۆ لام وەرچەرخاند وتی: پەیوەست بە سوژدەبردن بەبەردەوامی، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر بەندەیەك سوژدەیەك بۆ خوا ببات، بەهۆیەوە خوا پلەیەك بەرزی دەکاتەوە و گوناهێکی دەسڕێتەوە.

## بَابُ فَضْلِ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ

**٣١٧-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَبْلَ غُرُوبِهَا»[1].

### باسی فەزڵ و گەورەیی نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، ئێمە دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جا ئەگەر توانیتان خەو و ئیشوکار زاڵ نەبن بەسەرتاندا نوێژێك پێش خۆرکەوتن و نوێژێك پێش خۆرئاوابوون (بەیانی و عەسر) فەرامۆش مەکەن.

**٣١٨-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَقَبْلَ غُرُوبِهَا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ»[2].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عومارەی کوڕی ڕوەیبە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك پێش خۆرهەڵاتن نوێژ بکات، (مەبەستی نوێژی بەیانییە) وە پێش خۆرئاوابوونیش ( مەبەستی نوێژی عەسرە) خوا ئاگری لەسەر حەرام دەکات.

**٣١٩-** عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ يَلِجَ النَّارَ مَنْ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عومارەی کوڕی ڕوەیبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاگر هەرگیز کەسێك ناسوتێنێ پێش خۆرهەڵاتن نوێژ بکات (مەبەستی نوێژی بەیانییە)، وە پێش ئاوابوونیشی (مەبەستی نوێژی عەسرە).

**٣٢٠-** عن عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَلَا غُرُوبِهَا»، فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ فَقَالَ: أَنْتَ سَمِعْتَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ بِأَنَّكَ سَمِعْتَهُ[1].

واتە: عومارەی کوڕی ڕوەیبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئاگر هەرگیز کەسێك ناسوتێنێ پێش خۆرهەڵاتن نوێژ بکات (مەبەستی نوێژی بەیانییە)، نەك ئاوابوونی، پیاوێك لە خەڵکی بەصرە هات وتی: تۆ ئەوەت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ وتی: بەڵێ، وتی: منیش شایەتیت بۆ ئەدەم بەوەی کە بیستووتە.

## بَابُ ذِكْرِ اجْتِمَاعِ مَلَائِكَةِ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةِ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ جَمِيعًا، وَدُعَاءُ الْمَلَائِكَةِ لِمَنْ شَهِدَ الصَّلَاتَيْنِ جَمِيعًا

**٣٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ مَلَائِكَةً يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ، فَإِذَا كَانَ صَلَاةُ الْفَجْرِ نَزَلَتْ مَلَائِكَةُ النَّهَارِ فَشَهِدُوا مَعَكُمُ الصَّلَاةَ جَمِيعًا، ثُمَّ صَعِدَتْ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَكَثَتْ مَعَكُمْ مَلَائِكَةُ النَّهَارِ فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: مَا تَرَكْتُمْ عِبَادِي يَصْنَعُونَ؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ جِئْنَا وَهُمْ يُصَلُّونَ وَتَرَكْنَاهُمْ يُصَلُّونَ، فَإِذَا كَانَ صَلَاةُ الْعَصْرِ نَزَلَتْ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ فَشَهِدُوا مَعَكُمُ الصَّلَاةَ جَمِيعًا، ثُمَّ صَعِدَتْ مَلَائِكَةُ النَّهَارِ وَمَكَثَتْ مَعَكُمْ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ، فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُمْ عِبَادِي يَصْنَعُونَ؟ قَالَ: فَيَقُولُونَ: جِئْنَا وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَتَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ قَالَ: فَحَسِبْتُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ فَاغْفِرْ لَهُمْ يَوْمَ الدِّينِ»[2].

## باسی کۆبوونەوەی فریشتەکانی شەو و فریشتەکانی ڕۆژ لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر، هەروەها نزا و پاڕانەوەی فریشتەکان بۆ ئەو کەسەی ئامادەی ئەو دوو نوێژە دەبێت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فریشتەکان دەستە دەستە بەدوای یەکدی دێن بۆ لاتان، ئەگەر نوێژی بەیانی هات فریشتەکانی ڕۆژ دێن هەموویان ئامادەی نوێژی بەیانی دەبن لەگەڵتاندا، پاشان فریشتەکانی شەو بەرز دەبنەوە و فریشتەکانی ڕۆژ دەمێننەوە، پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەکات، خۆی زاناترە بە حاڵیان: کاتێ بەندەکانی منتان بەجێ هێشت چییان دەکرد؟ ئەوانیش دەڵێن: چووین بۆ لایان نوێژیان دەکرد، وە بەجێمان هێشتن هەر نوێژیان دەکرد، جا کاتێ نوێژی عەسر دێت فریشتەکانی شەو دادەبەزن هەموویان لەگەڵتاندا ئامادەی نوێژەکان دەبن، پاشان فریشتەکانی ڕۆژ بەرز دەبنەوە و فریشتەکانی شەو لەگەڵتان دەمێننەوە، فەرمووی: پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەکات، خۆی زاناترە بە حاڵیان، دەفەرمووێ: کاتێ بەندەکانی منتان بەجێ هێشت چییان دەکرد؟ فەرمووی: ئەوانیش دەڵێن: چووین بۆ لایان نوێژیان دەکرد، وە بەجێمان هێشتن هەر نوێژیان دەکرد، وتی: پێم وایە ئەوان دەڵێن: پەروەردگار لێیان خۆش بە لە ڕۆژی دواییدا (واتە: بۆیان دەپاڕێنەوە).

**٣٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَجْتَمِعُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلَائِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، فَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ فَتَصْعَدُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ، وَتَثْبُتُ مَلَائِكَةُ النَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْعَصْرِ فَتَصْعَدُ مَلَائِكَةُ النَّهَارِ، وَتَثْبُتُ مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ، فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ: كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي، فَيَقُولُونَ: أَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَتَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، فَاغْفِرْ لَهُمْ يَوْمَ الدِّينِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فریشتەکانی شەو و فریشتەکانی ڕۆژ کۆ دەبنەوە لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر، لە نوێژی بەیانی کۆ دەبنەوە، دواتر فریشتەکانی شەو بەرز دەبنەوە و فریشتەکانی ڕۆژ جێگیر دەبن، وە لە نوێژی عەسر کۆ دەبنەوە، دواتر فریشتەکانی ڕۆژ بەرز دەبنەوە و فریشتەکانی شەو جێگیر دەبن، پەروەردگاریان پرسیاریان لێ دەکات: بەندەکانی منتان بەجێ هێشت چییان دەکرد؟ ئەوانیش دەڵێن: چووین بۆ لایان نوێژیان دەکرد، وە بەجێمان هێشتن هەر نوێژیان دەکرد، لێیان خۆش بە لە ڕۆژی دواییدا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ مَوَاقِيتِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

**٣٢٣-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَسَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَوَاتِ، فَقَالَ: صَلِّ مَعَنَا، فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ وَقَالَ: وَصَلَّى الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ نَقِيَّةٌ، وَصَلَّى الْمَغْرِبَ حِينَ غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَصَلَّى الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى الْفَجْرَ بِغَلَسٍ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ الظُّهْرَ فَأَبْرَدَ بِهَا، فَأَنْعَمَ أَنْ يُبْرِدَ بِهَا، وَأَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، أَخَّرَ فَوْقَ الَّذِي كَانَ، وَأَمَرَهُ فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ قَبْلَ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَأَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعِشَاءَ بَعْدَمَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَأَمَرَهُ فَأَقَامَ الْفَجْرَ فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ؟» قَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَقْتُ صَلَاتِكُمْ بَيْنَ مَا رَأَيْتُمْ»[1].

### باسی کاتەکانی هەر پێنج نوێژەکە

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد دەربارەی کاتی نوێژەکان؟ فەرمووی: نوێژمان لەگەڵ بکە، کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دا نوێژی نیوەڕۆی کرد، وتی: پاشان نوێژی عەسری کرد کاتێ خۆر بەرز و ڕووناك بوو، نوێژی ئێوارەشی کرد کاتێ خۆر ئاوا بوو، نوێژی عیشایشی کرد کاتێ سورایی ئاسمان دیار نەما، نوێژی بەیانیشی کرد لە تاریکیدا، کاتێ بەیانی بۆیەوە فەرمانی کرد بە بیلال بانگی نیوەڕۆی دا نوێژی نیوەڕۆی دوا خست تا فێنك بوو، جەختیشی کردەوە لەوەی دوای بخات و بەفێنکی بیکات، وە فەرمانی پێ کرد قامەتی بۆ نوێژی عەسر کرد، خۆر هێشتا هەر مابوو ئاوا نەبووبوو، دوای خست زیاتر لە یەکەم جار، وە فەرمانی پێ کرد قامەت بۆ نوێژی ئێوارە بکات پێش ئەوەی سورایی ئاسمان نەمێنێ، وە فەرمانی پێ کرد قامەت بکات بۆ نوێژی عیشا دوای ئەوەی سێیەکی شەو تێپەڕ بوو، وە فەرمانی پێ کرد قامەت بۆ نوێژی بەیانی بکات کاتێ نوێژی بەیانی کرد بەرەبەیان ڕووناك بوو، پاشان فەرمووی: کوا ئەو کەسەی پرسیاری کاتی نوێژی کرد؟ وتی: منم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: کاتی نوێژەکانتان لە نێوان ئەوەدایە کە بینیتان.

---

(١) صحيح.

**٣٢٤-** عن بُنْدَارٍ، نا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ مَرْثَدٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَوَاقِيتِ لَمْ يَزِدْنَا بُنْدَارٌ عَلَى هَذَا. قَالَ بُنْدَارٌ: فَذَكَرْتُهُ لِأَبِي دَاوُدَ، فَقَالَ: صَاحِبُ هَذَا الْحَدِيثِ يَنْبَغِي أَنْ يُكَبَّرَ عَلَيْهِ. قَالَ بُنْدَارٌ: فَمَحَوْتُهُ مِنْ كِتَابِي[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَنْبَغِي أَنْ يُكَبَّرَ عَلَى أَبِي دَاوُدَ حَيْثُ غَلَطَ، وَأَنْ يُضْرَبَ بُنْدَارٌ عَشَرَةً حَيْثُ مَحَا هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ كِتَابِهِ، حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى مَا رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ أَيْضًا عَنْ عَلْقَمَةَ، غَلَطَ أَبُو دَاوُدَ، وَغَيَّرَ بُنْدَارٌ، هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ رَوَاهُ الثَّوْرِيُّ أَيْضًا عَنْ عَلْقَمَةَ نا بِخَبَرِ حَرَمِيِّ بْنِ عُمَارَةَ مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: نا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، نا حَرَمِيُّ بْنُ عُمَارَةَ، عَنْ شُعْبَةَ بِالْحَدِيثِ تَمَامِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ رَادٌّ عَلَى زَعْمِ الْعِرَاقِيِّينَ أَنَّ الْمُقِرَّ عِنْدَ الْحَاكِمِ أَنَّ لِفُلَانٍ عَلَيْهِ مَا بَيْنَ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةِ دَرَاهِمَ أَنَّ عَلَيْهِ ثَمَانِيَةَ دَرَاهِمَ، فَجَعَلُوا هَذَا الْمُحَالَ مِنَ الْمَقَالِ بَابًا طَوِيلًا فَرَّعُوا مَسَائِلَ عَلَى هَذَا الْخَطَأِ وَقَوْدُ مَقَالَتِهِمْ يُوجِبُ أَنَّ جِبْرِيلَ صَلَّى بِالنَّبِيِّ ﷺ فِي الْيَوْمَيْنِ وَاللَّيْلَتَيْنِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي غَيْرِ مَوَاقِيتِهَا؛ لِأَنَّ قَوْدَ مَقَالَتِهِمْ أَنَّ أَوْقَاتَ الصَّلَاةِ مَا بَيْنَ الْوَقْتِ الْأَوَّلِ، وَالْوَقْتِ الثَّانِي، وَأَنَّ الْوَقْتَ الْأَوَّلَ، وَالثَّانِي خَارِجَانِ مِنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ كَزَعْمِهِمْ أَنَّ الدِّرْهَمَ وَالْعَشَرَةَ خَارِجَانِ مِمَّا أَقَرَّ بِهِ الْمُقِرُّ، وَأَنَّ الثَّمَانِيَةَ هُوَ بَيْنَ دِرْهَمٍ إِلَى عَشَرَةٍ، قَدْ أَمْلَيْتُ مَسْأَلَةً طَوِيلَةً مِنْ هَذَا الْجِنْسِ.

واتە: بوندار دەگێڕێتەوە، حەڕەمی کوڕی عوماڕە هەواڵی پێ داین، شوعبە بۆی باس کردین، لە عەلقەمەی کوڕی مەڕسەد، لە سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە، لە باوکی ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی کاتەکانی نوێژ، بوندار هیچی بۆمان زیاد نەکرد لەسەر ئەو فەرموودە. بوندار وتی: بۆ ئەبو داودم باس کرد وتی: خاوەن ئەم فەرموودەیە پێویستە تەکبیر (الله أکبر)ی (نوێژی مردووی) بەسەردا بکرێ. بوندار وتی: دواتر لە کتێبەکەمدا سڕیمەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێویستە تەکبیر (الله أکبر)ی (نوێژی مردووی) بەسەر ئەبو داودا بکرێ کە هەڵەی کرد، بونداریش دە داری لێ بدرێ کە ئەم فەرموودەی لە کتێبەکەی سڕییەوە، ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی ڕاستە سەوری لە عەلقەمەوە گێڕاویەتەوە، ئەبو داود هەڵەی کرد، بونداریش گۆڕی، ئەمە فەرموودەیەکی ڕاستە بەهەمان شێوە سەوری لە عەلقەمەوە گێڕاویەتەوە و هەواڵی پێ داوین بە فەرموودەکەی حەڕەمی

---

(١) صحيح.

کوڕی عومارە، موحەممەدی کوڕی یەحیا وتی: عەلی کوڕی عەبدولّا هەواڵی پێ داین، حەڕەمی کوڕی عومارە هەواڵی پێ داین لە شوعبەوە فەرموودەکەی بەتەواوی باس کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بە بۆچوونی عێراقییەکان ئەوە دەگەیەنێ، ئەو کەسەی لەلای دادوەر دان دەنێ بەوەدا فلّانە کەس قەرزارە لە نێوان درهەمێك بۆ دە درهەم، ئەوە هەشت درهەمی لەلایە، ئەم نەشیاوەیان کردووەتە قسەوباس و بەشێکی بەرفراوانیان بۆ داناوە و چەند لقێکیان لەسەر ئەم هەڵەیە بونیاد ناوە، وتەکانیان ئەوە پێویست دەکات کە جبریل پێنج نوێژەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد لە ماوەی دوو ڕۆژ و دوو شەو لە جگە لە کاتەکانی خۆیان، چونکە قسەکانیان ئەوە دەگەیەنێ کاتی نوێژەکان لە نێوان کاتی یەکەم و کاتی دووەمدایە، کاتی یەکەم و کاتی دووەم لە دەرەوەی کاتی نوێژن، وەك پێیان وایە درهەمێك و دە درهەم لە دەرەوەی ئەوەن کە دانپێدانەر دانی پێدا ناوە، بێگومان هەشت درهەم لە نێوان درهەمێك و دە درهەمدایە، جا مەسەلەی لەم شێوەیەم بەدوورودرێژی باس کردووە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ فَرْضَ الصَّلَاةِ كَانَ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ قَبْلَ مُحَمَّدٍ ﷺ كَانَتْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، كَمَا هِيَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأُمَّتِهِ، وَأَنَّ أَوْقَاتَ صَلَوَاتِهِمْ كَانَتْ أَوْقَاتَ النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ ﷺ وَأُمَّتِهِ

٣٢٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « أَمَّنِي جِبْرِيلُ عِنْدَ الْبَيْتِ مَرَّتَيْنِ، فَصَلَّى بِيَ الظُّهْرَ حِينَ مَالَتِ الشَّمْسُ قَدْرَ الشِّرَاكِ، وَصَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ، وَصَلَّى بِيَ الْمَغْرِبَ حِينَ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، وَصَلَّى بِيَ الْفَجْرَ حِينَ حُرِّمَ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ عَلَى الصَّائِمِ، وَصَلَّى بِيَ الْغَدَ الظُّهْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ، وَصَلَّى بِيَ الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَيْهِ، وَصَلَّى بِيَ الْمَغْرِبَ حِينَ أَفْطَرَ الصَّائِمُ، وَصَلَّى بِيَ الْعِشَاءَ حِينَ مَضَى ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَصَلَّى بِيَ الْغَدَاةَ بَعْدَ مَا أَسْفَرَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، الْوَقْتُ فِيمَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ هَذَا وَقْتُكَ وَوَقْتُ الْأَنْبِيَاءِ قَبْلَكَ»[1].

---

(١) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژی فەرز لەسەر پێغەمبەران پێش موحەممەد ﷺ پێنج نوێژ بوو، وەكوو چۆن پێویست بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەكەی، بێگومان كاتی نوێژەكانیان هەمان كاتەكانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ و ئوممەتەكەی بوو

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جبریل دوو جار لەلای كەعبەی پیرۆز پێشنوێژی بۆ كردم، نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردم كاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لای دا بەئەندازەی قەیتانی پێڵاو، نوێژی عەسریشی بۆ كردم كاتێ سێبەری هەموو شتێك بەئەندازەی خۆی لێ هات، نوێژی مەغریبیشی بۆ كردم كاتێ ڕۆژووەوان ڕۆژووی شكاند، پاشان نوێژی عیشای بۆ كردم كاتێ سوورایی ئاسمان ونبوو، نوێژی بەیانی بۆ كردم كاتێ خواردن و خواردنەوە حەرام كرا لەسەر ڕۆژووەوان، ڕۆژی دواتر نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردم كاتێ سێبەری هەموو شتێك بەئەندازەی خۆی لێ هات، نوێژی عەسری بۆ كردم كاتێ سێبەری پیاوێك دوو هێندەی خۆی لێ هات، نوێژی مەغریبی بۆ كردم كاتێ ڕۆژووەوان ڕۆژووی شكاند، نوێژی عیشای بۆ كردم كاتێ سێیەكی شەو تێ پەڕی، نوێژی بەیانی بۆ كردم كاتێ دنیا خەریك بوو ڕووناك دەبۆیەوە، پاشان لای لێم كردەوە، وتی: ئەی موحەممەد كاتی نوێژ لە نێوان ئەم دوو كاتەدایە، ئەمە كاتی تۆ و كاتێ پێغەمبەرەكانی پێش تۆیە.

## بَابُ ذِكْرِ وَقْتِ الصَّلَاةِ لِلْمَعْذُورِ

**٣٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّيْتُمُ الصُّبْحَ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ يَطْلُعَ قَرْنُ الشَّمْسِ الْأَوَّلِ، فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الظُّهْرَ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ تُصَلُّوا الْعَصْرَ، فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ، فَإِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، فَإِذَا غَابَ الشَّفَقُ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ»[١].

---

(١) صحيح.

## باسی کاتی نوێژ بۆ خاوەن بیانوو (عوزر)

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر نوێژی بەیانیتان کرد ئەوە کات ماوە تا تەنیشتەکانی خۆر دەردەکەوێت، ئەگەر نوێژی نیوەڕۆتان کرد ئەوە کات ماوە تا نوێژی عەسر دەکەن، ئەگەر نوێژی عەسرتان کرد ئەوە کات ماوە تا خۆر زەرد دەبێت، ئەگەر خۆر ئاوا بوو ئەوە کاتی (نوێژی ئێوارە) ماوە تا سورایی ئاسمان نامێنێ، ئەگەر سورایی ئاسمان نەما ئەوە کاتی (نوێژی عیشا) ماوە تا نیوەی شەو.

## بَابُ اخْتِيَارِ الصَّلَاةِ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا، بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظُهُ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٣٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا»[١].

## باسی ئەنجامدانی نوێژ لە یەکەم کاتیدا، بە باسکردنی فەرموودەیەك دەستەواژەکەی دەستەواژەیەکی گشتییە مەبەست پێی تایبەتە

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیەك چاکترینە؟ فەرمووی: نوێژ لە سەرەتای یەکەم کاتیدا.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «الصَّلَاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا» بَعْضَ الصَّلَاةِ دُونَ جَمِيعِهَا، وَبَعْضَ الْأَوْقَاتِ دُونَ جَمِيعِ الْأَوْقَاتِ، إِذْ قَدْ أَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِتَبْرِيدِ الظُّهْرِ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ، وَقَدْ أَعْلَمَ أَنْ لَوْلَا ضَعْفُ الضَّعِيفِ، وَسَقَمُ السَّقِيمِ لَأَخَّرَ صَلَاةَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ

٣٢٨- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَبْرِدْ أَبْرِدْ»، أَوْ قَالَ: «انْتَظِرِ انْتَظِرْ»، فَقَالَ: «إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ» قَالَ أَبُو ذَرٍّ: حَتَّى رَأَيْنَا فَيْءَ التُّلُولِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەكەی: (الصَّلَاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا)، بەشێك لە نوێژە نەك هەموویان، وە بەشێك لە كاتەكانە نەك هەموو كاتەكان، چونكە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بە دواخستنی نوێژ لە قرچەی گەرما تا كەشوهەوا فێنك دەكات، بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ئەگەر بەهۆی لاوازی لاوازەكان و نەخۆشی نەخۆشان نەبووایە، فەرمانم دەكرد نوێژی عیشا دوا بخرێت بۆ نیوەی شەو**

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی نیوەڕۆی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فێنكی بكە، فێنكی بكە، یان فەرمووی: چاوەڕوان بە، چاوەڕوان بە، فەرمووی: بەڕاستی سەختی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە، ئەگەر گەرما تینی هێنا نوێژەكانتان بەفێنكی بكەن (واتە: نوێژی نیوەڕۆ دوابخەن تا كەشوهەوا فێنك دەكات)، ئەبو زەڕ وتی: (ئیدی نوێژەكانمان دوا دەخست) تا سێبەری تەپۆڵكەكانمان دەبینی.

**٣٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلَاةِ فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گەرما تینی هێنا نوێژ بخەنە كاتی فێنكی، چونكە سەختی تینی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە.

**٣٣٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَأَبْرِدُوا الصَّلَاةَ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی تینی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە، نوێژ بەفێنكی بكەن لە كاتی سەختی گەرما.

**٣٣١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَبْرِدُوا الظُّهْرَ فِي الْحَرِّ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی نیوەڕۆ بە فێنکی ئەنجام بدەن لە کاتی گەرمادا. ( واتە: لە قرچەی گەرمای هاویندا نوێژی نیوەڕۆ دوا بخەن تا فێنك دەکات).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَعْجِيلِ صَلَاةِ الْعَصْرِ

**٣٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ طَالِعَةٌ فِي حُجْرَتِي لَمْ يَظْهَرِ الْفَيْءُ بَعْدُ، قَالَ أَحْمَدُ: فِي حُجْرَتِهَا(١).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الظُّهُورِ عِنْدَ الْعَرَبِ يَكُونُ عَلَى مَعْنَيَيْنِ أَحَدُهُمَا أَنْ يَظْهَرَ الشَّيْءُ حَتَّى يُرَى وَيُتَبَيَّنُ فَلَا خَفَاءَ، وَالثَّانِي أَنْ يَغْلِبَ الشَّيْءُ عَلَى الشَّيْءِ كَمَا يَقُولُ الْعَرَبُ: ظَهَرَ فُلَانٌ عَلَى فُلَانٍ، وَظَهَرَ جَيْشُ فُلَانٍ عَلَى جَيْشِ فُلَانٍ أَيْ غَلَبَهُمْ، فَمَعْنَى قَوْلِهَا: لَمْ يَظْهَرِ الْفَيْءُ بَعْدُ، أَيْ لَمْ يَتَغَلَّبِ الْفَيْءُ عَلَى الشَّمْسِ فِي حُجْرَتِهَا، أَيْ لَمْ يَكُنِ الظِّلُّ فِي الْحُجْرَةِ أَكْثَرَ مِنَ الشَّمْسِ حِينَ صَلَاةِ الْعَصْرِ.

## باسی چاکتر وایە نوێژی عەسر زوو ئەنجام بدرێ لە کاتی خۆیدا و بەبێ دواخستن

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسری دەکرد خۆر لەنێو ژوورەکەی مندا بوو هێشتا سێبەر نەهاتبوو، ئەحمەد وتی: لە ژوورەکەیدا.

ئەبو بەکر دەڵێ: (الظُّهُورِ) لەلای عەرەب بە دوو مانا دێت: یەکەمیان: شتێك دەربکەوێ هەتا ببینرێ و ڕوون ببێتەوە بەبێ شاردنەوە، دووەم: بریتییە لە زاڵبوونی شتێك بەسەر شتێکی دیکەدا، وەك عەرەب دەڵێ: فڵانە کەس زاڵ بوو بەسەر فڵانە کەسدا، وە لە شکری فڵانە کەس زاڵ بوو بەسەر لەشکری فڵانە کەسدا، جا مانای وتەکەی عائیشە: (لَمْ يَظْهَرِ الْفَيْءُ بَعْدُ)، واتە سێبەر لە ژوورەکەیدا زاڵ نەبوو بەسەر خۆردا، واتە سێبەر لە ژوورەکەیدا لە خۆر زۆرتر نەبوو لە کاتی نوێژی عەسر.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ التَّغْلِيظِ فِي تَأْخِيرِ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى اصْفِرَارِ الشَّمْسِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ ﷺ فِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو: «فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ» إِنَّمَا أَرَادَ وَقْتَ الْعُذْرِ وَالضَّرُورَةِ وَالنَّاسِي لِصَلَاةِ الْعَصْرِ، فَيَذْكُرُهَا قَبْلَ اصْفِرَارِ الشَّمْسِ أَوْ عِنْدَهُ. وَكَذَلِكَ أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَقْتَ الْعُذْرِ وَالضَّرُورَةِ وَالنَّاسِي لِصَلَاةِ الْعَصْرِ حِينَ يَذْكُرُهَا، وَقْتًا يُمْكِنُهُ أَنْ يُصَلِّيَ رَكْعَةً مِنْهَا قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، لَا أَنَّهُ أَبَاحَ لِلْمُصَلِّي فِي غَيْرِ الْعُذْرِ وَالضَّرُورَةِ، وَهُوَ ذَاكِرٌ لِصَلَاةِ الْعَصْرِ، أَنْ يُؤَخِّرَهَا حَتَّى يُصَلِّيَ عِنْدَ اصْفِرَارِ الشَّمْسِ، أَوْ رَكْعَةً قَبْلَ الْغُرُوبِ وَثَلَاثًا بَعْدَهُ**

٣٣٣- عن الْعَلَاءِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَعْقُوبَ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ فِي دَارِهِ بِالْبَصْرَةِ حَتَّى انْصَرَفَ مِنَ الظُّهْرِ قَالَ: وَدَارُهُ بِجَنْبِ الْمَسْجِدِ فَلَمَّا دَخَلْنَا عَلَيْهِ قَالَ: صَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ؟ قُلْنَا لَهُ: إِنَّمَا انْصَرَفْنَا السَّاعَةَ مِنَ الظُّهْرِ قَالَ: فَصَلُّوا الْعَصْرَ، فَقُمْنَا فَصَلَّيْنَا، فَلَمَّا انْصَرَفْنَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا، لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا»[1].

**باسی هەڕەشەكردن لە دواخستنی نوێژی عەسر تا خۆر زەرد دەبێت، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەكەی عەبدوڵای كوڕی عەمرە كە لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتەوە (فەرموویەتی): (فَإِذَا صَلَّيْتُمُ الْعَصْرَ فَهُوَ وَقْتٌ إِلَى أَنْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ)، واتە: ئەگەر نوێژی عەسرتان كرد ئەوە كات ماوە تا خۆر زەرد دەبێت، مەبەستی پێی كاتێكە كە مرۆڤ عوزری هەبێت، یان ناچار بێت، یان نوێژی عەسری لەبیر چووبێت كاتێ بیری دەكەوێتەوە دەتوانێ یەك ڕكات نوێژی عەسر بكات پێش خۆرئاوابوون، بەو مانایە نەهاتووە ڕێگە درابێ بە نوێژخوێن بەبێ هیچ بیانوو و ناچاربوونێك و نوێژ عەسریشی لەبیردا بێت دوای بخات تا خۆر زەرد دەبێت، یا پێش خۆرئاوابوون ڕكاتێك ئەنجام بدات و سێ ڕكاتەكەی دیكەی بكەوێتە دوای خۆرئاوابوون**

واتە: عەلائی كوڕی عەبدوڕەحمانی كوڕی یەعقوب دەگێڕێتەوە، ئەو چووە ژوورەوە بۆ لای ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ لەماڵەكەی خۆی لە بەصرە، كاتێ لە نوێژی نیوەڕۆ

---

(١) صحيح.

بۆیەوە، وتی: ماڵەکەی لە تەنیشت مزگەوت بوو، کاتێ چووینە ژوورەوە بۆ لای، وتی: نوێژی عەسرتان کردووە؟ پێمان وت: ماوەیەك دەبێت لە نوێژی نیوەڕۆ گەڕاوینەتەوە. وتی: نوێژی عەسر بکەن. ئێمەش هەستاین نوێژی عەسرمان کرد، کاتێ لێ بووینەوە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوە نوێژی دووڕووە دادەنیشێ نوێژی عەسری دوا دەخات تا خۆر دەکەوێتە نێوان هەردوو شاخی شەیتان ئینجا هەڵدەستێ چوار جار دەنوك دەدا لە زەوی، زیکر و یادی خوای تێدا ناکات کەمێك نەبێت.

٣٣٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِقِ، يَنْتَظِرُ حَتَّى إِذَا اصْفَرَّتِ الشَّمْسُ وَكَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ، أَوْ عَلَى قَرْنَيِ الشَّيْطَانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەوە نوێژی دووڕووە چاوەڕێ دەکات هەتا کاتێ خۆر زەرد دەبێت و دەکەوێتە نێوان هەردوو شاخی شەیتان، یان دەکەوێتە سەر شاخی شەیتان، ئینجا هەڵدەستێ چوار جار دەنوك دەدا لە زەوی، زیکر و یادی خوای تێدا ناکات کەمێك نەبێت.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَأْخِيرِ صَلَاةِ الْعَصْرِ مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ

٣٣٥- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ» قَالَ مَالِكٌ: تَفْسِيرُهُ ذَهَابُ الْوَقْتِ[٢].

## باسی هەڕەشەکردن لە دواخستنی نوێژی عەسر بەبێ ناچاری و هەبوونی عوزر

واتە: سالیم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی نوێژی عەسری لەدەست دەچێت وەکوو ئەوە وایە ماڵ و منداڵی تاڵان کرابێت. مالیك وتی: تەفسیرەکەی ڕۆیشتنی کاتە (واتە: لە کاتی خۆیدا نایکات).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَبْكِيرِ صَلَاةِ الْعَصْرِ فِي يَوْمِ الْغَيْمِ، وَالتَّغْلِيظِ فِي تَرْكِ صَلَاةِ الْعَصْرِ

**٣٣٦-** عن أَبِي الْمَلِيحِ الْهُذَلِيِّ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ فِي يَوْمِ غَيْمٍ، فَقَالَ: بَكِّرُوا بِالصَّلَاةِ؛ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَرَكَ صَلَاةَ الْعَصْرِ أُحْبِطَ عَمَلُهُ»(١).

## باسی فەرمانکردن بە زووئەنجامدانی نوێژی عەسر لە ڕۆژی هەوردا، وە هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە نوێژی عەسر

واتە: ئەبو مەلیحی هوزلی دەڵێ: ئێمە لەگەڵ بورەیدەی ئەسلەمی ﷺ بووین لە غەزایەك لە ڕۆژێکدا (ئاسمان) هەور بوو، وتی: نوێژی عەسر زوو ئەنجام بدەن (لەبەر ئەوەی کاتەکە تێ نەپەڕێت و ئێوەیش پێی نەزانن)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك واز لە نوێژی عەسر بهێنێ کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَعْجِيلِ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

**٣٣٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ نَأْتِي بَنِي سَلِمَةَ فَنُبْصِرُ مَوَاقِعَ النَّبْلِ(٢).

## باسی چاکتر وایە پەلە بکرێت لە ئەنجامدانی نوێژی ئێوارەدا و لە کاتی خۆیدا بکرێ و دوا نەخرێت

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی ئێوارەمان دەکرد، پاشان دەهاتین بۆ لای نەوەکانی سەلەمە تەماشای شوێنی هاویشتنی تیرمان دەبینی. (واتە: ئەوەندە ڕۆشنایی دەمایەوە دەیانتوانی شوێنی تیرەکەیان ببین کە دەیانهاویشت، مەبەستی ئەوەیە هێشتا دنیا تاریك نەبووبوو).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٣٣٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ الْمَغْرِبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُونَ فَيَرَى أَحَدُهُمْ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەوان نوێژی ئێوارەیان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان (لە مزگەوت) دەگەڕانەوە هەریەکێکیان شوێنی هاویشتنی تیرەکەی خۆی دەبینی.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَأْخِيرِ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ، وَإِعْلَامِ النَّبِيِّ ﷺ أُمَّتَهُ أَنَّهُمْ لَا يَزَالُونَ بِخَيْرٍ ثَابِتِينَ عَلَى الْفِطْرَةِ، مَا لَمْ يُؤَخِّرُوهَا إِلَى اشْتِبَاكِ النُّجُومِ

٣٣٩- عَنْ مَرْثَدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْيَزَنِيِّ قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا أَبُو أَيُّوبَ ﷺ غَازِيًا، وَعُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ ﷺ يَوْمَئِذٍ عَلَى مِصْرَ فَأَخَّرَ الْمَغْرِبَ فَقَامَ إِلَيْهِ أَبُو أَيُّوبَ فَقَالَ: مَا هَذِهِ الصَّلَاةُ يَا عُقْبَةُ؟ فَقَالَ: شُغِلْنَا، فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ، مَا بِي إِلَّا أَنْ يَظُنَّ النَّاسُ أَنَّكَ رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ هَكَذَا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ أَوْ عَلَى الْفِطْرَةِ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ»[٢].

## باسی هەڕەشەکردن لە دواخستنی نوێژی ئێوارە، وە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئوممەتەکەی ئەوان بەردەوام لە خێردان و لەسەر ئیسلامەتین ئەگەر نوێژی ئێوارە دوا نەخەن هەتا ئەستێرەکان دەردەکەون

واتە: ئیبنو مەڕسەدی یەزەنی دەڵێ: ئەبو ئەیوب ﷺ غەزای دەکرد هات بۆ لامان مایەوە، عوقبەی کوڕی عامیریش ﷺ ئەوکاتە کاربەدەستی میصر بوو، عوقبە نوێژی ئێوارەی دوا خست، ئەبو ئەیوب هەستا و چوو بۆ لای وتی: ئەو نوێژە چی بوو ئەی عوقبە؟ وتی: سەرقاڵ کراین، ئەویش وتی: سوێند بە خوا من هیچ گرفتێکم نییە ئەوە نەبێت خەڵکەکە وا گومان دەبەن تۆ پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە بەو شێوەیە نوێژی ئێوارە بکات، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەردەوام ئوممەتی من لە خێردان یان لەسەر سوننەتن ئەگەر نوێژی ئێوارە دوا نەخەن تا ئەستێرەکان دەردەکەون.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

٣٤٠- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَزَالُ أُمَّتِي عَلَى الْفِطَرِ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي قَوْلِهِ: «لَا تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يُؤَخِّرُوا الْمَغْرِبَ حَتَّى تَشْتَبِكَ النُّجُومُ»: دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ فِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵁: وَوَقْتُ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَسْقُطْ ثَوْرُ الشَّفَقِ إِنَّمَا أَرَادَ وَقْتَ الْعُذْرِ وَالضَّرُورَةِ لَا أَنْ يُتَعَمَّدَ تَأْخِيرُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ إِلَى أَنْ تَقْرُبَ غَيْبُوبَةُ الشَّفَقِ؛ لِأَنَّ اشْتِبَاكَ النُّجُومِ يَكُونُ قَبْلَ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ بِوَقْتٍ طَوِيلٍ يُمْكِنُ أَنْ يُصَلَّى بَعْدَ اشْتِبَاكِ النُّجُومِ قَبْلَ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ رَكَعَاتٌ كَثِيرَةٌ أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ.

واتە: عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام ئوممەتەکەم لەسەر سوننەتن ئەگەر نوێژی ئێوارە دوا نەخەن تا ئەستێرەکان دەردەکەون.

ئەبو بەکر دەڵێ: دەربارەی فەرموودەکە: بەردەوام ئوممەتەکەم لەسەر سوننەتن ئەگەر نوێژی ئێوارە دوا نەخەن تا ئەستێرەکان دەردەکەون. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وتەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﵁: (وَقْتُ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَسْقُطْ ثَوْرُ الشَّفَقِ)، واتە: کاتی ئێوارە ئەو کاتەیە کە سورایی ئاسمان بڵاوە نەکات. مەبەستی پێی کاتی بیانوو و ناچارییە نەك بەئەنقەست ئێوارە دوا بخات تا سورایی ئاسمان تەواو دەبێت، چونکە ئەستێرەکان ماوەیەکی درێژ پێش نەمانی سورایی ئاسمان دەردەکەون، دەگونجێ چەند ڕکاتێك نوێژ بکرێ زیاتر لە چوار ڕکات دوای دەرکەوتنی ئەستێرەکان پێش نەمانی سورایی ئاسمان.

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ تَسْمِيَةِ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ عِشَاءً، إِذِ الْعَامَّةُ أَوْ كَثِيرٌ مِنْهُمْ يُسَمُّونَهَا عِشَاءً

**٣٤١-** عن عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ» قَالَ: وَيَقُولُ الْأَعْرَابُ: هِيَ الْعِشَاءُ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: عَبْدُ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ هُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُغَفَّلِ.

## باسی قەدەغەكردن لە ناونانی نوێژی (المغرب) بە (عِشَاء) چونكە زۆرینەی خەڵك ناوی (عِشَاء)ی لێ دەنێن

واتە: عەبدوڵای موزەنی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با قسەی دەشتەكییەكان زاڵ نەبێت لەسەر ناوی نوێژی (الْمَغْرِبِ). (واتە: زۆر ناوی (العشاء) بەكار مەهێنن بۆ (المغرب) وەك چۆن دەشتەكییەكان بەكاری دەهێنن، بەڵكوو بڵێن: (المغرب).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ تَأْخِيرِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِذَا لَمْ يَخَفِ الْمَرْءُ الرُّقَادَ قَبْلَهَا، وَلَمْ يَخَفِ الْإِمَامُ ضَعْفَ الضَّعِيفِ وَسَقَمَ السَّقِيمِ فَتَفُوتَهُمُ الْجَمَاعَةُ لِتَأْخِيرِ الْإِمَامِ الصَّلَاةَ، أَوْ يَشُقُّ عَلَيْهِمْ حُضُورُ الْجَمَاعَةِ إِذَا أُخِّرَ صَلَاةُ الْعِشَاءِ

**٣٤٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَّرَ صَلَاةَ الْعِشَاءِ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَخَرَجَ عُمَرُ ﷺ، فَقَالَ: الصَّلَاةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَقَدَ النِّسَاءُ وَالْوِلْدَانُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالْمَاءُ يَقْطُرُ عَنْ رَأْسِهِ وَهُوَ يَمْسَحُهُ عَنْ شِقَّيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوا هَذِهِ السَّاعَةَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاكتر وایە نوێژی عیشا دوا بخرێت ئەگەر بەندە نەترسا لەوەی پێش نوێژەكە خەوی لێ بكەوێت، هەروەها ئیمامیش نەترسا لە لاوازی لاوازەكان و نەخۆشی نەخۆشان نوێژی بەكۆمەڵیان لەدەست بچێت، بەهۆی ئەوەی ئیمام نوێژی دوا خستووە، یان ئامادەبوونی نوێژی بەكۆمەڵیان لەسەر قورس بكات، ئەگەر نوێژی عیشای دوا خست**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نوێژی عیشای دوا خست، عومەر ﷺ هاتە دەرەوە وتی: نوێژ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ژن و منداڵەكان خەویان لێ كەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە سەری ئاوی لێ دەتكا و دەیسڕی و دەیفەرموو: ئەگەر لەبەر بارگرانی نەبووایە لەسەر ئوممەتەكەم فەرمانم پێ دەكردن لەم كاتەدا نوێژ بكەن.

**٣٤٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْعِشَاءِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَنَادَاهُ عُمَرُ ﷺ فَقَالَ: نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: مَا يَنْتَظِرُ هَذِهِ الصَّلَاةَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ غَيْرُكُمْ، قَالَ الزُّهْرِيِّ: وَلَمْ يَكُنْ يُصَلِّي يَوْمَئِذٍ إِلَّا مَنْ بِالْمَدِينَةِ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نوێژی عیشای دوا خست (تا خەڵكەكە خەویان لێ كەوت و هەستانەوە) عومەر ﷺ بانگی كرد وتی: ژن و منداڵەكان خەویان لێ كەوت، دواتر پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لایان فەرمووی: هیچ كەسێك لەم سەر زەوییەدا چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناكات جگە لە ئێوە. زوهری وتی: لەو كاتەدا جگە لە خەڵكی مەدینە كەسی دیكە ئەو نوێژەیان نەدەكرد.

**٣٤٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا ذَاتَ لَيْلَةٍ نَنْتَظِرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ، فَخَرَجَ إِلَيْنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، وَلَا نَدْرِي أَيُّ شَيْءٍ شَغَلَهُ فِي أَهْلِهِ أَوْ غَيْرِ ذَلِكَ، فَقَالَ حِينَ خَرَجَ: «إِنَّكُمْ لَتَنْتَظِرُونَ صَلَاةً مَا يَنْتَظِرُهَا أَهْلُ دِينٍ غَيْرُكُمْ، وَلَوْلَا أَنْ يَثْقُلَ عَلَى أُمَّتِي لَصَلَّيْتُ بِهِمْ هَذِهِ السَّاعَةَ»، ثُمَّ أَمَرَ الْمُؤَذِّنَ فَأَقَامَ الصَّلَاةَ فَصَلَّى[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: شەوێك ماینەوە چاوەڕوانی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەكرد بۆ نوێژی عیشا، كاتێ هاتە دەرەوە یەك لەسەر سێی شەو ڕۆیشتبوو یان دوای ئەو كاتە، نازانین چی شتێك لە ماڵەوە سەرقاڵی كردبوو، كاتێ هاتە دەرەوە فەرمووی: ئێوە چاوەڕوانی نوێژێك دەكەن هیچ خاوەن ئاینێك جگە لە ئێوە چاوەڕوانی ناكات، ئەگەر لەبەر بارقورسی نەبووایە لەسەر ئوممەتەكەم لەم كاتەدا ئەم نوێژەم بۆیان دەكرد، پاشان: فەرمانی بە بانگدەر كرد قامەتی نوێژی كرد، پاشان نوێژی كرد.

**٣٤٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: انْتَظَرْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِصَلَاةِ الْعِشَاءِ حَتَّى ذَهَبَ مِنْ شَطْرِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جَاءَ فَصَلَّى بِنَا ثُمَّ قَالَ: «خُذُوا مَقَاعِدَكُمْ فَإِنَّ النَّاسَ قَدْ أَخَذُوا مَضَاجِعَهُمْ فَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مُنْذُ انْتَظَرْتُمُوهَا، وَلَوْلَا ضَعْفُ الضَّعِيفِ وَسَقَمُ السَّقِيمِ وَحَاجَةُ ذِي الْحَاجَةِ لَأَخَّرْتُ هَذِهِ الصَّلَاةَ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ»(١).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: شەوێك ماینەوە چاوەڕوانی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەكرد بۆ نوێژی عیشا، تا نیوەی شەو ڕۆیشت، پاشان هات نوێژی بۆ كردین، پاشان فەرمووی: لە جێگای خۆتان بمێننەوە، چونكە خەڵك جگە لە ئێوە ئێستا لە شوێنی خەوتنیان خەوتوون، بێگومان ئێوە بەردەوام لە نوێژدان لەو كاتەوەی چاوەڕوانتانی نوێژتان كردووە، ئەگەر لەبەر لاوازی لاوازەكان و نەخۆشی نەخۆشان و پێویستی خاوەنپێویستی نەبووایە ئەم نوێژەم دوا دەخست بۆ نیوەی شەو.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ النَّوْمِ قَبْلَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثِ بَعْدَهَا بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٣٤٦-** عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا. وَفِي حَدِيثِ سَيَّارُ بْنُ سَلَامَةَ أَبُو الْمِنْهَالِ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ أَبِي: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ؟ قَالَ: كَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ الَّتِي تَدْعُونَهَا الْعَتَمَةَ، وَكَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی خەوتن پێش نوێژی عیشا و هەروەها دەمەتەقێش لە دوایەوە کەڕاهەتی هەیە و پەسەند نییە، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو بەڕزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بوو لەپێش نوێژی عیشا بخەوێت و لەدوای نوێژیش حەزی نەدەکرد قسە بکات. وە لە فەرموودەی سەیاری کوڕی سەلامە باوکی مینهال دەڵێ: لەگەڵ باوکم چوومە ژوورەوە بۆ لای ئەبو بەڕزەی ئەسلەمی ﷺ باوکم پرسیاری لێ کرد: پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژی فەرزی دەکرد، وتی: پێی خۆش بوو نوێژی عیشا دوا بخات کە ئێوە پێی دەڵێن: (العتمة) تاریکی، وە پێی ناخۆش بوو پێش ئەو نوێژە بخەوێت و لە دوایەوە قسە بکات.

### بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الدَّالِّ عَلَى الرُّخْصَةِ فِي النَّوْمِ قَبْلَ الْعِشَاءِ إِذَا أُخِّرَتِ الصَّلَاةُ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ كَرَاهَةَ النَّبِيِّ ﷺ النَّوْمَ قَبْلَهَا إِذَا لَمْ تُؤَخَّرْ

**٣٤٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شُغِلَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، عَنْ صَلَاةِ الْعَتَمَةِ حَتَّى رَقَدْنَا، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ رَقَدْنَا، ثُمَّ اسْتَيْقَظْنَا، ثُمَّ خَرَجَ، فَقَالَ: «لَيْسَ يَنْتَظِرُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ هَذِهِ الصَّلَاةَ غَيْرُكُمْ»[١].

### باسی فەرموودەیەك بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مۆڵەت دراوە بە خەوتن پێش عیشا، ئەگەر نوێژ دوا خرا، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ پێی باش نەبووە ئەگەر دوا نەخرێت

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ شەوێك سەرقاڵ کرا لە ئەنجامدانی نوێژی (الْعَتَمَة) واتە: عیشا، تا خەومان لێ کەوت، پاشان هەستاین، پاشان خەومان لێ کەوت، پاشان هەستاین، پاشان دەرچوو، فەرمووی: هیچ کەس لە خەڵکی سەر زەوی چاوەڕوانی ئەم نوێژە ناکەن جگە لە ئێوە.

---

(١) صحیح.

**٣٤٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، رَضِي اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْتَمَ ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ، وَحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى وَقَالَ: «إِنَّهُ وَقْتُهَا لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَالنَّبِيُّ ﷺ لَمَّا أَخَّرَ صَلَاةَ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ حَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ لَمْ يَزْجُرْهُمْ عَنِ النَّوْمِ لَمَّا خَرَجَ عَلَيْهِمْ، وَلَوْ كَانَ نَوْمُهُمْ قَبْلَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ لَمَّا أَخَّرَ النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ مَكْرُوهًا لَأَشْبَهَ أَنْ يَزْجُرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ فِعْلِهِمْ، وَيُوَبِّخَهُمْ عَلَى فِعْلِ مَا لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِعْلُهُ وَفِي خَبَرِ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَوَاقِيتِ قَالَ فِي وَقْتِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ، فَنِمْنَا ثُمَّ قُمْنَا، ثُمَّ نِمْنَا ثُمَّ قُمْنَا، ثُمَّ نِمْنَا مِرَارًا.

**واتە:** عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك نوێژی عیشای دوا خست، تا زۆربەی شەوەکە ڕۆیشت، وە تا خەڵکی نێو مزگەوتەکە خەویان لێ کەوت، دواتر دەرچوو بۆ نێویان نوێژی بۆ کردن و فەرمووی: بێگومان ئەوە کاتەکەیەتی ئەگەر نەبووایەتە بارگرانی بەسەر ئوممەتەکەمەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی عیشای دوا خست تا خەڵکی مزگەوت خەویان لێ کەوت، کاتێ هات بۆ نێویان سەرزەنشتی نەکردن لەوەی کە خەوتن، جا ئەگەر نوستنیان پێش نوێژی عیشا ناپەسەند بووایە، ئیدی چۆن پێغەمبەر ﷺ نوێژی دوا دەخست کە دەزانێ ناپەسەندە، وە سەرزەنشتی دەکردن لەو کردەوەیە کە نەدەبوو بیکەن، وە لە فەرموودەکەی عەتاء لە جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄، لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە دەربارەی کاتەکان، جا سەربارەت بە کاتی نوێژی عیشا لە شەوی دووەمدا وتی: خەوتین پاشان هەستاین، پاشان خەوتین ئینجا هەستاین، پاشان چەند جارێك خەوتین.

## بَابُ كَرَاهَةِ تَسْمِيَةِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ عَتَمَةً

**٣٤٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَغْلِبَنَّكُمُ الْأَعْرَابُ عَلَى اسْمِ صَلَاتِكُمْ، إِنَّهُمْ يُعْتِمُونَ عَلَى الْإِبِلِ إِنَّهَا صَلَاةُ الْعِشَاءِ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ناوانی نوێژی عیشا بە عەتەمە کەڕاهەتی هەیە و پەسەند نییە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با دەشتەکییەکان زاڵ نەبن بەسەرتاندا لەسەر ناوانی نوێژەکەتان، ئەوان دۆشینی وشترەکانیان دوا دەخست تا تاریك دادەهات (واتە: دەشتەکییەکان بە عیشایان ئەوت عەتەمە، نەهی کرد ئەو ناوە بەکار بهێنن کە لەنێو دەشتەکییەکاندا باوە) بێگومان ئەو نوێژە نوێژی عیشایە (نەك عەتەمە).

**٣٥٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءَ الْمُؤْمِنَاتِ يُصَلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ يَخْرُجْنَ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ مَا يُعْرَفْنَ[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئافرەتانی باوەڕدار لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانییان دەکرد، پاشان دەهاتنە دەرەوە خۆیان بە پۆشاکی خوری یان کەتان پێچابۆیەوە نەدەناسرانەوە (بەهۆی تاریکی).

**٣٥١-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَزَا خَيْبَرَ قَالَ: فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلَاةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای خەیبەری کرد، وتی: نوێژی بەیانیمان لە خەیبەر کرد بەتاریکی.

**٣٥٢-** عن ابْنِ شِهَابٍ أَخْبَرَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَانَ قَاعِدًا عَلَى الْمِنْبَرِ فَأَخَّرَ الصَّلَاةَ شَيْئًا، فَقَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ: أَمَا إِنَّ جِبْرِيلَ قَدْ أَخْبَرَ مُحَمَّدًا ﷺ بِوَقْتِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: اعْلَمْ مَا تَقُولُ، فَقَالَ عُرْوَةُ ﷺ: سَمِعْتُ بَشِيرَ بْنَ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَزَلَ جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي بِوَقْتِ الصَّلَاةِ فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، فَحَسَبَ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، وَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ، وَرُبَّمَا أَخَّرَهَا حِينَ يَشْتَدُّ الْحَرُّ، وَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ بَيْضَاءُ قَبْلَ أَنْ تَدْخُلَهَا الصُّفْرَةُ، فَيَنْصَرِفُ الرَّجُلُ مِنَ الصَّلَاةِ فَيَأْتِي ذَا الْحُلَيْفَةِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَيُصَلِّي الْمَغْرِبَ حِينَ تَسْقُطُ الشَّمْسُ، وَيُصَلِّي الْعِشَاءَ حِينَ يَسْوَدُّ الْأُفُقُ،

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

وَرُبَّمَا أَخَّرَهَا حَتَّى يَجْتَمِعَ النَّاسُ، وَصَلَّى الصُّبْحَ مَرَّةً بِغَلَسٍ، ثُمَّ صَلَّى مَرَّةً أُخْرَى فَأَسْفَرَ بِهَا، ثُمَّ كَانَتْ صَلَاتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ بِالْغَلَسِ حَتَّى مَاتَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ لَمْ يُعِدْ إِلَى أَنْ يُسْفِرَ»[١].

واتە: ئیبنو شیهاب هەواڵی داوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیر دانیشتبوو لەسەر مینبەر کەمێ نوێژی دوا خست، عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ وتی: ئایا نەتزانیوە کە جبریل هەواڵی دا بە موحەممەد بە کاتی نوێژەکان، عومەر پێی وت: بزانە چی دەڵێی، عوڕوە ﷺ وتی: گوێم لە بەشیری کوڕی ئەبو مەسعود ﷺ بوو دەیوت: گوێم لە ئەبو مەسعودی ئەنصاڕی ﷺ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: جبریل دابەزی هەواڵی کاتی نوێژی پێ دام، دواتر لەگەڵی نوێژم کرد، پاشان لەگەڵی نوێژم کرد، پاشان لەگەڵی نوێژم کرد، پاشان لەگەڵی نوێژم کرد، بە پەنجەکانی پێنج نوێژی ژمارد، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی نیوەڕۆی کرد کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان ترازا، کەم جارێك دوای دەخست کاتێ گەرما زۆر تینی دەهێنا، وە بینیم نوێژی عەسری دەکرد خۆر بەرز و سپی بوو پێش ئەوەی زەرد بێت و دەربکەوێت، پیاوێك نوێژی تەواو دەکرد دەهاتە (ذَي الْحُلَيْفَةِ) پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت، وە نوێژی مەغریبی دەکرد کاتێ خۆر دەکەوت (واتە: ئاوا دەبوو)، وە نوێژی عیشای دەکرد کاتێ ئاسۆی ئاسمان ڕەش دەبوو، هەندێ جار دوای دەخست هەتا خەڵکی کۆ دەبوونەوە، وە جارێك نوێژی بەیانی کرد لە تاریکیدا، وە جارێکی دیکە نوێژی کرد دنیا ڕووناك بووبۆیەوە، پاشان دوای ئەوە بەتاریکی نوێژی کرد هەتا ﷺ وەفاتی کرد، پاش ئەوە ئیدی لە کاتی ڕووناکیدا نەیکردووە.

**٣٥٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ فِي مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ فِي الْيَوْمَيْنِ وَاللَّيْلَتَيْنِ، وَقَالَ فِي اللَّيْلَةِ الْأُولَى: ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ الْعِشَاءَ حِينَ ذَهَبَ بَيَاضُ النَّهَارِ وَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَأَقَامَ الصَّلَاةَ فَصَلَّى، وَقَالَ فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ: ثُمَّ أَذَّنَ بِلَالٌ الْعِشَاءَ حِينَ ذَهَبَ بَيَاضُ النَّهَارِ فَأَخَّرَهَا النَّبِيُّ ﷺ فَنِمْنَا، ثُمَّ نِمْنَا مِرَارًا، ثُمَّ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَرَقَدُوا وَإِنَّكُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مُنْذُ انْتَظَرْتُمُ الصَّلَاةَ»، ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد دەربارەی کاتی نوێژەکان، بەدرێژی فەرموودەکەی باس کرد سەبارەت بە کاتی نوێژەکان لە دوو شەو و دوو ڕۆژدا، لە شەوی یەکەم وتی: پاشان بیلال بانگی عیشای دا کاتێ سپیایی ئاسمان نەما، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد قامەتی بۆ نوێژ کرد، دواتر نوێژی کرد، وە لە شەوی دووەمدا وتی: پاشان بیلال بانگی عیشای دا کاتێ سپیایی ئاسمان ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی دوا خست، دواتر خەوتین، پاشان هەستاین، چەند جارێك بەو شێوەیە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە فەرمووی: بەڕاستی خەڵك نوێژیان کرد و خەوتن، ئێوەیش بەردەوام لە نوێژدان لەو کاتەوەی چاوەڕوانی نوێژتان کردووە. دواتر فەرموودەکەی بەدوورودرێژی باس کرد.

٣٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَقْتُ الظُّهْرِ إِلَى الْعَصْرِ، وَوَقْتُ الْعَصْرِ إِلَى اصْفِرَارِ الشَّمْسِ، وَوَقْتُ الْمَغْرِبِ إِلَى أَنْ تَذْهَبَ حُمْرَةُ الشَّفَقِ، وَوَقْتُ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، وَوَقْتُ صَلَاةِ الصُّبْحِ إِلَى طُلُوعِ الشَّمْسِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَلَوْ صَحَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ فِي هَذَا الْخَبَرِ لَكَانَ فِي هَذَا الْخَبَرِ بَيَانُ أَنَّ الشَّفَقَ الْحُمْرَةُ، إِلَّا أَنَّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ تَفَرَّدَ بِهَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ إِنْ كَانَتْ حُفِظَتْ عَنْهُ، وَإِنَّمَا قَالَ أَصْحَابُ شُعْبَةَ فِي هَذَا الْخَبَرِ: ثَوْرُ الشَّفَقِ مَكَانَ مَا قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ: حُمْرَةُ الشَّفَقِ.

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: کاتی نیوەڕۆ تا عەسرە، کاتی عەسریش تا خۆر زەردبوونە، کاتی ئێوارەش تا ئەو کاتەیە سورایی قەراغی خۆرهەڵات نامێنێ، کاتی نوێژی بەیانیش تا خۆرهەڵاتنە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر دەستەواژەی ئەم فەرموودەیە ڕاست و دروست بێت، ئەوە لەم فەرموودەدا ڕوونکردنەوەیەك هەیە کە ئەویش (الشَّفَقَ) بە واتای سورایی دێت، بەڵام ئەم دەستەواژەیە بەتەنها موحەممەدی کوڕی یەزید هێناویەتی ئەگەر لێیەوە پارێزراو بێت، بەڵام هاوەڵانی شوعبە لەم فەرموودەیەدا وتوویانە: (ثَوْرُ الشَّفَقِ) واتە: بڵاوبوونەوەی ڕۆشنایی قەراغی ئاسمان. لە جێگای ئەوەی کە موحەممەدی کوڕی یەزید وتوویەتی: (حُمْرَةُ الشَّفَقِ).

---

(١) صحيح.

**٣٥٥-** عَن شُعبةَ عَن قَتادةَ عن أبي أيُوبٍ عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﭭ قَالَ شُعْبَةُ: رَفَعَهُ مَرَّةً، وَقَالَ بُنْدَارٌ: بِمِثْلِ حَدِيثِ الْأَوَّلِ. وَرَوَاهُ أَيْضًا هِشَامٌ الدَّسْتُوَائِيُّ، عَنْ قَتَادَةَ وَرَفَعَهُ، قَدْ أَمْلَيْتُهُ قَبْلُ، وَقَالَ: إِلَى أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، وَلَمْ يَقُلْ: ثَوْرٌ وَلَا حُمْرَةٌ وَرَوَاهُ أَيْضًا سَعِيدُ بْنُ أَبِي عَرُوبَةَ وَلَمْ يَرْفَعْهُ وَلَمْ يَذْكُرِ الْحُمْرَةَ وَكَذَلِكَ رَوَاهُ ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ مَوْقُوفًا، وَلَمْ يَذْكُرِ الْحُمْرَةَ عَنْ شُعْبَةَ ثنا بِهِمَا أَبُو مُوسَى، نا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ شُعْبَةَ، ح وَحَدَّثَنَا أَيْضًا أَبُو مُوسَى، نا ابْنُ أَبِي عَدِيٍّ، عَنْ سَعِيدٍ كِلَيْهِمَا، عَنْ قَتَادَةَ، فَهَذَا الْحَدِيثُ مَوْقُوفًا لَيْسَ فِيهِ ذِكْرُ الْحُمْرَةِ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَالْوَاجِبُ فِي النَّظَرِ إِذَا لَمْ يَثْبُتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الشَّفَقَ هُوَ الْحُمْرَةُ وَثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ أَوَّلَ وَقْتِ الْعِشَاءِ إِذَا غَابَ الشَّفَقُ أَنْ لَا يُصَلِّيَ الْعِشَاءَ حَتَّى يَذْهَبَ بَيَاضُ الْأُفُقِ؛ لِأَنَّ مَا يَكُونُ مَعْدُومًا فَهُوَ مَعْدُومٌ، حَتَّى يُعْلَمَ كَوْنُهُ بِيَقِينٍ، فَمَا لَمْ يُعْلَمْ بِيَقِينٍ أَنَّ وَقْتَ الصَّلَاةِ قَدْ دَخَلَ، لَمْ تَجِبِ الصَّلَاةُ، وَلَمْ يَجُزْ أَنْ يُؤَدَّى الْفَرْضُ إِلَّا بَعْدَ يَقِينٍ أَنَّ الْفَرْضَ قَدْ وَجَبَ، فَإِذَا غَابَتِ الْحُمْرَةُ وَالْبَيَاضُ قَائِمٌ لَمْ يَغِبْ، فَدُخُولُ وَقْتِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ شَكٌّ لَا يَقِينٌ؛ لِأَنَّ الْعُلَمَاءَ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي الشَّفَقِ قَالَ بَعْضُهُمْ: الْحُمْرَةُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: الْبَيَاضُ، وَلَمْ يَثْبُتْ عِلْمِيًّا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الشَّفَقَ الْحُمْرَةُ، وَمَا لَمْ يَثْبُتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَلَمْ يَتَّفِقِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ، فَغَيْرُ وَاجِبٍ فَرْضُ الصَّلَاةِ إِلَّا أَنْ يُوجِبَهُ اللَّهُ أَوْ رَسُولُهُ أَوِ الْمُسْلِمُونَ فِي وَقْتٍ، فَإِذَا كَانَ الْبَيَاضُ قَائِمًا فِي الْأُفُقِ، وَقَدِ اخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ بِإِيجَابِ فَرْضِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ، وَلَمْ يَثْبُتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ خَبَرٌ بِإِيجَابِ فَرْضِ الصَّلَاةِ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ، فَإِذَا ذَهَبَ الْبَيَاضُ وَاسْوَدَّ فَقَدِ اتَّفَقَ الْعُلَمَاءُ عَلَى إِيجَابِ فَرْضِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ فَجَائِزٌ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ أَدَاءُ فَرْضِ تِلْكَ الصَّلَاةِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِصِحَّةِ هَذِهِ اللَّفْظَةِ الَّتِي ذُكِرَتْ فِي حَدِيثِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو.

واتە: شوعبە دەگێڕێتەوە لە قەتادەوە لە ئەبو ئەیوب، لە عەبدوڵای کوڕی عەمڕەوە ﭭ، شوعبە وتی: جارێك بەمەڕفوعی هێناویەتی، بونداریش هەر وەکوو فەرموودەی یەکەمی وت، هەروەها هیشامی دەستوائیش گێڕاویەتەوە لە قەتادە بەمەڕفوعی، پێشتر باسم کرد، وە وتی: (إِلَى أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ)، واتە: تا ڕۆشنایی قەراغ خۆرئاوا نامێنێ، نە (ثَوْرٌ)ی وت و نە (حُمْرَةٌ)، هەروەها سەعیدی کوڕی عەڕوبە گێڕاویەتەوە و ڕەفعی نەکردووە و باسی (حُمْرَةٌ)ەشی نەکردووە، بەهەمان شێوە ئیبنو عەدی گێڕاویەتەوە لە شوعبەوە بەمەوقوفی، باسی (الْحُمْرَةَ)ی نەکردووە لە شوعبەوە ئەبو موسا بۆی

---

(١) صحيح.

باس کردین، لە ئیبنو عەدی، لە شوعبەوە، فەرموودەکەی باس کرد، هەروەها ئەبو موسا بۆی باس کردین لە ئیبنو عەدی، لە سەعید، هەردووکیان لە قەتادەوە، جا ئەوە فەرموودەیەکی مەوقوفە بە هیچ شێوەیەك باسی (حُمْرَةٌ) تێدا نییە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەوەی پێویستە لە تێڕوانیندا ئەگەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگیر نەبوو کە (الشَّفَقَ) بریتییە لە (الْحُمْرَةُ)، بەڵام جێگیر بوو یەکەم کاتی عیشا ئەو کاتەیە کە (الشَّفَقُ) دیار نەما نوێژی عیشا نەکرێت هەتا سپیایی ئاسۆی ئاسمان نامێنێ، چونکە هەر شتێك نەبوو ئەوە نەبووە، هەتا بوونی بەدڵنیایی دەردەکەوێت، ئەگەر بەدڵنیایی نەزانرا کاتی نوێژ هاتووە، ئەوە نوێژ پێویست (واجب) نابێت، وە دروست نییە نوێژ ئەنجام بدرێ مەگەر دوای ئەوەی کە دڵنیا دەبێت نوێژ پێویست (واجب) بووە، جا ئەگەر (لْحُمْرَةُ) سورایی بن ئاسمان دیار نەما و (الْبَيَاضُ) سپیایی مابوو هێشتا نەڕۆیشتبوو، ئەوە چوونە نێو نوێژی عیشا گومانە و دڵنیایی تێدا نییە، چونکە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی (الشَّفَقَ)، هەندێکیان دەڵێن: بە مانای (الْحُمْرَةُ) سورایی دێت، هەندێکی دیکەشیان دەڵێن: بە مانای: (الْبَيَاضُ) سپیایی دێت، جا لە ڕووی زانستییەوە نەچەسپاوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە (الشَّفَقَ) بە مانای (الْحُمْرَةُ) سورایی بێت، هەر شتێکیش نەچەسپا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، موسوڵمانانیش لەسەری یەکدەنگ نەبوون، جا کەواتە واجب نییە نوێژێکی فەڕز ئەنجام بدرێت مەگەر خوا ﷻ یان پێغەمبەرەکەی ﷺ یان موسوڵمانان بەیەکدەنگی پێویستی بکەن لە کاتێکدا، جا ئەگەر سپیایی لە ئاسۆدا مابوو، ئەوە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر پێویست (واجب) بوونی فەڕزی نوێژی عیشا، هیچ فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەصەحیحی نەهاتووە بە پێویست (واجب) بوونی نوێژی فەڕز لەو کاتەدا، جا ئەگەر سپیایی ئاسمان ڕۆیشت و ڕەش بوو ئەوە زانایان یەکدەنگن لەسەر پێویست (واجب) بوونی فەڕزی نوێژی عیشا، لەو کاتەدا دروستە نوێژەکەی بەجێ بهێنێت، خوا زاناترە بە ڕاستی و دروستی ئەو دەستەواژەیەی کە لە فەرموودەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە.

## بَابُ ذِكْرِ بَيَانِ الْفَجْرِ الَّذِي يَجُوزُ صَلَاةُ الصُّبْحِ بَعْدَ طُلُوعِهِ، إِذِ الْفَجْرُ هُمَا فَجْرَانِ، طُلُوعُ أَحَدِهِمَا بِاللَّيْلِ، وَطُلُوعُ الثَّانِي يَكُونُ بِطُلُوعِ النَّهَارِ

٣٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْفَجْرُ فَجْرَانِ فَجْرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الطَّعَامُ وَيَحِلُّ فِيهِ الصَّلَاةُ، وَفَجْرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الصَّلَاةُ وَيَحِلُّ فِيهِ الطَّعَامُ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ صَلَاةَ الْفَرْضِ لَا يَجُوزُ أَدَاؤُهَا قَبْلَ دُخُولِ وَقْتِهَا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ فَجْرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الطَّعَامُ يُرِيدُ عَلَى الصَّائِمِ، وَيَحِلُّ فِيهِ الصَّلَاةُ يُرِيدُ صَلَاةَ الصُّبْحِ، وَفَجْرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الصَّلَاةُ يُرِيدُ صَلَاةَ الصُّبْحِ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ الْأَوَّلُ لَمْ يَحِلَّ أَنْ يُصَلَّى فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ صَلَاةُ الصُّبْحِ؛ لِأَنَّ الْفَجْرَ الْأَوَّلَ يَكُونُ بِاللَّيْلِ، وَلَمْ يَرِدْ أَنَّهُ لَا يَجُوزُ أَنْ يُتَطَوَّعَ بِالصَّلَاةِ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الْأَوَّلِ، وَقَوْلُهُ: وَيَحِلُّ فِيهِ الطَّعَامُ يُرِيدُ لِمَنْ يُرِيدُ الصِّيَامَ.

## باسی ڕوونکردنەوەی ئەو بەرەبەیانەی (فجر) کە دوای دەرچوونی دروستە نوێژی بەیانی بکرێت، چونکە بەرەبەیان دوو بەرەبەیانە، دانەیەکیان بە شەو دەردەچێت، ئەوی دیکەیان بە دەرچوونی ڕۆژ دەبێتەوە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەرەبەیان دوو بەرەبەیانە بەرەبەیانێك خواردن و خواردنەوەی تێدا حەرامە (لەسەر بەڕۆژوو)، وە نوێژی تێدا حەڵاڵە، وە بەرەبەیانێك نوێژی تێدا حەرامە و خواردن و خواردنەوەی تێدا حەڵاڵە.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی نوێژی فەڕز دروست نییە ئەنجام بدرێت پێش هاتنی کاتەکەی. ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (فَجَرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الطَّعَامُ)، واتە: بەرەبەیانێك خواردن و خواردنەوەی تێدا حەرامە. مەبەستی لەسەر ڕۆژووەوانە، (وَيَحِلُّ فِيهِ الصَّلَاةُ) واتە: نوێژی تێدا دروستە. مەبەستی نوێژی بەیانییە، وە (وَفَجَرٌ يَحْرُمُ فِيهِ الصَّلَاةُ)، واتە: بەرەبەیانێك نوێژی تێدا حەرامە. مەبەستی پێی نوێژی بەیانییە، کاتێ بەرەبەیانی یەکەم دەرکەوت حەڵاڵ نییە لەو

---

(١) إسناد هذا الحديث ضعيف.

کاتەدا نوێژی بەیانی بکرێت، چونکە بەرەبەیانی یەکەم لە شەودا دەبێت، مەبەستی ئەوە نییە دروست نییە نوێژی سوننەت بکرێ لەدوای دەرکەوتنی بەرەبەیانی یەکەم، وە فەرموودەی: (وَيَحِلُّ فِيهِ الطَّعَامُ)، واتە: خواردن و خواردنەوەی تێدا حەڵاڵە. مەبەستی ئەوەیە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بەڕۆژوو بێت.

## بَابُ فَضْلِ انْتِظَارِ الصَّلَاةِ وَالْجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ وَذِكْرِ دُعَاءِ الْمَلَائِكَةِ لِمُنْتَظِرِ الصَّلَاةِ الْجَالِسِ فِي الْمَسْجِدِ

**٣٥٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَزِيدُ فِي الْحَسَنَاتِ؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ فِي الْمَكَارِهِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، مَا مِنْكُمْ مِنْ رَجُلٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ فَيُصَلِّي مَعَ الْإِمَامِ، ثُمَّ يَجْلِسُ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ الْأُخْرَى إِلَّا وَالْمَلَائِكَةُ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ»[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی چاوەڕوانی نوێژ و دانیشتن لە مزگەوت، وە باسی پاڕانەوەی فریشتەکان بۆ ئەو کەسەی لە مزگەوت دانیشتووە و چاوەڕوانی نوێژ دەکات

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بەوەی خوا گوناهەکانی پێ دەسڕێتەوە و چاکەکانی پێ زۆر دەکات؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: دەستنوێژگرتن بەچاکی لە کاتی ناڕەحەتی (سەرما بێت یان ئازاری جەستە)، چاوەڕوانیکردنی نوێژ لەدوای نوێژ، وە هەر یەکێك لە ئێوە لە ماڵ دەربچێ بەدەستنوێژەوە (هەتا دەگاتە مزگەوت) دواتر لەگەڵ پێشنوێژدا نوێژ بکات، پاشان دابنیشێ چاوەڕوانی نوێژەکەی دیکە بکات ئیللا فریشتەکان دەڵێن: خوایە لێی خۆش بە خوایە ڕەحمی پێ بکە.

**٣٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ

---

(١) صحيح.

اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ أَخْفَاهَا لَا تَعْلَمُ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»[١].

فَقَالَ إِنِّي قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ لَا تَعْلَمُ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ قَدْ خُولِفَ فِيهَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ فَقَالَ: مَنْ رَوَى هَذَا الْخَبَرَ غَيْرُ يَحْيَى، لَا يَعْلَمُ شِمَالُهُ مَا يُنْفِقُ يَمِينُهُ.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەوت کۆمەڵە هەن خوا لە سێبەری خۆیدا دەیانپارێزێ و دەحەسێنەوە، لە ڕۆژێك کە هیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری خۆی نەبێ: پێشەوایەکی دادپەروەر، گەنجێك گەنجێتی کردبێتەوە لە پەرستشی خوادا، پیاوێکیش دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، دوو کەسیش لە پێناوی خوادا یەکدییان خۆش بووێ و لەیەك نزیك ببنەوە، پیاوێکیش ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایە و جوان بانگی بکات بۆ ڕابواردن، بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك خێر و بەخشینێك بکات، بیشارێتەوە دەستی ڕاستی بە دەستی چەپی نەزانێت، پیاوێك لە تەنیاییدا یادی خوا بکات و فرمێسك لە چاوی بێتە خوارەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە (دەستی ڕاستی بە دەستی چەپی نەزانێت لەوەی کە دەیبەخشێ) یەحیای کوڕی سەعید پێچەوانەی کردووە تیایدا، وتی: هەر کەسێك ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە جگە لە یەحیا بەم شێوەیە: (لَا يَعْلَمُ شِمَالُهُ مَا يُنْفِقُ يَمِينُهُ) واتە: دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی نەزانێت لەوەی کە دەیبەخشێ.

**٣٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ رَجُلٍ كَانَ يُوَطِّنُ الْمَسَاجِدَ فَشَغَلَهُ أَمْرٌ أَوْ عِلَّةٌ، ثُمَّ عَادَ إِلَى مَا كَانَ إِلَّا تَبَشْبَشَ اللَّهُ إِلَيْهِ كَمَا يَتَبَشْبَشُ أَهْلُ الْغَائِبِ بِغَائِبِهِمْ إِذَا قَدِمَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك جێگایەك دیاری بکات لەنێو مزگەوتەکان (پەرستشی تێدا بکات) شتێك سەرقاڵی بکات یان هەر هۆکارێك، پاشان گەڕایەوە بۆ جێگاکەی پێشووی ئەوە خوا بە ڕەحم و میهرەبانی خۆی ڕووی تێ دەکات وەکوو چۆن کەسوکاری نادیار کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ نێویان بەدڵێکی خۆشەوە ڕووی تێ دەکەن و پێشوازی لێ دەکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّيْءَ قَدْ يُشَبَّهُ بِالشَّيْءِ إِذَا اشْتَبَهَ فِي بَعْضِ الْمَعَانِي لَا فِي جَمِيعِهَا، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْعَبْدَ لَا يَزَالُ فِي صَلَاةٍ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ يَنْتَظِرُهَا، وَإِنَّمَا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُ لَا يَزَالُ فِي صَلَاةٍ، أَيْ أَنَّ لَهُ أَجْرَ الْمُصَلِّي، لَا أَنَّهُ فِي صَلَاةٍ فِي جَمِيعِ أَحْكَامِهِ، إِذْ لَوْ كَانَ مُنْتَظِرُ الصَّلَاةِ فِي صَلَاةٍ فِي جَمِيعِ أَحْكَامِهِ، لَمَا جَازَ لِمُنْتَظِرِ الصَّلَاةِ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ أَنْ يَتَكَلَّمَ بِمَا يَقْطَعُ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ لَوْ تَكَلَّمَ بِهِ فِي الصَّلَاةِ، وَلَمَا جَازَ أَنْ يُوَلِّيَ وَجْهَهُ عَنِ الْقِبْلَةِ أَوْ يَسْتَقْبِلَ غَيْرَ الْقِبْلَةِ، وَلَكَانَ مَنْهِيًّا عَنْ كُلِّ مَا نُهِيَ عَنْهُ الْمُصَلِّي

**٣٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَزَالُ الْعَبْدُ فِي صَلَاةٍ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ، تَقُولُ الْمَلَائِكَةُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يَنْصَرِفْ أَوْ يُحْدِثْ» قَالُوا: مَا يُحْدِثُ؟ قَالَ: «يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي يَقُولُ إِنَّ ذِكْرَهُمَا لِعِلَّةٍ؛ لِأَنَّهُمَا وَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى الِانْفِرَادِ يَنْقُضُ طُهْرَ الْمُتَوَضِّئِ، وَكُلُّ مَا نَقَضَ طُهْرَ الْمُتَوَضِّئِ مِنَ الْأَحْدَاثِ كُلِّهَا فَحُكْمُهُ حُكْمُ هَذَيْنِ الْحَدَثَيْنِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَجَبْتُ بَعْضَ أَصْحَابِنَا أَنَّهُ مِنَ الْخَبَرِ الْمُعَلَّلِ الَّذِي يَجُوزُ أَنْ يُشَبَّهَ بِهِ مَا هُوَ مِثْلُهُ فِي الْحُكْمِ وَلَوْ كَانَ التَّشْبِيهُ وَالتَّمْثِيلُ لَا يَجُوزُ عَلَى أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى مَا تَوَهَّمَ بَعْضُ مَنْ خَالَفَنَا لَكَانَ الْبَائِلُ فِي كُوزٍ أَوْ قَارُورَةٍ وَالْمُتَغَوِّطُ فِي طَشْتٍ، أَوْ أُجَانَةٍ إِذَا جَلَسَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ كَانَ لَهُ أَجْرُ الْمُصَلِّي، وَالْمُحْدِثُ إِذَا خَرَجَتْ مِنْهُ رِيحٌ لَمْ يَكُنْ لَهُ أَجْرُ الْمُصَلِّي، وَإِنْ جَلَسَ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ خُرُوجِ الرِّيحِ مِنْهُ يَنْتَظِرُ الصَّلَاةَ، وَمَنْ فَهِمَ الْعِلْمَ وَعَقَلَهُ وَلَمْ يُعَانِدْ وَلَمْ يُكَابِرْ غَفَلَةً عَلِمَ أَنَّ قَوْلَهُ: «يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ» إِنَّمَا أَرَادَ أَنَّ الْفِسَا وَالضِّرَاطُ يَنْقُضَانِ طُهْرَ الْمُتَوَضِّئِ وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَجْعَلْ لِمُنْتَظِرِ الصَّلَاةِ بَعْدَ هَذَيْنِ الْحَدَثَيْنِ فَضِيلَةَ الْمُصَلِّي؛ لِأَنَّهُ غَيْرُ الْمُتَوَضِّئِ فَكُلُّ مُنْتَظِرِ الصَّلَاةَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ غَيْرُ طَاهِرٍ طَهَارَةً تُجْزِيهِ الصَّلَاةُ مَعَهَا فَحُكْمُهُ حُكْمُ مَنْ خَرَجَتْ مِنْهُ رِيحٌ نَقَضَتْ عَلَيْهِ الطَّهَارَةَ.

---

(١) صحيح.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەندێ جار شتێك دەچوێنرێ بە شتێك، ئەگەر لە هەندێ مانادا لەو شتە بچێت نەك لە هەموو ماناکان، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە بەڕاستی مرۆڤ بەردەوام لە نوێژدایە مادام لە شوێنی نوێژەکەی ماوەتەوە و چاوەڕوانی نوێژەکەی دیکە دەکات، پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەوەی بەردەوام بەندە لەنێو نوێژدایە، واتە: پاداشتی نوێژخوێنی بۆ هەیە، نەك ئەو لە نوێژدایە بە هەموو ئەحکامەکانی، ئەگەر ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات بەردەوام لە نوێژدا بێت بە هەموو ئەحکامەکانی، دروست نەدەبوو بۆ چاوەڕوانیکەری نوێژ ئەو قسەی کە لەناو نوێژ دەیکات و نوێژەکەی بەتاڵ دەکاتەوە لە کاتی چاوەڕوانیشدا بیکات، وە دروست نەدەبوو ڕووی وەربگێڕێ لە قیبلە، یان ڕوو بکاتە جێگایەك جگە قیبلە، وە قەدەغەی لێ دەکرا لە هەموو ئەوانەی لەنێو نوێژدا قەدەغەن**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام بەندە لە نوێژدایە مادام لە شوێنی نوێژەکەی بێت، فریشتەکان دەڵێن: خوایە لێی خۆش بە خوایە ڕەحمی پێ بکە تا شوێنەکەی بەجێ نەهێڵێ یان بێدەستنوێژ نەبێت، وتیان: بە چی بێدەستنوێژ دەبێت؟ فەرمووی: هەوای لێ دەربچێت یان دەنگ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم ئەم دەستەواژەیە: (يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ) لەو ڕەگەزەی ئەو شتانەیە کە دەڵێ بێگومان باسکردنیان لەبەر ئەوەیە کە هۆکارن، هەر یەکێکیان بەتەنها دەستنوێژی دەستنوێژگر دەشکێنێ، (کەواتە هۆکارن بۆ دەستنوێژشکاندن)، وە هەموو ئەوانەش کە دەستنوێژی دەستنوێژگر دەشکێنن لە هەموو بێدەستنوێژییەکان هەمان حوکمی ئەم دووانەیان هەیە، (چونکە لە یەك ڕەگەن و هۆکارن)، ئەوەش لەو ڕەگەزەیە کە وەڵامی هەندێ لە هاوەڵانمانم پێ داوەتەوە ئەوە لەو فەمووادنەیە عیللەیان تێدایە کە دروستە ئەوەی لە حوکمدا هاوشێوەیەتی پێی بشوبهێت، جار ئەگەرچی تەشبیە و هاوشێوە دروست نەبووایە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن هەندێ لەوانە لێیان تێکچووە پێچەوانەی ئێمە دەکەن و بەهەڵەدا چوون، ئەوە ئەو کەسەی میز دەکاتە نێو کوپە یان قاپ و بوتڵ و ئەوەیشی پیسی دەکاتە نێو تەشت ئەگەر لەنێو مزگەوت دانیشت چاوەڕوانی نوێژ بکات ئەوە پاداشتی نوێژخوێنی بۆ هەیە، بێدەستنوێژ ئەگەر

هەوای لێ دەرچوو پاداشتی نوێژخوێنی بۆ نییە، ئەگەر دانیشت لە مزگەوت دوای دەرچوونی با لێیەوە بەمەبەستی چاوەڕوانی نوێژ، هەر کەسێك لە زانست تێ بگات و کەللەڕەق نەبێت و خۆی بەگەورە نەزانێت دەزانێت فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (يَفْسُو أَوْ يَضْرِطُ)، بێگومان مەبەستی پێی هەوا و دەنگلێدەرچوون دەستنوێژی دەستنوێژگر دەشکێنن، پێغەمبەر ﷺ پاداشتی نوێژخوێنی دانەناوە بۆ ئەو کەسەی چاوەڕوانی نوێژ دەکات بەبێدەستنوێژی، چونکە دەستنوێژی نییە، جا هەر کەسێك چاوەڕوانی نوێژ بێت و لە مزگەوت دانیشێت دەستنوێژی نەبێت وەك چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەگرێ، ئەوە حوکمی ئەو کەسەی هەیە هەوای لێ دەرچووە و دەستنوێژی شکاوە.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ

## بَابٌ فِي بَدْءِ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ

**٣٦١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَاةَ وَلَيْسَ يُنَادِي بِهَا أَحَدٌ فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ قَرْنًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ ﺡ: أَفَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُمْ يَا بِلَالُ، فَنَادِ بِالصَّلَاةِ»[1].

## کۆباسی بانگدان و قامەت

## باسی دەستپێکردنی بانگ و قامەت

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﭭ دەڵێ: موسوڵمانان کاتێ هاتن بۆ مەدینە کۆ دەبوونەوە و چاوەڕێی نوێژیان دەکرد، هیچ کەسێك نەبوو بانگ بۆ نوێژ بدات، ڕۆژێکیان قسەوباسیان لەو بارەوە کرد، هەندێکیان وتیان: زەنگێك بەکار بهێنن وەکوو زەنگی گاورەکان، هەندێکی دیکەیان وتیان: بەڵکوو کەڕەنایەك وەکوو کەڕەنای جوولەکەکان، عومەر ﺡ وتی: ئەی بۆ کەسێك نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بیلال هەستە و بانگ بدە بۆ نوێژ.

---

(١) صحيح.

**٣٦٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ بِلَالًا ﷺ كَانَ يَقُولُ أَوَّلَ مَا أَذَّنَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: قُلْ فِي أَثَرِهَا أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُلْ كَمَا أَمَرَكَ عُمَرُ ﷺ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە بیلال ﷺ دەیوت: یەکەم جار کە بانگی دا دەیوت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ) عومەر ﷺ وتی: بەدوایدا بڵێ: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومەر ﷺ چۆن فەرمانی پێ کردیت بەو شێوەیە بڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ مَنْ كَانَ أَرْفَعَ صَوْتًا وَأَجْهَرَ، كَانَ أَحَقَّ بِالْأَذَانِ مِمَّنْ كَانَ أَخْفَضَ صَوْتًا، إِذِ الْأَذَانُ إِنَّمَا يُنَادَى بِهِ لِاجْتِمَاعِ النَّاسِ لِلصَّلَاةِ

**٣٦٣-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا أَصْبَحْنَا أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ بِالرُّؤْيَا، فَقَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الرُّؤْيَا حَقٌّ، فَقُمْ مَعَ بِلَالٍ ﷺ فَإِنَّهُ أَنْدَى - أَوْ أَمَدُّ صَوْتًا - مِنْكَ فَأَلْقِ عَلَيْهِ مَا قِيلَ لَكَ فَيُنَادِي بِذَلِكَ» قَالَ: فَفَعَلْتُ فَلَمَّا سَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ نِدَاءَ بِلَالٍ بِالصَّلَاةِ خَرَجَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَجُرُّ رِدَاءَهُ وَهُوَ يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذِي قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلِلَّهِ الْحَمْدُ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك دەنگی بەرزتر و پاراوتر بێت، ئەوە لەپێشترە بە بانگدان لەوەی دەنگی نزمترە، چونکە بانگدان لەبەر ئەوە دەدرێ تا خەڵك کۆ ببنەوە بۆ نوێژ

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی زەید دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: کاتێ کە ڕۆژمان کردەوە هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی خەوەکەمم پێی دا، فەرمووی: بەڕاستی ئەوە خەونێکی ڕاستە هەستە ئەوەی بینیوتە بۆ بیلالی ﷺ بخوێنە، با بانگی پێ بدات، چونکە ئەو دەنگی بڵندترە -یان- دەنگی لە تۆ درێژترە، وتی: منیش

---

(١) هذا الحديث المنكر باطل غير صحيح.

(٢) صحيح.

لەگەڵ بیلالدا هەستام و بۆم خوێندەوە، ئەویش بەو شێوەیە بانگی دا، کاتێ عومەر ﷺ گوێبیستی دەنگی بیلال بوو، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەباکەی ڕادەکێشا و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەو خوایەی تۆی بەحەق ناردووە بەڕاستی منیش هەمان خەوم بینی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوپاس و ستاییش بۆ خوا ﷻ.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْأَذَانِ لِلصَّلَاةِ قَائِمًا لَا قَاعِدًا، إِذِ الْأَذَانُ قَائِمًا أَحْرَى أَنْ يَسْمَعَهُ مَنْ بَعُدَ عَنِ الْمُؤَذِّنِ مِنْ أَنْ يُؤَذِّنَ وَهُوَ قَاعِدٌ

**٣٦٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُمْ يَا بِلَالُ ﷺ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ»(١).

## باسی فەرمانکردن بە بانگدان بۆ نوێژ بەڕاوەستانەوە نەك بەدانیشتنەوە، چونکە بانگدان بەڕاوەستانەوە خەڵك چاکتر دەیبیستێ لە بانگدان بەدانیشتنەوە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەی نافیعدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەستە ئەی بیلال ﷺ بانگ بدە بۆ نوێژ.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ بَدْءَ الْأَذَانِ إِنَّمَا كَانَ بَعْدَ هِجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْمَدِينَةِ، وَأَنَّ صَلَاتَهُ بِمَكَّةَ إِنَّمَا كَانَتْ مِنْ غَيْرِ نِدَاءٍ لَهَا وَلَا إِقَامَةٍ

**٣٦٥-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ إِنَّمَا يَجْتَمِعُ النَّاسُ إِلَيْهِ لِلصَّلَاةِ بِحِينِ مَوَاقِيتِهَا بِغَيْرِ دَعْوَةٍ(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دەستپێکردنی بانگ دوای هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ بوو بۆ مەدینە، نوێژکردنی لە مەککە بەبێ بانگ و قامەت بوو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە خەڵکی لە کاتی خۆی بۆ نوێژ کۆ دەبوونەوە لە خزمەتیدا بەبێ بانگکردن.

## بَابُ تَثْنِيَةِ الْأَذَانِ وَإِفْرَادِ الْإِقَامَةِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٣٦٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُمِرَ بِلَالٌ ﷺ أَنْ يَشْفَعَ، الْأَذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةِ(١).

**باسی بانگدان بە جووت و قامەتکردن بە تاك، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون، بە دەستەواژەی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: فەرمان کرا بە بیلال ﷺ بانگ بە جووت بدات (واتە: ڕستەکان دوو جار دوو جار بڵێ)، قامەتیش بە تاك (یەك جار یەك جار).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْآمِرَ بِلَالًا أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ كَانَ النَّبِيَّ ﷺ لَا بَعْدَهُ أَبُو بَكْرٍ وَلَا عُمَرُ، كَمَا ادَّعَى بَعْضُ الْجَهَلَةِ أَنَّهُ جَائِزٌ أَنْ يَكُونَ الصِّدِّيقُ أَوِ الْفَارُوقُ أَمَرَ بِلَالًا بِذَلِكَ

**٣٦٧-** عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُ حَدَّثَ أَنَّهُمُ الْتَمَسُوا، شَيْئًا يُؤَذِّنُونَ بِهِ عِلْمًا لِلصَّلَاةِ قَالَ فَأُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ(٢).

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی فەرمانی بە بیلال کرد: بانگ بە جووت بدات و قامەتیش بە تاك بکات، پێغەمبەر ﷺ بوو، نەك ئەبو بەکر یان عومەر، وەك چۆن یەکێك لە نەفامەکان بانگەشەی ئەوە دەکات کە دروستە ئەبو بەکری صدیق یان عومەری فارۆق فەرمانی کردبێت بە بیلال بەوە**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ ئەو باسی کرد ئەوان بەدوای شتێکدا دەگەڕان بانگی پێ بدەن وەك نیشانەیەك بۆ زانینی کاتی نوێژ، جا فەرمان کرا بە بیلال بانگ بە جووت بدات، قامەتیش بە تاك.

**٣٦٨-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا كَثُرَ النَّاسُ ذَكَرُوا أَنْ يَعْلَمُوا وَقْتَ الصَّلَاةِ بِشَيْءٍ يَعْرِفُونَهُ، فَذَكَرُوا أَنْ يُنَوِّرُوا نَارًا أَوْ يَضْرِبُوا نَاقُوسًا، فَأُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: کاتێك کە خەڵك زۆر بوو باسی ئەوەیان کرد بە شتێك کاتی نوێژ بزانن، باسی ئەوەیان کرد ئاگرێ بکەنەوە یان زەنگێك لێ بدەن، جا فەرمان کرا بە بیلال بانگ بە جووت بدات، قامەتیش بە تاك.

**٣٦٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَتِ الصَّلَاةُ إِذَا حَضَرَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَعَى رَجُلٌ فِي الطَّرِيقِ فَنَادَى: « الصَّلَاةُ الصَّلَاةُ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَوِ اتَّخَذْنَا نَاقُوسًا؟ قَالَ: «ذَلِكَ لِلنَّصَارَى» قَالَ: فَلَوِ اتَّخَذْنَا بُوقًا قَالَ: «ذَلِكَ لِلْيَهُودِ» قَالَ: فَأُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کاتی نوێژ بهاتایە پیاوێك دەچووە سەر ڕێگا هاواری دەکرد: کاتی نوێژە، کاتی نوێژە، کاتی نوێژە، ئەوە گران بوو لەسەر خەڵك، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە زەنگێکمان دادەنا؟ فەرمووی: ئەوە زەنگی گاورەکانە، وتی: خۆزگە کەڕەنایەکمان دادەنا؟ فەرمووی: ئەوە بۆ جوولەکەیە، بۆیە فەرمان کرا بە بیلال بانگ بە جووت بدات، قامەتیش بە تاك.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِأَنْ يُشْفَعَ بَعْضُ الْأَذَانِ لَا كُلُّهَا، وَأَنَّهُ إِنَّمَا أَمَرَ بِأَنْ يُوتَرَ بَعْضُ الْإِقَامَةِ لَا كُلُّهَا، وَأَنَّ اللَّفْظَةَ الَّتِي فِي خَبَرِ أَنَسٍ إِنَّمَا هِيَ مِنْ أَخْبَارِ أَلْفَاظِ الْعَامِّ الَّتِي يُرَادُ بِهَا الْخَاصُّ، إِذِ الْأَذَانُ وِتْرٌ لَا شَفْعٌ؛ لِأَنَّ الْمُؤَذِّنَ إِنَّمَا يَقُولُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فِي آخِرِ الْأَذَانِ مَرَّةً وَاحِدَةً. وَكَذَلِكَ الْمُقِيمُ يُثَنِّي فِي الِابْتِدَاءِ اللَّهُ أَكْبَرُ، فَيَقُولُهُ مَرَّتَيْنِ، وَكَذَلِكَ يَقُولُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ مَرَّتَيْنِ، وَيَقُولُ أَيْضًا: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ مَرَّتَيْنِ

**٣٧٠-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ ﷺ قَالَ: وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَهَا إِنَّمَا يَجْتَمِعُ النَّاسُ إِلَيْهِ لِلصَّلَاةِ بِحِينِ مَوَاقِيتِهَا بِغَيْرِ دَعْوَةٍ، فَهَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَجْعَلَ بُوقًا كَبُوقِ الْيَهُودِ الَّذِي يَدْعُونَ بِهِ لِصَلَوَاتِهِمْ، ثُمَّ كَرِهَهُ، ثُمَّ أَمَرَ بِالنَّاقُوسِ فَنُحِتَ لَيَضْرِبَ بِهِ لِلْمُسْلِمِينَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ أُرِيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ أَخُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ النِّدَاءَ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ طَافَ بِي هَذِهِ اللَّيْلَةَ طَائِفٌ مَرَّ بِي رَجُلٌ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ يَحْمِلُ نَاقُوسًا فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ أَتَبِيعُ هَذَا النَّاقُوسَ؟ فَقَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ قُلْتُ نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ: أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: تَقُولُ اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ غَيْرَ كَثِيرٍ، ثُمَّ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، وَجَعَلَهَا وِتْرًا، إِلَّا قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَلَمَّا خَبَّرْتُهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقُمْ مَعَ بِلَالٍ فَأَلْقِهَا عَلَيْهِ فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ، فَلَمَّا أَذَّنَ بِهَا بِلَالٌ سَمِعَ بِهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ فَخَرَجَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَجُرُّ رِدَاءَهُ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا رَأَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلِلَّهِ الْحَمْدُ، فَذَاكَ أَثْبَتُ»[1].

---

(١) إسناده صحيح.

**باسی فەرموودەیەکی (مفسر) شیکراوە و ڕوون، بۆ ئەو دەستەواژە (مجمل) کورت و ناڕوونەی کە باسمان کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها فەرمانی کردووە بەشێك لە بانگەکە جووت بێت نەك هەمووی، هەروەها فەرمانی کردووە تەنها بەشێك لە قامەتەکە تاك بێت نەك هەمووی، وە ئەو دەستەواژەیەی لە فەرموودەکەی ئەنەس هاتووە، لەو فەرموودانەیە کە دەستەواژەکەیان (عَام) گشتییە و مەبەست پێی (خَاص) تایبەتییە، جا بۆیە بانگ نە تاکە نە جووت، چونکە بانگدەر لە کۆتایی بانگدا جارێك دەڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، بەهەمان شێوە قامەتکەریش سەرەتا دوو جار دەڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، بەهەمان شێوە دوو جار دەڵێ: (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)، هەروەها دوو جار دەڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ)**

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هات بۆ مەدینە خەڵك کۆ دەبوونەوە لە دەوری و چاوەڕێی نوێژیان دەکرد بەبێ بانگکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بە خەیاڵیدا کەڕەنایەك دابنێ بۆ بانگدان وەکوو کەڕەنای جوولەکەکان کە بانگی خەڵکیان پێ دەکرد بۆ نوێژەکانیان، پاشان پێی باش نەبوو، پاشان فەرمانی کرد زەنگێکی بۆ هەڵبکوڵدرێ بۆ ئەوەی موسوڵمانان بۆ کاتی نوێژ بەکاری بهێنن، لە کاتێکدا ئەوان لەو دۆخەدا بوون عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی (عَبْدِ رَبِّهِ) برای حارسی کوڕی خەزرەج لە خەودا بانگدانی پێ نیشان درا، دواتر هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمشەو لە خەومدا کەسێك تێ پەڕی بەلامدا دوو جلی سەوزی لەبەردا بوو زەنگێکی بەدەستەوە بوو، وتم: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگە دەفرۆشی؟ وتی: چی کارێکت پێی هەیە؟ وتم: بانگی پێ دەکەم بۆ نوێژکردن، وتی: ئایا شتێکت پێ بڵێم لەوە چاکتر بێت؟ وتم: ئەوە چییە؟ وتی: دەڵێی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، پاشان کەمێك دوا کەوت، ئینجا بەهەمان شێوەی وت، بەڵام کردی بە تاك جگە لە (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) کاتێ هەواڵم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوە خەونێکی ڕاستە هەستە ئەوەی بینیوتە بۆ بیلالی

بخوێنه، با بانگی پێ بدات، چونكه ئەو دەنگی له تۆ بڵندتره، كاتێ بیلال بانگی دا، عومەری كوڕی خەتاب ﷺ له ماڵەوه گوێی له دەنگی بیلال بوو، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەباكەی ڕادەكێشا و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بەو خوایەی تۆی بەحەق ناردووه بەڕاستی منیش هەمان خەوم بینی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوپاس و ستاییش بۆ خوا، ئەوەیان جێگیر دەكەم.

**٣٧١-** عن مُحَمدِ بن عبدِ اللهِ بنِ زيدٍ بنِ عبدِ ربِّهِ حدثني أبي عبد الله بن زيد ﷺ قَالَ: لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاقُوسِ، فَعُمِلَ لَيُضْرَبَ بِهِ لِلنَّاسِ فِي الْجَمْعِ لِلصَّلَاةِ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ(١).

واته: موحەممەدی كوڕی عەبدوڵای كوڕی زەیدی كوڕی (عَبْدِ رَبِّهِ) دەگێڕێتەوه، باوكم عەبدوڵای كوڕی زەید ﷺ بۆی باس كردم وتی: كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە زەنگلێدان، كار كرا بۆ ئەوەی لێ بدرێ بۆ كۆكردنەوەی نوێژ. دواتر فەرموودەكەی بەدرێژی باس كرد.

**٣٧٢-** عَن مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى يَقُولُ: لَيْسَ فِي أَخْبَارِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ فِي قِصَّةِ الْأَذَانِ خَبَرٌ أَصَحُّ مِنْ هَذَا؛ لِأَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ سَمِعَهُ مِنْ أَبِيهِ ﷺ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى لَمْ يَسْمَعْهُ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ(٢).

واته: موحەممەدی كوڕی یەحیا دەڵێ: له فەرموودەكانی عەبدوڵای كوڕی زەید ﷺ له باسی بانگدان فەرموودەیەك نییه لەم فەرموودەیه ڕاستتر بێت، چونكه موحەممەدی كوڕی عەبدوڵا له باوكیەوه ﷺ بیستوویەتی، بەڵام عەبدولڕەحمانی كوڕی لەیلا له عەبدوڵای كوڕی زەیدەوه نەیبیستووه.

**٣٧٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ ﷺ بِهَذَا الْخَبَرِ قَالَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذِهِ لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أَمَرَ بِالتَّأْذِينِ فَكَانَ بِلَالٌ مَوْلَى أَبِي بَكْرٍ يُؤَذِّنُ بِذَلِكَ»(٣).

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) هذا قول ابن خزيمة، وقد أخرجه البيهقي ٤١٥/١ انظر حديث (٣٦٣) و (٣٧١).

(٣) إسناده حسن.

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە، لە عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی (عَبْدِ رَبِّهِ) ﷺ بەم فەرموودەیە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بەڕاستی ئەم خەوبینینە حەقە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت، پاشان فەرمانی کرد بە بانگدان، جا ئیدی بیلال مەولای ئەبو بەکر بەو شێوەیە بانگی دەدا.

٣٧٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا كَانَ الْأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّتَيْنِ وَالْإِقَامَةُ مَرَّةً، غَيْرُ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، فَإِذَا سَمِعْنَا ذَلِكَ تَوَضَّأْنَا ثُمَّ خَرَجْنَا[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: بێگومان بانگ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دوو جار دوو جار بوو، قامەتیش یەك جار، ئەوە نەبێت دەیوت: (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)، جا کاتێ گوێمان لەوە بووایە دەستنوێژمان دەگرت و پاشان دەردەچووین (بۆ نوێژ).

## بَابُ تَثْنِيَةِ قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ فِي الْإِقَامَةِ، ضِدَّ قَوْلِ بَعْضِ مَنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ وَلَا يُمَيِّزُ بَيْنَ مَا يَكُونُ لَفْظُهُ عَامًّا مُرَادُهُ خَاصٌّ، وَبَيْنَ مَا لَفْظُهُ عَامٌّ مُرَادُهُ عَامٌّ، فَتَوَهَّمَ بِجَهْلِهِ أَنَّ قَوْلَهُ: وَيُوتِرُ الْإِقَامَةَ كُلَّ الْإِقَامَةِ لَا بَعْضَهَا مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا.

٣٧٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بِلَالٌ ﷺ يُثَنِّي الْأَذَانَ وَيُوتِرُ الْإِقَامَةَ، إِلَّا قَوْلَهُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ[٢].

## باسی دوو جار وتنی (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ) لە قامەتدا، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی لە زانست تێ ناگات، جیای ناکاتەوە لە نێوان ئەوەی کام دەستەواژە (عَام) گشتییە و مەبەست پێی (خَاص) تایبەتە، هەروەها جیای ناکاتەوە لە نێوان کام دەستەواژە (عَام) گشتییە و مەبەستی پێی (عَام) گشتییە، بەهۆی نەفامی خۆیەوە لێی تێك چووە وا دەزانێ فەرموودەی: (وَيُوتِرُ الْإِقَامَةَ) هەموو ڕستەکانی نێو قامەتە لە یەکەمەوە تا کۆتاییە نەك هەندێکیان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: بیلال ﷺ دوو جار دوو جار بانگی دەدا و یەك جار قامەتی دەکرد، جگە لە وتەی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ).

**٣٧٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أُمِرَ بِلَالٌ ﷺ أَنْ يَشْفَعَ، الْأَذَانَ وَأَنْ يُوتِرَ الْإِقَامَةَ، إِلَّا الْإِقَامَةَ يَعْنِي قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: فەرمان کرا بە بیلال ﷺ بانگ بە جووت بدات، قامەتیش بە تاك، جگە لە (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ).

## بَابُ التَّرْجِيعِ فِي الْأَذَانِ مَعَ تَثْنِيَةِ الْإِقَامَةِ، وَهَذَا مِنْ جِنْسِ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، فَمُبَاحٌ أَنْ يُؤَذِّنَ الْمُؤَذِّنُ فَيُرَجِّعَ فِي الْأَذَانِ وَيُثَنِّيَ الْإِقَامَةَ، وَمُبَاحٌ أَنْ يُثَنِّيَ الْأَذَانَ وَيُفْرِدَ الْإِقَامَةَ، إِذْ قَدْ صَحَّ كِلَا الْأَمْرَيْنِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَّا تَثْنِيَةُ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ فَلَمْ يَثْبُتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الْأَمْرُ بِهِمَا

**٣٧٧-** عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ نَحْوًا مِنْ عِشْرِينَ رَجُلًا فَأَذَّنُوا فَأَعْجَبَهُ صَوْتُ أَبِي مَحْذُورَةَ، فَعَلَّمَهُ الْأَذَانَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَعَلَّمَهُ الْإِقَامَةَ مَثْنَى»[2].

**باسی تەرجیع لە بانگدان لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ڕستەکانی قامەت، ئەمەش لە جۆری ئەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەیان پێ دراوە، جا ڕێگە دراوە بانگدەر بانگ بدات، وە بانگەکەی خۆی دووبارە بکاتەوە بە دەنگی نزم، دوو جاریش قامەت بڵێتەوە، وە ڕێگە دراوە دوو جار ڕستەی بانگ دووبارە بکاتەوە و بە تاکیش قامەت بکات، چونکە هەردوو کارەکە بە فەرموودەی ڕاست و دروستەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵام دووبارەکردنەوەی ڕستەکانی نێو بانگ و قامەت، لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەچەسپاوە فەرمان بە هەردووکیان بکات**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

تێبینی: (التَّرْجِيعِ): بریتییە لەوەی چوار جار بەدەنگی بەرز دەڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان بە دەنگی نزم بۆ خۆی دووجار دووبارەی دەکاتەوە.

واتە: ئەبو مەحزورە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە ژمارەیەك نزیك بیست کەس دەبوون هەموویان بانگیان دا، دەنگی ئەبو مەحزورەی پێ خۆش بوو، بۆیە فێری بانگدانی کرد: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وە فێری قامەتی کرد دوو دوو.

٣٧٨- عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْعَدَهُ فَأَلْقَى عَلَيْهِ الْأَذَانَ حَرْفًا حَرْفًا، قَالَ بِشْرٌ: قَالَ لِي إِبْرَاهِيمُ: هُوَ مِثْلُ أَذَانِنَا هَذَا، فَقُلْتُ لَهُ أَعِدْ عَلَيَّ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مَرَّتَيْنِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَّتَيْنِ قَالَ بِصَوْتٍ دُونَ ذَلِكَ الصَّوْتِ يُسْمِعُ مَنْ حَوْلَهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مَرَّتَيْنِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ رَفَعَ صَوْتَهُ فَقَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ مَرَّتَيْنِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ مَرَّتَيْنِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ(1).

واتە: ئەبو مەحزورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ داینیشاند بانگی بۆی خوێندەوە پیت بە پیت، -بیشر وتی: ئیبراهیم پێمی وت-: هەر وەکوو ئەم بانگەی ئێمەیە، دواتر پێم وت: بۆم دووبارە بکەوە، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) دوو جار، (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ) دوو جار، ئینجا بە دەنگێکی نزمتر لەو دەنگە دوو جار وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ) دەوروبەری گوێیان لێ بوو، پاشان دەنگی بەرز کردەوە دوو جار وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ)، دوو جار وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، (ئینجا وتی): (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).

٣٧٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَيْرِيزٍ أَخْبَرَ، وَكَانَ يَتِيمًا فِي حِجْرِ أَبِي مَحْذُورَةَ بْنِ مِعْيَرٍ ﷺ حِينَ جَهَّزَهُ إِلَى الشَّامِ، فَقُلْتُ لِأَبِي مَحْذُورَةَ: إِنِّي خَارِجٌ إِلَى الشَّامِ، وَإِنِّي أُسْأَلُ عَنْ تَأْذِينِكَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ إِلَّا أَنَّ بُنْدَارًا قَالَ فِي الْخَبَرِ: مِنْ أَوَّلِ الْأَذَانِ وَأَلْقَى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ التَّأْذِينَ هُوَ نَفْسِهِ،

---

(١) صحيح من غير هذا الوجه.

فَقَالَ: قُلْ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ ذَكَرَ بَقِيَّةَ الْأَذَانِ مِثْلَ خَبَرِ مَكْحُولٍ، عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ، وَلَمْ يَذْكُرِ الْإِقَامَةَ[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی موحەیریز هەواڵی داوە، ئەو هەتیو بوو لە ماڵی ئەبو مەحزورەی کوڕی میعیەر ﷺ کاتێك ئامادەی کرد بۆ شام (دەڵێ): بە ئەبو مەحزورەم وت: من دەچم بۆ شام و لەوێ پرسیارم لێ دەکرێ دەربارەی شێوازی بانگدانی تۆ؟ دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، ئەوە نەبێ بوندار (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) لە فەرموودەکەدا وتی: لە یەکەم بانگدان بانگی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندەوە، فەرمووی: بڵێ: ( اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان ئەوەی مابوو لە بانگەکە باسی کرد، وەك فەرموودەکەی مەکحول لە ئیبنو موحەریز، باسی قامەتی نەکرد.

**٣٨٠**- وَحَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ قَزَعَةَ، حَدَّثَنَا حُصَيْنُ بْنُ نُمَيْرٍ، نا ابْنُ أَبِي لَيْلَى[٢].

واتە: حەسەنی کوڕی قەزعە بۆی باس کردین، حوصەینی کوڕی نەمیر بۆی باس کردین، ئیبنو ئەبو لەیلا بۆی باس کردین. (زانای پایە بەرز ئەبو بەکری کوڕی خوزەیمە بۆ چەسپاندنی فەرموودە چەند زنجیرەیەکی هێناوە بە پێویستمان نەزانی باسی بکەین).

**٣٨١**- عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى، عَنْ مُعَاذٍ ﷺ[٣].

واتە: عەمری کوڕی مورە دەگێڕێتەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا لە موعازەوە ﷺ بەهەمان شێوە.

---

(١) صحيح.

(٢) رواية وكيع عن الأعمش صحيحة، ورواية ابن أبي ليلى -وهو محمد- ضعيفة لضعفه.

(٣) أخرجه: الطيالسي (٥٦٦)، وأحمد ٢٤٦/٥، وأبو داود (٥٠٧)، الطبري في **تفسيره** ٤/٢ و ١٣١ و ١٣٢ - ١٣٣، والطحاوي في **شرح المشكل** (٤٧٨)، والشاشي (١٣٦٢) و (١٣٦٣)، والطبراني في **الكبير** ٢٧٠/٢٠، والحاكم ٢٧٤/٢، والبيهقي ٣٩١/١ و ٤٢٠ - ٤٢١ و ٢٩٦/٢ و ٢٠٠/٤ من طرق عن المسعودي، عن عمرو بن مرة، بهذا الإسناد.

وأخرجه: أحمد ٢٣٣/٥ و ٢٤٦، والشاشي (١٣٥٩) و (١٣٦٠) و (١٣٦١)، والطبراني في **الكبير** ٢٦٧/٢٠ و ٢٦٨، والبغوي (٨٢٥) من طرق، عن عبد الرحمن بن أبي ليلى، به.

الروايات مطولة ومختصرة. انظر: **إتحاف المهرة** ٢٦٧/١٣ (١٦٦٩٨).

**٣٨٢-** وَرَوَاهُ حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى مُرْسَلًا، فَلَمْ يَقُلْ: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ، وَلَا عَنْ مُعَاذٍ ﷺ، وَلَا ذَكَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، إِنَّمَا قَالَ: لَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ ﷺ مِنَ النِّدَاءِ مَا رَأَى قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

**واتە:** وە حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان گێڕاویەتەوە لە ئیبنو ئەبو لەیلا بە (مُرْسَل)ی، نە وتوویەتی: لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە، وە نە لە موعاز ﷺ، وە ناوی هیچ یەکێك لە هاوەڵانی نەهێناوە لە زنجیرەی فەرموودەکە، بەڵکوو وتوویەتی: کاتێ عەبدوڵای کوڕی زەید ﷺ لە خەویدا شێوەی بانگدانی بینی لەوەی کە بینی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو.

**٣٨٣-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ قَالَ: أُحِيلَتِ الصَّلَاةُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ، وَالصِّيَامُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ، فَحَدَّثَنَا أَصْحَابُنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَقَدْ أَعْجَبَنِي أَنْ تَكُونَ صَلَاةُ الْمُؤْمِنِينَ أَوِ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةً حَتَّى لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَبُثَّ رِجَالًا فِي الدُّورِ فَيُؤْذِنُونَ النَّاسَ بِحِينِ الصَّلَاةِ» فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[٢].

**واتە:** عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: (لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ) نوێژ سێ جار گۆڕانکاری بەسەردا هات، ڕۆژووش سێ جار گۆڕانکاری بەسەردا هات، (عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ:) هاوەڵانمان بۆیان باس کردین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی پێم خۆش بوو نوێژی باوەڕداران یان موسوڵمانان یەك بووایە (واتە: بە یەك ئیمام و بەکۆمەڵ) هەتا هات بە خەیاڵمدا پیاوانێك بڵاو بکەمەوە بە نێو ماڵەکاندا خەڵکی ئاگادار بکەنەوە لە کاتی نوێژ.

**٣٨٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ، عَنْ رَجُلٍ، بَعْضُ هَذَا الْخَبَرِ - أَعْنِي قَوْلَهُ: «أُحِيلَتِ الصَّلَاةُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ» وَلَمْ يَذْكُرْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ، وَلَا مُعَاذًا ﷺ. وعَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: أُحِيلَتِ الصَّلَاةُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ، وَأُحِيلَ الصَّوْمُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَلَمْ يَذْكُرْ

---

(١) أخرجه: عبد الرزاق (١٧٨٨) من طريق عمرو بن مرة وحصين بن عبد الرحمن عن ابن أبي ليلى، به مرسلا. انظر: **إتحاف المهرة** ٦٥٦/٦ (٧١٧٥) و ٢٦٧/١٣ - ٢٦٨ (١٦٦٩٨).

(٢) صحيح.

عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ، وَلَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، وَلَا أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَا قَالَ: حَدَّثَنَا أَصْحَابُنَا، وَلَمْ يَقُلْ أَيْضًا: عَنْ رَجُلٍ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا خَبَرُ الْعِرَاقِيِّينَ الَّذِينَ احْتَجُّوا بِهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ فِي تَثْنِيَةِ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ، وَفِي أَسَانِيدِهِمْ مِنَ التَّخْلِيطِ مَا بَيَّنْتُهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي لَيْلَى لَمْ يَسْمَعْ مِنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَلَا مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ صَاحِبِ الْأَذَانِ، فَغَيْرُ جَايِزٍ أَنْ يُحْتَجَّ بِخَبَرٍ غَيْرِ ثَابِتٍ عَلَى أَخْبَارٍ ثَابِتَةٍ، وَسَأُبَيِّنُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ بِتَمَامِهَا فِي كِتَابِ الصَّلَاةِ «الْمُسْنَدُ الْكَبِيرُ» لَا «الْمُخْتَصَرُ».

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﵁ لە پیاوێکەوە بەشێك لەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، مەبەستم فەرموودەی: (أُحِيلَتِ الصَّلَاةُ ثَلَاثَةَ أَحْوَال) وە باسی نەکرد نە لە عەبدوڵای کوڕی زەیدەوە و نە لە موعازی کوڕی جەبەلیشەوە ﵄. هەروەها بە زنجیرە و سەنەدێك لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا گێڕدراوەتەوە دەڵێ: (أُحِيلَتِ الصَّلَاةُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ، وَأُحِيلَ الصَّوْمُ ثَلَاثَةَ أَحْوَالٍ)، فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، نە باسی عەبدوڵای کوڕی زەیدی کرد، نە باسی موعازی کوڕی جەبەلی کرد، نە هیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەمە فەرموودەی خەڵکی عێراقە کە دەیکەن بە بەڵگە لە عەبدوڵای کوڕی زەید سەبارەت بە بانگدان و قامەت بە دوو دوو، لە زەنجیرە و سەنەدەکانیان تێکەڵاوییەك هەیە وەك ڕوونم کردەوە، جا عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا نە لە موعازی کوڕی جەبەلەوە بیستوویەتی، نە لە عەبدوڵای کوڕی زەیدی کوڕی (عَبْدِ رَبِّهِ) بیستوویەتی خاوەنی فەرموودەی بانگدان، جا دروست نییە فەرموودەیەك بە بەڵگە وەربگیرێ کە جێگیر نییە لەسەر کۆمەڵە فەرموودەیەکی جێگیر، لەمەودوا ئەم بابەتە ڕوون دەکەومەوە بەتەواوەتی لە کتێبی نوێژدا (الْمُسْنَدُ الْكَبِيرُ) نەك (الْمُخْتَصَرُ).

---

(١) إسناده ضعيف.

## بَابُ التَّثْوِيبِ فِي أَذَانِ الصُّبْحِ

٣٨٥- عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا رَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ حُنَيْنٍ خَرَجْتُ عَاشِرَ عَشَرَةٍ مِنْ مَكَّةَ نَطْلُبُهُمْ، فَسَمِعْتَهُمْ يُؤَذِّنُونَ بِالصَّلَاةِ، فَقُمْنَا نُؤَذِّنُ نَسْتَهْزِئُ بِهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « لَقَدْ سَمِعْتُ فِي هَؤُلَاءِ تَأْذِينَ إِنْسَانٍ حَسَنِ الصَّوْتِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْنَا، فَأَذَّنَّا رَجُلًا رَجُلًا، فَكُنْتُ آخِرَهُمْ، فَقَالَ حِينَ أَذَّنْتُ: «تَعَالَ»، فَأَجْلَسَنِي بَيْنَ يَدَيْهِ فَمَسَحَ عَلَى نَاصِيَتِي وَبَارَكَ عَلَيَّ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: «اذْهَبْ فَأَذِّنْ عِنْدَ الْبَيْتِ الْحَرَامِ»، قُلْتُ: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَعَلَّمَنِي الْأَذَانَ كَمَا يُؤَذِّنُونَ الْآنَ بِهَا: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، فِي الْأَوَّلِ مِنَ الصُّبْحِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ: وَعَلَّمَنِي الْإِقَامَةَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ[1].

### باسی (التَّثْوِيب) کردن لە نوێژی بەیانی (التَّثْوِيب: واتە: کاتێ بانگدەر دەڵێ: الصلاة خير من النوم، الصلاة خير من النوم)

واتە: ئەبو مەحزورە ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە حونەین گەڕایەوە دەیەم کەس بووم لە خەڵکی مەککە دەمانویست بگەین پێیان، بیستمان بانگیان دەدا بۆ نوێژ، ئێمەش هەستاین بەگاڵتەپێکردنەوە بانگمان دەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گوێم لێ بوو لەنێو ئەوانەدا کەسێکی دەنگخۆش بانگی دەدا، ناردی بە شوێنماندا، یەك یەك بانگمان بۆی دا، من کۆتا کەسیان بووم، کاتێ بانگم دا فەرمووی: (بێ) لەپێش خۆی دایبنیشاندم سێ جار دەستی هێنا بە نێوچاوانمدا دووعای بەرەکەتی بۆ کردم، پاشان فەرمووی: (برۆ بۆ لای کەعبە لەوێ بانگ بدە) وتم: چۆن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فێری بانگدانی کردم وەکوو چۆن ئێستا بانگ دەدەن: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا

---

(١) صحيح بطرقه.

إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) لە بانگی یەکەمدا، (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) وتی: وە فێری قامەتیشی کردم دوو جار دوو جار: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ.).

٣٨٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ فِي أَذَانِ الْفَجْرِ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ قَالَ: الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ[1] .

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: سوننەت وایە ئەگەر بانگدەر لە بانگی بەیانی وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، دواتر بڵێ: (الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ).

## بَابُ الِانْحِرَافِ فِي الْأَذَانِ عِنْدَ قَوْلِ الْمُؤَذِّنِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّهُ إِنَّمَا يَنْحَرِفُ بِفِيهِ لَا بِبَدَنِهِ كُلِّهِ وَإِنَّمَا يُمْكِنُ الِانْحِرَافُ بِالْفَمِ بِانْحِرَافِ الْوَجْهِ

٣٨٧- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِالْبَطْحَاءِ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ، وَعِنْدَهُ نَاسٌ يَسِيرٌ، فَجَاءَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ، ثُمَّ حَوَّلَ يَتْبَعُ فَاهُ هَهُنَا - يَعْنِي بِقَوْلِهِ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ[2].

## باسی ڕوو وەرچەرخان بەولا و بەولادا لە بانگدا، کاتێ بانگدەر دەڵێ: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بانگدەر دەمی وەردەچەرخێنێ نەك هەموو جەستەی، وەرچەرخانی دەمیش وەرچەرخانی ڕوخساری لەگەڵدایە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە (الْبَطْحَاء) (کە جێگایەکی نەرمی فراوانە لم و زیخی تێدایە بۆ پشوودان گونجاوە لە نێوان مەککە و مینا) لەنێو خێمەیەکی سووردا بوو لە شێوەی گومەز، خەڵکانێکی کەمیش لە لای بوون، بیلال هات بانگی دا، پاشان دەمی بەملا و بەولادا دەهێنا و دەبرد، کاتێ کە دەیوت: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ).

**بَابُ إِدْخَالِ الْإِصْبَعَيْنِ فِي الْأُذُنَيْنِ عِنْدَ الْأَذَانِ، إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ لَسْتُ أَحْفَظُهَا إِلَّا عَنْ حَجَّاجِ بْنِ أَرْطَاةَ، وَلَسْتُ أَفْهَمُ أَسَمِعَ الْحَجَّاجُ هَذَا الْخَبَرَ مِنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ أَمْ لَا، فَأَشُكُّ فِي صِحَّةِ هَذَا الْخَبَرِ لِهَذِهِ الْعِلَّةِ**

٣٨٨- عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ بِلَالًا ﷺ يُؤَذِّنُ، وَقَدْ جَعَلَ أُصْبُعَيهُ فِي أُذُنَيْهِ وَهُوَ يَلْتَوِي فِي أَذَانِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا»[1].

**باسی خستنە نێوەوەی هەردوو پەنجە بۆ نێو هەردوو گوێ لە کاتی بانگدان، ئەگەر دەستەواژەی فەرموودەکە ڕاست بێت، چونکە من ئەم فەرموودەیەم لەبەر نەکردووە تەنها لە ڕێگای حەجاجی کوڕی ئەرتاتەوە نەبێت، نازانم حەجاج ئەم فەرموودەیەی بیستووە لە کوڕەکەی ئەبو جوحەیفە یان نا، لەبەر ئەم هۆکارە گومانم هەیە لە ڕاستی ئەم فەرموودەیە**

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: بیلالم ﷺ بینی بانگی دەدا، پەنجەکانی خستبووە نێو گوێیەکانی، لە کاتی بانگدانەکەیدا بە لای ڕاست و چەپ ڕووی وەردەچەرخاند.

---

(١) صحيح من غير هذا الطريق.

## بَابُ فَضْلِ الْأَذَانِ وَرَفْعِ الصَّوْتِ بِهِ وَشَهَادَةِ مَنْ يَسْمَعُهُ مِنْ حَجَرٍ وَمَدَرٍ وَشَجَرٍ وَجِنٍّ وَإِنْسٍ لِلْمُؤَذِّنِ

**٣٨٩-** عن عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: إِذَا كُنْتَ فِي الْبَوَادِي فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَسْمَعُ صَوْتَهُ شَجَرٌ، وَلَا مَدَرٌ، وَلَا حَجَرٌ، وَلَا جِنٌّ، وَلَا إِنْسٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ»[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی بانگدان و دەنگ بەرزکردنەوە پێی، وە شایەتیدانی ئەوەی دەیبیستێ لە بەرد و خشت و دار و جنۆکە و مرۆڤ بۆ بانگدەر

**واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، دەڵێ: ئەبو سەعید ﷺ وتی: ئەگەر تۆ لە دەشت بووی بانگت دا لە کاتی بانگداندا دەنگت بەرز بکەرەوە، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دار و درەخت و خشت و بەرد و جنۆکە و مرۆڤ گوێیان لە دەنگی بانگدانی بێت شایەتی بۆ دەدەن.**

**٣٩٠-** عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ مَدَى صَوْتِهِ، وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ، وَشَاهِدُ الصَّلَاةِ يُكْتَبُ لَهُ خَمْسٌ وَعِشْرُونَ حَسَنَةً، وَيُكَفَّرُ عَنْهُ مَا بَيْنَهُمَا»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يُرِيدُ مَا بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ.

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لە بانگدەر خۆش دەبێت بەئەندازەی ڕۆیشتنی دەنگی، وە هەموو شوێنێکی تەڕایی و وشکاییەك شایەتی بۆ دەدەن، وە ئامادەبووی نوێژیش بیست و پێنج چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە دەیکاتە کەفارەت بۆی لە نێوانی ئەو دوو نوێژەدا.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: مەبەستی نێوان دوو نوێژە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح بطرق وشواهده.

## بَابُ الِاسْتِهَامِ عَلَى الْأَذَانِ إِذَا تَشَاجَرَ النَّاسُ عَلَيْهِ

**٣٩١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي الْأَذَانِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا عَلَيْهِ»[١] .

## باسی تیروپشککردن لەسەر بانگدان، کاتێ خەڵکی مشتومڕیان لەسەری کرد

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی بیانزانیبایە چی خێر و پاداشت لە بانگ و ڕیزی یەکەمی (نوێژدا) هەیە، ئینجا دەستیان نەکەوتایە جگە لەوەی تیروپشکی بۆ بکەن، تیروپشکیان بۆ دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ تَبَاعُدِ الشَّيْطَانِ عَنِ الْمُؤَذِّنِ عِنْدَ أَذَانِهِ وَهَرَبِهِ كَيْ لَا يَسْمَعَ الْأَذَانَ

**٣٩٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعَ الشَّيْطَانُ الْأَذَانَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ وَلَهُ ضِرَاطٌ حَتَّى لَا يَسْمَعَهُ»[٢].

## باسی دوورکەوتنەوەی شەیتان لە بانگدەر لە کاتی بانگدانیدا، وە هەڵهاتنی بۆ ئەوەی گوێی لە بانگەکە نەبێت

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شەیتان گوێی لە بانگدان بوو بۆ نوێژ پشت هەڵدەکات و دەڕوات با بەردەداتەوە بۆ ئەوەی گوێی لە بانگ نەبێت.

**٣٩٣-** عَن سُلَيْمَانَ الْأَعْمَشِ عَنْ أَبِي سُفِيانَ عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ ذَهَبَ حَتَّى يَكُونَ مَكَانَ الرَّوْحَاءِ» قَالَ سُلَيْمَانُ فَسَأَلْتُهُ عَنِ الرَّوْحَاءِ، فَقَالَ: هِيَ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى سِتَّةٍ وَثَلَاثِينَ مِيلًا[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: سولەیمانی ئەعمەش دەگێڕێتەوە لە ئەبو سوفیان، لە جابرەوە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بەڕاستی شەیتان کاتێ گوێی لە بانگدانی نوێژ دەبێت، دەڕوات هەتا دەگاتە ڕەوحاء، سولەیمان وتی: پرسیارم لێی کرد لەبارەی ڕەوحاء، وتی: شوێنێکە سی و شەش میل لە مەدینەوە دوورە.

**بَابُ الْأَمْرِ بِالْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ فِي السَّفَرِ لِلصَّلَاةِ كُلِّهَا ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ لَا يُؤَذِّنُ فِي السَّفَرِ لِلصَّلَاةِ إِلَّا لِلْفَجْرِ خَاصَّةً قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ أَبِي ذَرٍّ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُؤَذِّنَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَبْرِدْ»**

**٣٩٤-** عن زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَأَرَادَ الْمُؤَذِّنُ أَنْ يُؤَذِّنَ، فَقَالَ: «أَبْرِدْ»، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُؤَذِّنَ، فَقَالَ: «أَبْرِدْ» قَالَ شُعْبَةُ: حَتَّى سَاوَى الظِّلُّ التُّلُولَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ»[1].

**باسی فەرمانکردن بە بانگ و قامەت بۆ هەموو نوێژێك لە کاتی گەشت، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە لە گەشت بانگ نادرێ بۆ نوێژ مەگەر نوێژی بەیانی بەتایبەت، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی ئەبو زەڕ: ئێمە لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین بانگدەر ویستی بانگ بدات، فەرمووی: (أَبْرِدْ) واتە: با فێنك بکات**

واتە: زەیدی کوڕی وەهب دەڵێ: گوێم لە ئەبو زەڕ ﷺ بوو وتی: ئێمە لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین بانگدەر ویستی بانگ بدات، فەرمووی: با فێنك بکات، پاشان ویستی بانگ بدات، فەرمووی: با فێنك بکات، شوعبە وتی: تا سێبەری تەپۆڵکەکان یەکسان بوونەوە، پاشان فەرمووی: بەڕاستی سەختی گەرما لە هەناسەی دۆزەخەوەیە نوێژ بەفێنکی بکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ فِي السَّفَرِ، وَإِنْ كَانَا اثْنَيْنِ لَا أَكْثَرَ بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظُهُ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٣٩٥-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَنَا وَرَجُلٌ فَوَدَّعَنَا، ثُمَّ قَالَ: «إِذَا سَافَرْتُمَا وَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا، وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا» قَالَ الْحَذَّاءُ: وَكَانَا مُتَقَارِبَيْنِ فِي الْقِرَاءَةِ[1].

### باسی فەرمانکردن بە بانگدان و قامەتکردن لە گەشت، ئەگەرچی دوو کەس زیاتر نەبوون، بە باسکردنی فەرموودەیەك دەستەواژەکەی (عَام) گشتییە و مەبەست پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: من و پیاوێك هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، دواتر خواحافیزیمان لێ کرد، پاشان فەرمووی: ئەگەر گەشتتان کرد و کاتی نوێژ هات بانگ بدەن و قامەت بکەن، وە با کامەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات. حەزاء (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە) وتی: ئەو دووانە لە یەك ئاستدا بوون لە خوێندنی قورئان.

**٣٩٦-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَابْنُ عَمٍّ لِي، فَقَالَ: «إِذَا سَافَرْتُمَا فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا»[2].

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: من و ئامۆزایەکم هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەگەر گەشتتان کرد (کاتی نوێژ هات) بانگ بدەن و قامەت بکەن، وە با کامەتان گەورەترە پێشنوێژیتان بۆ بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُ أَنَّهَا لَفْظَةُ عَامٍّ مُرَادُهَا خَاصٌّ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ أَنْ يُؤَذِّنَ أَحَدُهُمَا لَا كِلَيْهِمَا

**٣٩٧-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ شَبِيبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَحِيمًا رَفِيقًا، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلِينَا، أَوِ اشْتَقْنَا سَأَلَنَا عَمَّا تَرَكْنَا بَعْدَنَا، فَأَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ، فَأَقِيمُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ»، وَذَكَرَ أَشْيَاءَ أَحْفَظُهَا وَأَشْيَاءَ لَا أَحْفَظُهَا وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ[١].

**باسی فەرموودەیەکی (مُفَسَّر) شیکەرەوە و ڕوونکەرەوەی دەستەواژەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوونە کە باسم کرد، ئەوە دەستەواژەیەکی (عَام) گشتییە مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تەنها فەرمانی کردووە یەکێکیان بانگ بدەن نەك هەردووکیان**

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە گەنجێکی هاوتەمەنی یەك بووین، بیست شەو لە لای ماینەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی زۆر بەبەزەیی و نەرمونیان بوو، کاتێ هەستی کرد ئێمە حەز دەکەین بگەڕێینەوە بۆ لای خێزانەکانمان، پرسیاری لێ کردین دەربارەی ئەوانەی بەجێمان هێشتوون لە کەسوکارمان، ئێمەش هەواڵمان پێ دا، فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ نێو کەسوکارتان، لەلایان بمێننەوە و فێریان بکەن، وە فەرمانیان پێ بکەن، باسی کۆمەڵە شتێکی کرد لەبەرم کردووە و پاراستوومە، وە کۆمەڵە شتێکی دیکەش لەبەرم نەکردووە: وە نوێژ بکەن وەکوو چۆن منتان بینیوە نوێژ دەکەم، ئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و گەورەترینیشتان پیشنوێژیتان بۆ بکات.

**٣٩٨-** عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِتَمَامِهِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموودەکەی بەتەواوی باس کرد.

بَابُ الْأَذَانِ فِي السَّفَرِ وَإِنْ كَانَ الْمَرْءُ وَحْدَهُ لَيْسَ مَعَهُ جَمَاعَةٌ وَلَا وَاحِدٌ طَلَبًا لِفَضِيلَةِ الْأَذَانِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ سُئِلَ عَنِ الْأَذَانِ فِي السَّفَرِ فَقَالَ: لِمَنْ يُؤَذِّنُ؟ فَتَوَهَّمَ أَنَّ الْأَذَانَ لَا يُؤَذَّنُ إِلَّا لِاجْتِمَاعِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ جَمَاعَةً، وَالْأَذَانُ وَإِنْ كَانَ الْأَعَمُّ أَنَّهُ يُؤَذَّنُ لِاجْتِمَاعِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ جَمَاعَةً فَقَدْ يُؤَذَّنُ أَيْضًا طَلَبًا لِفَضِيلَةِ الْأَذَانِ، أَلَا تَرَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَمَرَ مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ ﷺ وَابْنَ عَمِّهِ إِذَا كَانَا فِي السَّفَرِ بِالْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ، وَإِمَامَةِ أَكْبَرِهِمَا أَصْغَرَهُمَا، وَلَا جَمَاعَةَ مَعَهُمْ تَجْتَمِعُ لِأَذَانِهِمَا وَإِقَامَتِهِمَا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ: إِذَا كُنْتَ فِي الْبَوَادِي فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَسْمَعُ صَوْتَهُ شَجَرٌ وَلَا مَدَرٌ وَلَا حَجَرٌ وَلَا جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ» فَالْمُؤَذِّنُ فِي الْبَوَادِي وَإِنْ كَانَ وَحْدَهُ إِذَا أَذَّنَ طَلَبًا لِهَذِهِ الْفَضِيلَةِ كَانَ خَيْرًا وَأَحْسَنَ وَأَفْضَلَ مِنْ أَنْ يُصَلِّيَ بِلَا أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ. وَكَذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ الْمُؤَذِّنَ يُغْفَرُ لَهُ مَدَى صَوْتِهِ وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ. وَالْمُؤَذِّنُ فِي الْبَوَادِي وَالْأَسْفَارِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ مَنْ يُصَلِّي مَعَهُ صَلَاةَ جَمَاعَةٍ، كَانَتْ لَهُ هَذِهِ الْفَضِيلَةُ لِأَذَانِهِ بِالصَّلَاةِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يَخُصَّ مُؤَذِّنًا فِي مَدِينَةٍ وَلَا فِي قَرْيَةٍ دُونَ مُؤَذِّنٍ فِي سَفَرٍ وَبَادِيَةٍ، وَلَا مُؤَذِّنًا يُؤَذِّنُ لِاجْتِمَاعِ النَّاسِ إِلَيْهِ لِلصَّلَاةِ جَمَاعَةً دُونَ مُؤَذِّنٍ لِصَلَاةٍ يُصَلِّي مُنْفَرِدًا

باسی بانگدان لە گەشت ئەگەرچی بەندە تەنها خۆی بێت و خەڵکی دیکەی لەگەڵ نەبێت بۆ ئەوەی فەزڵ و پاداشتی بانگدان بۆ خۆی مسۆگەر بکات، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پرسیاری لێ کرا دەربارەی بانگدان لە گەشت، لە وەڵامدا وتی: بۆ کێ بانگ دەدات؟ بەهەڵەداچوو وایزانیوە بانگ بۆ ئەوە ئەدرێ خەڵك کۆ بێتەوە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، بانگدان ئەگەرچی بەشێوەیەکی گشتی بۆ کۆبوونەوەی خەڵکە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، بەهەمان شێوە بانگ دەدرێ بۆ بەدەستهێنانی فەزڵ و پاداشتەکەی، ئایا نەتبینی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە مالیکی کوڕی حوەیریس و ئامۆزاکەی ئەگەر لە گەشتدا بوون بانگ بدەن و قامەت بکەن، وە کامەیان گەورەترە پێشنوێژی بچووکەکە بکات، خۆ ئەوان کۆمەڵێکیان لەگەڵ نەبوو بەهۆی بانگ و قامەتەکەیان کۆ ببنەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەی ئەبو سەعید

هاتووە: ئەگەر تۆ لە دەشت و چۆڵەوانی بووی دەنگت بەرز بکەرەوە بە بانگدان، چونکە من بیستوومە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دار و درەخت و خشت و بەرد و جنۆکە و مرۆڤ گوێیان لە دەنگی بانگدانی بێت شایەتی بۆ دەدەن. جا بانگدەر لە دەشت ئەگەرچی بەتەنهاش بێت بانگ دەدات بەهۆی بەدەستهێنانی ئەو فەزڵ و پاداشتە، چاکترە لەوەی نوێژ بکات بەبێ بانگدان و قامەتکردن، بەهەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە: خوا لە بانگدەر خۆش دەبێت بەئەندازەی ڕۆیشتنی دەنگی، وە هەموو تەڕایی و وشکاییەك شایەتی بۆ دەدەن. بانگدەر لە دەشت و چۆڵەوانی و گەشتەکاندا ئەگەر چی کەسێك نەبێت نوێژی بەکۆمەڵی لەگەڵ بکات ئەوە فەزڵ و پاداشتی بانگدانەکەی دەست دەکەوێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بانگدەری تایبەت نەکردووە بە شار یان بە گوند بەبێ ئەوەی بانگدەر تایبەت بکات بۆ گەشت و چۆڵەوانی، وە بانگدەری تایبەت نەکردووە بۆ کۆبوونەوەی خەڵك بۆ نوێژ و تایبەتی نەکردبێت بۆ نوێژکردن بەتەنها

٣٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا وَهُوَ فِي مَسِيرٍ لَهُ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «عَلَى الْفِطْرَةِ» قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ: «خَرَجَ مِنَ النَّارِ»، فَاسْتَبَقَ الْقَوْمَ إِلَى الرَّجُلِ، فَإِذَا رَاعِي غَنَمٍ حَضَرَتْهُ الصَّلَاةُ فَقَامَ يُؤَذِّنُ[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە یەکێك لە دەرچوونەکانیدا بۆ (غەزاکردن) گوێی لە پیاوێك بوو (بانگی دەدا) دەیوت: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەسەر سوننەت و پاکی و فیترەتە، پیاوەکە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) فەرمووی: لە ئاگر دەرچوو (واتە: ڕزگاری بوو)، خەڵکەکە بەهەڵەداوان چوون بۆ لای پیاوەکە بینییان شوانی مەڕ وماڵاتێکە، کاتی نوێژ هاتووە هەستاوە بانگی داوە.

٤٠٠ - عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُغِيرُ عِنْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ وَإِلَّا أَغَارَ، فَاسْتَمَعَ ذَاتَ يَوْمٍ فَسَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ: «عَلَى الْفِطْرَةِ»، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ: «خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَإِذَا كَانَ الْمَرْءُ يَطْمَعُ بِالشَّهَادَةِ بِالتَّوْحِيدِ لِلَّهِ فِي الْأَذَانِ وَهُوَ يَرْجُو أَنْ يُخَلِّصَهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ بِالشَّهَادَةِ بِاللَّهِ بِالتَّوْحِيدِ فِي أَذَانِهِ فَيَنْبَغِي لِكُلِّ مُؤْمِنٍ أَنْ يَتَسَارَعَ إِلَى هَذِهِ الْفَضِيلَةِ طَمَعًا فِي أَنْ يُخَلِّصَهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ، خَلَا فِي مَنْزِلِهِ أَوْ فِي بَادِيَةٍ أَوْ قَرْيَةٍ أَوْ مَدِينَةٍ طَلَبًا لِهَذِهِ الْفَضِيلَةِ، وَقَدْ خَرَّجْتُ أَبْوَابَ الْأَذَانِ فِي السَّفَرِ أَيْضًا فِي مَوَاضِعَ غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ فِي نَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَأَمْرُهُ ﷺ بِلَالًا بِالْأَذَانِ لِلصُّبْحِ بَعْدَ ذَهَابِ وَقْتِ تِلْكَ الصَّلَاةِ، وَتِلْكَ الْأَخْبَارُ أَيْضًا خِلَافُ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنْ لَا يُؤَذَّنَ لِلصَّلَاةِ بَعْدَ ذَهَابِ وَقْتِهَا، وَإِنَّمَا يُقَامُ لَهَا بِغَيْرِ أَذَانٍ.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نوێژی بەیانی هێرشی دەکردە سەر دوژمن، ئەگەر گوێی لە بانگ بووایە هێرشەکەی دەوەستاند ئەگەرنا هێرشی دەکرد، ڕۆژێك گوێی لە پیاوێك بوو (بانگی دەدا) دەیوت: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر سوننەت و پاکی و فیترەتە، دواتر پیاوەکە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) فەرمووی: لە ئاگر دەرچوو (واتە: ڕزگاری بوو).

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەگەر بەندە تەماح و ئومێدی ئەوەی هەبێت بەشایەتیدان بە یەکتاپەرستی خوا لە بانگدا خوا لە ئاگر ڕزگاری بکات بەوەی شایەتی یەکتاپەرستی داوە بۆ خوا لە بانگەکەیدا، ئەوە دەبێت هەموو بڕوادارێك پێشبڕکێ بکات بۆ بەدەستهێنانی ئەو شکۆ و ڕێزە بە تەماحی ئەوەی خوا ڕزگاری بکات لە ئاگر، جا بەتەنها لە ماڵەکەیدا بوو یان لە چۆڵەوانی یان لە گوند و لادێ یان لەشار بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕێز و شکۆیە، هەروەها بەشەکانی بانگدانم لە باسی گەشت باس کردووە لە چەند شوێنێك جگە لەم شوێنە لە خەوتنی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی هەتا خۆر هەڵهات، وە فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بە بیلال، بە بانگدان بۆ نوێژی بەیانی دوای ڕۆیشتنی کاتی نوێژەکە، هەروەها ئەو فەرموودانەش پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەیە کە پێی وایە بانگ نادرێ بۆ نوێژ لەدوای نەمانی کاتەکەی، بەڵکوو قامەتی بۆ دەکرێ بەبێ بانگدان.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْأَذَانِ لِلصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ إِذَا كَانَ لِلْمَسْجِدِ مُؤَذِّنَانِ لَا مُؤَذِّنٌ وَاحِدٌ، فَيُؤَذِّنُ أَحَدُهُمَا قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ، وَالْآخَرُ بَعْدَ طُلُوعِهِ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٤٠١-** عن سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ بِلَالًا ﷺ يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى تَسْمَعُوا أَذَانَ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ(١).

**باسی ڕێگە دراوە بانگی بەیانی بدرێت پێش دەرچوونی بەرەبەیان، ئەگەر مزگەوتەکە دوو بانگدەری هەبوو نەك یەك بانگدەر، یەکێکیان پێش دەرچوونی بەرەبەیان بانگ بدات، ئەوی دیکەیان دوای بەرەبەیان بانگ بدات، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکرا وە و ڕوونکراوە**

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بیلال ﷺ بە شەو بانگ دەدا، بۆیە بخۆن و بخۆنەوە هەتا گوێتان لە بانگدانی ئیبنو ئوم مەکتوم دەبێت.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي كَانَ لَهَا بِلَالٌ ﷺ يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ

**٤٠٢-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ ﷺ مِنْ سَحُورِهِ؛ فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ أَوْ يُنَادِي لِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ وَيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ، وَلَيْسَ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا وَهَكَذَا، حَتَّى يَقُولَ هَكَذَا وَهَكَذَا»(٢).

**باسی ئەو هۆکارەی کە بیلال ﷺ لە پێناویدا بە شەو بانگی دەدا**

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە بانگی بیلال ﷺ نەبێتە ڕێگر لەبەردەمی بۆ پارشێوکردن، بەڕاستی بیلال لە شەودا بانگ دەدا بۆ ئەوەی خەوتووەکانتان ئاگادار بکاتەوە و ئەوەیشتان کە شەونوێژ دەکات بگەڕێتەوە (بۆ ئەوەی ئەندازەیەك بخەوێت و بەچالاکییەوە هەستێت بۆ نوێژی بەیانی)، بەرەبەیان ئەوە نییە ئاوا و ئاوا بێت (ئاماژەی بە هەردوو پەنجەی شایەتمانی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کرد، بەرزی کردنەوە بۆ ئاسمان هێنایەوە بۆ خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێی کرد بە شەبەقی درۆینە کە بریتییە لە ڕووناکییەکی لاکێشەیی لە سەرەوە بۆ خوارەوە پێی ناچێتە نێو شەبەقەوە و دروستە پارشێوی تێدا بکات)، بەڵام بەرەبەیان بریتییە لەوەی ئاواو ئاوا بێت (ئاماژەی کرد بە نێولەپی).

## بَابُ ذِكْرِ قَدْرِ مَا كَانَ بَيْنَ أَذَانِ بِلَالٍ رضي الله عنه وَأَذَانِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ رضي الله عنه

**٤٠٣-** عَنْ القَاسِمِ عَن عَائِشَةَ، رضي الله عنها أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ بِلَالًا رضي الله عنه يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ رضي الله عنه»، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا قَدْرُ مَا يَرْقَى هَذَا وَيَنْزِلُ هَذَا[1].

## باسی ماوەی نێوان بانگدانی بیلال رضي الله عنه و بانگدانی ئیبنو ئوم مەکتوم رضي الله عنه

واتە: قاسم دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە رضي الله عنها، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان بیلال رضي الله عنه بەشەو بانگ دەدا، بۆیە بخۆن و بخۆنەوە هەتا گوێتان لە بانگدانی ئیبنو ئوم مەکتوم رضي الله عنه دەبێت. لە نێوانیاندا هیچ نەبوو مەگەر ئەندازەی ئەوەی یەکێکیان دابەزێت و ئەوی دیکەیان بچێتە سەربان. (واتە: بیلال بانگی یەکەم بدات و دووعا بخوێنێ، پاشان دابەزێتە خوارەوە، ئینجا ئیبنو ئوم مەکتوم سەر بکەوێت و بانگی بەیانی بدات).

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ رَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْجَهْلِ أَنَّهُ يُضَادُّ هَذَا الْخَبَرَ الَّذِي ذَكَرْنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلَالًا رضي الله عنه يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ»

**٤٠٤-** عَنْ أُنَيْسَةَ بِنْتِ خُبَيْبٍ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَذَّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ رضي الله عنه فَكُلُوا وَاشْرَبُوا، وَإِذَا أَذَّنَ بِلَالٌ فَلَا تَأْكُلُوا وَلَا تَشْرَبُوا»، فَإِنْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ مِنَّا لَيَبْقَى عَلَيْهَا شَيْءٌ مِنْ سُحُورِهَا، فَتَقُولُ لِبِلَالٍ رضي الله عنه: أَمْهِلْ حَتَّى أَفْرَغَ مِنْ سُحُورِي[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، هەندێ لە نەفامەکان وا دەبینن ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە کە باسمان کرد پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بیلال بەشەو بانگ دەدا**

واتە: ئونەیسەی کچی خوبەیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئیبنو ئوم مەکتوم ﷺ بانگی دا بخۆن و بخۆنەوە، ئەگەر بیلال بانگی دا مەخۆن و مەخۆنەوە، جا ئەگەر ئافرەتێ لە ئێمە کەمێکی مابایە خواردنەکەی تەواو بکات لە پارشێودا بە بیلالی ﷺ دەوت: لەسەرخۆ بە تا خواردنەکەم تەواو دەکەم.

٤٠٥- عَنْ خُبَيْبٍ وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمَّتِهِ أُنَيْسَةَ وَكَانَتْ مُصَلِّيَةً عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ أَوْ بِلَالًا ﷺ يُنَادِي بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ بِلَالٌ ﷺ أَوِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ»، وَمَا كَانَ إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ أَحَدُهُمَا وَيَقْعُدَ الْآخَرُ فَتَأْخُذُ بِثَوْبِهِ، فَتَقُولُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَتَسَحَّرَ[١].

واتە: خوبەیبی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە لە پووریەوە (خوشکی باوکی) ئونەیسە ئافرەتێك بوو نوێژی زۆر دەکرد، لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئیبنو ئوم مەکتوم ﷺ یان بیلال ﷺ بانگ دەدا بەشەو، بۆیە بخۆن و بخۆنەوە هەتا بیلال ﷺ یان ئیبنو ئوم مەکتوم ﷺ بانگ دەدا. نێوانی ئەو دوو بانگەش تەنها ئەوەندە بوو یەکێکیان دابەزێت و ئەوی دیکەیان لە خەو هەستێت و جلەکانی لەبەر بکات، جا هەبوو دەیوت: لە شوێنی خۆت دانیشە هەتا پارشێو دەکەم.

٤٠٦- عَنْ هِشام بن عُروةَ عَن أبيهِ عَن عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ بِلَالٌ؛ فَإِنَّ بِلَالًا لَا يُؤَذِّنُ حَتَّى يَرَى الْفَجْرَ»[٢].

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە عائیشەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئیبنو ئوم مەکتوم بەشە و بانگ دەدا بخۆن و بخۆنەوە هەتا بیلال بانگ دەدا، چونکە بیلال بانگ نادات تا بەرەبەیان نەبینێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٤٠٧- عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: أَيُّ سَاعَةٍ تُوتِرِينَ؟ قَالَتْ: مَا أُوتِرُ حَتَّى يُؤَذِّنُونَ، وَمَا يُؤَذِّنُونَ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ، قَالَتْ: وَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُؤَذِّنَانِ، فُلَانٌ وَعَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَذَّنَ عَمْرٌو فَكُلُوا وَاشْرَبُوا فَإِنَّهُ رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ، وَإِذَا أَذَّنَ بِلَالٌ فَارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ فَإِنَّ بِلَالًا لَا يُؤَذِّنُ حَتَّى يُصْبِحَ»(١).

واتە: ئەسوەدی كوڕی یەزید دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: چی كاتێك ویتر دەكەی؟ وتی: ویتر ناكەم هەتا بانگ دەدەن، بانگیش نادەن هەتا بەرەبەیان دەرنەكەوێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بانگدەری هەبوو، فڵان و عەمری كوڕی دایكی مەكتوم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر عەمر بانگی دا ئەوە بخۆن و بخۆنەوە چونكە ئەو پیاوێكی نابینایە، وە ئەگەر بیلال بانگی دا دەست (لە خواردن و خواردنەوە) هەڵگرن چونكە بیلال بانگ نادات هەتا ڕۆژ دەبێتەوە.

٤٠٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةُ مُؤَذِّنِينَ بِلَالٌ وَأَبُو مَحْذُورَةَ وَعَمْرُو بْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَذَّنَ عَمْرٌو ﷺ فَإِنَّهُ ضَرِيرُ الْبَصَرِ فَلَا يَغُرَّنَّكُمْ، وَإِذَا أَذَّنَ بِلَالٌ ﷺ فَلَا يَطْعَمَنَّ أَحَدٌ»(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَمَّا خَبَرُ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ فَإِنَّ فِيهِ نَظَرًا؛ لِأَنِّي لَا أَقِفُ عَلَى سَمَاعِ أَبِي إِسْحَاقَ هَذَا الْخَبَرَ مِنَ الْأَسْوَدِ، فَأَمَّا خَبَرُ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ فَصَحِيحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ، وَلَيْسَ هَذَا الْخَبَرُ يُضَادُّ خَبَرَ سَالِمٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، وَخَبَرَ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂، إِذْ جَائِزٌ أَنْ يَكُونَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ جَعَلَ الْأَذَانَ بِاللَّيْلِ نَوَائِبَ بَيْنَ بِلَالٍ وَبَيْنَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ فَأَمَرَ فِي بَعْضِ اللَّيَالِي بِلَالًا أَنْ يُؤَذِّنَ أَوَّلًا بِاللَّيْلِ، فَإِذَا نَزَلَ بِلَالٌ صَعِدَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ فَأَذَّنَ بَعْدَهُ بِالنَّهَارِ، فَإِذَا جَاءَتْ نَوْبَةُ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ بَدَأَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ فَأَذَّنَ بِلَيْلٍ، فَإِذَا نَزَلَ صَعِدَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ بَعْدَهُ بِالنَّهَارِ، وَكَانَتْ مَقَالَةُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فِي الْوَقْتِ الَّذِي كَانَتِ النَّوْبَةُ لِبِلَالٍ ﷺ فِي الْأَذَانِ بِلَيْلٍ وَكَانَتْ مَقَالَتُهُ ﷺ أَنَّ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ ﷺ يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فِي الْوَقْتِ الَّذِي كَانَتِ النَّوْبَةُ فِي الْأَذَانِ بِاللَّيْلِ نَوْبَةَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْلِمُ النَّاسَ فِي كُلِّ الْوَقْتَيْنِ أَنَّ الْأَذَانَ الْأَوَّلَ مِنْهُمَا هُوَ أَذَانٌ بِلَيْلٍ لَا بِنَهَارٍ، وَأَنَّهُ لَا يَمْنَعُ مَنْ أَرَادَ الصَّوْمَ طَعَامًا وَلَا شَرَابًا، وَأَنَّ أَذَانَ الثَّانِي إِنَّمَا يَمْنَعُ الطَّعَامَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

وَالشَّرَابَ إِذْ هُوَ بِنَهَارٍ لَا بِلَيْلٍ فَأَمَّا خَبَرُ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ وَمَا يُؤَذِّنُونَ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ فَإِنَّ لَهُ أَحَدَ مَعْنَيَيْنِ أَحَدُهُمَا لَا يُؤَذِّنُ جَمِيعُهُمْ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرَ لَا أَنَّهُ لَا يُؤَذِّنُ أَحَدٌ مِنْهُمْ، أَلَا تَرَاهُ أَنَّهُ قَدْ قَالَ فِي الْخَبَرِ: إِذَا أَذَّنَ عَمْرٌو ﵁ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا، فَلَوْ كَانَ عَمْرٌو ﵁ لَا يُؤَذِّنُ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ لَكَانَ الْأَكْلُ وَالشُّرْبُ عَلَى الصَّائِمِ بَعْدَ أَذَانِ عَمْرٍو مُحَرَّمَيْنِ، وَالْمَعْنَى الثَّانِي أَنْ تَكُونَ عَائِشَةُ ﵂ أَرَادَتْ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ الْأَوَّلُ فَيُؤَذِّنُ الْبَادِي مِنْهُمْ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الْأَوَّلِ لَا قَبْلَهُ، وَهُوَ الْوَقْتُ الَّذِي يَحِلُّ فِيهِ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ لِمَنْ أَرَادَ الصَّوْمَ إِذْ طُلُوعُ الْفَجْرِ الْأَوَّلِ بِلَيْلٍ لَا بِنَهَارٍ، ثُمَّ يُؤَذِّنُ الَّذِي يَلِيهِ بَعْدَ طُلُوعِ الْفَجْرِ الثَّانِي الَّذِي هُوَ نَهَارٌ لَا لَيْلٌ، فَهَذَا مَعْنَى هَذَا الْخَبَرِ عِنْدِي وَاللَّهُ أَعْلَمُ.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ بانگدەری هەبوو، بیلال و ئەبو مەحزورە و عەمری كوڕی دایكی مەكتوم ﵃، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر عەمر بانگی دا ئەوە ئەو كەسێكی نابینایە هیچ كێشەیەكتان نەبێت (خواردن و خواردنەوە بخۆن) وە ئەگەر بیلال بانگی دا ئەوە با هیچ كەس خواردن نەخوات.

ئەبو بەكر دەڵێ: فەرموودەكەی ئەبو ئیسحاق لە ئەسوەدەوە جێگای سەرنج و تێڕوانینە (مەبەستی فەرموودەی ژمارە ٤٠٧ ) نەمزانیوە ئەبو ئیسحاق ئەو فەرموودەی لە ئەسوەدەوە بیستبێت، بەڵام فەرموودەكەی هیشامی كوڕی عوروە (مەبەستی فەرموودەی ژمارە ٤٠٦) لە ڕووی گواستنەوەوە ڕاستە، ئەم فەرموودەیە دژیەك نابێتەوە لەگەڵ فەرموودەكەی سالیم لە ئیبنو عومەر ﵄ (مەبەستی فەرموودەی ژمارە ٤٠١) وە فەرموودەكەی قاسم لە عائیشە ﵂ (مەبەستی فەرموودەی ژمارە ٤٠٣) چونكە دروستە پێغەمبەر ﷺ بانگدانی شەوی كردبێت بە نۆرە لە نێوان بیلال و نێوان ئیبنو ئوم مەكتوم ﵁، فەرمانی كردبێت هەندێ شەو بیلال ﵁ یەكەم جار بانگ بدات، ئەگەر بیلال ﵁ دابەزی ئیبنو ئوم مەكتوم ﵁ سەر بكەوێت دوای ئەو بە ڕۆژ ئەو بانگ بدات، جا ئەگەر سەرەی ئیبنو ئوم مەكتوم ﵁ هات ئەوە شەو بانگ دەدات، ئەگەر دابەزی بیلال ﵁ سەر دەكەوێت و دوای ئەو بە ڕۆژ بانگ دەدات، جا فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ: (بیلال ﵁ بەشەو بانگ دەدات) لەو كاتە بووە نۆرەی بیلال ﵁ بووە بۆ بانگدانی شەو، وە فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ: ئیبنو ئوم مەكتوم ﵁ بە شەو بانگ دەدات لەو كاتە بووە كە نۆرەی بووە بەشەو بانگ بدات، پێغەمبەر ﷺ خەڵكی ئاگادار كردۆتەوە لە هەردوو كاتەكەدا، بانگدانی یەكەم لە هەردووكیانەوە بانگدانی شەوە نەك ڕۆژ، هەر

کەسێك دەیەوێ بەڕۆژوو بێت بانگی یەکەم ڕێگری لە خواردن و خواردنەوە ناکات، بەڵکو بانگی دووەم ڕێگری دەکات لە خواردن و خواردنەوە، چونکە لە ڕۆژدایە نەك لە شەو، بەڵام فەرموودەکەی ئەسوەد لە عائیشەوە ﵂: بانگیان نەدەدا هەتا بەرەبەیان دەردەکەوت، ئەوە یەکێك لەم دوو مانایەی بۆ هەیە: یەکەمیان: هەموویان بانگ نادەن هەتا بەرەبەیان دەرنەکەوێت، نەك هیچ یەکێك لە ئەوان بانگ نادەن، ئەی نەتبینیوە ئەو لە فەرموودەکەدا فەرمووی: (إِذَا أَذَّنَ عَمْرٌو فَكُلُوا وَاشْرَبُوا)، واتە: ئەگەر عەمر ﵁ بانگی دا ئەوە بخۆن و بخۆنەوە. ئەگەر عەمر ﵁ بانگی نەدایە تا بەرەبەیان دەردەکەوت ئەوە دوای بانگی عەمر ﵁ خواردن و خواردنەوە قەدەغە دەبوو بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بەڕۆژوو بێت، مانای دووەم ئەوەیە: عائیشە ﵂ مەبەستی ئەوە بووە بەرەبەیانی یەکەم دەردەچێت، بانگدەر دوای دەرچوونی بەرەبەیانی یەکەم بانگ دەدات نەك پێش دەرچوونی، ئەویش ئەو کاتەیە کە خواردن و خواردنەوە تیایدا دروستە بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بەڕۆژوو بێت، چونکە دەرچوونی بەرەبەیانی یەکەم لە شەودایە نەك لە ڕۆژ، پاشان ئەوی دیکەیان بانگ دەدات دوای دەرچوونی بەرەبەیانی دووەم کە ڕۆژە نەك شەو، ئەمەش مانای ئەم فەرموودەیە بەلای منەوە. خوا زاناترە.

## بَابُ الْأَذَانِ لِلصَّلَوَاتِ بَعْدَ ذَهَابِ الْوَقْتِ

٤٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: لَوْ عَرَّسْتَ بِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنِّي أَخَافُ أَنْ تَنَامُوا عَنِ الصَّلَاةِ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «يَا بِلَالُ، قُمْ فَأَذِّنِ النَّاسَ بِالصَّلَاةِ»[1].

## باسی بانگدان بۆ نوێژەکان دوای ڕۆیشتنی کاتی نوێژ

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: لە سەفەرێکدا شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین (بۆ غەزایەك)، هەندێ لە خەڵکەکە وتی: ئەگەر دابەزیت پشوو بدەین زۆر چاکە، فەرمووی: من دەترسم خەوتان لێ

---

(١) صحيح.

**بکەوێت و بەخەبەر نەیەن بۆ نوێژ، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، وتی: پیغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەستا پاشان فەرمووی: ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ.**

**٤١٠-** عَن ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ رَبَاحٍ، حَدَّثَ الْقَوْمَ فِي الْمَسْجِدِ الْجَامِعِ وَفِي الْقَوْمِ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ ﷺ، فَقَالَ عِمْرَانُ: مَنِ الْفَتَى؟ فَقَالَ: امْرُؤٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ عِمْرَانُ: الْقَوْمُ أَعْلَمُ بِحَدِيثِهِمْ انْظُرْ كَيْفَ تُحَدِّثُ فَإِنِّي سَابِعُ سَبْعَةٍ تِلْكَ اللَّيْلَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ عِمْرَانُ: مَا كُنْتَ أَرَى أَحَدًا بَقِيَ يَحْفَظُ هَذَا الْحَدِيثَ غَيْرِي، فَقَالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ إِلَّا تُدْرِكُوا الْمَاءَ مِنْ غَدٍ تَعْطَشُوا، فَانْطَلَقَ سَرَعَانُ النَّاسُ»، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: وَلَزِمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تِلْكَ اللَّيْلَةَ، فَنَعَسَ فَنَامَ فَدَعَمْتُهُ، ثُمَّ نَعَسَ أَيْضًا، فَمَالَ فَدَعَمْتُهُ، ثُمَّ نَعَسَ فَمَالَ أُخْرَى حَتَّى كَادَ يَنْجَفِلُ، فَاسْتَيْقَظَ فَقَالَ: «مَنِ الرَّجُلُ؟» فَقُلْتُ: أَبُو قَتَادَةَ، فَقَالَ: «مِنْ كَمْ كَانَ مَسِيرَكَ هَذَا؟»، قُلْتُ: مُنْذُ اللَّيْلَةِ، فَقَالَ: «حَفِظَكَ اللَّهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّهُ»، ثُمَّ قَالَ: «لَوْ عَرَّسْنَا»، فَمَالَ إِلَى شَجَرَةٍ وَمِلْتُ مَعَهُ فَقَالَ: «هَلْ تَرَى مِنْ أَحَدٍ؟»، قُلْتُ: نَعَمْ، هَذَا رَاكِبٌ، هَذَا رَاكِبٌ، هَذَانِ رَاكِبَانِ، هَؤُلَاءِ ثَلَاثَةٌ، حَتَّى صِرْنَا سَبْعَةً، فَقَالَ: «احْفَظُوا عَلَيْنَا صَلَاتَنَا لَا نَرْقُدُ عَنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ»، فَضُرِبَ عَلَى آذَانِهِمْ حَتَّى أَيْقَظَهُمْ حَرُّ الشَّمْسِ فَقَامُوا فَاقْتَادُوا هُنَيْئَةً ثُمَّ نَزَلُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَعَكُمْ مَاءٌ؟» فَقُلْتُ: نَعَمْ، مَعِي مِيضَأَةٌ لِي فِيهَا مَاءٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتِ بِهَا»، فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَالَ: «مُسُّوا مِنْهَا، مُسُّوا مِنْهَا»، فَتَوَضَّأْنَا وَبَقِيَ مِنْهَا جُرْعَةٌ، فَقَالَ: « ازْدَهِرْهَا يَا أَبَا قَتَادَةَ؛ فَإِنَّ لِهَذِهِ نَبَأً، فَأَذَّنَ بِلَالٌ فَصَلَّوْا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ صَلَّوَا الْفَجْرَ، ثُمَّ رَكِبُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: فَرَّطْنَا فِي صَلَاتِنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَقُولُونَ؟ إِنْ كَانَ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ دُنْيَاكُمْ فَشَأْنُكُمْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ دِينِكُمْ فَإِلَيَّ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَّطْنَا فِي صَلَاتِنَا، فَقَالَ: «إِنَّهُ لَا تَفْرِيطَ فِي النَّوْمِ، وَإِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ، وَإِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ عَنْ صَلَاتِهِ فَلْيُصَلِّهَا حِينَ يَذْكُرُهَا وَمِنَ الْغَدِ لِلْوَقْتِ» فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[١].

**واتە: سابیتی بونانی دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی ریباح قسەی بۆ خەڵك دەکرد لە مزگەوتی گەورەی مەدینە، عیمڕانی کوڕی حوصەینیش ﷺ لەنێو خەڵکەکە بوو، عیمڕان وتی: ئەو گەنجە کێیە؟ وتی: پیاوێکە لە ئەنصارەکان، عیمڕان وتی: خەڵکەکە شارەزاترن بە قسە و باسەکەیان تەماشا بکە چۆن قسە دەکەی چونکە من ئەو شەوە**

---

(١) صحيح.

حەوتەمین کەس بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، عیمڕان وتی: من کەسێك نابینم مابێت ئەم باسەی لەبەر بێت جگە لە خۆم، وتی: گوێم لە ئەبو قەتادە ﷺ بوو دەیوت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، فەرمووی: ئێوە بەیانی ئاوتان دەست ناکەوێت تینووتان دەبێ، خەڵکەکە بەپەلە دەرچوون، ئەبو قەتادە وتی: ئەو شەوە پەیوەست بووم بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، خەو بردیەوە و خەوت (بەسەر وشترەکەیەوە) منیش بە دەستم گرتم، پاشان خەو بردیەوە بە دەستم گرتم، پاشان خەو بردیەوە هەتا خەریك بوو بکەوێت، فەرمووی: ئەم پیاوە کێیە؟ وتم: ئەبو قەتادەیە، فەرمووی: لەکەیەوە بەم شێوە لەگەڵمی؟ وتم: بە درێژایی ئەم شەو، فەرمووی: خوا بتپارێزێ وەکوو چۆن پارێزگاریت لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد، پاشان فەرمووی: با دابەزین بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین، لایدایە لای درەختێك منیش لەگەڵی لام دا، فەرمووی: ئایا کەسێك دەبینی؟ وتم: بەڵێ، ئەوە سوارێکە، ئەوە سوارێکی دیکەیە، ئەوە دوو سوارە، ئەوەش سێ سوارە، هەتا بووین بە حەوت، فەرمووی: ئاگاتان لە نوێژی بەیانی بێت خەو نەمانباتەوە، پەردە درا بەسەر گوێیاندا هەتا تینی گەرمای خۆر بەخەبەری هێنانەوە، دواتر هەستان وشترەکانیان خستە ڕێ و کەمێك ڕێیان کرد پاشان دابەزین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئاوتان پێیە؟ وتم: بەڵێ، جامێکم پێیە ئاوی تێدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیهێنە، بۆم هێنا، فەرمووی: ئاوی لێ ببەن (بۆ دەستنوێژگرتن) ئاوی لێ ببەن، ئێمەیش دەستنوێژمان لێ گرت، ئەندازەی مشتێك ئاوی تێدا مایەوە، فەرمووی: بیپارێزە ئەی ئەبو قەتادە، چونکە لەوەدا هەواڵێك هەیە، دواتر بیلال بانگی دا دوو ڕکاتی بەرەبەیانیان کرد، پاشان نوێژی بەیانییان کرد، ئینجا سواری وڵاخەکانیان بوون، هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان وت: کەمتەرخەمیمان کرد لە نوێژەکەماندا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چی دەڵێن؟ ئەگەر شتێ پەیوەندی هەبوو بە کاروباری دنیاتان ئەوە کاری خۆتانە، وە ئەگەر شتێ پەیوەندی هەبوو بە ئایینەکەتان ئەوە کاری منە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەمتەرخەمیمان کرد لە نوێژەکەماندا، فەرمووی: لە خەودا هیچ کەمتەرخەمییەك نییە، بەڵکوو کەمتەرخەمی لە بەخەبەربوونە، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بێئاگا بوو لە نوێژەکەی، با کاتێ بیری دەکەوێتەوە ئەنجامی بدات، ئەگەر ڕۆژ بۆیەوە با لە یەکەم کاتیدا نوێژەکەی بکات (مەبەستی ئەوە نییە دوو جار نوێژەکەی ئەنجام بدات: جاری یەکەم: کە خەبەری بۆیەوە یان بیری کەوتەوە، جاری دووەم: لەگەڵ نوێژی بەیانییەکەی دیکە دووبارەی بکاتەوە).

## بَابُ الْأَمْرِ بِأَنْ يُقَالَ مَا يَقُولُهُ الْمُؤَذِّنُ إِذَا سَمِعَهُ يُنَادِي بِالصَّلَاةِ، بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٤١١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُنَادِيَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ»[١].

## باسی فەرمانکردن بەوەی ئەوە بوترێ کە بانگدەر دەیڵێ، ئەگەر بیستی بانگ دەدات بۆ نوێژ، بە دەستەواژەیەکی (عَام) گشتییە و مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو (بانگی دەدا)، ئەوە وەکوو ئەو بیڵێنەوە.

**٤١٢-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَ عِنْدَهَا فِي يَوْمِهَا فَسَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يُؤَذِّنُ قَالَ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ حَتَّى يَفْرُغَ[٢].

واتە: دایکی حەبیبە، کچی ئەبو سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە سەرەی ڕۆژەکەی لەلای بووایە گوێی لە بانگدەر بووایە بانگی بدایە، دەیفەرموو وەکوو چۆن بانگدەر بانگی دەدا هەتا تەواو دەبوو (واتە: وەکوو بانگدەر بانگەی دووبارە دەکردەوە).

**٤١٣-** عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ حَتَّى يَسْكُتَ الْمُؤَذِّنُ»[٣].

واتە: دایکی حەبیبە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو وەك چۆن بانگدەر بانگی دەدا هەتا بانگدەر بێدەنگ دەبوو.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

ب

## ‌ابُ ذِكْرِ الْأَخْبَارِ الْمُفَسِّرَةِ لِلَّفْظَتَيْنِ اللَّتَيْنِ ذَكَرْتُهُمَا فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ وَأُمِّ حَبِيبَةَ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ أَنْ يَقَالَ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ حَتَّى يَفْرَغَ، وَكَذَاكَ كَانَ يَقُولُ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ حَتَّى يَسْكُتَ، خَلَا قَوْلِهِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ.

٤١٤- عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى مُعَاوِيَةَ ﷺ فَنَادَى الْمُنَادِي بِالصَّلَاةِ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ ﷺ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: وَأَنَا أَشْهَدُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ ﷺ: وَأَنَا أَشْهَدُ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ[1].

**باسی ئەو فەرموودانەی شیکەرەوەی ئەو دوو دەستەواژەیەن کە باسمان کرد لە فەرموودەکەی: ئەبو سەعید و دایکی حەبیبە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی ئەبو سەعید ﷺ فەرمانی کرد بانگدەر چی وت وەکوو ئەو بڵێتەوە هەتا بانگەکەی تەواو دەکات، بەهەمان شێوە دەیفەرموو وەکوو چۆن بانگدەر بانگی دەدا هەتا بێدەنگ دەبوو، جگە لەوەی کە دەڵێت: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)**

واتە: عیسای کوڕی تەلحە دەڵێ: چووین بۆ لای موعاویە ﷺ، جا بانگدەر بانگی نوێژی دا، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، موعاویە وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، موعاویە وتی: منیش شایەتی دەدەم، پاشان وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ)، موعاویە وتی: منیش شایەتی دەدەم، پاشان وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ)، موعاویە وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، پاشان وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، موعاویە وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، پاشان وتی: بەم شێوە گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بوو دەیفەرموو.

---

(١) صحيح.

**٤١٥-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ مَوْلَى عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ: « اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ مُعَاوِيَةُ ﷺ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ مُعَاوِيَةُ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ مُعَاوِيَةُ ﷺ: هَكَذَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ[١].

**واتە: موحەممەدی كوڕی یوسف مەولای عوسمانی كوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: بانگدەر بانگی دا وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان ﷺ وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، موعاویە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، موعاویە ﷺ وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، پاشان موعاویە ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەم شێوەیەی دەفەرموو.**

**٤١٦-** عن مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَقَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَخَبَرُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ مِنْ هَذَا الْبَابِ أَيْضًا، قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي بَابٍ آخَرَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: مَعْنَى خَبَرِ أُمِّ حَبِيبَةَ: قَالَ كَمَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ حَتَّى يَفْرُغَ، أَيْ إِلَّا قَوْلَهُ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، وَكَذَلِكَ مَعْنَى خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ، فَقُولُوا كَمَا يَقُولُ: أَيْ خَلَا قَوْلِهِ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، وَخَبَرُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَمُعَاوِيَةَ مُفَسِّرَيْنِ لِهَذَيْنِ الْخَبَرَيْنِ، وَقَدْ بُيِّنَ فِي خَبَرِ عُمَرَ وَمُعَاوِيَةَ أَنَّ مَنْ سَمِعَ هَذَا الْمُنَادِي يُنَادِي بِالصَّلَاةِ إِنَّمَا يَقُولُ مِثْلَ مَا يَقُولُ، خَلَا قَوْلِهِ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، وَيَقُولُ إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، الْمُصَلِّي، وَالْمُؤَذِّنُ لَا يَقُولُ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فِي أَذَانِهِ، فَهَذَا الْقَوْلُ مِنْ سَامِعِ الْمُؤَذِّنِ لَيْسَ هُوَ مِمَّا يَقُولُهُ الْمُؤَذِّنُ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمر دەگێڕێتەوە باوکم بۆی باس کردم لە باپیرەمەوە وتی: من لەلای موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بووم، بانگدەر وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، موعاویە ﷺ وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، موعاویە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، دواتر وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، موعاویە وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ)، موعاویە وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، موعاویە وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، موعاویە وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، پاشان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەمشێوەیەی دەفەرموو.

ئەبو بەکر دەڵێ: هەروەها فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتابیش ﷺ لەم باسەدا هاتووە، لە بەشێکی دیکەدا هێناومە. ئەبو بەکر دەڵێ: مانای فەرموودەکەی دایکی حەبیبە: (دەیفەرموو وەکوو چۆن بانگدەر بانگی دەدا هەتا تەواو دەبوو) واتە: جگە لە وتەی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الفلاح) بەهەمان شێوە مانای فەرموودەکەی ئەبو سەعید: (بیڵێنەوە وەکوو چۆن بانگدەر دەیڵێ) واتە: جگە لە (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الفلاح)، هەروەها فەرموودەکەی عومەری کوڕی خەتاب و موعاویەش شیکەرەوە و ڕوونکەرەوەی ئەو دوو فەرموودەیەن، بێگومان ڕوون بووەتەوە لە فەرموودەکەی عومەر و موعاویە هەر کەسێك گوێی لە بانگدەر بوو بانگی دەدا بۆ نوێژ دەبێ وەکوو ئەو بیڵێتەوە جگە لە وتەی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الفلاح)، وە کاتێ کە بانگدەر وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الفلاح)، نوێژخوێن دەڵێ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، بەڵام بانگدەر لە بانگەکەیدا ناڵێ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، ئەمەش وتەی ئەو کەسەیە گوێی لە بانگ دەبێت، بانگدەر ئەوە لە بانگەکەیدا ناڵێ.

## بَابُ ذِكْرِ فَضِيلَةِ هَذَا الْقَوْلِ عِنْدَ سَمَاعِ الْأَذَانِ إِذَا قَالَهُ الْمَرْءُ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ

**٤١٧-** عَنْ حَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ أَحَدُكُمْ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ قَالَ: لَا

حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئەم وتەیە لە کاتی گوێگرتن لە بانگ، ئەگەر بانگدەر لە ناخی دڵیەوە ئەوەی وت

واتە: حەفصی کوڕی عاصم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە عومەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بانگدەر وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، هەر یەکێك لە ئێوەش (لە ناخی دڵیەوە) وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، ئەویش وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، پاشان وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، ئەویش وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، پاشان وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ)، ئەویش وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، پاشان وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ)، ئەویش وتی: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، پاشان وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، ئەویش وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، ئەویش وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، لە ناخی دڵیەوە دەچێتە بەهەشت.

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ فَرَاغِ سَمَاعِ الْأَذَانِ

**٤١٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، وَإِنَّهَا دَرَجَةٌ فِي الْجَنَّةِ لَا تَنْبَغِي إِلَّا لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ» هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ حَيْوَةَ، وَفِي خَبَرِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي أَيُّوبَ قَالَ: «وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ»[2].

## باسی فەزڵ و ڕێزی صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دوای تەواوبوونی گوێگرتن لە بانگ

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر گوێتان لە بانگدەر بوو چی دەڵێت وەکوو ئەو بیڵێنەوە، پاشان

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

صەڵاوات بدەن لەسەرم، چونکە هەر کەسێك یەك صەڵاوات بدات لەسەرم، خوا دە صەڵاوات دەدات لەسەری، پاشان داوای وەسیلەم بۆ بکەن، چونکە ئەوە پلەیەکە لە بەهەشتدا تەنها بۆ بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا، هەر کەسێك داوای وەسیلەم بۆ بکات ئەوە شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێ. ئەمە دەستەواژەی فەرموودەکەی حەیوەیە، وە لە فەرموودەکەی سەعیدی کوڕی ئەیوبدا هاتووە فەرموویەتی: ئومێدەوارم ئەو کەسە من بم.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْأَذَانِ وَرَجَاءِ إِجَابَةِ الدَّعْوَةِ عِنْدَهُ

٤١٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ أَخْبَرَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اثْنَتَانِ لَا تُرَدَّانِ أَوْ قَلَّ مَا تُرَدَّانِ الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يَلْتَحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا»[1].

## باسی چاکتر وایە لە کاتی بانگدان بپاڕێتەوە، وە ئومێدی قبووڵبوونی پاڕانەوە لەو کاتەدا

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ هەواڵی داوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو دوعا و پاڕانەوە هەیە ڕەت ناکرێنەوە، یان بەکەمی ڕەت دەکرێنەوە، لە کاتی بانگدان، وە لە کاتی ناڕەحەتی و سەختی کاتێ کە جەنگ لە نێوانیاندا گەرم دەبێت (واتە: لە نێوانی موسوڵمانان و بێباوەڕان).

## بَابُ صِفَةِ الدُّعَاءِ عِنْدَ مَسْأَلَةِ اللَّهِ ﷻ لِلنَّبِيِّ ﷺ مُحَمَّدٍ الْوَسِيلَةَ، وَاسْتِحْقَاقِ الدَّاعِي بِتِلْكَ الدَّعْوَةِ الشَّفَاعَةَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

٤٢٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَنْ قَالَ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ الْمَقَامَ الْمَحْمُودَ الَّذِي وَعَدْتَهُ، إِلَّا حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چۆنیەتی پاڕانەوە كاتێ داوا لە خوا ﷻ دەكات وەسیلە و فەزیلە ببەخشێ بە موحەممەد ﷺ، وە بەهۆی ئەو پاڕانەوەیە شەفاعەت بۆ خاوەن پاڕانەوەكە شایستە دەبێت لە ڕۆژی دوایی**

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵا رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك گوێی لە بانگ بوو بڵێ: ئەی پەروەردگاری خاوەن ئەم بانگەوازە تەواوە و ئەم نوێژە ڕاگیراوە كە دەكرێت، وەسیلە و فەزیلە ببەخشە بە موحەممەد ﷺ وە بیگەیەنەرە ئەو شوێنە سوپاسگوزارییە كە پەیمانت پێ داوە (هەر كەسێك ئەوە بڵێ)، ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت و دەیگرێتەوە.

**بَابُ فَضِيلَةِ الشَّهَادَةِ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِوَحْدَانِيَّتِهِ وَلِلنَّبِيِّ ﷺ بِرِسَالَتِهِ وَعُبُودِيَّتِهِ وَبِالرِّضَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ رَسُولاً وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا عِنْدَ سَمَاعِ الْأَذَانِ وَمَا يُرْجَى مِنْ مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ بِذَلِكَ**

**٤٢١**- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ[1].

**باسی فەزڵ و شكۆی شایەتیدان بە تاك و تەنهایی خوا، وە شایەتیدان بە نێردراوێتی و خواپەرستی پێغەمبەر ﷺ، بە ڕازیبوون بە پەروەردگارێتیی خوا، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەری خوایە، ئیسلامیش دین و ئایینە، لە كاتی بیستنی بانگدا، ئەوەشی ئومێدی لێ دەكرێ لە لێخۆشبوونی گوناهەكان بەو هۆیەوە**

واتە: سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك كاتێ گوێبیستی بانگ دەبێت بڵێ: منیش شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوای تاك و تەنها و هیچ هاوبەشی نییە، وە موحەممەدیش

---

(١) صحيح.

بەندە و پێغەمبەری خوایە، ڕازی بووم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێت، ئیسلامیش ئایینم بێت خوا لە گوناهەكانی خۆش دەبێت.

**٤٢٢-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يَتَشَهَّدُ فَالْتَفَتَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ(١).

واتە: سەعدی كوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك گوێی لە بانگدەر بوو شاهیدی دەدا ڕووی تێ كرد و وتی: شاهیدی دەدەم هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوای تاك و تەنها و هیچ هاوبەشی نییە، وە موحەممەدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە، ڕازی بووم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێت، ئیسلامیش ئایینم بێت خوا لە گوناهەكانی ڕابردووی خۆش دەبێت.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ أَخْذِ الْأَجْرِ عَلَى الْأَذَانِ

**٤٢٣-** عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَلِّمْنِي الْقُرْآنَ وَاجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي قَالَ: فَقَالَ: «اقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ، وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لَا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا»(٢).

### باسی سەرزەنشتكردن لە وەرگرتنی كرێ لەسەر بانگدان

واتە: عوسمانی كوڕی ئەبولعاص ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، قورئانم فێر بكە و بمكە بە پێشنوێژی قەومەكەم، وتی: فەرمووی: پێشنوێژییان بكە و پەیڕەوی لاوازترینیان بكە، (واتە: بەپێی توانای لاوازترینیان نوێژ بكە و كورتی بكەرەوە بەبێ ئەوەی پایەكانی كەم بكەیتەوە) وە بانگدەرێك دابنێ با لەبری بانگدانەكەی كرێ وەرنەگرێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي أَذَانِ الْأَعْمَى إِذَا كَانَ لَهُ مَنْ يَعْلَمُهُ الْوَقْتَ

**٤٢٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ بِلَالًا رضي الله عنه يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ رضي الله عنه» قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: وَسَمِعْتُ الْقَاسِمَ يُحَدِّثُ بِذَلِكَ عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَ: وَإِنَّمَا كَانَ بَيْنَهُمَا قَدْرُ مَا يَنْزِلُ هَذَا، وَيَصْعَدُ هَذَا[1].

### باسی ڕێگەدان بە بانگدانی نابینا بە مەرجێك کەسێك کاتی بانگ ئاگاداری بکاتەوە

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان بیلال رضي الله عنه بە شەو بانگ دەدا، بۆیە بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبنو ئوم مەکتوم رضي الله عنه بانگ دەدات. عوبەیدوڵا وتی: گوێم لە قاسم بوو باسی دەکرد، لە عائیشەوە رضي الله عنها وتی: لە نێوانیاندا ئەندازەی ئەوە بوو یەکێکیان دابەزێت و ئەوی دیکەیان بچێتە سەربان (واتە: بیلال بانگی یەکەم بدات و دووعا بخوێنێ، پاشان دابەزێتە خوارەوە ئینجا ئیبنو ئوم مەکتوم سەر بکەوێت و بانگی بەیانی بدات).

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الدُّعَاءِ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ رَجَاءَ أَنْ تَكُونَ الدَّعْوَةُ غَيْرَ مَرْدُودَةٍ بَيْنَهُمَا

**٤٢٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدُّعَاءُ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لَا يُرَدُّ، فَادْعُوا»[2].

### باسی چاکتر وایە لە نێوان بانگ و قامەت بپاڕێتەوە، بەئومێدی ئەوەی پاڕانەوە لە نێوانیاندا ڕەت ناکرێتەوە

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نزا و پاڕانەوە لە نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە، بۆیە بپاڕێنەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٤٢٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الدُّعَاءُ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لَا يُرَدُّ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پاڕانەوە لە نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە.

٤٢٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدَّعْوَةُ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لَا تُرَدُّ فَادْعُوا»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاڕانەوە لە نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە، بۆیە بپاڕێنەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الصَّلَاةِ كَانَتْ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَبْلَ هِجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْمَدِينَةِ، إِذِ الْقِبْلَةُ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ بَيْتُ الْمَقْدِسِ لَا الْكَعْبَةُ

٤٢٨- عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ يَقُولُ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا، ثُمَّ صُرِفْنَا نَحْوَ الْكَعْبَةِ[٣].

## باسی نوێژکردن بەرەوڕووی بەیتولمەقدیس پێش هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، چونکە ئەوکاتە قیبلە بەیتولمەقدیس بوو نەك كەعبەی پیرۆز

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: نوێژمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووبەڕووی بەیتولمەقدیس بۆ ماوەی شازدە یان حەڤدە مانگ، پاشان ڕوومان وەرگێڕدرا بۆ لای کەعبە.

٤٢٩- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: مَعْبَدُ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، وَكَانَ مِنْ أَعْلَمِ الْأَنْصَارِ، حَدَّثَنِي أَنَّ أَبَاهُ كَعْبًا حَدَّثَهُ، وَخَبَرُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ فِي خُرُوجِ الْأَنْصَارِ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ فِي بَيْعَةِ الْعَقَبَةِ، وَذَكَرَ فِي الْخَبَرِ أَنَّ الْبَرَاءَ بْنَ مَعْرُورٍ ﷺ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنِّي خَرَجْتُ فِي سَفَرِي هَذَا وَقَدْ هَدَانِي اللَّهُ لِلْإِسْلَامِ، فَرَأَيْتُ أَلَّا أَجْعَلَ هَذِهِ الْبِنْيَةَ مِنِّي بِظَهْرٍ فَصَلَّيْتُ إِلَيْهَا، وَقَدْ خَالَفَنِي أَصْحَابِي

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

فِي ذَلِكَ حَتَّى وَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَمَاذَا تَرَى؟ قَالَ: «قَدْ كُنْتَ عَلَى قِبْلَةٍ لَوْ صَبَرْتَ عَلَيْهَا» قَالَ: فَرَجَعَ الْبَرَاءُ ﷺ إِلَى قِبْلَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَصَلَّى مَعَنَا إِلَى الشَّامِ(١).

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: مەعبەدی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك بۆی باس کردم، کە زاناترینی نێو ئەنصارەکان بوو، وتی: باوکی کە کەعب بوو بۆی باس کرد، وە فەرموودەی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ لە دەرچوونی ئەنصارەکان لە مەدینەوە بۆ مەککە لە بەیعەتی عەقەبە بوو، لە فەرموودەکەدا باسی کرد بەڕائی کوڕی مەعرور ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ وت: من لە گەشتەکەمدا دەرچووم خوا هیدایەتی دام بۆ ئیسلام، پێم وا بوو ئەو خانووە (کەعبە) نەخەمە پشتمەوە، کاتێ نوێژم کرد ڕووم تێ کرد، هاوەڵەکانم بەتوندی پێچەوانەیان کردم، هەتا ئەوەی لە نەفسمدا لەوبارەوە شتێك دروست بوو تۆ پێت چۆنە؟ فەرمووی: بێگومان تۆ ڕووبەڕووی قیبلە نوێژت کرد، ئەگەر ئارامت بگرتایە، وتی: بەڕاء گەڕایەوە بۆ قیبلەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شام لەگەڵماندا نوێژی کرد.

## بَابُ بَدْءِ الْأَمْرِ بِاسْتِقْبَالِ الْكَعْبَةِ لِلصَّلَاةِ وَنَسْخِ الْأَمْرِ بِالصَّلَوَاتِ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ مِنْ هَذَا الْبَابِ

٤٣٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَأَصْحَابَهُ كَانُوا يُصَلُّونَ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۝١٤٤﴾ البقرة، مَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلَمَةَ فَنَادَاهُمْ وَهُمْ رُكُوعٌ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ أَلَا إِنَّ الْقِبْلَةَ قَدْ حُوِّلَتْ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَمَالُوا رُكُوعًا(٢).

**باسی دەسپێکردنی فەرمانکردن بە ڕووکردنە کەعبە بۆ نوێژ، وە هەڵوەشاندنەوەی فەرمان بە نوێژەکان بۆ لای بەیتولمەقدیس، ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازیب لەم بەشەیە**

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ڕووبەڕووی بەیتولمەقدیس نوێژیان دەکرد کاتێ ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ

(١) إسناده حسن.
(٢) صحيح.

ﭐلۡحَرَامِۚ ﴿١٤٤﴾﴾، واتە: ئیدی ڕووت وەرچەرخێنە بەرەولای مزگەوتی حەڕام. پیاوێك لە نەوەکانی سەلەمە تێ پەڕی بەلای خەڵکێك لە ئەنصارەکان بانگی کردن ئەوان لە ڕکووعدا بوون، لە نوێژی بەیانی، ئاگادار بن قیبلە گۆڕاوە بۆ لای کەعبە، ئەوانیش لە ڕکووعدا لار بوونەوە بەرەوڕووی کەعبە.

**٤٣١-** عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانُوا يُصَلُّونَ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَزَادَ وَاعْتَدُّوا بِمَا مَضَى مِنْ صَلَاتِهِمْ[1].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: ئەوان نوێژیان دەکرد بەرەوڕووی بەیتولمەقدیس، دواتر هەروەك فەرموودەکەی پێشوو باسی کرد، ئەوەشی زیاد کرد: ئەو نوێژانەش کە پێشتر (بەرەو بەیتولمەقدیس) کردبوویان حیسابیان کردن و نەیانگێڕانەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْقِبْلَةَ إِنَّمَا هِيَ الْكَعْبَةُ لَا جَمِيعُ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَأَنَّ اللَّهَ ﷻ إِنَّمَا أَرَادَهُ بِقَوْلِهِ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ ﴿١٤٤﴾﴾ البقرة، لِأَنَّ الْكَعْبَةَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَإِنَّمَا أُمِرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُسْلِمِينَ أَنْ يُصَلُّوا إِلَى الْكَعْبَةِ إِذِ الْقِبْلَةَ إِنَّمَا هِيَ الْكَعْبَةُ لَا الْمَسْجِدُ كُلُّهُ، إِذِ اسْمُ الْمَسْجِدِ يَقَعُ عَلَى كُلِّ مَوْضِعٍ يُسْجَدُ فِيهِ

**٤٣٢** - عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا دَخَلَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ فِي قُبُلِ الْكَعْبَةِ، وَقَالَ: «هَذِهِ الْقِبْلَةُ»[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی قیبلە بریتییە لە کەعبە نەك هەموو مزگەوتی حەڕام، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ ﴿١٤٤﴾﴾، واتە: ئیدی ڕووت وەرچەرخێنە بەرەولای کەعبە. چونکە کەعبە لەنێو مزگەوتی حەڕامدایە، وە بۆیە پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمانان فەرمانیان پێ کراوە ڕوو بکەنە کەعبە، چونکە قیبلە کەعبەیە نەك هەموو مزگەوتەکە، چونکە ناوی مزگەوت بۆ هەموو جێگایەك بەکار دێت کە سوژدەی تێدا ببرێت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ چووە نێو کەعبەوە لە هەموو گۆشەکانیەوە پاڕایەوە، نوێژی تێدا نەکرد هەتا دەرچوو، کاتێ دەرچوو لە ڕووی دەرگاکەی دوو ڕکات نوێژی کرد، فەرمووی: ئەمە قیبلەیە.

**٤٣٣-** وَفِي خَبَرِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: ثُمَّ صُرِفْنَا نَحْوَ الْكَعْبَةِ وَقَالَ إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ: ثُمَّ وُجِّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ، وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ[١].

واتە: لە فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازیبدا ﷺ هاتووە: پاشان ڕوومان وەرگێڕدرا بەرەوڕووی کەعبە، ئیسڕائیل وتی: لە ئەبو ئیسحاق، لە بەڕائەوە ﷺ (وتی): پاشان (پێغەمبەر ﷺ بە فەرمانی خوا ﷻ) ڕووی وەرگێڕدرا بۆ لای کەعبە، پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بوو ڕووی بکرێتە لای کەعبە.

**٤٣٤-** وَفِي خَبَرِ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَلَا إِنَّ الْقِبْلَةَ قَدْ حُوِّلَتْ إِلَى الْكَعْبَةِ، وَهَكَذَا قَالَ عُثْمَانُ بْنُ سَعْدٍ الْكَاتِبُ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ إِذْ صُرِفَ إِلَى الْكَعْبَةِ، وعن عُثْمَانِ بْنُ سَعْدٍ، حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ أَشْهُرًا، فَبَيْنَمَا هُوَ ذَاتَ يَوْمٍ يُصَلِّي الظُّهْرَ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ إِذْ صُرِفَ إِلَى الْكَعْبَةِ، فَقَالَ السُّفَهَاءُ ﴿مَا وَلَّـٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا﴾البقرة: ١٤٢[٢].

واتە: هەروەها لە فەرموودەی سابیتەوە هاتووە لە ئەنەسەوە ﷺ: ئاگادار بن قیبلە گۆڕدرا بۆ لای کەعبە، عوسمانی کوڕی سەعدی کاتبیش بەو شێوە هێناویەتی لە ئەنەسەوە ﷺ: کاتێ ڕووی وەرگێڕدرا بۆ لای کەعبە، هەروەها لە عوسمانی کوڕی سەعدەوە وتی، ئەنەس ﷺ بۆی باس کردین وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند مانگێك ڕووبەڕووی بەیتولمەقدیس نوێژی کرد، ڕۆژێ نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، دوو ڕکات نوێژی کرد لەپڕ ڕووی وەرگێڕدرا بۆ لای کەعبە، جا ناحاڵی و گێلەکان (لە جوولەکەکان و هاوئاوازەکانیان) وتیان: ﴿مَا وَلَّـٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا﴾، واتە: چی ڕووی موسوڵمانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیان کە جاران لەسەری بوون.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٤٣٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ أَهْلَ قُبَاءَ كَانُوا يُصَلُّونَ قِبَلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَأَتَاهُمْ آتٍ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَزَلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ وَتَوَجَّهَ إِلَى الْكَعْبَةِ فَاسْتَقْبِلُوهَا، فَاسْتَدَارُوا كَمَا هُمْ»[١].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکی قوباء ڕووبەڕووی بەیتولمەقدیس نوێژیان دەکرد، کەسێك هات بۆ لایان وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕئانی بۆ دابەزیوە و ڕووی کردووەتە کەعبە ئێوەش ڕووی تێ بکەن، ئینجا ڕوویان وەرچەرخاند بۆ لای کەعبە، بێ ئەوەی نوێژ ببڕن.**

**٤٣٦- وَفِي خَبَرِ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: ثُمَّ صُرِفَ إِلَى الْكَعْبَةِ، وَفِي خَبَرِ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ جَاءَ مُنَادِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْقِبْلَةَ قَدْ حُوِّلَتْ إِلَى الْكَعْبَةِ» قَدْ خَرَّجْتُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ كُلَّهَا فِي كِتَابِ الصَّلَاةِ الْكَبِيرِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَدَلَّتْ هَذِهِ الْأَخْبَارُ كُلُّهَا عَلَى أَنَّ الْقِبْلَةَ إِنَّمَا هِيَ الْكَعْبَةُ وَفِي خَبَرِ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ: انْطَلَقَ رَجُلٌ إِلَى أَهْلِ قُبَاءَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ أُمِرَ أَنْ يُصَلِّيَ إِلَى الْكَعْبَةِ وَفِي خَبَرِ عُمَارَةَ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: فَأَشْهَدُ عَلَى إِمَامِنَا أَنَّهُ تَوَجَّهَ هُوَ وَالرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ نَحْوَ الْكَعْبَةِ، وَفِي خَبَرِ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: لَمَّا وُجِّهَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْكَعْبَةِ[٢].**

**واتە: لە فەرموودەکەی موجاهیددا هاتووە: پاشان ڕووی وەرگێڕدرا بۆ لای کەعبە، هەروەها لە فەرموودەی سومامەی کوڕی عەبدوڵادا هاتووە لە ئەنەسەوە بانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ هات وتی: (بەڕاستی قیبلە گۆڕدرا بۆ لای کەعبە)، هەموو ئەم فەرموودانەم دەرهێناوە لە کتێبی (الصَّلَاة الْكَبِير)، ئەبو بەکر وتی: هەموو ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی وشەی (الْقِبْلَة) بە مانای (الْكَعْبَة) هاتووە، لە فەرموودەی ئەبو حازم لە سەهلی کوڕی سەعدەوە: پیاوێك ڕۆیشت بۆ لای خەڵکی قوباء وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرا بەرەو ڕووی کەعبە نوێژ بکات. وە لە فەرموودەی عومارەی کوڕی ئەوس دەڵێ: شایەتی ئەدەم پێشنوێژەکەمان خۆی و کۆمەڵێك لە پیاوان و ئافرەتان ڕوویان کردە کەعبە، هەروەها لە فەرموودەی عیکریمە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە کەعبە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الشَّطْرَ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ الْقِبَلُ لَا النِّصْفُ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي نَقُولُ إِنَّ الْعَرَبَ قَدْ يُوقِعُ الِاسْمَ الْوَاحِدَ عَلَى الشَّيْئَيْنِ الْمُخْتَلِفَيْنِ، قَدْ يُوقِعُ اسْمَ الشَّطْرِ عَلَى النِّصْفِ وَعَلَى الْقِبَلِ أَيِ الْجِهَةِ

**٤٣٧-** عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: قَالَ الْبَرَاءُ: وَالشَّطْرُ فِينَا قِبَلَهُ[1].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی وشەی (الشَّطْر) لەم جێگایەدا بە واتای ڕووتێکردن دێت نەك نیوە، وە ئەوەش لەو شێوازانەیە کە دەڵێین عەرەب هەندێ جار ناوێك بەکار دەهێنێ بۆ دوو شتی جیاواز، هەندێ جار ناوی (الشَّطْر) بەمانای نیوە بەکار دەهێنێ، هەندێ جاریش بە مانای ڕووتێکردن**

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ شازدە مانگ نوێژم کرد بەرەولای بەیتولمەقدیس. دواتر فەرموودەکەی باس کرد وتی: بەڕاء وتی: (الشَّطْرُ) لای ئێمە واتە: ڕووی.

**٤٣٨-** عَنْ عَمْرٍو وَهُوَ ابْنُ دِينَارٍ قَالَ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: « أَنُلْزِمُكُمُوهَا مِنْ شَطْرِ أَنْفُسِنَا: مِنْ تِلْقَاءِ أَنْفُسِنَا » قَدْ خَرَّجْتُ هَذَا الْبَابَ بِتَمَامِهِ فِي كِتَابِ التَّفْسِيرِ[2].

واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: ئیبنو عەباس ﷺ ئەم ئایەتەی بەم قیرائەتە خوێندەوە: (أَنُلْزِمُكُمُوهَا مِنْ شَطْرِ أَنْفُسِنَا)، بە مانای: ئایا بەزۆر پابەندتان بکەین لە لایەن خۆمانەوە لەسەر هیدایەت (لە کاتێکدا خوا هیدایەتی نەداون). بێگومان ئەم بەشەم تەخریج کردووە و هێناوە بەتێروتەسەلی لە کتێبی تەفسیر.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّشْبِيكِ بَيْنَ الْأَصَابِعِ عِنْدَ الْخُرُوجِ إِلَى الصَّلَاةِ

**٤٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ كَانَ فِي صَلَاةٍ حَتَّى يَرْجِعَ فَلَا يَقُلْ هَكَذَا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لە ئاڵاندن و تێکەڵکردنی پەنجەکان بە نێو یەکدی لە کاتی دەرچوون بۆ نوێژ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسم ﷺ فەرمووی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە ماڵەکەی دەستنویژی گرت پاشان هات بۆ مزگەوت ئەوە لە نوێژدایە هەتا دەگەڕێتەوە. با بەم شێوەیە نەکات، پەنجەکانی خستە نێو یەکدی.

**٤٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأْتَ ثُمَّ دَخَلْتَ الْمَسْجِدَ فَلَا تُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِكَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەعبی کوڕی عوجرەی ﷺ فەرموو: ئەگەر دەستنوێژت گرت پاشان چوویتە نێو مزگەوتەوە پەنجەکانت مەخە نێو یەکدی.

**٤٤١-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَرُوِيَ هَذَا الْخَبَرُ دَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ الْفَرَّاءُ، عَنْ سَعْدِ بْنِ إِسْحَاقِ بْنِ كَعْبِ بْنِ عَجْرَةَ عَنْ أَبِي ثُمَامَةَ وَهُوَ الْخَيَّاطُ أَنَّ كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ ﷺ حَدَّثه، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا يُشَبِّكْ بَيْنَ أَصَابِعِهِ؛ فَإِنَّهُ فِي الصَّلَاةِ»[٢].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە داودی کوڕی قەیسی فەڕاء گێڕاویەتەوە لە سەعدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی کەعبی کوڕی عوجرە لە ئەبو سومامەی خەیات، کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ بۆی باس کرد لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت پاشان چوو بۆ مزگەوت با پەنجەکانی نەخاتە نێو یەکدیی چونکە ئەو لە نوێژدایە.

**٤٤٢-** ورواه أنس بن عياض عن سعد بن إسحاق عن أبي سعيد المقبري عن أبي ثمامة قال عَنْ أَبِي ثُمَامَةَ قَالَ: لَقِيتُ كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ ﷺ وَأَنَا أُرِيدُ الْجُمُعَةَ، وَقَدْ شَبَّكْتُ بَيْنَ أَصَابِعِي، فَلَمَّا دَنَوْتُ ضَرَبَ يَدَيَّ فَفَرَّقَ بَيْنَ أَصَابِعِي، وَقَالَ: «إِنَّا نُهِينَا أَنْ يُشَبِّكَ أَحَدٌ بَيْنَ أَصَابِعِهِ فِي الصَّلَاةِ»، قُلْتُ: إِنِّي لَسْتُ فِي صَلَاةٍ قَالَ: أَلَيْسَ قَدْ تَوَضَّأْتَ وَأَنْتَ تُرِيدُ الْجُمُعَةَ؟ قُلْتُ: بَلَى قَالَ: «فَأَنْتَ فِي صَلَاةٍ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

واتە: وە ئەنەسی کوڕی عیاز گێڕاویەتەوە لە سەعدی کوڕی ئیسحاق لە ئەبو سەعیدی مەقبوری لە ئەبو یومامە دەڵێ: بۆ نوێژی هەینی دەڕۆیشتم گەیشتم بە کەعبی کوڕی عوجڕە ﷺ، پەنجەکانم خستبووە نێو یەکدی، کاتێ نزیك بوومەوە دای لە هەردوو دەستم پەنجەکانمی لە یەکدی جیا کردەوە و وتی: بەڕاستی قەدەغەمان لێ کراوە هەر یەکێك لەئێمە پەنجەکانی بخاتە نێو یەکدی لەنێو نوێژدا، وتم: خۆ من لەنێو نوێژدا نیم، وتی: ئایا تۆ دەستنوێژت نەگرتووە و بۆ نوێژی هەینی ناڕۆی؟ وتم: بەڵێ، وتی: کەواتە تۆ لە نوێژدای.

**٤٤٣-** عَنِ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سَالِمٍ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَعْدُ بْنُ إِسْحَاقَ بْنِ كَعْبٍ هُوَ مِنْ بَنِي سَالِمٍ(١).

واتە: مەقبوری دەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە نەوەکانی سالیم هەواڵی پێ داوە لە باوکی لە باپیرەیەوە لە کەعبی کوڕی عوجڕە ﷺ، هەمان فەرموودە. ئەبو بەکر دەڵێ: سەعدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی کەعب لە نەوەکانی سالیمە.

**٤٤٤-** ورواه أبو خالد الأحمر عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ كَعْبٍ ﷺ(٢).

واتە: ئەبو خالیدی ئەحمەر گێڕاویەتەوە لە ئیبنو عەجلان لە سەعید، لە کەعبەوە ﷺ، هەمان فەرموودە.

**٤٤٥-** وَجَاءَ خَالِدُ بْنُ حَيَّانَ الرَّقِّيُّ بِطَامَّةٍ رَوَاهُ عَنِ ابْنُ عَجْلَانَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، وَحَدَّثَنَاهُ جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ الثَّعْلَبِيُّ، حَدَّثَنَا خَالِدٌ يَعْنِي ابْنَ حَيَّانَ الرَّقِّيَّ(٣).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَا أُحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَرْوِيَ عَنِّي بِهَذَا الْخَبَرِ إِلَّا عَلَى هَذِهِ الصِّيغَةِ؛ فَإِنَّ هَذَا إِسْنَادٌ مَقْلُوبٌ فَيُشْبِهُ أَنْ يَكُونَ الصَّحِيحُ مَا رَوَاهُ أَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ؛ لِأَنَّ دَاوُدَ بْنَ قَيْسٍ أَسْقَطَ مِنَ الْإِسْنَادِ أَبَا سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيَّ، فَقَالَ: عَنْ سَعْدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي ثُمَامَةَ وَأَمَّا ابْنُ عَجْلَانَ فَقَدْ وَهِمَ فِي الْإِسْنَادِ وَخَلَطَ فِيهِ، فَمَرَّةً يَقُولُ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَمَرَّةً يُرْسِلُهُ، وَمَرَّةً يَقُولُ: عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ كَعْبٍ.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) إسناده ضعيف.

وَابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَدْ بَيَّنَ أَنَّ الْمَقْبُرِيَّ سَعِيدَ بْنَ أَبِي سَعِيدٍ إِنَّمَا رَوَاهُ عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سَالِمٍ، وَهُوَ عِنْدِي سَعْدُ بْنُ إِسْحَاقَ إِلَّا أَنَّهُ غَلَطَ عَلَى سَعْدِ بْنِ إِسْحَاقَ فَقَالَ: عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ كَعْبٍ. وَدَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ، وَأَنَسُ بْنُ عِيَاضٍ جَمِيعًا قَدِ اتَّفَقَا عَلَى أَنَّ الْخَبَرَ إِنَّمَا هُوَ عَنْ أَبِي ثُمَامَةَ.

واتە: خالیدی کوڕی حەیانی ڕەقی بە کارەساتێکەوە هات، گێڕایەوە لە ئیبنو عەجلان لە سەعیدی کوڕی موسەیب لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ، لە کاتێکدا جەعفەری کوڕی موحەممەی سەعلەبی بۆمانی باس کرد، وتی: خالیدی کوڕی حەیانی ڕەقی بۆی باس کردین.

ئەبو بەکر دەڵێ: بە دروستی نازانم هیچ کەسێك ئەم فەرموودەیە لە منەوە بگێڕێتەوە بەم شێوەیە نەبێت، چونکە ئەوە زنجیرە و سەنەدێکی هەڵگێڕدراوەیە، پێ دەچێت ئەوەی ڕاستە ئەمە بێت کە ئەنەسی کوڕی عیاز گێڕاویەتەوە، (فەرموودەی ژمارە ٤٤٢)، چونکە داودی کوڕی قەیس لە سەنەدەکەدا ئەبو سەعیدی مەقبوری پەڕاندووە، وتوویەتی: لە سەعدی کوڕی ئیسحاق لە ئەبو سومامەوە، (فەرموودەی ژمارە ٤٤١)، بەڵام ئیبنو عەجلان لە سەنەدەکەدا هەڵەی کردووە و تێکەڵی کردووە، جارێك دەڵێ: لە ئەبو هورەیرەوە (فەرموودەی ژمارە ٤٤٠)، (جارێکیش بە (مُرسَل)ی دەیهێنێ، جارێکیش دەڵێ: لە سەعید لە کەعب (فەرموودەی ژمارە ٤٤٤). ئیبنو ئەبو زیئب ڕوونی کردۆتەوە مەقبوری ناوی سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدە، فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە لە پیاوێك لە نەوەکانی سالیم (فەرموودەی ژمارە ٤٤٣)، ئەو پیاوە لای من سەعدی کوڕی ئیسحاقە، بەڵام ئەبو سەعید هەڵەی کردووە لە سەعدی کوڕی ئیسحاق وتوویەتی: لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە کەعب. داودی کوڕی قەیس و ئەنەسی کوڕی عیاز هەموویان ڕێك کەوتوون لەسەر ئەوەی فەرموودەکە لە ئەبو سومامەوەیە.

**٤٤٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ ثُمَّ خَرَجَ يُرِيدُ الصَّلَاةَ فَهُوَ فِي صَلَاةٍ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ، وَلَا يَقُولُ: هَذَا يَعْنِي يُشَبِّكُ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژ بگرێ پاشان دەربچێت بۆ نوێژ (ی بەکۆمەڵ لە مزگەوت)، ئەوە لە نوێژدایە هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی، جا با ئاوا نەکات، واتە: پەنجەکانی خستە نێو یەکدی.

---

(١) صحيح.

**٤٤٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ كَانَ فِي صَلَاةٍ حَتَّى يَرْجِعَ، فَلَا يَقُلْ هَكَذَا، وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دەستنوێژی گرت لە ماڵەکەی، پاشان هات بۆ مزگەوت ئەوە لە نوێژدایە هەتا دەگەڕێتەوە، با ئاوا نەکات، پەنجەکانی خستە نێو یەکدی.**

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْخُرُوجِ إِلَى الصَّلَاةِ

**٤٤٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ رَقَدَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَأَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ فَخَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي لِسَانِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، وَاجْعَلْ خَلْفِي نُورًا، وَمِنْ أَمَامِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا، اللَّهُمَّ أَعْظِمْ لِي نُورًا»[٢].

## باسی نزا و پاڕانەوە لە کاتی دەرچوون بۆ مزگەوت

**واتە: عەبدوڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ خەوت، وتی: بانگدەر هات بۆ لای دواتر دەرچوو بۆ نوێژ و دەیفەرموو: خوایە ڕووناکی بخەیتە نێو دڵمەوە، ڕووناکی بخەیتە سەر زمانم، ڕووناکی بخەیتە بیستنمەوە، ڕووناکی بخەیتە چاوەکانم، ڕووناکی لە پشتمیشەوە دابنێیت، ڕووناکی بخەیتە پێشمەوە، ڕووناکی بخەیتە سەرroومەوە، ڕووناکی بخەیتە خوارووومەوە، ئەی خوایە ڕووناکیم بۆ زۆر و زیاد بکەی.**

**٤٤٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[٣].

**واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: لەلای پوورم (خوشکی دایکم) مەیمونە مامەوە، دواتر باسی فەرموودەکەی کرد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ الْمَشْيِ إِلَى الْمَسَاجِدِ لِلصَّلَاةِ

**٤٥٠-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ بَيْتُهُ أَقْصَى بَيْتٍ بِالْمَدِينَةِ، وَكَانَ لَا تُخْطِئُهُ الصَّلَاةُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَوَجَّعْتُ لَهُ، فَقُلْتُ: يَا فُلَانُ لَوْ أَنَّكَ اشْتَرَيْتَ حِمَارًا يَقِيكَ الرَّمْضَاءَ وَيَرْفَعُكَ مِنَ الرُّقَعِ وَيَقِيكَ هَوَامَّ الْأَرْضِ، فَقَالَ لَهُ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنَّ بَيْتِي مُطَنَّبٌ بِبَيْتِ مُحَمَّدٍ ﷺ قَالَ: فَحَمَلْتُ بِهِ حَمْلًا حَتَّى أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ قَالَ: فَدَعَاهُ فَسَأَلَهُ وَذَكَرَ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَذَكَرَ أَنَّهُ يَرْجُو فِي أَثَرِهِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لَكَ مَا احْتَسَبْتَ»[1].

## باسی فەزڵ و پاداشتی ڕێکردن بۆ مزگەوتەکان بۆ ئەنجامدانی نوێژ

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە ئەنصارەکان ماڵی لە ئەوپەڕی شاری مەدینە بوو، نوێژی لەدەست دەرنەدەچوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش دڵم پێی سوتا و بەزەییم پێیدا هاتەوە وتم: ئەی فلانەکەس خۆزگە گوێدرێژێکت دەکڕی و دەیپاراستی لە گەرمای زەوی و سواری دەبووی بەرد بەر قاچەکانت نەدەکەوت و دەیپاراستی لە گیانەوەری زەوی، ئەویش وتی: سوێند بە خوا پێم خۆش نییە ماڵم لە تەنیشت ماڵی پێغەمبەری خواوە ﷺ بێت، وتی: ئەوە (قسە ناشرینە) لە دڵمدا بوو بە گرێ هەتا هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەم بۆی باس کرد، وتی: بانگی کرد و پرسیاری لێ کرد، ئەویش هەمان قسەی کرد، باسی ئەوەیشی کرد ئومێدی ئەوەیە بەو هەنگاوانەی پاداشت وەربگرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بێگومان چۆن حیسابت کرد و بەتەمای پاداشتی ئەوەت بۆ هەیە.

**٤٥١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَلَتِ الْبِقَاعُ حَوْلَ الْمَسْجِدِ فَأَرَادَ بَنُو سَلِمَةَ قُرْبَ الْمَسْجِدِ فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ أَرَدْتُمْ أَنْ تَحَوَّلُوا قُرْبَ الْمَسْجِدِ؟» فَقَالُوا: نَعَمْ، فَقَالَ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ دِيَارَكُمْ تُكْتَبُ آثَارُكُمْ» قَالَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[2].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: زەوی بەتاڵ هەبوو لە دەوروبەری مزگەوت، نەوەکانی سەلەمە ویستیان (ماڵ بگوازنەوە) بۆ نزیکی مزگەوت (بۆ ئەوەی ئامادەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

نوێژی بەکۆمەڵ و هەینییەکان بن) ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ئەی نەوەکانی سەلەمە ئایا ئێوە دەتانەوێ ماڵتان بگوازنەوە بۆ نزیك مزگەوت؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەی نەوەکانی سەلەمە، لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، لەبری هەموو هەنگاوەکانتان پاداشت وەردەگرن، سێ جار ئەوەی فەرموو.

## بَابُ السَّلَامِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَمَسْأَلَةِ اللَّهِ فَتْحَ أَبْوَابِ الرَّحْمَةِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ

**٤٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»(١).

## باسی سڵاوکردن لە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی چوونە نێو مزگەوت، وە داواکردن لە خوا دەرگاکانی ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی بکاتەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە چووە نێو مزگەوتەوە با سڵاو بکات لە پێغەمبەر ﷺ، وە با بڵێت: خوایە دەرگاکانی میهرەبانی خۆتم بۆ بکەرەوە، وە ئەگەر دەرچوو با سڵاو بکات لە پێغەمبەر ﷺ و بڵێت: خوایە بمپارێزی لە شەیتانی ڕەجم کراو.

## بَابُ الْقَوْلِ عِنْدَ الِانْتِهَاءِ إِلَى الصَّفِّ قَبْلَ تَكْبِيرَةِ الِافْتِتَاحِ

**٤٥٣-** عَن سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى الصَّلَاةِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِنَا فَقَالَ حِينَ انْتَهَى إِلَى الصَّفِّ: اللَّهُمَّ ائْتِنِي أَفْضَلَ مَا تُؤْتِي عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ قَالَ: «مَنِ الْمُتَكَلِّمُ آنِفًا؟» قَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذًا تَعْقِرُ جَوَادَكَ وَتُسْتَشْهَدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»(٢).

---

(١) هذا حديث معلول.

(٢) إسناده ضعيف.

## باسی ئەوەی دەوترێ لە کاتی گەیشتن بە کۆتایی ڕیز، پێش تەکبیرکردنی چوونە نێو نوێژ

واتە: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هات بۆ نوێژ، پێغەمبەریش ﷺ نوێژی بۆ دەکردین، کاتێ گەیشتە لای ڕیزەکە وتی: ئەی خوایە پێم ببەخشە چاکترینی ئەوەی دەیبەخشی بە بەندە چاکەکانت، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: ئەوە کێ بوو کەمێك پێش ئێستا قسەی کرد؟ پیاوەکە وتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەواتە ئەسپەکەت لە گۆڕەپانی جیهادا دەکوژرێ و خۆیشت شەهید دەکرێیت لە ڕێگای خوادا.

## بَابُ إِيجَابِ اسْتِقْبَالِ الْقِبْلَةِ لِلصَّلَاةِ

٤٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ الْوُضُوءَ، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ»، وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ[1].

## باسی واجببوونی ڕووکردنە قیبلە بۆ نوێژکردن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك چووە نێو مزگەوتەوە نوێژی کرد، پاشان هات سڵاوی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، دواتر فەرموودەکەی باس کرد. وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر هەستای بۆ نوێژ بەچاکی دەستنوێژ بگرە، پاشان ڕوو بکە قیبلە و تەکبیر بکە. فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

## بَابُ إِحْدَاثِ النِّيَّةِ عِنْدَ دُخُولِ كُلِّ صَلَاةٍ يُرِيدُهَا الْمَرْءُ فَيَنْوِيهَا بِعَيْنِهَا فَرِيضَةً كَانَتْ أَوْ نَافِلَةً، إِذِ الْأَعْمَالُ إِنَّمَا تَكُونُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا يَكُونُ لِلْمَرْءِ مَا يَنْوِي بِحُكْمِ النَّبِيِّ الْمُصْطَفَى ﷺ

---

(١) صحيح.

٤٥٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ» زَادَ يَحْيَى بْنِ حَبِيبٍ: «وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى»[١].

## باسی دەستپێکردنی نییەتهێنان کاتێ بەندە بیەوێ بچێتە نێو هەر نوێژێکەوە فەرز بێت یان سوننەت، چونکە کردەوەکان تەنها بەپێی نییەت و مەبەستن، مرۆڤیش بەپێی نییەتەکەیەتی، بەگوێرەی بڕیاری پێغەمبەر ﷺ

واتە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: کردەوەکان تەنها بەپێی نیاز و مەبەستن، بێگومان هەموو کەسێك بەپێی نیاز و مەبەستی خۆیەتی.

## بَابُ الْبَدْءِ بِرَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ قَبْلَ التَّكْبِيرِ

٤٥٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِﷺ إِذَا قَامَ لِلصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا بِحَذْوِ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَلَا يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ»[٢].

## باسی دەستپێکردن بە بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی چوونە نێو نوێژ پێش تەکبیرکردن (الله أكبر)

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی دابەستایە دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا ئاستی هەردوو سەرشانی، پاشان (الله أكبر)ی دەکرد ئەگەر بیویستایە بچێتە ڕکووع، بەهەمان شێوە (دەستەکانی بەرز) دەکردەوە، ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع بەهەمان شێوە (دەستەکانی بەرز) دەکردەوە، بەڵام کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە لە سوژدە ئەوەی نەدەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي رَفْعِ الْيَدَيْنِ تَحْتَ الثِّيَابِ فِي الْبَرْدِ وَتَرْكِ إِخْرَاجِهِمَا مِنَ الثِّيَابِ عِنْدَ رَفْعِهِمَا

**٤٥٧-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابِهِ فَرَأَيْتُهُمْ يَرْفَعُونَ أَيْدِيَهُمْ فِي الْبَرَانِسِ(١).

### باسی مۆڵەتدان بە بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لەژێر جلەوە لە کاتی سەرما، وە وازهێنان لە دەرکردنیان لەنێو جلوبەرگ لە کاتی بەرزکردنەوەیان

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانی نوێژم کرد بینیمن دەستیان لەژێر جلەکانەوە بەرز دەکردەوە.

## بَابُ نَشْرِ الْأَصَابِعِ عِنْدَ رَفْعِ الْيَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ

**٤٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَنْشُرُ أَصَابِعَهُ فِي الصَّلَاةِ نَشْراً»(٢).

### باسی بڵاوکردنەوەی پەنجەکان لە کاتی بەرزکردنەوەی دەست لە نوێژدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەکانی بڵاو دەکردەوە لەنێو نوێژدا.

**٤٥٩-** عَنْ أَبِي عَامِرٍ حَدَّثَنَا ابن أَبِي ذِئب، عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَمْعَانَ قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ مَسْجِدَ بَنِي زُرَيْقٍ قَالَ: ثَلَاثٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ بِهِنَّ، تَرَكَهُنَّ النَّاسُ، كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ قَالَ: هَكَذَا، وَأَشَارَ أَبُو عَامِرٍ بِيَدِهِ وَلَمْ يُفَرِّجْ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَلَمْ يَضُمَّهَا، وَقَالَ: هَكَذَا أَرَانَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حديث معلول.

(٣) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَأَشَارَ لَنَا يَحْيَى بْنُ حَكِيمٍ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ تَفْرِيجًا لَيْسَ بِالْوَاسِعِ، وَلَمْ يَضُمَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، وَلَا بَاعَدَ بَيْنَهُمَا، رَفَعَ يَدَيْهِ فَوْقَ رَأْسِهِ مَدًّا، وَكَانَ يَقِفُ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ هُنَيَّةً يَسْأَلُ اللَّهَ تَعَالَى مِنْ فَضْلِهِ، وَكَانَ يُكَبِّرُ فِي الصَّلَاةِ كُلَّمَا سَجَدَ وَرَفَعَ.

واتە: ئەبو عامر دەگێڕێتەوە، ئیبنو ئەبو زیئب بۆی باس کردین، سەعیدی کوڕی سەمعان دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ هات بۆ لامان لە مزگەوتی (بَنو وُرَيْق) وتی: سێ شت پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد، بەڵام خەڵکی وازیان لێی هێناوە، کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ (دەستەکانی بەرز دەکردەوە) بەم شێوەی دەکرد. ئەبو عامر بە دەستی ئاماژەی کرد بە پەنجەکانی دەستی نە تەواو بڵاوی کردەوە نە گەیاندنیە یەکدی، وتی: بەم شێوەیە ئیبنو ئەبو زیئب پێی نیشان داین.

ئەبو بەکر دەڵێ: یەحیای کوڕی حەکیم ئاماژەی بۆ کردین پەنجەکانی بڵاو کردەوە زۆر بڵاوی نەکردەوە، هەروەها پەنجەکانی تەواو نەگەیاندن بە یەکدی، لە یەکدیش دووری نەخستنەوە، دەستەکانی بەرز کردەوە لە سەرووی سەریەوە بەدرێژکردن. ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ پێش قورئانخوێندن ئەندازەیەکی کەم دەوەستا داوای فەزڵ و بەخششی لە خوا دەکرد، هەروەها هەر کات سوژدەی ببردایە و سەری بەرز بکردایەتەوە لە نوێژدا تەکبیری دەکرد.

٤٦٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَمْعَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ قَالَ: «رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا وَلَمْ يُشَبِّكَا»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی سەمعان دەگێڕێتەوە، لە ئەبو هورەیرە ﷺ، فەرموودەکەی باس کرد، وتی: هەردوو دەستی بەرز کردەوە و درێژی کردن و بڵاوی نەکردنەوە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ لِافْتِتَاحِ الصَّلَاةِ

٤٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثًا مِرَارٍ»،

---

(١) صحيح.

فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَعْلَمُ غَيْرَ هَذَا، فَقَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ بِمَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا، وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا»[١].

## باسی تەکبیرکردن (الله أكبر) بۆ دەستپێکردنی نوێژ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو مزگەوتەوە و پیاوێکیش هاتە ژوورەوە نوێژی کرد، پاشان سڵاوی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش وەڵامی دایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە، هەتا سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، پیاوەکە وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەحەق ناردووە لەمە زیاتر نازانم، فەرمووی: ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ (الله أكبر) بکە، پاشان چەندە ئەزانی لە قورئان بخوێنە، پاشان ڕکووع ببە ئارام بگرە هەتا دڵنیا دەبیت ڕکووعت بردووە، پاشان هەستەوە هەتا بەتەواوی ڕێك دەبیتەوە، پاشان سوژدە ببە ئارام بگرە هەتا دڵنیا دەبیت سوژدەت بردووە، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە و ئارام بگرە هەتا دڵنیا دەبیت دانیشتووی، وە لە هەموو نوێژەکەتدا بەو شێوەیە بکە.

## بَابُ ذِكْرِ الدُّعَاءِ بَيْنَ تَكْبِيرَةِ الِافْتِتَاحِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ

**٤٦٢-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ، ثُمَّ قَالَ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ: ﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾ الأنعام، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلَكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي، وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لَا يَصْرِفُ سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ، لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی پاڕانەوە لە نێوان تەکبیر (الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ و نێوان خوێندنی قوڕئان

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی بکردایە بە نوێژی فەرز تەکبیری دەکرد، پاشان دەیفەرموو: ڕووم کردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە بەنییەت و مەبەستێکی پاك لام دا بەلای ئایینی حەقدا و لە هاوبەشدانەران نیم: ﴿إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾، واتە: بەڕاستی نوێژ و سەربڕین و ژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانییانە هیچ هاوبەشێکی نییە، بەوە فەرمانم پێ کراوە من لە یەکەمینی موسوڵمانانم. خوایە تۆ پاشای خاوەنی هەموو شتێکی هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە تۆ، تۆ پەروەردگارمی و من بەندەی تۆم ستەمم لە نەفسی خۆم کرد و دانم نا بە گوناهمدا، دەی خوایە لە هەموو تاوانەکانم خۆش بە، کەس لە گوناهەکان خۆش نابێت جگە لە تۆ، وە ڕێنمایيم بکە بۆ لای چاکترینی ڕەوشتەکان، کەس ڕێنمایی ناکات بۆ چاکترین ڕەوشت جگە لە تۆ، کردەوە خراپەکانم لێ دوور بخەرەوە، کەس کرداری خراپم لێ دوور ناخاتەوە جگە لە تۆ، (لَبَّيْكَ) (وشەیەکە بۆ وەڵامدانەوەی بانگکەرێك بەکار دەهێنرێت)، واتە: خوایە بەردەوامم لەسەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانت، (سَعْدَيْكَ) (وشەیەکە لەگەڵ (لَبَّيْكَ) بەکار دێت بە مانای نزیکی دێت) واتە: گوێڕایەڵی لەدوای گوێڕایەڵی و جێبەجێکاری فەرمانەکانتم، چاکە هەمووی بە دەستی تۆیە، شەڕ و خراپە لەو شتانە نییە کە مرۆڤ پێی نزیك ببێتەوە لە تۆ، من خۆم پەنا دەدەمە لای تۆ، گەورەیی و بەرزی و بڵندی بۆ تۆ، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ.

**٤٦٣**- عَنِ الْأَعْرَجِ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ[(١)].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ «وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ»: أَيْ لَيْسَ مِمَّا يُتَقَرَّبُ بِهِ إِلَيْكَ.

واتە: ئەعرەجیش بەم سەنەدە هێناویەتی وەکوو ئەو فەرمووده. ئەبو بەکر دەڵێ: (وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ): واتە: شەڕ و خراپە لەو شتانە نییە کە مرۆڤ پێی نزیك ببێتەوە لە تۆ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ بَيَانِ إِغْفَالِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الدُّعَاءَ بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ غَيْرُ جَائِزٍ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَهَذَا الْقَوْلُ خِلَافُ سُنَنِ النَّبِيِّ ﷺ الثَّابِتَةِ، قَدْ دَعَا النَّبِيُّ ﷺ فِي أَوَّلِ صَلَاتِهِ وَوَسَطِهَا وَآخِرِهَا بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ

٤٦٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ، وَيَقُولُ حِينَ يَفْتَتِحُ الصَّلَاةَ بَعْدَ التَّكْبِيرِ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ»، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ وَقَالَ: «وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ»، وَلَمْ يَذْكُرَا وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الْأَخْلَاقِ لَا يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلَّا أَنْتَ، وَلَا وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لَا يَصْرِفُ سَيِّئَهَا إِلَّا أَنْتَ[١].

## باسی ڕوونکردنەوە سەبارەت بە بێئاگایی ئەو کەسەی پێی وایە دوعا و پاڕانەوە بێجگە لە دوعا قورئانییەکان لەنێو نوێژی فەرز دروست نییە، ئەم وتەیە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، بێگومان پێغەمبەر ﷺ نزای کردووە لە سەرەتای نوێژەکەی و نێوەڕاستی و کۆتایی بەوەی لە قورئاندا نییە

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژی فەرز تەکبیری دەکرد، وە کاتێ دەستی بکردایە بە نوێژ دوای تەکبیر (الله أكبر) دەیفەرموو: ڕووم کردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، فەرمووی: من لە موسوڵمانانم، (ڕەبیعی کوڕی سولەیمان و بەحری کوڕی نەصری کوڕی سابق کە فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە) باسی ئەم دەستەواژەیان نەکرد: وە ڕێنمایی‌یم بکە بۆ لای چاکترینی ڕەوشتەکان، کەس ڕێنمایی ناکات بۆ چاکترین ڕەوشت جگە لە تۆ، وە کردەوە خراپەکانم لێ دوور بخەرەوە، کەس کرداری خراپم لێ دوور ناخاتەوە جگە لە تۆ.

## بَابُ إِبَاحَةِ الدُّعَاءِ بَعْدَ التَّكْبِيرِ وَقَبْلَ الْقِرَاءَةِ بِغَيْرِ مَا ذَكَرْنَا فِي خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ هَذَا الِاخْتِلَافَ فِي الِافْتِتَاحِ مِنْ جِهَةِ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، جَائِزٌ لِلْمُصَلِّي أَنْ يَفْتَتِحَ بِكُلِّ مَا ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ بِهِ بَعْدَ التَّكْبِيرِ مِنْ حَمْدٍ وَثَنَاءٍ عَلَى اللَّهِ ﷻ وَدُعَاءٍ مِمَّا هُوَ فِي الْقُرْآنِ وَمِمَّا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ مِنَ الدُّعَاءِ

---

(١) صحيح.

٤٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ سَكَتَ هُنَيَّةً، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، بِأَبِي وَأُمِّي مَا تَقُولُ فِي سُكُوتِكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ؟ قَالَ: أَقُولُ: اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ[١].

**باسی ڕێگەدان بە پاڕانەوە دوای تەکبیر (الله أکبر) کردنی (نوێژ دابەستن) و پێش خوێندنی سوڕەتی فاتیحە، بە جگە لەو پاڕانەوەی باسمان کرد کە لە فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ هاتووە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئەم جیاوازییە دەربارەی نزای دەستپێکردن لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراوە، دروستە بۆ نوێژخوێن نوێژ دەست پێ بکات بە هەموو ئەو پاڕانەوانەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بەصەحیحی هاتوون، ئەو نوێژەی دەست پێ کرد دوای تەکبیر (الله أکبر) بەستاییش و پیاهەڵدانی خوا ﷻ، هەروەها نزایەك لە قوڕئاندا هاتبێت و نزایەکیش لە قوڕئاندا نەهاتبێت**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر تەکبیری نوێژی بکردایە، (لە نێوان (الله أکبر)ی دابەستنی نوێژ و لە نێوان قوڕئانخوێندندا) کەمێك بێدەنگ دەبوو، وتم: باوك و دایکم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی بێدەنگبوونت (لە نێوان (الله أکبر)ی دابەستنی نوێژ و لە نێوان قوڕئانخوێندندا) چی ئەڵێیت؟ فەرمووی: ئەڵێم: خوایە نێوانی من و هەڵەکانم دوور بخەرەوە، وەکوو چۆن نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستووەتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە هەڵەکانم وەکوو چۆن جلی سپی پاك دەکرێتەوە لە پیسی، خوایە بمشۆرە لە هەڵەکان بە ئاو و بەفر و تەرزە.

٤٦٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا جَاءَ وَقَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاتَهُ قَالَ: «أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِالْكَلِمَاتِ؟» فَأَرَمَّ الْقَوْمُ، فَقَالَ: «أَيُّكُمُ الْمُتَكَلِّمُ بِالْكَلِمَاتِ فَإِنَّهُ لَمْ يَقُلْ بَأْسًا؟» فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، جِئْتُ وَقَدْ حَفَزَنِي النَّفَسُ فَقُلْتُهُنَّ، فَقَالَ: «لَقَدْ رَأَيْتُ اثْنَيْ عَشَرَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَرْفَعُهَا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَدْ رُوِيَتْ أَخْبَارٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي افْتِتَاحِهِ صَلَاةَ اللَّيْلِ بِدَعَوَاتٍ مُخْتَلِفَةِ الْأَلْفَاظِ، قَدْ خَرَّجْتُهَا فِي أَبْوَابِ صَلَاةِ اللَّيْلِ، أَمَّا مَا يَفْتَتِحُ بِهِ الْعَامَّةُ صَلَاتَهُمْ بِخُرَاسَانَ مِنْ قَوْلِهِمْ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ، فَلَا نَعْلَمُ فِي هَذَا خَبَرًا ثَابِتًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ أَهْلِ الْمَعْرِفَةِ بِالْحَدِيثِ، وَأَحْسَنُ إِسْنَادٍ نَعْلَمُهُ رُوِيَ فِي هَذَا خَبَرُ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ.

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ دەکردن)، لەناکاو پیاوێك هات هەناسەسوار بوو، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ)، (واتە: خوای مەزن گەورەترە لە هەموو شتێ، سوپاس و ستاییش بۆ خوای گەورە ستاییشێکی زۆری پاکی پیرۆز)، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بۆیەوە فەرمووی: کامەتان ئەو وشانەی درکاند؟ خەڵکەکە بێدەنگ بوون. فەرمووی: کامەتان ئەو وشانەی درکاند چونکە ئەو شتێکی خراپی نەوتووە؟ پیاوەکە وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاتم بەهۆی پەلەکردنەوە هەناسەسوار بووم ئەوەم وت، فەرمووی: بێگومان دوازدە فریشتەم بینی دەستپێشخەرییان دەکرد کامەیان زووتر بەرزی بکاتەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: چەندین فەرموودە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بە دەستەواژەی جیاواز دەربارەی دەستپێکردنی نوێژ لە شەونوێژدا، لە بەشەکانی شەونوێژ تەخریجم کردووە و دەرمهێناوە، بەڵام ئەوەی بەگشتی نوێژی پێ دەست پێ دەکەن لە ناوچەی خوڕاسان ئەمەیە: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ)، لەمەدا فەرموودەیەکی جێگیر بەدی ناکەم لەلای ئەوانەی شارەزای زانستی فەرموودەن، چاکترین سەنەدیش زانیبێتمان لەمەدا فەرموودەی ئەبو موتەوەکیلە لە ئەبو سەعیدەوە.

**٤٦٧-** عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ النَّاجِيِّ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ إِلَى الصَّلَاةِ كَبَّرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ» ثُمَّ يَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُ أَكْبَرُ» ثَلَاثًا، ثُمَّ يَقُولُ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ»، ثُمَّ يَقْرَأُ[1].

---

(١) إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو موتەوەکیلی ناجی دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ شەو هەڵدەستا بۆ نوێژکردن، سێ جار (الله أکبر)ی دەکرد پاشان دەیفەرموو: خوایە پاکی و بێگەردی و ستاییش هەر بۆ تۆیە، وە ناوی تۆ گەورە و پیرۆزە و فەڕ و بەرەکەتی زۆر فراوانە و گەورەییت بەرز و بڵندە، هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە جگە لە تۆ، پاشان سێ جار دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك بەحەق نییە جگە لە خوا، پاشان سێ جار دەیفەرموو: (اللَّهُ أَكْبَرُ) پاشان دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە خوای بیسەری زۆر زانا لە شەیتانی ڕەجمکراو لەوەی تووشی فێ و شێتی و لووتبەرزی و شیعری خراپ و قەدەغە کراوم بکات، پاشان قورئانی دەخوێند.

**٤٦٨-** وَقَدْ رُوِيَ عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا» ثَلَاثَ مِرَارٍ، الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا ثَلَاثَ مِرَارٍ، سُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ثَلَاثَ مِرَارٍ «، ثُمَّ يَتَعَوَّذُ بِشَبِيهٍ مِنَ التَّعَوُّذِ الَّذِي فِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ، إِلَّا أَنَّهُمْ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي إِسْنَادِ خَبَرِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ[1].

واتە: لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ نوێژی دەست پێ بکردایە سێ جار دەیفەرموو: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا)، سێ جاریش (الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا)، سێ جاریش: (سُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا)، پاشان پەنای دەگرت بە هاوشێوەی ئەو پەناگرتنەی کە لە فەرموودەی ئەبو سەعید هاتووە، ئەوە نەبێ ئەوان جیاوازییان هەیە لە سەنەدی فەرموودەکەی جوبەیری کوڕی موتعیم.

**٤٦٩-** وَرَوَاهُ حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ فَقَالَ: عَنْ عَبَّادِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ.[2]

واتە: وە ئەم فەرموودەیە حوصەینی کوڕی عەبدوڕەحمان گێڕاویەتەوە، لە عەمری کوڕی مورەوە وتی: لە عوبادی کوڕی عاصم لە نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ ئەویش لە باوکیەوە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

**٤٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺإِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ فَكَبَّرَ، ثُمَّ يَقُولُ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»[١].

**واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی دەست پێ بکردایە دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا ئاستی هەردوو شانی ئینجا (الله أکبر)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: خوایە پاکی و بێگەردی و ستاییش هەر بۆ تۆیە، وە ناوی تۆ گەورە و پیرۆزە و فەڕ و بەرەکەتی زۆر فراوانە و گەورەییت بەرز و بڵندە، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ.**

**٤٧١-** حَدَّثَنَاهُ مُؤَمَّلُ بْنُ هِشَامٍ، وَسَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ قَالَا: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ قَالَ مُؤَمَّلٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَارِثَةُ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَقَالَ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ: عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُحَمَّدٍ، غَيْرُ أَنَّ سَلْمًا لَمْ يَقُلْ: فَكَبَّرَ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَحَارِثَةُ بْنُ مُحَمَّدٍ رَحِمَهُ اللَّهُ، لَيْسَ مِمَّنْ يَحْتَجُّ أَهْلُ الْحَدِيثِ بِحَدِيثِهِ، وَهَذَا صَحِيحٌ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ أَنَّهُ كَانَ يَسْتَفْتِحُ الصَّلَاةَ مِثْلَ حَدِيثِ حَارِثَةَ، لَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَسْتُ أَكْرَهُ الِافْتِتَاحَ بِقَوْلِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ عَلَى مَا ثَبَتَ عَنِ الْفَارُوقِ ﵁ أَنَّهُ كَانَ يَسْتَفْتِحُ الصَّلَاةَ، غَيْرُ أَنَّ الِافْتِتَاحَ بِمَا ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَغَيْرِهِمَا ﵄ بِنَقْلِ الْعَدْلِ عَنِ الْعَدْلِ مَوْصُولًا إِلَيْهِ ﷺ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَأَوْلَى بِالِاسْتِعْمَالِ إِذِ اتِّبَاعُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ أَفْضَلُ وَخَيْرٌ مِنْ غَيْرِهَا.

**واتە: موئەمیلی کوڕی هیشام و سەلمی کوڕی جونادە هەمان فەرموودەیان بۆ باس کردین، وتیان: ئەبو موعاویە بۆی باس کردین وتی: موئەمیل وتی: حاریسەی کوڕی موحەممەد بۆی باس کردین، سەلمی کوڕی جونادەش وتی: لە حاریسەی کوڕی موحەممەدەوە، ئەوە نەبێ سەلم نەیوت: (الله أکبر)ی کرد.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: حاریسەی کوڕی موحەممەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەوانە نییە کە شارەزایانی فەرموودە فەرموودەیان لێ وەرگرتبێت، ئەوەش بەسەنەدی ڕاست و دروست هاتووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە ﵁ بێگومان ئەو بەو پاڕانەوە نوێژی دەست پێ دەکرد، هەروەك لە فەرموودەکەی حاریسەدا هاتووە، نەك لە پێغەمبەرەوە**

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) ذكره المؤلف معلقا.

ﷺ، من پێم ناخۆش نییه نوێژ دەست پێ بكەم بە وتەی: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ)، لەوەی جێگیر بووە لە فاڕوقەوە رضي الله عنه كە ئەو نوێژی بەو شێوەیە دەست پێ دەكرد، ئەوە نەبێ دەستپێكردنی نوێژ جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە فەرموودەی عەلی كوڕی ئەبو تالیب (فەرموودەی ٤٦٤) و ئەبو هورەیرە (فەرموودەی ٤٦٥) و جگە لە ئەوانیش رضي الله عنهم، بەگواستنەوەی كەسی دادپەروەر لە دادپەروەرەوە بە زنجیرەیەك گەیەنراوە بە پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەوەم پێم باشترە، وە لە پێشترە بە بەكارهێنان، چونكە شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ چاكتر و خێرترە لە سوننەتی دیكە.

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ فِي الصَّلَاةِ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: [فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ]النحل: ٩٨.

٤٧٢- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ وَنَفْخِهِ وَهَمْزِهِ وَنَفْثِهِ» قَالَ: وَهَمْزِهِ الْمُوتَةُ، وَنَفْثِهِ الشِّعْرُ، وَنَفْخِهِ الْكِبْرِيَاءُ [(١)]

## باسی پەناگرتن لە نوێژدا پێش قورئانخوێندن، خوا تعالى فەرموویەتی: كاتێ ویستت قورئان بخوێنی، پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەركراو لە بەزەیی خوا

واتە: ئیبنو مەسعود رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شەیتان: لەوەی تووشی فێ و شێتی و لووتبەرزی و شیعری خراپ و قەدەغە كراوم بكات. وتی: (هَمْزُهُ) فێ و شێتی، وە (نَفْثُهُ) شیعرە، وە (نَفْخُهُ) لووتبەرزییە.

## بَابُ ذِكْرِ سُؤَالِ الْعَبْدِ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ فَضْلِهِ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الدُّعَاءَ بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ يُفْسِدُ صَلَاةَ الْفَرِيضَةِ

٤٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: «ثَلَاثٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُنَّ، تَرَكَهُنَّ النَّاسُ، كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا، وَكَانَ يَقِفُ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ هُنَيَّةً يَسْأَلُ اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ، وَكَانَ يُكَبِّرُ كُلَّمَا خَفَضَ وَرَفَعَ»[(٢)].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**باسی داواکردنی بەندە لە پەروەردگاری لە فەزڵ و بەخششی لە نێوان (الله أکبر)ی دابەستنی نوێژ و قورئانخوێندن لە نوێژە فەرزەکان، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وا بووە پاڕانەوە بەوەی کە لە قورئاندا نییە نوێژی فەرز تێک دەدات**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سێ شت هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی دەدا خەڵکی وازیان لێ هێناوە: (پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر هەستابایە بۆ نوێژ هەردوو دەستی بەتەواوی بەرز دەکردەوە، وە ماوەیەکی کەم بێدەنگ دەبوو پێش قورئانخوێندن داوای فەزڵ و چاکەی لە خوا دەکرد، وە (الله أکبر)ی دەکرد لەنێو نوێژدا هەرکاتێ بچەمابایەوە و بەرز ببووایەتەوە. (جگە لە بەرزبوونەوە لە ڕکووع نەبێت).

**بَابُ الْأَمْرِ بِالْخُشُوعِ فِي الصَّلَاةِ، إِذِ الْمُصَلِّي يُنَاجِي رَبَّهُ، وَالْمُنَاجِي رَبَّهُ يَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يُفَرِّغَ قَلْبَهُ لِمُنَاجَاةِ خَالِقِهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلَا يَشْغَلَ قَلْبَهُ التَّعَلُّقُ بِشَيْءٍ مِنْ أُمُورِ الدُّنْيَا يَشْغَلُهُ عَنْ مُنَاجَاةِ خَالِقِهِ**

**٤٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺالظُّهْرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ نَادَى رَجُلًا كَانَ فِي آخِرِ الصُّفُوفِ، فَقَالَ: «يَا فُلَانُ، أَلَا تَتَّقِي اللَّهَ أَلَا تَنْظُرُ كَيْفَ تُصَلِّي؟ إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي إِنَّمَا يَقُومُ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلْيَنْظُرْ كَيْفَ يُنَاجِيهِ، إِنَّكُمْ تَرَوْنَ أَنِّي لَا أَرَاكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ لَأَرَى مِنْ خَلْفِ ظَهْرِي كَمَا أَرَى مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ»[١].

**باسی فەرمانکردن بە ملکەچبوون لە نوێژدا، چونکە نوێژخوێن گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاری دەکات، ئەو کەسەشی گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاری دەکات پێویستە دڵی تەرخان بکات بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دروستکەرەکەی ﷻ، دڵی سەرقاڵ نەکات بەپەیوەستبوون بە شتێکەوە لە کاروباری دنیا، بەڵکوو سەرقاڵی بکات لە گفتوگۆکردن لەگەڵ پەروەردگاری**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، کاتێ سەلامی دایەوە بانگی پیاوێکی کرد لە کۆتایی ڕیزەکان بوو، فەرمووی: ئەی فڵانە

---

(١) صحیح.

کەس ئایا لە خوا ناترسی؟ ئایا تەماشا ناکەی چۆن نوێژ دەکەی؟ بەڕاستی هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر هەستا بۆ نوێژ ئەوە گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاری دەکات، با تەماشا بکات چۆن گفتوگۆ دەکات، ئێوە وا دەزانن من لە پشتەوە ناتانبینم، سوێند بە خوا لە پشتەوەم دەتانبینم وەکوو چۆن لە پێشەوە دەتانبینم.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي النَّظَرِ إِلَى السَّمَاءِ فِي الصَّلَاةِ

**٤٧٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلَاتِهِمْ»، فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ حَتَّى قَالَ: «لَيَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ»[١].

### باسی هەڕەشەکردن لە تەماشاکردنی ئاسمان لەنێو نوێژدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوە چییە خەڵکانێك لەنێو نوێژەکانیاندا چاویان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان، وتەکەی توند کردەوە لەو بوارەدا هەتا فەرمووی: واز لەو کارە دەهێنن یان چاوەکانیان دەفڕێندرێن. (یەکێك لەم دووانە هەر دەبێ ببێت، یان واز دەهێنن لەو ڕەفتارە، یان خوا ﷻ چاوەکانیان کوێر دەکات، جارێکی دیکە بۆیان ناگەڕێتەوە).

**٤٧٦-** عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، حَدَّثَهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ سَوَاءً، غَيْرُ أَنَّهُ قَالَ: فَاشْتَدَّ قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ فِي ذَلِكَ[٢].

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ، بۆی باس کردن لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، ئەوە نەبێ وتی: وتەی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەوە توند بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ وَضْعِ الْيَمِينِ عَلَى الشِّمَالِ فِي الصَّلَاةِ قَبْلَ افْتِتَاحِ الْقِرَاءَةِ

**٤٧٧-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَقُلْتُ: «لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرَأَيْتُ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ فَرَفَعَ يَعْنِي يَدَيْهِ فَرَأَيْتُ إِبْهَامَيْهِ بِحِذَاءِ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ قَرَأَ» ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

## باسی دانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپ لەنێو نوێژدا پێش دەستپێکردنی قورئانخوێندن

**واتە:** وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە وتم: دەبێ تەماشای نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم بینیم کاتێ نوێژی دابەست (الله أكبر)ی کرد، دەستەکانی بەرز کردەوە بینیم هەردوو پەنجە گەورەکەی تا ئاستی هەردوو گوێی بوو، پاشان بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت، پاشان قورئانی خوێند.

**٤٧٨-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي، فَرَأَيْتُهُ حِينَ كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَأَمْسَكَهَا « ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[٢].

**واتە:** وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: من لەو کەسانە بووم کە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وتم: دەبێ تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم بزانم چۆن نوێژ دەکات، بینیم کاتێ (الله أكبر)ی کرد (نوێژی دابەست)، دەستەکانی بەرز کردەوە هەتا ئاستی هەردوو گوێی، پاشان دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا و گرتی. پاشان باسی فەرموودەکەی کرد.

**٤٧٩-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: «صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى عَلَى صَدْرِهِ» [٣].

---

(١) صحيح.

(٢) لم نقف عليه من طريق ابن فضيل، وانظر الحديث السابق، وسيأتي مكررا عند رقم (٧١٣).

(٣) زيادة: ((على صدره)) زيادة شاذة غير صحيحة شذ بها مؤمل بن اسماعيل وأخطأ بذكرها، ومؤمل قد اضطرب

واتە: وائیلی کوڕ حوجر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دانا لەسەر سینگی.

## بَابُ وَضْعِ بَطْنِ الْكَفِّ الْيُمْنَى عَلَى كَفِّ الْيُسْرَى وَالرُّسْغِ وَالسَّاعِدِ جَمِيعًا

**٤٨٠**- عن وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، قَامَ فَكَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا أُذُنَيْهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى ظَهَرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُّسْغَ وَالسَّاعِدَ[١].

## باسی دانانی نێولەپی ڕاست لەسەر بانلەپی چەپ و مەچەك و قۆڵ بەگشتی

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: وتم: دەبێ تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم بزانم چۆن نوێژ دەکات، وتی: تەماشام کرد، هەستا (الله أكبر)ی کرد (نوێژی دابەست)، دەستەکانی بەرز کردەوە هەتا ئاستی هەردوو گوێی، پاشان دەستی ڕاستی خستە سەر بانلەپی دەستی چەپی و مەچەك و قۆڵی.

## بَابٌ فِي الْخُشُوعِ فِي الصَّلَاةِ أَيْضًا، وَالزَّجْرِ عَنِ الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ إِذِ اللَّهُ ﷻ يَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنْ وَجْهِ الْمُصَلِّي إِذَا الْتَفَتَ فِي صَلَاتِهِ

**٤٨١**- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ أَبَا ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بِمِثْلِهِ[٢].

---

بهذه الزيادة فقال: ((على صدره)) كما هنا، وقال مرة:((عند صدره)) كما عند أبي الشيخ في طبقات محدثي أصبهان (٢٦٨/٢)، ومرة لم يذكرها كما عند الطحاوي في **شرح المعاني** (١٩٦/١ و ٢٥٧) وزيادة مؤمل مع شدة فرديتها واضطرابه فيها لا تصح لشدة مخالفته بها الرواة عن سفيان والرواة عن عاصم والرواة عن وائل، وقد فصلت هذه الطرق كلها في كتابي أثر اختلاف الأسانيد والمتون في **اختلاف الفقهاء** (٤٢٩-٤٣٣).

أخرجه: عبدالرزاق (٢٥٢٢) و (٢٩٤٨) و (٣٠٣٨)، وأحمد (٣١٦/٤ و ٣١٧ و ٣١٨)، والنسائي (٣٥/٣)، **وفي الكبرى** له (١١٨٧)، والطحاوي في **شرح المعاني** (١٩٦/١)، والطبراني (٧٨/٢٢ و ٨١) من طريق سفيان الثوري، عن عاصم بن كليب، به.

انظر حديث (٤٧٧). انظر: إتحاف المهرة ٦٥٩/١٣ (١٧٢٧١).

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسێك دەربارەی ملکەچبوون لەنێو نوێژدا، وە سەرزەنشتکردنی ئاوڕدانەوە لەنێو نوێژدا، چونکە خوا ﷻ ڕوو ناکاتە نوێژخوێنێك لە نوێژەکەیدا ئاوڕ بداتەوە**

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە، ئەبو زەڕ ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو.

**٤٨٢-** عَنِ ابْنِ الْمُسَيِّبِ أَنَّ أَبَا ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ اللَّهُ مُقْبِلًا عَلَى الْعَبْدِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، فَإِذَا صَرَفَ وَجْهَهُ انْصَرَفَ عَنْهُ»[1].

واتە: ئیبنو موسەیب دەگێڕێتەوە، ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خوا ﷻ ڕووی لە بەندەکەی دەکات (بەئیحسان و لێخۆشبوون لەنێو نوێژدا) کە ئاوڕ نەداتەوە، جا ئەگەر ئاوڕی دایەوە ڕووی لێ وەردەگێڕێت.

**٤٨٣-** عن الْحَارِثِ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قال: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ اللَّهَ ﷻ أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ يَفْعَلُ بِهِنَّ وَيَأْمُرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَفْعَلُوا بِهِنَّ، يُوعَظُ النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَكُمْ بِالصَّلَاةِ، فَإِذَا نَصَبْتُمْ وُجُوهَكُمْ فَلَا تَلْتَفِتُوا فَإِنَّ اللَّهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ حِينَ يُصَلِّي لَهُ، فَلَا يَصْرِفُ عَنْهُ وَجْهَهُ حَتَّى يَكُونَ الْعَبْدُ هُوَ يَنْصَرِفُ[2].

واتە: حارسی ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کرد: بەڕاستی خوا ﷻ فەرمانی کرد بە یەحیای کوڕی زەکەریا بە پێنج وشە کاریان پێ بکات و فەرمانیش بە نەوەکانی ئیسرائیل بکات کاریان پێ بکەن، ئامۆژگاری خەڵك بکرێ، پاشان فەرمووی: بێگومان خوا فەرمانی پێ کردوون نوێژ بکەن، کاتێ چوونە نێو نوێژەوە و ڕووتان تێ کرد، ئاوڕ مەدەنەوە، چونکە بەڕاستی خوا ڕوو دەکاتە بەندەکەی (بەئیحسان و لێخۆشبوون) کاتێ نوێژی بۆ دەکات، ڕووی وەرناچەرخێنێ هەتا بەندەکە ڕووی خۆی وەردەچەرخێنێ.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِالْتِفَاتَ فِي الصَّلَاةِ يَنْقُصُ الصَّلَاةَ لَا أَنَّهُ يُفْسِدُهَا فَسَادًا يَجِبُ عَلَيْهِ إِعَادَتُهَا

٤٨٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاوڕدانەوە لەنێو نوێژدا پاداشتەکەی کەم دەکاتەوە، بەڵام نوێژەکە بەجۆرێ تێک نادات پێویست بە دووبارەکردنەوەی بکات

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا، فەرمووی: بێگومان ئەوە دزینێکە شەیتان لە نوێژی بەندەدا دەیدزێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِالْتِفَاتَ الْمَنْهِيَّ عَنْهُ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي تَكُونُ صَلَاةُ الْمَرْءِ بِهِ نَاقِصَةً هُوَ أَنْ يَلْوِيَ الْمُلْتَفِتُ عُنُقَهُ، لَا أَنْ يَلْحَظَ بِعَيْنِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَلْوِيَ عُنُقَهُ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَلْوِيَ عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ

٤٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا، وَلَا يَلْوِي عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ - يَعْنِي يَلْحَظُ بِعَيْنِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاوڕدانەوەی قەدەغەکراو لە نوێژی بەندەدا ببێت نوێژەکەی پێ ناتەواو دەبێت، ئاوڕدانەوەش بریتییە لەوەی ملی بسوڕێنێتەوە، نەک چاو بسوڕێنێ بە لای ڕاست و چەپ بەبێ ئەوەی بە ملی ئاوڕ بداتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا ئاوڕی دەدایەوە بەبێ ئەوەی ملی بسوڕێنی بۆ پشتەوەی

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حديث معلول.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو نوێژەکەی ئاوڕی دەدایەوە بە لای ڕاست و چەپدا، بەڵام ملی نەدەسوڕاندەوە بۆ دواوەی. (بە پوختی ئاوڕدانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر بەرژەوەندییەکی تایبەت بووە لە گەڵ ئەوەی دڵی لە لای خوا بووە).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِالْتِفَاتَ الْمَنْهِيَّ عَنْهُ فِي الصَّلَاةِ هُوَ الِالْتِفَاتُ فِي الصَّلَاةِ فِي غَيْرِ الْوَقْتِ الَّذِي يَحْتَاجُ الْمُصَلِّي أَنْ يَعْرِفَ فِعْلَ الْمَأْمُومِينَ أَوْ بَعْضِهِمْ لِيَأْمُرَهُمْ بِفِعْلٍ أَوْ يَزْجُرَهُمْ عَنْ فِعْلٍ بِإِشَارَةٍ أَوْ إِيمَاءٍ يُفْهِمُهُمْ مَا يَأْتُونَ وَمَا يَذَرُونَ فِي صَلَوَاتِهِمْ

**٤٨٦-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ يُكَبِّرُ فَيَسْمَعُ النَّاسُ تَكْبِيرَهُ قَالَ: فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا فَرَآنَا قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «إِنْ كِدْتُمْ آنِفًا تَفْعَلُونَ فِعْلَ فَارِسَ وَالرُّومِ، يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ، فَلَا تَفْعَلُوا، ائْتَمُّوا بِأَئِمَّتِكُمْ، إِنْ صَلَّى الْإِمَامُ قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاوڕدانەوەی قەدەغە کراو لە نوێژدا، جگە لەو کاتەی کە پێویستە لەسەر پێشنوێژ بزانێ نوێژخوێنەکان یان هەندێکیان چی دەکەن، بۆ ئەوەی فەرمانیان پێ بکات بە کردەوەیەك، یان سەرزەنشتیان بکات لە کردەوەیەك بە ئاماژە تێیان بگەیەنێت لەوەی دەیکەن و ئەوەی وازی لێ دێنن لە نوێژەکانیان

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بوو لە پشتیەوە نوێژمان کرد ئەو دانیشتبوو، ئەبو بەکریش ﷺ تەکبیر (االله أکبر)ی دەکرد خەڵکەکە گوێیان لە تەکبیرکردنی بوو، وتی: لای لێ کردینەوە و تەماشای کردین وەستاوین، ئاماژەی بۆ کردین (دابنیشین) ئێمەش دانیشتین، کاتێ سەلامی دایەوە فەرمووی: خەریك بوو وەکوو ڕەفتاری فارس و ڕۆمەکان بکەن لەگەڵ پاشاکانیان، لە کاتێکدا ئەوان دانیشتبوون، وا مەکەن، پەیڕەوی پێشنوێژەکەتان بکەن، ئەگەر بەوەستانەوە نوێژی کرد بەوەستانەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن.

---

(١) صحيح.

**٤٨٧-** عن مُعَاوِيَةَ بْنِ سَلَامٍ فِي حَدِيثٍ طَوِيلٍ[١].

واتە: موعاویەی کوڕی سەلام لە فەرموودەیەکدا بەدرێژی باسی دەکات.

## بَابُ إِيجَابِ الْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَنَفْيِ الصَّلَاةِ بِغَيْرِ قِرَاءَتِهَا

**٤٨٨-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[٢].

## باسی پێویست (واجب) بوونی خوێندنی سوڕەتی فاتیحە لە نوێژدا، وە ڕەتکردنەوەی نوێژ بەبێ خوێندنی

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی ئەو کەسە تەواو نییە سوڕەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێت.

## بَابُ ذِكْرِ لَفْظَةٍ رُوِيَتْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي تَرْكِ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ بِلَفْظٍ ادَّعَتْ فِرْقَةٌ أَنَّهَا دَالَّةٌ عَلَى أَنَّ تَرْكَ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ يَنْقُصُ صَلَاةَ الْمُصَلِّي لَا تُبْطِلُ صَلَاتَهُ وَلَا يَجِبُ عَلَيْهِ إِعَادَتُهَا

**٤٨٩-** عن أَبِي السائبِ، سمع أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ، هِيَ خِدَاجٌ غَيْرَ تَامٍّ»، فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، إِنِّي أَكُونُ أَحْيَانًا وَرَاءَ الْإِمَامِ قَالَ: فَغَمَزَ ذِرَاعِي وَقَالَ: يَا فَارِسِيُّ اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ[٣].

## باسی دەستەواژەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە دەربارەی نەخوێندنی سوڕەتی فاتیحە بە دەستەواژەیەك دەستەیەك بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وازهێنان لە خوێندنی سوڕەتی فاتیحە، نوێژی نوێژخوێن کەموکورت دەکات، نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە و پێویست نییە لەسەری دووبارەی بکاتەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەبو سائیب دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژێك بکات سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، تەواو نییە، وتم: ئەی ئەبو هورەیرە ﷺ من هەندێ جار لەپشت پێشنوێژەوەم، وتی: قۆڵی گرتم و فەرمووی: ئەی فارسی بۆ خۆت بیخوێنە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْخِدَاجَ الَّذِي أَعْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ فِي هَذَا الْخَبَرِ هُوَ النَّقْصُ الَّذِي لَا تُجْزِئُ الصَّلَاةُ مَعَهُ، إِذِ النَّقْصُ فِي الصَّلَاةِ يَكُونُ نَقْصَيْنِ، أَحَدُهُمَا لَا تُجْزِئُ الصَّلَاةُ مَعَ ذَلِكَ النَّقْصِ، وَالْآخَرُ تَكُونُ الصَّلَاةُ جَائِزَةً مَعَ ذَلِكَ النَّقْصِ لَا يَجِبُ إِعَادَتُهَا، وَلَيْسَ هَذَا النَّقْصُ مِمَّا يُوجِبُ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ مَعَ جَوَازِ الصَّلَاةِ

٤٩٠- عَنْ العلاءِ بنِ عبدِ الرحمنِ، عن أبيهِ، عن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يَقْرَأُ فِيهَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ» قُلْتُ: فَإِنْ كُنْتُ خَلْفَ الْإِمَامِ، فَأَخَذَ بِيَدِي، وَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ يَا فَارِسِيُّ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی (الْخِدَاجَ) کە پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودە باسی کردوە بریتییە لەو کەموکوڕی و ناتەواوییەی (النَّقْص) نوێژ بەبێ خوێندنی دروست نییە، چونکە کەموکوڕی لە نوێژدا دوو کەموکوڕییە، یەکەمیان: نوێژ لەگەڵ ئەو کەموکوڕی ناتەواوییە دروست نییە، ئەوی دیکەیان نوێژ لەگەڵ ئەو کەموکوڕییە دروستە و پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات، جا ئەم کەموکوڕی و ناتەواوییە لەو جۆرە نییە کە دوو سوژدەی سەهوو پێویست دەکات لەگەڵ ئەوەی نوێژەکە دروست بێت

واتە: ئەبو عەلائی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ دروست نییە سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنرێ، وتم: ئەگەر من لەپشت پێشنوێژەوە بووم نوێژم دەکرد؟ دەستمی گرت و وتی: ئەی فارسی بۆ خۆت بیخوێنە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ افْتِتَاحِ الْقِرَاءَةِ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾

٤٩١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ ﷺ كَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾[1].

## باسی دەستپێکردنی قورئانخوێندن لە نوێژ بە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﷺ بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾، دەستیان بە قورئانخوێندنی نوێژ دەکرد.

٤٩٢- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ ﷺ كَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان ﷺ بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾، دەستیان بە نوێژ دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ آيَةٌ مِنْ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ

٤٩٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ فِي الصَّلَاةِ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾الفاتحة، فَعَدَّهَا آيَةً، وَ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾الفاتحة، آيَتَيْنِ، ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾الفاتحة، وَجَمَعَ خَمْسَ أَصَابِعِهِ[3].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) ئایەتێکە لە سورەتی فاتیحە

واتە: دایکی سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١﴾ ی خوێند، بە ئایەتێکی دانا، وە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ ئایەتی دووەم،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف جداً.

وە ﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ هەر پێنج پەنجەکەی کۆ کردەوە. (واتە: تاکوو ئەوێ پێنج ئایەتە).

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ غَلِطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهِ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرْ بِالْعِلْمِ فَتَوَهَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَقْرَأُ بِبِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فِي الصَّلَاةِ فِي فَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَلَا فِي غَيْرِهَا مِنَ السُّوَرِ

٤٩٤- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ:» صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رضي الله عنهما فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ الفاتحة[1].

## باسی فەرموودەیەك ئەو كەسەی زۆر شارەزا نییە لە زانست و هەڵەی كردووە لەوەی كردوویەتی بە بەڵگە، وا دەزانێ پێغەمبەر ﷺ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ ی نەخوێندووە لەنێو سورەتی فاتیحە لە نوێژدا، هەروەها لە سورەتەكانی دیكەش نەیخوێندوە

واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر رضي الله عنهما نوێژم کرد نەمبیست یەکێکیان ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ بخوێنێت.

٤٩٥- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ رضي الله عنهم فَلَمْ يَجْهَرُوا بِـ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ الفاتحة[2].

واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: لەپشت پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان رضي الله عنهم نوێژم کرد بەدەنگی بەرز ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ یان نەخوێند.

٤٩٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَجْهَرْ بِـ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ الفاتحة، وَلَا أَبُو بَكْرٍ، وَلَا عُمَرُ، وَلَا عُثْمَانُ رضي الله عنهم[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگی بەرز ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ ی نەخوێند، هەروەها ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش ﷺ.

٤٩٧- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ ﷺ فَلَمْ يَجْهَرُوا بِـ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ الفاتحة[1].

ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، وە لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەریش ﷺ نوێژم کرد بەدەنگی بەرز ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ یان نەدەخوێند.

٤٩٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ « يُسِرُّ بِـ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ الفاتحة، فِي الصَّلَاةِ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﷺ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ بِخِلَافِ مَا تَوَهَّمَ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ وَادَّعَى أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ أَرَادَ بِقَوْلِهِ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ ﷺ يَسْتَفْتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ الفاتحة، وَبِقَوْلِهِ: لَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ الفاتحة، أَنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَقْرَءُونَ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ [الفاتحة: ١] جَهْرًا وَلَا خَفِيًّا، وَهَذَا الْخَبَرُ يُصَرِّحُ أَنَّهُ أَرَادَ أَنَّهُمْ كَانُوا يُسِرُّونَ بِهِ وَلَا يَجْهَرُونَ بِهِ.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا بەنهێنی: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ دەخوێند، هەروەها ئەبو بەکر و عومەریش ﷺ.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە بەڕاستەوخۆیی پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەیە کە شارەزا نییە لە زانست و بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ مەبەستی لە وتەکەی: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر ﷺ بە ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ دەستیان بە نوێژ دەکرد. هەروەها لە وتەکەیشیدا: نەمبیستووە یەکیك لە ئەوان ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ بخوێنێ، ئەوان ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ یان نەدەخوێند نە بەئاشکرا و نە بەشاراوە، بەڵام ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی باس لەوە دەکات ئەو مەبەستی ئەوە بووە ئەوان بەدەنگی نزم ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ یان دەخوێند، بەدەنگی بەرز نەیاندەخوێند.

---

(١) حديث صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْجَهْرَ بِبِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَالْمُخَافَتَةَ بِهِ جَمِيعًا مُبَاحٌ، لَيْسَ وَاحِدٌ مِنْهُمَا مَحْظُورًا، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ

٤٩٩- عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَقَرَأَ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ الفاتحة، ثُمَّ قَرَأَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ حَتَّى بَلَغَ ﴿وَلَا الضَّالِّينَ ⑦﴾ الفاتحة، فَقَالَ: آمِينَ، وَقَالَ النَّاسُ: آمِينَ، وَيَقُولُ كُلَّمَا سَجَدَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الْجُلُوسِ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَيَقُولُ إِذَا سَلَّمَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدِ اسْتَقْصَيْتُ ذِكْرَ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ الفاتحة، فِي كِتَابِ مَعَانِي الْقُرْآنِ، وَبَيَّنْتُ فِي ذَلِكَ الْكِتَابِ أَنَّهُ مِنَ الْقُرْآنِ بِبَيَانٍ وَاضِحٍ غَيْرِ مُشْكِلٍ عِنْدَ مَنْ يَفْهَمُ صِنَاعَةَ الْعِلْمِ، وَيَتَدَبَّرُ مَا بَيَّنْتُ فِي ذَلِكَ الْكِتَابِ، وَيَرْزُقُهُ اللَّهُ فَهْمَهُ وَيُوَفِّقُهُ لِإِدْرَاكِ الصَّوَابِ وَالرَّشَادِ بِمَنِّهِ وَفَضْلِهِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی دەنگ بەرزکردنەوە و دەنگ نزمکردنەوە بە خوێندنی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ لەنێو نوێژ هەموویان ڕێگەپێدراون، هیچیان قەدەغە نین، ئەمەش لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراون

واتە: نوعەیمی موجمیر دەڵێ: لەپشت ئەبو هورەیرە ﷺ نوێژم کرد بە ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ دەستی پێ کرد، پاشان سورەتی فاتیحەی خوێند، هەتا گەیشتە: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ ⑦﴾ وتی: ئامین، خەڵکەکەیش وتیان: ئامین، کاتێك سوژدەی برد وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ) وە کاتێ هەستایەوە لە دانیشتن وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ) وە کاتێ سەلامی دایەوە وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە نوێژی من لە نوێژی هەمووتان زیاتر بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: لێکۆڵینەوەم لە باسی ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ①﴾ کردووە لە کتێبی (مَعَانِي الْقُرْآنِ)، لەو کتێبەدا ڕوونم کردۆتەوە (بسم الله) ئایەتێکە لە قورئان، بە باسکردنی ڕوون و دیار و ئاشکرا و بەبێ ئاڵۆزی، ئەو کەسەی لە زانستی شەرعی دەزانێ و خوا سەرکەوتووی کردووە بە منەت و چاکەی خۆی بۆ هەستکردن بە مانای ڕاست و دروست و ڕێنیشاندان، تێ دەگات لەوەی ڕوونم کردۆتەوە.

---

(١) صحيح.

## باب فضل قراءة فاتحة الكتاب مع البيان أنها السبع المثاني وأن الله لم ينزل في التوراة ولا في الإنجيل ولا في القرآن مثلها

٥٠٠- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُعَلِّمُكَ سُورَةً مَا أُنْزِلَ فِي التَّوْرَاةِ، وَلَا فِي الْإِنْجِيلِ، وَلَا فِي الْقُرْآنِ مَثْلُهَا»، قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَعَلَّكَ أَنْ لَا تَخْرُجَ مِنْ ذَلِكَ الْبَابِ حَتَّى أُحَدِّثَكَ بِهَا»، فَقُمْتُ مَعَهُ فَجَعَلَ يُحَدِّثُنِي، وَيَدِي فِي يَدِهِ، فَجَعَلْتُ أَتَبَاطَأُ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُخْبِرَنِي بِهَا، فَلَمَّا دَنَوْتُ مِنَ الْبَابِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، السُّورَةُ الَّتِي وَعَدْتَنِي قَالَ: كَيْفَ تَبْدَأُ إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ؟» قَالَ: فَقَرَأْتُ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ، فَقَالَ: هِيَ، هِيَ، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي الَّذِي قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر، هُوَ الَّذِي أُوتِيتُهُ[1].

## باسی خوێندنی سورەتی فاتیحە لەگەڵ ڕوونکردنەوە کە ئەو سورەتە حەوت ئایەتی دووبارەیە، بێگومان خوا ﷻ نە لە تەوڕاتدا دایبەزاندووە، نە لە ئینجیل، نە لە قورئانیشدا هاووێنەی هەیە

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا سورەتێکت فێر بکەم نە لە تەوڕاتدا دابەزیوە و نە لە ئینجیل و نە لە قورئانیشدا هاوشێوەی هەیە، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: بەڵکوو لەم دەرگایە دەرنەچیت هەتا بۆت باس دەکەم، لەگەڵی ڕاوەستام قسەی بۆ دەکردم و دەستم لەنێو دەستی بوو، خاوەخاوم دەکرد حەزم نەکرد دەرچێت لە دەرگاکە هەتا بۆم باس دەکات، کاتێ نزیك بوومەوە لە دەرگاکە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو سورەتەم پێ بڵێ کە بەڵێنت پێ دام، فەرمووی: کاتێ نوێژ دادەبەستی بە چی دەست پێ دەکەی؟ وتی: سورەتی فاتیحەم خوێند، فەرمووی: ئەوەیە، ئەوەیە، ئەوە حەوت ئایەتی دووبارەکراوەیە کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی حەوت ئایەتی دووبارەکراوەمان پێ بەخشیت، هەروەها قورئانی گەورەش. ئەوە ئەوەیە کە پێم دراوە.

---

(١) صحيح.

**٥٠١-** «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِي التَّوْرَاةِ، وَلَا فِي الْإِنْجِيلِ، وَلَا فِي الْقُرْآنِ مِثْلَ أُمِّ الْكِتَابِ، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي»[1].

**واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا هاوشێوەی سوڕەتی فاتیحەی دانەبەزاندووە، کە ئەویش حەوت ئایەتی دووبارە کراوە، نە لە تەوڕات و نە لە ئینجیل و نە لە قوڕئانیشدا.**

**تێبینی:**

(أُمِّ الْكِتَابِ): **بنچینەی هەموو قوڕئانە، یان مانای هەموو قوڕئانی بەکورتی و پوختی تێدایە.**

(السَّبْعُ الْمَثَانِي): **بریتییە لەو حەوت ئایەتەی کە بەردەوام دووبارە دەبنەوە لەنێو نوێژدا.**

**جا** (أُمِّ الْكِتَابِ) **و** (السَّبْعُ الْمَثَانِي) **هەردووکیان ناون بۆ سوڕەتی فاتیحە، چەند ناوێکی دیکەشی هەیە کە لە تەفسیرەکاندا باس کراون.**

**٥٠٢-** «عَنِ أَبِي السَّائِبِ مَوْلَى هِشَامِ بْنِ زُهْرَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ، فَهِيَ خِدَاجٌ غَيْرُ تَمَامٍ»، فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، إِنِّي أَكُونُ أَحْيَانًا وَرَاءَ الْإِمَامِ، فَغَمَزَ ذِرَاعِي، وَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا يَا فَارِسِيُّ فِي نَفْسِكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلَاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، فَنِصْفُهَا لِي وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللَّهُ: حَمِدَنِي عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللَّهُ: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ الفاتحة، يَقُولُ اللَّهُ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وَهَذِهِ الْآيَةُ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾ الفاتحة، فَهَذِهِ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، يَقُولُ الْعَبْدُ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَهُوَ لِعَبْدِي، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو سائیب مەولای هیشامی کوڕی زوهرە دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژێك بكات سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ ئەوە ناتەواوە، ئەوە ناتەواوە، ئەوە ناتەواوە تەواو نییە، وتم: ئەی ئەبو هورەیرە ﷺ، جار جار من لەپشت پێشنوێژەوەم، دواتر باڵمی گرت و پاشان وتی: ئەی فارسی، بۆ خۆت بیخوێنە، چونكە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی: نوێژم دابەش كردووە لە نێوان خۆم و لە نێوان بەندەكانمدا بە دوو بەش، نیوەی بۆ منە و نیوەی بۆ بەندەكەم، بەندە دەڵێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾، خوا ﷻ دەفەرمووێ: بەندەكەم ستاییشی كردم، بەندە دەڵێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾، خوا ﷻ دەفەرمووێ: بەندەكەم پیاهەڵدانی كردم، بەندە دەڵێ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾، خوا ﷻ دەفەرمووێ: بەندەكەم بەگەورە و مەزنی دانام، ئەم ئایەتە لە نێوانی من و نێوانی بەندەكەمە، بەندە دەڵێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥﴾، ئەوە لە نێوانی من و بەندەكەمە، بەندەكەم داوای چی دەكات با بیكات، بەندە دەڵێ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، ئەوە بۆ بەندەكەمە، بەندەكەم داوای چی دەكات با بیكات.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي الْأُولَيَيْنِ مِنْهُمَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُصَلِّيَ ظُهْرًا أَوْ عَصْرًا مُخَيَّرٌ بَيْنَ أَنْ يَقْرَأَ فِي الْأُخْرَيَيْنِ مِنْهُمَا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَبَيْنَ أَنْ يُسَبِّحَ فِي الْأُخْرَيَيْنِ مِنْهُمَا، وَخِلَافَ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ يُسَبِّحُ فِي الْأُخْرَيَيْنِ وَلَا يَقْرَأُ فِي الْأُخْرَيَيْنِ مِنْهُمَا. وَهَذَا الْقَوْلُ خِلَافُ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ الَّذِي وَلَّاهُ اللَّهُ بَيَانَ مَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ مِنَ الْفُرْقَانِ، وَأَمَرَهُ عَزَّ وَجَلَّ بِتَعْلِيمِ أُمَّتِهِ صَلَاتَهُمْ

٥٠٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَيَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[1].

---

(١) صحيح.

**باسی خوێندنی سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکە لە دوو ڕکاتی یەکەم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و خوێندنی تەنها فاتیحە لە دوو ڕکاتەکەی دیکەدا، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی وا گومان دەبات ئەو کەسەی نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر دەکات ئازادە لەوەی دوو ڕکاتی کۆتایی سوڕەتی فاتیحە دەخوێنێ یان تەسبیحات دەکات، هەروەها پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەیە کە وا گومان دەبات لە دوو ڕکاتی کۆتایی تەسبیحات دەکات و قورئانیان تێدا ناخوێنێ، ئەم قسەیە پێچەوانەی سوننەتی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ کە خوا ناردوویەتی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی دایبەزاندووە بۆی لە قورئان، وە فەرمانی پێ کردووە ئوممەتەکەی فێری نوێژ بکات**

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی (یەکەم لە) نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکەی دەخوێند، وە هەندێ جار ئایەتەکەی پێ دەبیساندین (واتە: بەدەنگی بەرز دەیخوێند و گوێمان لە خوێندنەکەی بوو)، وە لە دوو ڕکاتی کۆتاییدا سوڕەتی فاتیحەی دەخوێند.

**٥٠٤**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِنَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، فَيَقْرَأُ فِي الْأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ مَعَهَا، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الْأُولَى وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا[1].

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا سوڕەتی فاتیحە و سوڕەتێکی دیکەی لەگەڵی دەخوێند لە دوو ڕکاتی کۆتاییدا سوڕەتی فاتیحەی دەخوێند، ڕکاتی یەکەمی درێژ دەکردەوە، جار جار گوێمان لە ئایەتەکەی دەبوو (واتە: بەدەنگی بەرز دەیخوێند).

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْمُخَافَتَةِ بِالْقِرَاءَةِ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَتَرْكِ الْجَهْرِ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ

٥٠٥- عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: سَأَلْنَا خَبَّابًا ﷺ، أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْنَا: بِأَيِّ شَيْءٍ عَلِمْتُمْ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ[١].

## باسی قورئانخوێندن بەشاراوەیی لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، وە وازهێنان لە دەنگبەرزکردنەوە تیایاندا

واتە: ئەبو مەعمەر دەڵێ: پرسیارمان لە خەباب ﷺ کرد، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی دەخوێند لە نیوەڕۆ و عەسردا؟ وتی: بەڵێ، وتمان: بە چی شتێك دەتانزانی؟ وتی: بە جوڵاندنەوەی ڕیشی.

٥٠٦- عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَارَةَ بْنَ عُمَيْرٍ ﷺ بِهَذَا الْإِسْنَادِ مِثْلَهُ، وَقَالَ: لِحْيَتِهِ[٢].

واتە: سولەیمان دەڵێ: گوێم لێ بوو عومارەی کوڕی عومەیر ﷺ بەم زنجیرەیە هێنای، وە وتی: (لِحْيَتِهِ).

## بَابُ إِبَاحَةِ الْجَهْرِ بِبَعْضِ الْآيِ فِي صَلَاةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

٥٠٧- حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ، حَدَّثَنِي أَبِي ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، وَسُورَتَيْنِ مَعَهَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ[٣].

## باسی ڕێگەدان بە دەنگبەرزکردنەوە بە خوێندنی هەندێ لە ئایەتەکان لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە، باوکم ﷺ بۆی باس کردم، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی یەکەم لە نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسردا سوڕەتی فاتیحە و

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.

سورەتێکی دیکەی لەگەڵی دەخوێند، جار جار ئایەتەکەی پێ دەبیساندین (واتە: بەدەنگی بەرز دەیخوێند)، وە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە.

## بَابُ تَطْوِيلِ الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَحَذْفِ الْأُخْرَيَيْنِ مِنْهُمَا

٥٠٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁، أَنَّ أَهْلَ الْكُوفَةِ شَكَوْا سَعْدًا ﵁ إِلَى عُمَرَ ﵁، فَذَكَرُوا مِنْ صَلَاتِهِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ عُمَرُ ﵁، فَقَدِمَ عَلَيْهِ، فَذَكَرَ لَهُ مَا عَابُوهُ مِنْ أَمْرِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: إِنِّي لَأُصَلِّي بِهِمْ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَمَا أَخْرِمُ عَنْهَا، إِنِّي لَأَرْكُدُ بِهِمْ فِي الْأُولَيَيْنِ، وَأَحْذِفُ بِهِمْ فِي الْأُخْرَيَيْنِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﵁: ذَاكَ الظَّنُّ بِكَ يَا أَبَا إِسْحَاقَ(١).

## باسی درێژکردنەوەی دوو ڕکاتی یەکەم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، وە کورتکردنەوەی دوو ڕکاتی کۆتایی

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﵁ دەڵێ: خەڵکی کوفە سکاڵایان کرد لە سەعد ﵁ لای عومەر ﵁، باسی ئەوەیان کرد نوێژیان بەچاکی بۆ ناکات، دواتر سەعد ﵁ هات بۆ لای عومەر ﵁، باسی ڕەخنە و تێبینییەکانیانی بۆ کرد دەربارەی ئەو نوێژەی بۆیان دەکات، سەعد ﵁ وتی: من هەمان نوێژی پێغەمبەری خوایان ﷺ بۆ دەکەم، کەمتەرخەمی تێدا ناکەم، من لە دوو ڕکاتی یەکەم درێژی دەکەمەوە و دوو ڕکاتی کۆتاییش کورت دەکەمەوە، عومەر ﵁ پێی وت: ئەوە تەنها گومانێکە بۆت دەبرێ ئەی باوکی ئیسحاق.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْقِرَاءَةِ فِي الْأُخْرَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِأَكْثَرَ مِنْ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ لَا مِنَ اخْتِلَافِ الَّذِي يَكُونُ أَحَدُهُمَا مَحْظُورًا وَالْآخَرُ مُبَاحًا، فَجَائِزٌ أَنْ يُقْرَأَ فِي الْأُخْرَيَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَيُقْصَرَ مِنَ الْقِرَاءَةِ عَلَيْهَا، وَمُبَاحٌ أَنْ يُزَادَ فِي الْأُخْرَيَيْنِ عَلَى فَاتِحَةِ الْكِتَابِ

---

(١) صحيح.

٥٠٩- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَحْزِرُ قِيَامَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الظُّهْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ قَدْرَ قِرَاءَةِ ثَلَاثِينَ آيَةً قَدْرَ قِرَاءَةِ الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةِ قَالَ: وَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الْأُخْرَيَيْنِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: وَحَزَرْنَا قِيَامَهُ فِي الْأُولَيَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ عَلَى النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ[١]».

**باسی ڕێگەدراوە لە دوو ڕکاتی کۆتایی نیوەڕۆ و عەسر زیاتر لە سورەتی فاتیحە بخوێنێ، ئەمەش لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراوە نەك لەو جیاوازییەی کە یەکێکیان قەدەغەیە و ئەوی دیکەیان ڕێگەپێدراوە، جا دروستە لە دوو ڕکاتی کۆتایی لە هەر ڕکاتێکدا سورەتی فاتیحە بخوێنرێ و تێیدا کورت دەکرێتەوە، وە ڕێگەدراوە لە دوو ڕکاتی کۆتایی لە سورەتی فاتیحە زیاتر بخوێنرێ**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: ئێمە وەستانی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەخەمڵاند لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ، بەئەندازەی خوێندنی سی ئایەت، بە ئەندازەی خوێندنی (الم تَنْزِيلُ) سورەتی: (السَّجْدَة)، وە وەستانیان خەمڵاند لە دوو ڕکاتەکەی کۆتاییدا بەئەندازەی نیوەی دوو ڕکاتی یەکەم، وتی: وە وەستانیان خەمڵاند لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی عەسر بەئەندازەی نیوەی دوو ڕکاتەکەی کۆتایی نوێژی نیوەڕۆ.

## بَابُ ذِكْرِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ

٥١٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِـ اللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا وَنَحْوِهَا، وَيَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ بِأَطْوَلَ مِنْ ذَلِكَ[٢].

## باسی قورئانخوێندن لە دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر (اللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) و (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا) و هاوشێوەی ئەو سورەتانەی دەخوێند، وە لە نوێژی بەیانی لەوانە درێژتری دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٥١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيُّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ بـِ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ وَنَحْوِهَا[١].

واتە: عەبدوڵای کوڕی بورەیدەی ئەسلەمی دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی نیوەڕۆدا (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) و هاوشێوەی ئەو سورەتەی دەخوێند.

٥١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَسْمَعُونَ مِنْهُ النَّغَمَةَ فِي الظُّهْرِ بـِ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوان لە نوێژی نیوەڕۆدا گوێیان لە دەنگی قورئانخوێندنی دەبوو بە خوێندنی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) وە (وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الصَّلَاةَ بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ جَائِزَةٌ دُونَ غَيْرِهَا مِنَ الْقِرَاءَةِ، وَأَنَّ مَا زَادَ عَلَى فَاتِحَةِ الْكِتَابِ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ فَضِيلَةٌ لَا فَرِيضَةٌ فِي خَبَرِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ» دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَنْ قَرَأَ بِهَا لَهُ صَلَاةٌ. وَفِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ» دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ مَنْ قَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي الصَّلَاةِ لَمْ تَكُنْ صَلَاتُهُ خِدَاجًا

٥١٣- «عَنْ حَنْظَلَةُ السَّدُوسِيُّ قَالَ: قُلْتُ لِعِكْرِمَةَ: رُبَّمَا قَرَأْتُ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ بـِ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، وَإِنَّ نَاسًا يَعِيبُونَ ذَاكَ عَلَيَّ قَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، وَمَا بَأْسُ ذَاكَ؟ اقْرَأْ بِهِمَا فَإِنَّهُمَا مِنَ الْقُرْآنِ»، ثُمَّ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يَقْرَأْ فِيهِمَا إِلَّا بِأُمِّ الْكِتَابِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژ تەنها بە خوێندنی سورەتی فاتیحە جگە لە خوێندنی هیچ سورەتێکی دیکە دروستە، بێگومان خوێندنی زیاتر لە سورەتی فاتیحە لەنێو نوێژ فەزڵ و چاکەیە نەك فەرز، وەك لە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ هاتووە: (لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ) واتە: نوێژ نییە بۆ ئەو کەسەی سورەتی فاتیحە نەخوێنێت. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی بیخوێنێت نوێژەکەی دروستە، وە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەدا ﷺ هاتووە: (مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ) واتە: هەر کەسێك نوێژ بکات سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێ ئەوە ناتەواوە. ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك فاتیحە بخوێنێ لە نوێژەکەیدا ئەوە نوێژەکەی ناتەواو نییە**

واتە: حەنزەلەی سەدوسی دەڵێ: بە عیکریمەم وت: هەندێ جار لە نوێژی ئێوارەدا (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)م خوێند، خەڵکانێك ڕەخنەیان لێ دەگرتم لەسەر ئەوە، وتی: پاك و بێگەردی بۆ خوا، ئەوە کێشەیەکی تێدایە؟ بیانخوێنە بێگومان ئەو دووانە لە قورئانن، پاشان وتی: ئیبنو عەباس ﷺ بۆی باس کردم پێغەمبەری خوا ﷺ هات دوو ڕکات نوێژی کرد، جگە لە فاتیحە هیچی تیایاندا نەخوێند.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

٥١٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبيهِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ: يَقْرَأُ فِي المَغْرِبِ بالطُّورِ.[١]

## باسی قورئانخوێندن لە نوێژی ئێوارەدا

واتە: مەحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ، کە ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژی ئێوارەدا سورەتی (الطور)ی دەخوێند.

٥١٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ بِطُولَى الطُّولَيَيْنِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی ئێوارەدا درێژترینی دوو سوڕەتەکەی دەخوێند (سوڕەتی ئەعراف و ئەنعام، درێژترینی ئەو دوو سوڕەتەش سوڕەتی ئەعرافە).

٥١٦- عَنْ مَرْوَانِ بْنِ الْحَكَمِ قَالَ: قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: مَا لَكَ تَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِقِصَارِ الْمُفَصَّلِ، لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِطُولَى الطُّولَيَيْنِ قَالَ: قُلْتُ: وَمَا طُولَى الطُّولَيَيْنِ؟ قَالَ: الْأَعْرَافُ فَسَأَلْتُ ابْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ، وَمَا الطُّولَيَانِ؟ فَقَالَ: مِنْ قِبَلِ رَأْيِهِ: الْأَنْعَامُ وَالْأَعْرَافُ[1].

واتە: مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: ئەوە چییە لە نوێژی ئێوارەدا سوڕەتە کورتەکان دەخوێنی، بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئێوارەدا درێژترینی دوو سوڕەتەکەی دەخوێند، وتی: وتم: درێژترینی ئەو دوو سوڕەتە کامەیە؟ وتی: سوڕەتی (الْأَعْرَاف)ە، دواتر پرسیارم لە ئیبنو ئەبو مولەیکە کرد ئەو دوو سوڕەتە درێژە کامەن؟ بە بۆچوونی خۆی وتی: (الْأَنْعَام) و (الْأَعْرَاف)ن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يَقْرَأُ بِطُولَى الطُّولَيَيْنِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ لَا فِي رَكْعَةٍ وَاحِدَةٍ

٥١٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِسُورَةِ الْأَعْرَافِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ درێژترینی دوو سوڕەتەکەی لە دوو ڕکاتی ئێوارەدا خوێند نەک لە یەک ڕکاتدا

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی ئێوارەدا سوڕەتی (الْأَعْرَاف)ی لە هەردوو ڕکاتەکەدا خوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٥١٨-** عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ ﷺ، أَوْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ شَكَّ هِشَامٌ، قَالَ لِمَرْوَانَ - وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ - إِنَّكَ تُخِفُّ الْقِرَاءَةَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ، فَوَاللَّهِ، لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِيهِمَا بِسُورَةِ الْأَعْرَافِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَمِيعًا، فَقُلْتُ لِأَبِي: مَا كَانَ مَرْوَانُ يَقْرَأُ فِيهِمَا؟ قَالَ: مِنْ طُوَلِ الْمُفَصَّلِ[١].

**واتە: هیشام دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، بەڕاستی باوکی ئەیوب ﷺ، یان زەیدی کوڕی سابیت ﷺ هیشام گومانی هەبوو کام لەو دووانە بە مەڕوانی وت -کاتێ کە کاربەستی مەدینە بوو-: بەڕاستی تۆ لە دوو ڕکاتەکەی نوێژی ئێوارەدا قورئان کەم دەخوێنی، دەی سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەردووکیاندا سورەتی (الْأَعْرَاف)ی دەخوێند، بە باوکمم وت: مەڕوان چی سورەتێکی دەخوێند لەو دوو ڕکاتەدا؟ وتی: سورەتێکی درێژ لە سورەتە موفەصەلەکانی دەخوێند.**

**٥١٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنْ أُمِّهِ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ ﷺ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالْمُرْسَلَاتِ[٢].

**واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە لە دایکیەوە دایکی فەزلی کچی حاریس ﷺ ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی ئێوارەدا سورەتی (الْمُرْسَلَات)ی دەخوێند.**

**٥٢٠-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشْبَهَ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فُلَانٍ، لِأَمِيرٍ كَانَ بِالْمَدِينَةِ قَالَ سُلَيْمَانُ: «فَصَلَّيْتُ أَنَا وَرَاءَهُ فَكَانَ يُطِيلُ فِي الْأُولَيَيْنِ، وَيُخَفِّفُ الْأُخْرَيَيْنِ، وَيُخَفِّفُ الْعَصْرَ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِي الْأُولَيَيْنِ مِنَ الْمَغْرِبِ بِقِصَارِ الْمُفَصَّلِ، وَفِي الْأُولَيَيْنِ مِنَ الْعِشَاءِ بِوَسَطِ الْمُفَصَّلِ، وَفِي الصُّبْحِ بِطُوَلِ الْمُفَصَّلِ»[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الِاخْتِلَافُ فِي الْقِرَاءَةِ مِنْ جِهَةِ الْمُبَاحِ، جَائِزٌ لِلْمُصَلِّي أَنْ يَقْرَأَ فِي الْمَغْرِبِ وَفِي الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا الَّتِي يُزَادُ عَلَى فَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِيهَا بِمَا أَحَبَّ، وَشَيْئًا مِنْ سُوَرِ الْقُرْآنِ، لَيْسَ بِمَحْظُورٍ عَلَيْهِ أَنْ يَقْرَأَ بِمَا شَاءَ مِنْ سُوَرِ الْقُرْآنِ، غَيْرُ أَنَّهُ إِذَا كَانَ إِمَامًا فَالِاخْتِيَارُ لَهُ أَنْ يُخَفِّفَ فِي الْقِرَاءَةِ، وَلَا يُطَوِّلَ بِالنَّاسِ فِي الْقِرَاءَةِ فَيَفْتِنَهُمْ كَمَا قَالَ الْمُصْطَفَى ﷺ لِمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ أَتُرِيدُ أَنْ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده حسن.

تَكُونَ فَتَّانًا، وَكَمَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ الْأَئِمَّةَ أَنْ يُخَفِّفُوا الصَّلَاةَ، فَقَالَ: «مَنْ أَمَّ مِنْكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ» وَسَأُخَرِّجُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ أَوْ بَعْضَهَا فِي كِتَابِ الْإِمَامَةِ؛ فَإِنَّ ذَلِكَ الْكِتَابَ مَوْضِعُ هَذِهِ الْأَخْبَارِ.

واتە: سولەیانی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: کەسم نەبینیوە ئەوەندەی فڵانە کەس نوێژی لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ چووبێت، ئەو پیاوە کاربەدەست بوو لە مەدینە، سولەیان وتی: من لە پشتیەوە نوێژم کرد، دوو ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە، وە دوو ڕکاتەکەی کۆتایی کورت دەکردەوە، لە دوو ڕکاتی یەکەمی ئێوارەیشدا سوڕەتە کورتەکانی دەخوێند، وە لە عیشایشدا سوڕەتە نێوەندەکانی دەخوێند، وە لە نوێژی بەیانیدا سوڕەتە درێژەکانی دەخوێند.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم جیاوازییە لە خوێندنی سوڕەتەکانی قوڕئان لەنێو نوێژدا جیاوازییەکی ڕێگەپێدراوە، دروستە بۆ نوێژخوێن لە ئێوارەدا و لە هەموو نوێژەکاندا ئەوەی پێی خۆشە لە قوڕئان دوای فاتیحە بیخوێنێت، قەدەغە نییە لەسەری ئەوەی پێی خۆشە لە سوڕەتەکانی قوڕئان بیخوێنێت، ئەوە نەبێت ئەگەر پێشنوێژ بوو چاکتر وایە قوڕئان کەم بخوێنێت و درێژی نەکاتەوە بۆ خەڵك تا تووشی فیتنە نەبن وەك پێغەمبەر ﷺ بە موعازی کوڕی جەبەلی ﷺ فەرموو: ئایا تۆ دەتەوێ ببیت بە مایەی فیتنە و ناڕەحەتی؛ وە هەر وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە پێشەوایان نوێژەکانیان کورت و پوخت بکەن، فەرمووی: هەر کەسێك لە ئێوە پێشنوێژی کرد با کورت و پوختی بکات. لە داهاتوودا ئەو فەرموودانە یان هەندێکیان لە (كِتَابِ الْإِمَامَةِ) واتە: کتێبی پێشنوێژی باس دەکەم، چونکە ئەو کتێبە جێگای ئەو فەرموودانەیە.

تێبینی: (الْمُفَصَّلِ): بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە سوڕەتەکانی بەزۆری بە (بسم الله) لە یەکدی جیا کراوەتەوە، سێ بەشە: (طِوال الْمُفَصَّلِ) وە (أواسِط الْمُفَصَّلِ) وە (قِصار الْمُفَصَّلِ). (طِوال الْمُفَصَّلِ): کە سونەتە لە نوێژی بەیانیدا بخوێنرێ، لە سوڕەتی (ق)وە دەست پێ دەکات بۆ سوڕەتی: (عَمَّ). وە (أواسِط الْمُفَصَّلِ) کە سونەتە لە نوێژی عەسر و عیشادا بخوێنرێ، لە سوڕەتی (عَمَّ)وە دەست پێ دەکات بۆ سوڕەتی (الضُحی). وە (قِصار الْمُفَصَّلِ) کە سونەتە لە نوێژی ئێوارەدا بخوێنرێ، لە سوڕەتی (الضُحی) دەست پێ دەکات تا کۆتایی قوڕئان.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ

**٥٢١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، وَأَبِي الزُّبَيْرِ، سَمِعْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، يَزِيدُ أَحَدُهُمَا عَلَى صَاحِبِهِ، قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ ﵁ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى قَوْمِهِ فَيُصَلِّي بِهِمْ، فَأَخَّرَ النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَرَجَعَ مُعَاذٌ يَؤُمُّهُمْ، فَقَرَأَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ انْحَرَفَ إِلَى نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَصَلَّى وَحْدَهُ، فَقَالُوا: أَنَافَقْتَ؟ قَالَ: لَا قَالَ: وَلَآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَلَأُخْبِرَنَّهُ، وَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ مُعَاذًا ﵁ يُصَلِّي مَعَكَ ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَؤُمُّنَا، وَإِنَّكَ أَخَّرْتَ الصَّلَاةَ الْبَارِحَةَ فَجَاءَ فَأَمَّنَا فَقَرَأَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَإِنِّي تَأَخَّرْتُ عَنْهُ فَصَلَّيْتُ وَحْدِي يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّا نَحْنُ أَصْحَابُ نَوَاضِحَ، وَإِنَّمَا نَعْمَلُ بِأَيْدِينَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ اقْرَأْ سُورَةَ وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى، وَسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ خَرَّجْتُ طُرُقَ هَذَا الْخَبَرِ فِي كِتَابِ الْإِمَامَةِ».

## باسی قورئانخوێندن لە نوێژی عیشادا

واتە: عەمری کوڕی دینار و ئەبو زوبەیر دەگێڕنەوە، گوێیان لێ بوو جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ -یەکێکیان زیاتر باسی دەکرد لەوی دیکەیان- وتی: موعاز ﵁ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی پێشنوێژی بۆ دەکردن، شەوێك پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی دوا خست، موعاز گەڕایەوە بۆ نێو قەومەکەی پێشنوێژی بۆ کردن سورەتی بەقەڕەی خوێند، کاتێ پیاوێك لە قەومەکە ئەوەی بینی بەتەنیا لە سوچێکی مزگەوتەکە نوێژی خۆی کرد، وتیان: ئایا دوڕوو بوویت؟ وتی: نەخێر، وتی: دەچم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ دەدەم، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: موعاز ﵁ نوێژت لەگەڵ دەکات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە پێشنوێژیان بۆ دەکات، وە تۆ دوێنێ نوێژەکەت دوا خست، دواتر ئەو گەڕایەوە پێشنوێژی بۆ کردین، سورەتی بەقەڕەی خوێند، منیش خۆم دوا خست بەتەنها نوێژی خۆمم کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئێمە خەڵکی خاوەنکارین بە دەستەکانی

---

(١) صحيح.

خۆمان کار دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز: ئایا تۆ دەتەوێ ببیتە مایەی فیتنە و ناڕەحەتی؟ سوڕەتی (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) و (وَسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) و (وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ)یان بۆ بخوێنە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ڕێگاکانی ئەم فەرموودەیەم لە (كِتَاب الْإِمَامَة)دا دەرهێناوە و تەخریجم کردووە.

**٥٢٢-** عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِـ التِّينِ وَالزَّيْتُونِ فِي عِشَاءِ الْآخِرَةِ فَمَا سَمِعْتُ أَحْسَنَ قِرَاءَةً مِنْهُ[١].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی عیشادا (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی دەخوێند، گوێم لێ نەبووە کەس ئەوەندەی ئەو بەجوانی قورئان بخوێنێت.

**٥٢٣-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: شَكَوْتُ أَوِ اشْتَكَيْتُ فَذَكَرْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «طُوفِي مُرُورَ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ» قَالَتْ: فَطُفْتُ عَلَى جَمَلٍ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى صُقْعِ الْبَيْتِ، فَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ وَهُوَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ[٢].

واتە: دایکی سەلەمە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: نەخۆش بووم بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ باس کرد، فەرمووی: تەواف بکە بەسواری بەنێو خەڵکدا ڕێ بکە، دواتر لەسەر وشترێك تەوافم کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لە لایەکی مزگەوتەوە نوێژی دەکرد، گوێم لێی بوو لە نوێژی عیشادا کە نوێژی بۆ خەڵك دەکرد (وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ی دەخوێند.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ فِي السَّفَرِ

**٥٢٤-** عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَصَلَّى الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، فَقَرَأَ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ بِـ (التِّينِ وَالزَّيْتُونِ)[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی قورئانخوێندن لە نوێژی عیشادا لە گەشتدا

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بوو نوێژی عیشای کرد، لە یەکێك لە ڕکاتەکانیدا (التِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی خوێند.

٥٢٥- عَنْ الْبَرَاءِ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، فَقَرَأَ فِيهَا بِـ التِّينِ وَالزَّيْتُونِ[1].

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە گەشتێکدا نوێژی عیشای کرد، (التِّينِ وَالزَّيْتُونِ)ی تێدا خوێند.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ

٥٢٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ بِقَافٍ، وَكَانَتْ صَلَاتُهُ بَعْدُ تَخْفِيفًا[2].

## باسی قورئان خوێندن لە نوێژی بەیانی

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا سورەتی (قاف) ی دەخوێند، وە لە نوێژەکانی دیکەدا قورئانی کەم دەخوێند. (واتە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی درێژ دەکردەوە و قورئانی زۆر تێدا دەخوێند، بەڵام لە نویژەکانی دیکەدا قورئانی کەم دەخوێند).

٥٢٧- عَنْ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ بِسُورَةِ ق، وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ[3].

واتە: قوتبەی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا سورەتی (قاف)ی دەخوێند، وە گوێم لێی بوو (وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ)ی دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٥٢٨-** عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ بِالْمِائَةِ إِلَى السِّتِّينَ، أَوِ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ[1].

**واتە: ئەبو بەرزە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا سەد بۆ شەست یان شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند.**

**٥٢٩-** عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ ﷺ بِهَذَا الْإِسْنَادِ: مِثْلَهُ، وَقَالُوا بِالسِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ[2].

**واتە: سولەیمانی تەمیمی ﷺ بەم سەنەدە دەگێڕێتەوە، بەهەمان شێوەی فەرموودەکەی پێشوو، وە وتیان: شەست بۆ سەد ئایەت.**

**٥٣٠-** عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ بِمَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ[3].

**واتە: ئەبو بەرزە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانیدا لە نێوان شەست بۆ سەد ئایەتی دەخوێند.**

**٥٣١-** عَنْ جَابِرِ بْن سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي نَحْوًا مِنْ صَلَاتِكُمْ، وَلَكِنَّهُ كَانَ يُخَفِّفُ الصَّلَاةَ، كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ بِالْوَاقِعَةِ وَنَحْوِهَا مِنَ السُّوَرِ»[4].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: رَوَى هَذَا الْخَبَرَ مَنْ لَيْسَ الْحَدِيثُ صِنَاعَتُهُ فَجَاءَ بِطَامَّةٍ، رَوَاهُ عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، فَقَالَ: عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

**واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەکوو ئێوە نوێژی دەکرد، بەڵام ئەو نوێژی کورتتر دەکرد، لە نوێژی بەیانیدا سوڕەتی (الْوَاقِعَةِ) و هاوشێوەی ئەو سوڕەتەی دەخوێند.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە کەسێك گێڕاویەتەوە کە فەرموودە پیشەی ئەو نییە بۆیە کارەساتی هێناوە، لە سولەیمانی تەیمییەوە گێڕاویەتەوە وتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

**٥٣٢**- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِهَذَا. وَهَذَا خَطأٌ فَاحِشٌ، وَالْخَبَرُ إِنَّمَا هُوَ عَنْ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ سَيَّارِ بْنِ سَلَامَةَ، عَنْ أَبِي بَرْزَةَ، كَذَا رَوَاهُ هَؤُلَاءِ الْحُفَّاظُ الَّذِينَ الْحَدِيثُ صِنَاعَتُهُمْ(١).

**واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بەهەمان شێوە، ئەمەش هەڵەیەکی ناشرینە، فەرموودەکە لە سولەیمانەوەیە لە ئەبولمینهال سەیاری کوڕی سەلامە، لە ئەبو بەرزەوە، بەهەمان شێوە ئەو شارەزایانەی کە پیشەیان زانستی فەرموودەیە گێڕاویانەتەوە.**

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

**٥٣٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ الم تَنْزِيلُ، وَهَلْ أَتَى. -وعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ الم تَنْزِيلُ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ، وَفِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ، وَالْمُنَافِقُونَ. وعَنه ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ الم تَنْزِيلُ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ(٢).

## باسی قورئانخوێندن لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا

**واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی سورەتی (الم تَنْزِيلُ) و (وَهَلْ أَتَى)ی دەخوێند. (لە ڕیوایەتی دیکە) ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی سورەتی (الْجُمُعَة) و (الم تَنْزِيلُ) و (وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ)ی دەخوێند، لە نوێژی هەینیش سورەتی (الْجُمُعَة) و (الْمُنَافِقُونَ)ی دەخوێند. هەروەها ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی سورەتی (الم تَنْزِيلُ) و (وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ)ی دەخوێند.**

---

(١) المتن صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ قِرَاءَةِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ فِي الصَّلَاةِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُعَوِّذَتَيْنِ لَيْسَتَا مِنَ الْقُرْآنِ

**٥٣٤-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قُدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَقَبٍ مِنْ تِلْكَ النِّقَابِ، فَقَالَ: «أَلَا تَرْكَبُ يَا عُقَيْبُ؟» فَأَجْلَلْتُ أَنْ أَرْكَبَ مَرْكَبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «أَلَا تَرْكَبُ يَا عُقَيْبُ؟» فَأَشْفَقْتُ أَنْ تَكُونَ مَعْصِيَةً، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَرَكِبْتُ هُنَيْهَةً، ثُمَّ نَزَلْتُ وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «يَا عُقَيْبُ أَلَا أُعَلِّمُكَ سُورَتَيْنِ مِنْ خَيْرِ سُورَتَيْنِ قَرَأَ بِهِمَا النَّاسُ؟» قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَقْرَأَنِي قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى وَقَرَأَ بِهِمَا، ثُمَّ مَرَّ بِي، فَقَالَ: «كَيْفَ رَأَيْتَ يَا عُقَيْبُ؟ اقْرَأْ بِهِمَا كُلَّمَا نِمْتَ وَقُمْتَ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ اللَّفْظَةُ «كُلَّمَا نِمْتَ وَقُمْتَ» مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ الْعَرَبَ يُوقِعُ اسْمَ النَّائِمِ عَلَى الْمُضْطَجِعِ، وَيُوقِعُهُ عَلَى النَّائِمِ الزَّائِلِ الْعَقْلِ، وَالنَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ فِي هَذَا الْخَبَرِ: «اقْرَأْ بِهِمَا إِذَا نِمْتَ»، أَيْ إِذَا اضْطَجَعْتَ، إِذِ النَّائِمُ الزَّائِلُ الْعَقْلِ مُحَالٌ أَنْ يُخَاطَبَ، فَيُقَالَ لَهُ: إِذَا نِمْتَ - وَزَالَ عَقْلُهُ - فَاقْرَأْ بِالْمُعَوِّذَتَيْنِ، وَكَذَاكَ خَبَرُ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ: «صَلَاةُ النَّائِمِ عَلَى نِصْفِ صَلَاةِ الْقَاعِدِ»، وَإِنَّمَا أَرَادَ بِالنَّائِمِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ الْمُضْطَجِعَ لَا النَّائِمَ الزَّائِلَ الْعَقْلِ، إِذِ النَّائِمُ الزَّائِلُ الْعَقْلِ غَيْرُ مُخَاطَبٍ بِالصَّلَاةِ، وَلَا يُمْكِنُهُ الصَّلَاةَ لِزَوَالِ الْعَقْلِ.

## باسی خوێندنی (الْمُعَوِّذَتَيْنِ) لەنێو نوێژ بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە (الْمُعَوِّذَتَيْنِ) لە قورئاندا نییە

واتە: عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو لە یەکێك لە غەزاکاندا، فەرمووی: ئەی عوقەیب سوار نابیت؟ منیش قورس بوو بەلامەوە لە جێگای پێغەمبەری خوا ﷺ سوار بم، پاشان فەرمووی: ئەی عوقەیب سوار نابیت؟ منیش سوار نەبووم ترسام لەوەی گوناهبار بم، پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و کەمێك سوار بووم، پاشان دابەزیمە خوارەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ سوار بوو، پاشان فەرمووی: ئەی عوقەیب ئایا چاکترین دوو

---

(١) صحيح.

سورەتت فێر بکەم لەوەی کە خەڵکی دەیانخوێنن؟ وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)ی بۆم خوێند، (پێغەمبەر ﷺ بینی عوقبە خۆشحاڵ نەبوو، چونکە گەورەیی ئەو دوو سورەتەی بۆ دەرنەکەوتبوو)، پاشان قامەت کرا بۆ نوێژ، ئینجا نوێژی کرد و هەردوو سورەتەکەی تیایاندا خوێند، پاشان بەلامدا تێپەڕ بوو، فەرمووی: مەزنی ئەم دوو سورەتەت چۆن بینی ئەی عوقەیب؟ (ئەگەر گەورە نەبوونایە لە جێگای دوو سورەتی درێژ نەدەخوێنران لەنێو نوێژی بەیانیدا)، هەر کات خەوتیت و هەستای لە خەو بیانخوێنە.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم دەستەواژەیە: (كُلَّمَا نِمْتَ وَقُمْتَ) لەو شێوازەیە کە باسم کرد عەرەب لە زمانەوانی خۆیاندا ناوی (النَّائِمُ) خەوتوو بەکار دەهێنێ بۆ ئەو کەسەی ڕاکشاوە، هەروەها بۆ ئەو کەسەش بەکاری دەهێنێ کە خەوتووە و ئاگای لە خۆی نەماوە، جا پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لەم فەرموودەیە: (اقْرَأْ بِهِمَا إِذَا نِمْتَ) (واتە: ئەگەر خەوتیت بیانخوێنە). واتە: ئەگەر ڕاکشای، چونکە خەوتوو کە ئەقڵی لەدەست داوە ئەستەمە بدوێنرێ، پێی بوترێ: ئەگەر خەوتیت -کە ئەقڵی لای خۆی نەماوە- (الْمُعَوِّذَتَيْنِ) بخوێنە، بەهەمان شێوە فەرموودەکەی ئیبنو بورەیدەیش لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ: (صَلَاةُ النَّائِمِ عَلَى نِصْفِ صَلَاةِ الْقَاعِدِ) واتە: نوێژی خەوتوو خێرەکەی نیوەی نوێژی دانیشتووە. مەبەست لە (النَّائِمِ) خەوتوو لەم جێگایەدا ئەو کەسەیە کە (الْمُضْطَجِعَ) پاڵ کەوتووە نەك خەوتوویەك ئەقڵی لای خۆی نەمابێت، چونکە خەوتوو دواندنی نوێژی لەگەڵ ناکرێ، ناشتوانێ نوێژ بکات چونکە ئەقڵی لای خۆی نییە.

**٥٣٥-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أَقُودُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَاحِلَتَهُ فِي السَّفَرِ، فَقَالَ: «يَا عُقْبَةُ، أَلَا أُعَلِّمُكَ خَيْرَ سُورَتَيْنِ قُرِئَتَا؟» قُلْتُ: بَلَى قَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ فَلَمَّا نَزَلَ صَلَّى بِهِمَا صَلَاةَ الْغَدَاةِ قَالَ: «كَيْفَ رَأَيْتَ يَا عُقْبَةُ؟»[1].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا من ڕەشمەی وشترەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ گرتبوو لە گەشتێکدا، فەرمووی: ئەی عوقبە ئایا چاکترین دوو سورەتت

---

(١) صحیح.

فێر بکەم کە دەخوێنرێن؟ وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) (پێغەمبەر ﷺ بینی عوقبە خۆشحاڵ نەبوو، چونکە گەورەیی ئەو دوو سورەتەی بۆ دەرنەکەوتبوو)، کاتێ دابەزی نوێژی بەیانی کرد ئەو دوو سورەتەی تیایاندا خوێند فەرمووی: مەزنی ئەم دوو سورەتەت چۆن بینی ئەی عوقەیب؟ (ئەگەر گەورە نەبوونایە لە جێگای دوو سورەتی درێژ نەدەخوێنران لەنێو نوێژی بەیانیدا).

**٥٣٦-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقَ وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)ی دەخوێند.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْدَادِ الْمُصَلِّي قِرَاءَةَ السُّورَةِ الْوَاحِدَةِ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ

**٥٣٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يَؤُمُّهُمْ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ قَالَ: وَكَانَ كُلَّمَا افْتَتَحَ سُورَةً يَقْرَأُ لَهُمْ بِهَا فِي الصَّلَاةِ مِمَّا يَقْرَأُ بِهِ افْتَتَحَ بِـ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهَا، ثُمَّ يَقْرَأُ بِسُورَةٍ أُخْرَى مَعَهَا، وَكَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَلَمَّا أَتَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ أَخْبَرُوهُ بِالْخَبَرِ، فَقَالَ: «يَا فُلَانُ، مَا يَحْمِلُكَ عَلَى لُزُومِ هَذِهِ السُّورَةِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ؟ قَالَ: إِنِّي أُحِبُّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حُبُّهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ»[٢].

## باسی ئەوە کە ڕێگە دراوە نوێژخوێن یەك سورەت دووبارە بکاتەوە لە هەموو دوو ڕکاتێکی نوێژی فەرزدا

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: پیاوێك لە ئەنصارەکان لە مزگەوتی قوباء پێشنوێژی بۆ دەکردن، وتی: هەر کات دەستی بکردایە بە خوێندنی سورەتێك لە نوێژدا

---

(١) صحيح.

(٢) حديث صحيح.

سەرەتا بە (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) دەستی پێ دەکرد هەتا تەواو دەبوو، پاشان سوورەتێکی دیکەی دەخوێند لەگەڵیدا، لە هەموو ڕکاتێکدا ئەوەی دەخوێند، کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لایان ئەو هەواڵەیان پێ دا، فەرمووی: چی وای لێ کردووی پەیوەست بیت بەو سوڕەتەوە لە هەموو ڕکاتێکدا؟ وتی: ئەو سوڕەتەم خۆش دەوێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆشەویستیت بۆ ئەو سوڕەتە دەتخاتە بەهەشتەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ قِرَاءَةِ السُّورَتَيْنِ فِي الرَّكْعَةِ الْوَاحِدَةِ

**٥٣٨-** عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: جَاءَ نَهِيكُ بْنُ سِنَانٍ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدُ هَذَا الْحَرْفَ: ﴿مِن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ۝١٥﴾ محمد، أَوْ يَاسِنٍ؟ فَقَالَ: أَكُلَّ الْقُرْآنِ أَحْصَيْتَ إِلَّا هَذَا؟ قَالَ: إِنِّي لَأَقْرَأُ الْمُفَصَّلَ فِي رَكْعَةٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ إِنَّ أَقْوَامًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ بِأَلْسِنَتِهِمْ لَا يَعْدُو تَرَاقِيَهُمْ، وَلَكِنَّهُ إِذَا دَخَلَ فِي قَلْبٍ فَرَسَخَ فِيهِ نَفَعَ، وَإِنَّ أَخْيَرَ الصَّلَاةِ الرُّكُوعُ وَالسُّجُودُ، وَإِنِّي أَعْلَمُ النَّظَائِرَ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ بِهِنَّ سُورَتَيْنِ فِي رَكْعَةٍ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِ عَلْقَمَةَ فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ فَعَدَّهُنَّ عَلَيْنَا قَالَ الْأَعْمَشُ: وَهِيَ عِشْرُونَ سُورَةً عَلَى تَأْلِيفِ عَبْدِ اللَّهِ أَوَّلُهُنَّ الرَّحْمَنُ وَآخِرَتُهُنَّ الدُّخَانُ: الرَّحْمَنُ، وَالنَّجْمُ، وَالذَّارِيَاتُ، وَالطُّورُ هَذِهِ النَّظَائِرُ، وَاقْتَرَبَتِ وَالْحَاقَّةُ، وَالْوَاقِعَةُ، وَن وَالنَّازِعَاتُ وَسَأَلَ سَائِلٌ، وَالْمُدَّثِّرُ، وَالْمُزَّمِّلُ، وَوَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، وَعَبَسَ وَلَا أُقْسِمُ، وَهَلْ أَتَى، وَالْمُرْسَلَاتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ[١].

## باسی ڕێگەدان بە خوێندنی دوو سوڕەت لە یەك ڕکاتدا

واتە: شەقیق دەڵێ: نوهەیکی کوڕی سینان هات بۆ لای عەبدوڵا ﷺ وتی: شێوازی خوێندنەوەی ئەم وشە چۆن دەبینی: ﴿مِن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ۝١٥﴾ یان (يَاسِنٍ)؟ (واتە: پیاوێك پرسیاری لە ئیبنو مەسعود ﷺ کرد ئایا ئەوە (ءاسِنٍ) یان (يَاسِنٍ)ە؟) ئەویش وتی: ئایا تۆ هەموو قوڕئانت خوێندووە جگە لەم وشە نەبێت؟ وتی: من هەموو (الْمُفَصَّلَ) دەخوێنم لە یەك ڕکاتدا، (واتە: لە سوورەتی (قٓ) بۆ کۆتایی قوڕئان)، عەبدوڵا ﷺ وتی: ئەمە وەکوو شیعر خوێندن وایە (لەوەی زۆر پەلەی تیادا دەکات)،

---

(١) صحيح.

بەڕاستی خەڵكانێك هەن بە زمانیان قورئان دەخوێنن لە گەرویان ناچێتە خوارەوە، بەڵام ئەگەر چووە دڵێکەوە و دامەزرا تیایدا سوودی لێ وەردەگرێ، بەڕاستی چاکترین نوێژ ڕکووعبردن و سوژدەبردنە، بێگومان ئەو سوڕەتانە دەزانم کە لە یەکدییەوە نزیکن، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو سوڕەتی لە یەك ڕکاتدا دەخوێند (لەدوای سوڕەتی فاتیحە)، پاشان دەستی عەلقەمەی گرت چووە ژوورەوە، پاشان هاتە دەرەوە هەموو ئەو سوڕەتانەی بۆمان ژمارد، ئەعمەش وتی: ئەوانیش بیست سوڕەتن بەپێی دانانی عەبدوڵا، یەکەمینیان سوڕەتی (الرَّحْمَنُ)ە کۆتاهەمینیشیان سوڕەتی (الدُّخَانُ)ە: (الرَّحْمَنُ، وَالنَّجْمُ، وَالذَّارِيَاتُ، وَالطُّورُ هَذِهِ النَّظَائِرُ، وَاقْتَرَبَتِ وَالْحَاقَّةُ، وَالْوَاقِعَةُ، وَن وَالنَّازِعَاتُ وَسَأَلَ سَائِلٌ، وَالْمُدَّثِّرُ، وَالْمُزَّمِّلُ، وَوَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، وَعَبَسَ وَلَا أُقْسِمُ، وَهَلْ أَتَى، وَالْمُرْسَلَاتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ).

## بَابُ إِبَاحَةِ جَمْعِ السُّوَرِ فِي الرَّكْعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنَ الْمُفَصَّلِ

**٥٣٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ الْعُقَيْلِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ السُّوَرِ فِي الرَّكْعَةِ؟ قَالَتِ: «الْمُفَصَّلُ». وَقَالَ الدَّوْرَقِيُّ فِي حَدِيثِهِ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: «إِذَا جَاءَ مِنْ مَغِيبِهِ؟» قُلْتُ: أَكَانَ يَقْرِنُ السُّوَرَ؟ قَالَتِ: «الْمُفَصَّلُ»، قُلْتُ: أَكَانَ يُصَلِّي جَالِسًا؟ قَالَتْ: «بَعْدَمَا حَطَمَهُ النَّاسُ»[1].

## باسی ڕێگەدان بە کۆکردنەوەی چەند سوڕەتێك لە یەك ڕکاتدا لە سوڕەتە موفەصەلەکان

واتە: عەبدوڵای کوڕی شەقیقی عوقەیلی دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکاتێکدا چەند سوڕەتێکی دەخوێند وتی: سوڕەتە (الْمُفَصَّلُ)کان. (واتە: لە سوڕەتی (قَ) بۆ کۆتایی قورئان). دەوڕەقی لە فەرموودەکەیدا دەڵێ: بە عائیشەم ﵂ وت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ وتی: نەخێر، مەگەر لە گەشتێکی بگەڕایەتەوە، وتم: ئایا پێغەمبەر ﷺ چەند سوڕەتێکی پێکەوە لە یەك ڕکاتدا

---

(١) صحيح.

دەخوێند؟ وتی: بەڵێ، سورەتە (الْمُفَصَّلُ)ەکان، وتم: ئایا پێغەمبەر ﷺ بەدانیشتەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ، دوای ئەوەی کەوتە نێو ساڵەوە.

**بَابُ إِبَاحَةِ تَرْدِيدِ الْآيَةِ الْوَاحِدَةِ فِي الصَّلَاةِ مِرَارًا عِنْدَ التَّدَبُّرِ وَالتَّفَكُّرِ فِي الْقُرْآنِ إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ؛ فَإِنَّ جَسْرَةَ بِنْتَ دَجَاجَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يُرَدِّدُهَا وَالْآيَةُ: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة.**

**باسی ڕێگەدان بە دووبارەکردنەوەی ئایەتێك لە نوێژدا لە کاتی تێڕامان و بیرکردنەوە لە قورئان ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، چونکە جەسرەی کچی دەجاجە وتی: گوێم لە ئەبو زەڕ بوو دەیوت: پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی کرد ئایەتێکی خوێند هەتا بەیانی دووبارەی دەکردەوە، ئایەتەکەش ئەمەیە: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ واتە: پەروەردگار ئەگەر سزایان بدەی ئەوا ئەوان بەندەی تۆن، وە ئەگەر لێیان خۆش بیت ئەوە تۆ باڵادەست و کاربەجێی**

**بَابُ إِبَاحَةِ قِرَاءَةِ السُّورَةِ الْوَاحِدَةِ فِي رَكْعَتَيْنِ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ**

**٥٤٠-** عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ، أَوْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ[١].

**باسی ڕێگەدان بە خوێندنی یەك سورەت لە دوو ڕکاتدا لە نوێژی فەرز**

واتە: هیشام دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، ئەبو ئەیوب یان زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

**٥٤١-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ لِمَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ: يَا أَبَا عَبْدِ الْمَلِكِ، أَتَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِـ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَإِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَقَالَ: نَعَمْ قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: فَمَحْلُوفَةٌ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فَيَبْدَأُ بِأَطْوَلِ الطُّولَيَيْنِ المص[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عورووەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: زەیدی کوڕی سابیت بە مەڕوانی کوڕی حەکەمی وت: ئەی باوکی عەبدولمەلیك ئایا لە نوێژی ئێوارەدا: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) وتی: بەڵێ، زەیدی کوڕی سابیت ﷺ وتی: سوێند بەو خوایە کە تەنها ئەو شیاوی سوێندپێخواردنە، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی (لە نوێژی ئێوارە) درێژترینی دوو سوڕەتەکەی خوێندووە (المص) (واتە: سوڕەتی ئەعراف).

## بَابُ الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ بِالْمَسْأَلَةِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ الرَّحْمَةِ، وَالِاسْتِعَاذَةِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ الْعَذَابِ، وَالتَّسْبِيحِ عِنْدَ قِرَاءَةِ آيَةِ التَّنْزِيهِ

**٥٤٢-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَافْتَتَحَ الْقِرَاءَةَ، فَقَرَأَ حَتَّى انْتَهَى إِلَى الْمِائَةِ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى بَلَغَ الْمِائَتَيْنِ، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، ثُمَّ قَرَأَ حَتَّى خَتَمَهَا، فَقُلْتُ: يَرْكَعُ، ثُمَّ افْتَتَحَ النِّسَاءَ، فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ، فَكَانَ رُكُوعُهُ مِثْلَ قِيَامِهِ، وَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، ثُمَّ سَجَدَ، وَكَانَ سُجُودُهُ مِثْلَ رُكُوعِهِ، فَقَالَ فِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، وَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ تَعَوَّذَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَنْزِيهٌ لِلَّهِ سَبَّحَ»[1].

## باسی پاڕانەوە لە نوێژدا بە داواکردن لە کاتی خوێندنی ئایەتی ڕەحمەت، وە پەناگرتن لە کاتی خوێندنی ئایەتی سزا، وە تەسبیحکردن لە کاتی خوێندنی ئایەتی بەپاك و بێگەرد ڕاگرتنی خوا

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، دەستی کرد بە خوێندنی قورئان، خوێندی تا گەیشتە سەد ئایەت، وتم: دەچێتە ڕکووع، پاشان بەردەوام بوو هەتا گەیشتە دوو سەد ئایەت، وتم: دەچێتە ڕکووع، پاشان خوێندی هەتا تەواوی کرد، وتم: دەچێتە ڕکووع، پاشان دەستی کرد بە سوڕەتی (النِّسَاء) و خوێندی، پاشان چووە ڕکووع، ڕکووعبردنەکەی وەکوو ڕاوەستانی وا بوو، لە ڕکووعەکەیدا فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) پاشان سوژدەی برد، جا سوژدەبردنەکەی وەکوو ڕکووعەکەی وا بوو، لە سوژدەکەیدا فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) جا ئەگەر بەلای

---

(١) صحيح.

ئایەتی ڕەحمەت تێپەڕ بووایە داوای (لێخۆشبوونی لە خوا) دەکرد، وە ئەگەر بەلای ئایەتی سزا تێپەر بووایە پەنای دەگرت (بە خوا لێی)، وە ئەگەر بەلای ئایەتێك تێپەڕ بووایە بەپاکڕاگرتنی خوای تێدا بووایە، تەسبیحی دەکرد.

٥٤٣- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، مَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ عِنْدَهَا، فَسَأَلَ، وَلَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ عِنْدَهَا فَتَعَوَّذَ[1].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد، تێ نەدەپەڕی بەلای ئایەتی ڕەحمەت ئیللا لەسەری دەوەستا، داوای (لێخۆشبوون سۆز و ڕەحمەتی لە خوا) دەکرد، هەروەها تێ نەدەپەڕی بەلای ئایەتی سزادا ئیللا لەسەری دەوەستا و پەنای دەگرت (بە خوا لێی).

## بَابُ إِجَازَةِ الصَّلَاةِ بِالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّهْلِيلِ لِمَنْ لَا يُحْسِنُ الْقُرْآنَ

٥٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي شَيْئًا يُجْزِئُنِي مِنَ الْقُرْآنِ، فَإِنِّي لَا أَقْرَأُ، فَقَالَ: قُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ قَالَ: فَضَمَّ عَلَيْهَا الرَّجُلُ بِيَدِهِ قَالَ: هَذَا لِرَبِّي، فَمَا لِي؟ قَالَ: قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، وَعَافِنِي قَالَ: فَضَمَّ عَلَيْهَا بِيَدِهِ الْأُخْرَى وَقَامَ[2].

## باسی دروستە نوێژ ئەنجام بدرێ بە (سُبْحَانَ اللَّهِ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ) و (الْحَمْدُ لِلَّهِ) و (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بۆ ئەو کەسەی نازانێ قورئان بخوێنێت

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ناتوانم فێری قورئانخوێندن بم، شتێکم فێر بکە لە جێگای ئەو بیڵێم، فەرمووی: بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ)، وتی: کابرا دەستی نوقاند و وتی: ئەمە بۆ پەروەردگارمە

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

ئەی کامە بۆ منە؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە لێم خۆش بە و ڕەحمم لێ بکە و هیدایەتم بدە و ڕزق و ڕۆزیم بدە و لەشساغ و سەلامەتم بکە، وتی: دەستەکەی دیکەی نوقاند و هەستا.

**٥٤٥-** عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا - قَالَ رِفَاعَةُ: وَنَحْنُ مَعَهُ - إِذْ جَاءَ رَجُلٌ كَالْبَدَوِيِّ فَصَلَّى فَأَخَفَّ صَلَاتَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، فَرَجَعَ فَصَلَّى، ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، وَقَالَ: «ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، فَفَعَلَ ذَلِكَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَأْتِي النَّبِيَّ ﷺ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ، وَيَقُولُ: «وَعَلَيْكَ، فَارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، فَخَافَ النَّاسُ وَكَبُرَ عَلَيْهِمْ أَنْ يَكُونَ مَنْ أَخَفَّ صَلَاتَهُ لَمْ يُصَلِّ، فَقَالَ الرَّجُلُ فِي آخِرِ ذَلِكَ: فَأَرِنِي أَوْ عَلِّمْنِي فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أُصِيبُ وَأُخْطِئُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَجَلْ، إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَتَوَضَّأْ كَمَا أَمَرَكَ اللَّهُ، ثُمَّ تَشَهَّدْ، فَأَقِمْ، ثُمَّ كَبِّرْ، فَإِنْ كَانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَاقْرَأْ بِهِ وَإِلَّا فَاحْمَدِ اللَّهَ، وَكَبِّرْهُ، وَهَلِّلْهُ، ثُمَّ ارْكَعْ فَاطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ اعْتَدِلْ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ فَاعْتَدِلْ سَاجِدًا، ثُمَّ اجْلِسْ فَاطْمَئِنَّ جَالِسًا، ثُمَّ قُمْ، فَإِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ فَقَدْ تَمَّتْ صَلَاتُكَ، وَإِنِ انْتَقَصْتَ مِنْهَا شَيْئًا انْتَقَصْتَ مِنْ صَلَاتِكَ» قَالَ: وَكَانَتْ هَذِهِ أَهْوَنُ عَلَيْهِمْ مِنَ الْأُولَى، أَنَّ مَنِ انْتَقَصَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا انْتَقَصَ مِنْ صَلَاتِهِ وَلَمْ يَذْهَبْ كُلُّهَا»[1].

واتە: ریفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو، -ریفاعە وتی: ئێمەیش لەگەڵی بووین- پیاوێك هات لە دەشتەکی دەچوو، نوێژێ کرد، نوێژەکەی کورت کردەوە و حەقی خۆی پێ نەدا، کە تەواوی کرد سڵاوی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سڵاو لەسەر خۆشت، بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە، دواتر گەڕایەوە و نوێژی کرد، پاشان هات سڵاوی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە، دوو جار یان سێ جار ئەوەی پێ دووبارە کردەوە، هەموو جارەکان دەهات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێ دەکرد، ئەویش دەیفەرموو: لەسەر خۆت، بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە، خەڵکەکە ترسان و قورس بوو بەلایانەوە کە هەر کەسێك نوێژەکەی کورت بێت

---

(١) صحيح.

وەکوو ئەوە وایە نوێژی نەکردبێت، پیاوەکە لە کۆتاییدا وتی: نیشانم بدە یا وتی: فێرم بکە چونکە من مرۆڤم دەیپێکم و هەڵە دەکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە، ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ دەستنوێژ بگرە وەکوو چۆن خوا فەرمانی پێ کردووی، پاشان دوای دەستنوێژ شایەتمان بهێنە، دواتر قامەت بکە، ئینجا تەکبیر (اللَّهُ أَكْبَرُ) بکە، چەندت زانی لە قورئان بخوێنە، ئەگەرنا تەکبیر و (اللَّهُ أَكْبَرُ) تەحمید و (الْحَمْدُ لِلَّهِ) تەهلیل (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بکە، پاشان ڕکووع ببە و لە ڕکووعەکەدا ئارام بگرە، پاشان هەستەوە هەتا بەتەواوی ڕێك دەبیتەوە، پاشان سوژدە ببە لە سوژدەکەدا ئارام بگرە، پاشان هەستەوە، ئەگەر ئەوەت کرد ئەوە نوێژەکەت بەتەواوی ئەنجام داوە، ئەگەر کەموکوڕیت تێدا کرد ئەوە لە نوێژەکەتدا کەموکوڕیت کردووە. وتی: ئەمە ئاسانتر بوو لەسەریان لە یەکەم، کەوا هەر کەسێك کەموکوڕییەکی تێدا بکات ئەوە کەموکوڕی تەنها لە نوێژەکەیدا کردووە، هەموو نوێژەکەی ناڕوات.

## بَابُ إِبَاحَةِ قِرَاءَةِ بَعْضِ السُّورَةِ فِي الرَّكْعَةِ الْوَاحِدَةِ لِلْعِلَّةِ تَعْرِضُ لِلْمُصَلِّي

**٥٤٦**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَكَّةَ الصُّبْحَ، وَاسْتَفْتَحَ سُورَةَ الْمُؤْمِنُونَ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى، وَهَارُونَ، أَوْ ذِكْرُ عِيسَى - مُحَمَّدُ بْنُ عَبَّادٍ شَكَّ أَوِ اخْتَلَفُوا عَلَيْهِ - أَخَذَتِ النَّبِيَّ ﷺ سَعْلَةٌ قَالَ: فَرَكَعَ قَالَ: وَابْنُ السَّائِبِ حَاضِرٌ ذَلِكَ[1].

## باسی خوێندنی چەند ئایەتێك لە سورەتێك لە یەك ڕکاتدا بەهۆی ناڕەحەتییەك تووشی نوێژخوێن دەبێت

واتە: عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی لە مەککە کرد، بە سورەتی (الْمُؤْمِنُونَ) دەستی پێ کرد، هەتا گەیشتە باسی موسا و هارون، یان باسی عیسا- موحەممەدی کوڕی عەباد گومانی هەبوو کامەیانە یان جیاوازییان لەسەری هەیە- پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە کۆکە، پاشان ڕکووعی برد، (گێڕەرەوەکە) وتی: ئیبنو سائیب لەوێ بوو.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَاةِ وَالْمُخَافَتَةِ بِهَا

٥٤٧- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: فِي كُلِّ صَلَاةٍ يُقْرَأُ، فَمَا أَسْمَعَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَسْمَعْنَاكُمْ، وَمَا أَخْفَى عَنَّا أَخْفَيْنَاهُ عَنْكُمْ[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ بَيَّنْتُ فِي كِتَابِ الْإِمَامَةِ جَمِيعَ مَا يَنْبَغِي لِلْمُصَلِّي أَنْ يُعْلِنَ بِالْقِرَاءَةِ فِيهَا مِنَ الصَّلَوَاتِ، وَمَا عَلَيْهِ أَنْ يُخَافِتَ بِهَا عَلَى مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْلِنَ وَيُخَافِتُ.

## باسی قورئانخوێندن بەدەنگی بەرز لە نوێژدا هەروەها بەدەنگی نزمیش

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە هەر نوێژێك كە قورئانی تێدا دەخوێنرێت، ئەوەی بیستوومانە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگی بەرز خوێندوویەتی بەدەنگی بەرز بۆتان دەخوێنین، (وەك نوێژی بەیانی و ئێوارە و عیشا) وە ئەوەی بەشاراوە خوێندوویەتی ئێمەیش بەپەنهان دەیخوێنین (وەك نوێژی نیوەڕۆ و عەسر).

ئەبو بەكر دەڵێ: بێگومان لە (كِتَابِ الْإِمَامَةِ) هەموو ئەوانەم ڕوون كردۆتەوە كە دەبێ نوێژخوێن قورئان بەدەنگی بەرز بخوێنێ لە نوێژەكان، هەروەها ئەوەیشی كە پێویستە بەدەنگی نزم بیخوێنێ بەوشێوەیەی پێغەمبەر ﷺ بەئاشكرا و بەشاراوە خوێندوویەتی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

٥٤٨- عَن ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَشَفَ النَّبِيُّ ﷺ السِّتَارَةَ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَهُ، أَلَا إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردن لە قورئانخوێندن لەنێو ڕکووع و سوژدەدا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (لەو نەخۆشییەی کە بەهۆیەوە کۆچی دوایی کرد) پەردەی لا دا خەڵکەکەش ڕیزیان بەستبوو لەپشت ئەبو بەکر، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی مژدەدانی پێغەمبەرایەتی نەما جگە لە خەوی چاك کەسێکی موسوڵمان ببینێ یان خەوی پێوە ببینن، ئاگادار بن من قەدەغەم لێ کراوە لە ڕکووع یان لە سوژدەدا قورئان بخوێنم، بەڵام لە ڕکووعدا پەروەردگار بەگەورە ڕابگرن، وە لە سوژدەشدا بپاڕێنەوە چونکە شیاوە لێتان وەربگیرێ.

## بَابُ فَضْلِ السُّجُودِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ وَبُكَاءِ الشَّيْطَانِ وَدُعَائِهِ بِالْوَيْلِ لِنَفْسِهِ عِنْدَ سُجُودِ الْقَارِئِ السَّجْدَةَ

**٥٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي، وَيَقُولُ: يَا وَيْلَهُ أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ، وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ[١].

## باسی فەزڵ و گەورەیی سوژدەبردن لە کاتی خوێندنی ئایەتێك کە سوژدەی تێدا بێت، وە گریانی شەیتان و نزاکردنی لە نەفسی خۆی بە تیاچوون، لە کاتی سوژدەبردنی قورئانخوێن لە ئایەتی سوژدە

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر نەوەی ئادەم ئایەتی سوژدەی خوێند، دواتر سوژدەی برد، شەیتان وازی لێ دەهێنێ و دەگری، دەڵێ: ئەی هاوار نەوەی ئادەم فەرمانی پێ کرا بە سوژدەبردن، سوژدەی برد و بەهەشتی مسۆگەر کرد، منیش فەرمانم پێ کرا بە سوژدەبردن، سوژدەم نەبرد ئاگرم مسۆگەر کرد.

---

(١) صحيح.




## بَابُ السَّجْدَةِ فِي ص

٥٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: ص لَيْسَتْ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ فِيهَا[١].

## باسی سوژدەبردن لە خوێندنی سورەتی (ص)

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: ئایەتی سوژدە لە سورەتی (ص) زۆر جەخت لەسەر سوژدەبردنی نەکراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی سوژدەی تێدا برد.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ص

٥٥١ - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَسْجُدُ فِي ص، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ۝٩٠﴾ الأنعام، وَقَالَ: سَجَدَهَا دَاوُدُ، وَسَجَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[٢].

## باسی هۆکاری سوژدەبردنی پێغەمبەر ﷺ لە خوێندنی سورەتی (ص)دا

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو لە سورەتی (ص) سوژدەی برد، پێی وترا: وتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ۝٩٠﴾، واتە: ئا ئەوانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ) شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە. وتی: داود (علیه السلام) سوژدەی بردووە (لەو شوێنەدا)، وە پێغەمبەری خواش ﷺ سوژدەی بردووە.

٥٥٢- «عَنِ الْمُجَاهِدِ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: سَجْدَةُ «ص» مِنْ أَيْنَ أَخَذْتَهَا؟ قَالَ: فَتَلَا عَلَيَّ: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ ۝٨٤﴾ الأنعام، حَتَّى بَلَغَ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ۝٩٠﴾ الأنعام، قَالَ: كَانَ دَاوُدُ سَجَدَ فِيهَا، فَلِذَلِكَ سَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نا الْأَشَجُّ، نا ابْنُ أَبِي غَنِيَّةَ، نا الْعَوَّامُ بْنُ حَوْشَبٍ بِهَذَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: موجاهید دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﷺ وت: سوژدەبردنی سورەتی (ص) لە کوێوە هێناوەتە؟ وتی: ئەم ئایەتەی بەسەرمدا خوێندەوە: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ ﴿٨٤﴾﴾، واتە: وە لە نەوەی ئەمانیش داود و سولەیمان و ئەیوب. هەتا گەیشتە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴿٩٠﴾﴾، واتە: ئا ئەوانەن کە خوای گەورە هیدایەتی داون تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ) شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە. وتی: داود سوژدەی تێدا بردووە، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ سوژدەی تێدا برد.

## بَابُ السُّجُودِ فِي النَّجْمِ

٥٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَرَأَ النَّجْمَ فَسَجَدَ فِيهَا، وَسَجَدَ مَنْ كَانَ مَعَهُ غَيْرَ أَنَّ شَيْخًا أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ، وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا[١].

## باسی سوژدەبردن لە خوێندی سورەتی (النَّجْمَ)

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سورەتی (النَّجْم)ی خوێند و سوژدەی تێدا برد، ئەوەیشی لەگەڵی بوو سوژدەی برد جگە لە پیاوێکی بەساڵاچوو، مشتێ زیخ یان خۆڵی هەڵگرت بەرزی کردەوە بۆ نێوچاوانی و وتی: ئەوەم بەسە، عەبدوڵا وتی: بێگومان دواتر ئەو پیاوەم بینی بەبێباوەڕی کوژرا (واتە: سوژدەی نەبرد، بەڵکوو خۆڵەکەی لە نێوچاوانی نزیك کردەوە و وتی: ئەوەندە بەسە).

---

(١) صحیح.

## بَابُ السُّجُودِ فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ، وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ

**٥٥٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، وَإِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ[١].

## باسی سوژدەبردن لە (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) و (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ)

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەمان برد لە خوێندنی سورەتی: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) و (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ).**

**٥٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: سَجَدْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ وَفِي اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ سوژدەم برد لە خوێندنی سورەتی: (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) و (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ).**

## بَابُ صِفَةِ سُجُودِ الرَّاكِبِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ

**٥٥٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ عَامَ الْفَتْحِ سَجْدَةً فَسَجَدَ النَّاسُ كُلُّهُمْ، فَمِنْهُمُ الرَّاكِبُ وَالسَّاجِدُ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى إِنَّ الرَّاكِبَ لَيَسْجُدُ عَلَى يَدِهِ[٣].

## باسی چۆنیەتی سوژدەبردنی سوار لە کاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی فەتحی مەککە کاتێ ئایەتی سوژدەی خوێند، خەڵککە هەموویان سوژدەیان برد، تیایاندا بوو سوار بوو، تیایشیاندا بوو پیادە بوو لەسەر زەوی سوژدەی برد، تەنانەت سوار هەبوو لەسەر دەستی سوژدەی برد.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ سُجُودِ الْمُسْتَمِعِ لِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْقَارِئِ السَّجْدَةَ إِذَا سَجَدَ

**٥٥٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ، فَيَقْرَأُ السُّورَةَ فِيهَا السَّجْدَةُ فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ، حَتَّى لَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَكَانًا لِجَبِينِهِ[١].

**باسی چاکتر وایە ئەو کەسەی گوێ بۆ قورئانخوێندن دەگرێ لەو کاتەی قورئانخوێن ئایەتی سوژدە دەخوێنێ سوژدە ببات ئەگەر قورئانخوێن سوژدەی برد**

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی بەسەرماندا دەخوێند، سورەتی دەخوێند سوژدەی تێدا بوو، دواتر سوژدەی دەبرد ئێمەیش لەگەڵی سوژدەمان دەبرد، تەنانەت یەکێك لە ئێمە جێگایەکی نەدەبینییەوە نێوچاوی لەسەر دابنێت.

**٥٥٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭬ قَالَ: كُنَّا نَقْرَأُ السَّجْدَةَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَيَسْجُدُ، وَنَسْجُدُ مَعَهُ حَتَّى يَزْحَمَ بَعْضُنَا بَعْضاً[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﭬ دەڵێ: ئێمە ئایەتی سوژدەمان دەخوێند لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەو سوژدەی دەبرد، ئێمەیش لەگەڵی سوژدەمان دەبرد هەتا هەندێکمان پاڵ پاڵێنمان کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَسْجُدْ فِي الْمُفَصَّلِ بَعْدَ هِجْرَتِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ

**٥٥٩-** عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ فَوْقَ هَذَا الْمَسْجِدِ، فَقَرَأَ إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ فَسَجَدَ فِيهَا، وَقَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ فِيهَا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﵁ إِنَّمَا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَسْلَمَ بَعْدَ الْهِجْرَةِ بِسِنِينَ قَالَ فِي خَبَرِ عِرَاكِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَالنَّبِيُّ ﷺ بِخَيْبَرَ قَدِ اسْتَخْلَفَ عَلَى الْمَدِينَةِ سِبَاعَ بْنَ عُرْفُطَةَ وَقَالَ قَيْسُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: صَحِبْتُ النَّبِيَّ ثَلَاثَ سَنَوَاتٍ، وَقَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، وَقَدْ أَعْلَمْتُ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا أَنَّ الْمُخْبِرَ وَالشَّاهِدَ الَّذِي يَجِبُ قَبُولُ شَهَادَتِهِ وَخَبَرِهِ مَنْ يُخْبِرُ بِكَوْنِ الشَّيْءِ، وَيَشْهَدُ عَلَى رُؤْيَةِ الشَّيْءِ وَسَمَاعِهِ، لَا مَنْ يَنْفِي كَوْنَ الشَّيْءِ وَيُنْكِرُهُ وَمَنْ قَالَ: لَمْ يَفْعَلْ فُلَانٌ كَذَا لَيْسَ بِمُخْبِرٍ وَلَا شَاهِدٍ، وَإِنَّمَا الشَّاهِدُ مَنْ يَشْهَدُ وَيَقُولُ: رَأَيْتُ فُلَانًا يَفْعَلُ كَذَا، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ كَذَا، وَهَذَا لَا يَخْفَى عَلَى مَنْ يَفْهَمُ الْعِلْمَ وَالْفِقْهَ، وَقَدْ بَيَّنْتُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ مِنْ كُتُبِنَا. وَتَوَهَّمَ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّ خَبَرَ الْحَارِثِ بْنِ عُبَيْدٍ، عَنْ مَطَرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَسْجُدْ فِي شَيْءٍ مِنَ الْمُفَصَّلِ مُنْذُ تَحَوَّلَ إِلَى الْمَدِينَةِ حُجَّةُ مَنْ زَعَمَ أَنْ لَا سُجُودَ فِي الْمُفَصَّلِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَعْلَمْتُ أَنَّ الشَّاهِدَ مَنْ يَشْهَدُ بِرُؤْيَةِ الشَّيْءِ أَوْ سَمَاعِهِ لَا مَنْ يُنْكِرُهُ وَيَدْفَعُهُ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ ﵁ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ سَجَدَ فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ، وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ بَعْدَ تَحَوُّلِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ إِذْ كَانَتْ صُحْبَتُهُ إِيَّاهُ إِنَّمَا كَانَ بَعْدَ تَحَوُّلِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى الْمَدِينَةِ لَا قَبْلُ.

## باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە پێغەمبەر ﷺ دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە لە سورەتە (الْمُفَصَّل)ەکاندا سوژدەی نەبرد

واتە: نوعەیمی کوڕی عەبدوڵای موجمیر دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە ﵁ نوێژم کرد لە سەربانی ئەم مزگەوتە، سورەتی (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) سوژدەی تێدا برد و وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی سوژدەی تێدا برد.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﵁ ساڵانێك دوای هیجرەت هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و موسوڵمان بوو، لە ڕیوایەتی عیراکی کوڕی مالیك هاتووە، ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: هاتمە مەدینە پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بوو، سیباعی کوڕی عورفوتە بە جێنشینی خۆی دانابوو لە مەدینە. قەیسی کوڕی ئەبو حازم دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﵁ بوو دەیوت: سێ ساڵ هاوەڵی پێغەمبەرم ﷺ کرد، بێگومان ڕایگەیاندووە ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی سوژدەی برد لە سورەتی: (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) و (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) لە چەند

شوێنێکی کتێبەکەمان باسمان کرد، بێگومان ئەو هەواڵدەر و شایەتیدەرە کە پێویستە شایەتی و هەواڵەکەی وەربگیرێ، کە لەبارەی شتێکەوە هەواڵ دەدات، وە شایەتی دەدات لەسەر بینینی شتێك و بیستنی، وەکوو ئەوە نییە خودی شتەکە ڕەت دەکاتەوە و نکوولّی دەکات، هەر کەسێك بڵێ: فڵانە کەس فڵان شتی نەکرد، ئەوە نە هەواڵی داوە و نە شایەتی، بەڵکوو شایەت ئەو کەسەیە ئامادە بێت و بڵێ: فڵانە کەسم بینی فڵان کاری دەکرد، وە گوێم لێ بوو ئاوا و ئاوای دەوت، ئەمەش شاراوە نییە لەلای ئەو کەسەی لە زانست و فیقە تێ دەگات، بێگومان ئەم مەسەلەیەم لە چەند شوێنێکی کتێبەکەماندا ڕوون کردۆتەوە. وە بەهەڵەدا چووە ئەو کەسەی شارەزا نییە لە زانست پێی وایە فەرموودەکەی حارسی کوڕی عوبەید لە مەتەر لە عیکریمە لە ئیبنو عەباسەوە ﷻ پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی چوو بۆ مەدینە سوژدەی لە هیچ یەکێك لە سوڕەتەکانی (الْمُفَصَّل) نەبردووە (واتە: لە سوڕەتی (قٓ) بۆ کۆتایی قورئان) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوژدە نییە لە سوڕەتە (الْمُفَصَّل)کان، ئەم شێوازەیش کە باسم کرد، شایەت ئەو کەسەیە شایەتی دەدات لەسەر بینینی شتێك، یان بیستنی نەك ئەو کەسەی نکوولّی دەکات و ڕەتی دەکاتەوە، ئەبو هوڕەیرە ﷺ ڕایگەیاندووە کە ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی سوژدەی برد لە (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ، وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) دوای کۆچی بۆ مەدینە، چونکە ئەبو هوڕەیرە دوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە هاوەڵی کرد، نەك پێش کۆچ.

٥٦٠- عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مَطَرٌ الْوَرَّاقُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، أَوْ غَيْرِهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ[1].
واتە: لەم ڕێگایشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ السُّجُودِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ ضِدُّ قَوْلِ بَعْضِ أَهْلِ الْجَهْلِ مِمَّنْ لَا يَفْهَمُ الْعِلْمَ مِنْ أَهْلِ عَصْرِنَا مِمَّنْ زَعَمَ أَنَّ السَّجْدَةَ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ غَيْرُ جَائِزَةٍ

٥٦١- عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ صَلَاةَ الْعَتَمَةِ، وَقَرَأَ: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١﴾ الانشقاق، فَسَجَدَ، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذِهِ السَّجْدَةُ؟ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ وَقَالَ الصَّنْعَانِيُّ: عَنْ أَبِيهِ، وَزَادَ فِي آخِرِ الْخَبَرِ: فَلَا أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ[2].

---

(١) إسناده ضعيف.
(٢) صحيح.

### باسی سوژدەبردن لە کاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە لە نوێژی فەرز، بە پێچەوانەی وتەی هەندێ لە خەڵکی نەفام ئەوەی لە زانست تێ ناگات لە خەڵکی ئەم سەردەمەمان کە گومان دەبات سوژدەبردن لە کاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە لە نوێژی فەرزدا دروست نییە

واتە: ئەبو ڕافیع دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە ﷺ نوێژی عیشام کرد، سورەتی ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ ی خوێند، دواتر سوژدەی برد، پێم وت: ئەو سوژدەیە چییە؟ وتی: لەپشت باوکی قاسمەوە ﷺ بە خوێندنی سوژدەم برد. صەنعانی دەڵێ: لە باوکیەوە، لە کۆتایی فەرموودەکە ئەوەی زیاد کرد: بەردەوام سوژدە دەبەم بە خوێندنی هەتا دەگەم بە باوکی قاسم ﷺ.

### بَابُ الذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ

٥٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِنِّي رَأَيْتُ فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ كَأَنِّي أُصَلِّي خَلْفَ شَجَرَةٍ، فَرَأَيْتُ كَأَنِّي قَرَأْتُ سَجْدَةً فَسَجَدْتُ، فَرَأَيْتُ الشَّجَرَةَ كَأَنَّهَا تَسْجُدُ بِسُجُودِي، فَسَمِعْتُهَا وَهِيَ سَاجِدَةٌ، وَهِيَ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اكْتُبْ لِي عِنْدَكَ بِهَا أَجْرًا، وَاجْعَلْهَا لِي عِنْدَكَ ذُخْرًا، وَضَعْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَاقْبَلْهَا مِنِّي كَمَا قَبِلْتَ مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ السَّجْدَةَ، ثُمَّ سَجَدَ، فَسَمِعْتُهُ وَهُوَ سَاجِدٌ يَقُولُ مِثْلَ مَا قَالَ الرَّجُلُ عَنْ كَلَامِ الشَّجَرَةِ[١]

### باسی زیکر و پاڕانەوە لە سوژدە لە کاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەم شەو خەونێکم بینی وەکوو ئەوەی خەوتوویەك دەیبینێ، لە خەوەکەمدا وەکوو بڵێی من لەپشت دارێکەوە نوێژم دەکرد، لەنێو نوێژەکەشدا ئایەتی سوژدەم دەخوێند، دواتر سوژدەم برد دارەکەم بینی لە پشتمەوە بە سوژدەکەی من

---

(١) إسناده ضعيف.

سوژدەی برد، گوێم لێ بوو لە سوژدەکەیدا دەیوت: خوایە بەهۆی ئەم سوژدەیەوە لەلای خۆت پاداشتم بۆ بنووسە، وە پاداشتەکەیم بۆ بکە بە توێشوو لەلای خۆت، وە بەهۆیەوە گوناهەکانم لەسەر لابە، وە لێم وەربگرە وەکوو چۆن لە داودی بەندەی خۆتت وەرگرت، ئیبنو عەباس ﵄ وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئایەتی سوژدەی خوێند گوێم لێ بوو لە سوژدەدا ئەوەی دەخوێند کە پیاوەکە لەبارەی قسەی دارەکەوە گێڕایەوە.

**٥٦٣**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: فَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَقَالَ: «وَاحْطُطْ عَنِّي بِهَا وِزْرًا، وَلَمْ يَقُلِ اقْبَلْهَا مِنِّي كَمَا تَقَبَّلْتَ مِنْ عَبْدِكَ دَاوُدَ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَإِنَّمَا كُنْتُ تَرَكْتُ إِمْلَاءَ خَبَرِ أَبِي الْعَالِيَةِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ: سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ؛ لِأَنَّ بَيْنَ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ وَبَيْنَ أَبِي الْعَالِيَةِ رَجُلًا غَيْرَ مُسَمًّى لَمْ يَذْكُرِ الرَّجُلَ عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنِ عَبْدِ الْمَجِيدِ، وَخَالِدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْوَاسِطِيُّ.

واتە: بە هەمان شێوە لە ئیبنو عەباس ﵄ گێڕدراوەتەوە، وتی: گوناهی گەورەم لەسەر لابە، نەیوت: لێم وەربگرە وەکوو چۆن لە داودی بەندەی خۆتت وەرگرت.

ئەبو بەکر دەڵێ: بۆیە من دەستبەرداری فەرموودەکەی ئەبولعالییە بووم لە عائیشەوە ﵂ پێغەمبەر ﷺ لە سوژدەی قورئانخوێندن لە شەودا دەیفەرموو: ڕوخسارم سوژدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە و وێنەی کێشاوە بەچاکترین شێوە، وە بیستن و بینینی بۆ کۆ کردۆتەوە، بە هێز و توانای خۆی، چونکە لە نێوان خالیدی حەزاء و نێوان ئەبولعالییە پیاوێك هەیە ناوی نەهێنراوە، عەبدولوەهابی کوڕی عەبدولمەجید و خالیدی کوڕی عەبدوڵای واسیتی باسی ئەو پیاوەیان نەکردووە.

**٥٦٤** - عَنْ عَائِشَةَ ﵂، غَيْرُ أَنَّ أَبَا بِشْرٍ لَمْ يَقُلْ: بِاللَّيْلِ، وَزَادَ: يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ[2].

واتە: هەمان فەرموودەی پێشوو لە عائیشەوە ﵂ گێڕدراوەتەوە، ئەوە نەبێت ئەبو بیشر نەیوت: بە (اللَّيْلِ) ئەوەیشی زیاد کرد: سێ جار ئەوەی دەوت.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

٥٦٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ مِثْلَ حَدِيثِ بُنْدَارٍ، غَيْرُ أَنَّهُ قَالَ: يَقُولُ «فِي السَّجْدَةِ مِرَارًا»(١).

واتە: هەمان فەرموودەی پێشوو لە عائیشەوە ﵂ گێردراوەتەوە، وەك فەرموودەكەی بوندار ئەوە نەبێت ئەو وتی: چەند جارێك لە خوێندنی ئایەتی سوژدەدا ئەوەی دەفەرموو (واتە: زیكری نێو سوژدە).

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ السُّجُودَ عِنْدَ قِرَاءَةِ السَّجْدَةِ فَضِيلَةٌ لَا فَرِيضَةٌ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ سَجَدَ وَسَجَدَ الْمُسْلِمُونَ مَعَهُ وَالْمُشْرِكُونَ جَمِيعًا، إِلَّا الرَّجُلَيْنِ اللَّذَيْنِ أَرَادَا الشُّهْرَةَ، وَقَدْ قَرَأَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ النَّجْمَ فَلَمْ يَسْجُدْ وَلَمْ يَأْمُرْهُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، وَلَوْ كَانَ السُّجُودُ فَرِيضَةً لَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِهَا، وَلَوْ لَمْ تَكُنْ فِي النَّجْمِ سَجْدَةٌ كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ النَّاسِ لِعِلَّةِ هَذَا الْخَبَرِ الَّذِي سَنَذْكُرُهُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَمَا سَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ فِي النَّجْمِ

٥٦٦- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁ قَالَ: عَرَضْتُ النَّجْمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَسْجُدْ مِنَّا أَحَدٌ(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی سوژدەبردن لە كاتی خوێندنی ئایەتی سوژدە سوننەتە نەك فەرز، چونكە پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد، موسوڵمانان و هاوبەشدانەران پێكەوە سوژدەیان برد جگە لە دوو پیاو نەبێت ئەوانیش مەبەستیان خۆدەرخستن بوو، بێگومان زەیدی كوڕی سابیت ﵁ لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سوڕەتی (النَّجْمَ)ی خوێند سوژدەی نەبرد و فەرمانیشی پێ نەكرد سوژدە ببات، ئەگەر سوژدەبردن فەرز بووایە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دەكرد سوژدە ببات، ئەگەر لە سوڕەتی (النَّجْمَ)دا سوژدە نەبووایە، وەك بەهەڵەداچوون هەندێ لە خەڵك بەهۆی ئەم فەرموودەیەی كە ئێستا بە ویستی خوا باسی دەكەین، پێغەمبەر ﷺ بۆچی لە خوێندنی سوڕەتی (النَّجْمَ) سوژدەی دەبرد

واتە: زەیدی كوڕی سابیت ﵁ دەڵێ: سوڕەتی (النَّجْمَ)م خوێند بۆ پێغەمبەر ﷺ هیچ یەكێك لە ئێمە سوژدەی نەبرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

٥٦٧- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْهُدَيْرِ التَّيْمِيِّ - قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: وَكَانَ رَبِيعَةُ مِنْ خِيَارِ النَّاسِ مِمَّنْ حَضَرَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ - قَالَ رَبِيعَةُ: قَرَأَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ سُورَةَ النَّحْلِ حَتَّى إِذَا أَتَى السَّجْدَةَ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ وَأَحْسَنَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ»[1].

واتە: ڕەبیعەی كوڕی عەبدوڵای كوڕی هودەیری تەیمی -ئەبو بەكری كوڕی ئەبو مولەیكە دەڵێ: ڕەبیعە لە چاكترینی نێو خەڵك بوو لەوانە بوو ئامادە دەبوو لەلای عومەری كوڕی خەتاب ﷺ- دەڵێ: عومەری كوڕی خەتاب ﷺ لە ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر سوڕەتی (النَّحْل)ی خوێند هەتا گەیشتە ئایەتی سوژدە، وتی: ئێمە تێ دەپەڕین بەسەر ئایەتی سوژدە جا هەر كەسێك سوژدەی برد ئەوە پێكاویەتی و چاكی كردووە، هەر كەسێكیش سوژدەی نەبرد گوناهبار نابێت.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى الْمُنْصِتِ السَّامِعِ قِرَاءَةَ السَّجْدَةِ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ السُّجُودُ إِذَا لَمْ يَسْجُدِ الْقَارِئُ، ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ السَّجْدَةَ عَلَى مَنِ اسْتَمَعَ لَهَا وَأَنْصَتَ

٥٦٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ النَّجْمَ فَلَمْ يَسْجُدْ[2].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو كەسەی گوێ لە قوڕئانخوێن دەگرێ تا دەگاتە ئایەتی سوژدە واجب نییە لەسەری سوژدە ببات، ئەگەر قوڕئانخوێن سوژدەی نەبرد، بە پێچەوانەی وتەی ئەو كەسەی پێی وایە ئەو كەسەی گوێ بۆ قوڕئان دەگرێ دەبێت سوژدە ببات

واتە: زەیدی كوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: سوڕەتی (النَّجْمَ)م بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێند، سوژدەی نەبرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الْجَهْرِ بِآمِينَ عِنْدَ انْقِضَاءِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي يَجْهَرُ الْإِمَامُ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ

٥٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَمَّنَ الْقَارِئُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تُؤَمِّنُ، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، قَالَ الْمَخْزُومِيُّ مَرَّةً قَالَ سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ[١].

## باسی دەنگبەرزکردنەوە بە وتنەوەی (آمِينَ) لە کاتی کۆتاییپێهاتنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا، کە پێشنوێژ بەدەنگی بەرز قورئانی تێدا دەخوێنێت

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قورئانخوێن ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، چونکە بەڕاستی فریشتەکان ئامین دەکەن، هەر کەسێك ئامینکردنەکەی یەکانگیر بێتەوە لەگەڵ ئامینکردنی فریشتەکان، ئەوا لە گوناهی پێشووی دەبووردرێت.

٥٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَمَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ «إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا»، مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ الْإِمَامَ يَجْهَرُ بِآمِينَ، إِذْ مَعْلُومٌ عِنْدَ مَنْ يَفْهَمُ الْعِلْمَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَا يَأْمُرُ الْمَأْمُومَ أَنْ يَقُولَ: آمِينَ، عِنْدَ تَأْمِينِ الْإِمَامِ إِلَّا وَالْمَأْمُومُ يَعْلَمُ أَنَّ الْإِمَامَ يَقُولُهُ، وَلَوْ كَانَ الْإِمَامُ يُسِرُّ آمِينَ لَا يَجْهَرُ بِهِ لَمْ يَعْلَمِ الْمَأْمُومُ أَنَّ إِمَامَهُ قَالَ: آمِينَ، أَوْ لَمْ يَقُلْهُ، وَمُحَالٌ أَنْ يُقَالَ لِلرَّجُلِ: إِذَا قَالَ فُلَانٌ كَذَا فَقُلْ مِثْلَ مَقَالَتِهِ، وَأَنْتَ لَا تَسْمَعُ مَقَالَتَهُ، هَذَا عَيْنُ الْمُحَالِ، وَمَا لَا يَتَوَهَّمُهُ عَالِمٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَأْمُرُ الْمَأْمُومَ أَنْ يَقُولَ آمِينَ إِذَا قَالَهُ إِمَامُهُ وَهُوَ لَا يَسْمَعُ تَأْمِينَ إِمَامِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَاسْمَعِ الْخَبَرَ الْمُصَرِّحَ بِصِحَّةِ مَا ذَكَرْتُ أَنَّ الْإِمَامَ يَجْهَرُ بِآمِينَ عِنْدَ قِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پێشنوێژ ئامینی کرد ئێوەش ئامین بکەن، هەر کەسێك ئامینی یەکانگیر بێتەوە لەگەڵ ئامینی فریشتەکان ئەوا لە گوناهی پێشووی دەبووردرێت.

ئەبو بەکر سەبارەت بە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: (إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا)، دەڵێ: ڕوون بۆتەوە و جێگیر بووە پێشنوێژ بەدەنگی بەرز ئامین دەکات، چونکە زانراوە لای ئەو کەسەی شارەزای زانستە پێغەمبەر ﷺ فەرمان بە نوێژخوێن ناکات بڵێ: ئامین، لە کاتی ئامینکردنی پێشنوێژ ئیللا نوێژخوێن دەزانێ پێشنوێژ دەیڵێ، جا ئەگەر پێشنوێژ بەنهێنی ئامینی کرد و دەنگی بەرز نەکردەوە، نوێژخوێن نازانێ پێشنوێژەکەی وتوویەتی: ئامین، یان نەیوتووە، ئەستەمە بە کەسێك بوترێ: ئەگەر فلانە کەس فلان شتی وت تۆش وەکوو ئەو بڵێ، تۆش نازانی ئەو چی دەڵێ، ئەمەش مەحاڵە، بە خەیاڵی زانایەکیشدا نایەت پێغەمبەر ﷺ فەرمان بکات بە نوێژخوێن بڵێ: ئامین ئەگەر پێشنوێژەکەی وتی، لە کاتێکدا نوێژخوێن گوێی لە ئامینی پێشنوێژەکەی نەبێ. ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی ڕوون و ئاشکرا بیبستە لەسەر ڕاستی ئەوەی باسم کرد کە پێشنوێژ بەدەنگی بەرز ئامین دەکات لە کاتی خوێندنی سورەتی فاتیحە.

**٥٧١**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ أُمِّ الْقُرْآنِ رَفَعَ صَوْتَهُ قَالَ: «آمِينَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سورەتی فاتیحەی تەواو دەکرد دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیفەرموو: (آمِينَ).

**٥٧٢**- عَنِ نافع عَن ابْنِ عُمَرَ ﷺ كَانَ إِذَا كَانَ مَعَ الْإِمَامِ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَأَمَّنَ النَّاسُ أَمَّنَ ابْنُ عُمَرَ، وَرَأَى تِلْكَ السُّنَّةَ[2].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ ئەگەر لەپشت پێشنوێژەوە بووایە و فاتیحەی بخوێندایە، دواتر خەڵکەکە ئامینیان بکردایە ئیبنو عومەریش ئامینی دەکرد، پێیشی وا بوو کە ئەوە سوننەتە.

---

(١) حسن الدار قطني في سننه هذا الحديث، ونقله عنه البيهقي.

(٢) إسناده ضعيف.

**٥٧٣-** عَنْ بِلَالٍ ﵁ أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ «لَا تَسْبِقْنِي بِآمِينَ»[(١)].

واتە: بیلال ﵁ دەگێڕێتەوە، ئەو بە پێغەمبەری ﷺ وت: پێشم مەكەوە بە ئامین (واتە: كاتێك بیلال ﵁ دەهاتە مزگەوتەوە پێغەمبەریش ﷺ نوێژی دابەستبوو دەیوت: لەسەرم ڕاوەستە با ئامینكردنەكەم لەگەڵ ئامینكردنەكەت یەكانگیر ببێتەوە).

## بَابُ ذِكْرِ حَسَدِ الْيَهُودِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى التَّأْمِينِ أَنْ يَكُونَ زَجْرُ بَعْضِ الْجُهَّالِ الْأَئِمَّةَ وَالْمَأْمُومِينَ عَنِ التَّأْمِينِ عِنْدَ قِرَاءَةِ الْإِمَامِ شُعْبَةً مِنْ فِعْلِ الْيَهُودِ وَحَسَدًا مِنْهُمْ لِمُتَّبِعِي النَّبِيِّ ﷺ

**٥٧٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ يَهُودِيٌّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: السَّأمُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَعَلَيْكَ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂ فَهَمَمْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ فَعَلِمْتُ كَرَاهِيَةَ النَّبِيِّ ﷺ لِذَلِكَ فَسَكَتُّ، ثُمَّ دَخَلَ آخَرُ، فَقَالَ: السَّأمُ عَلَيْكَ، فَقَالَ: «عَلَيْكَ»، فَهَمَمْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ فَعَلِمْتُ كَرَاهِيَةَ النَّبِيِّ ﷺ لِذَلِكَ، ثُمَّ دَخَلَ الثَّالِثُ، فَقَالَ: السَّأمُ عَلَيْكَ، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قُلْتُ: وَعَلَيْكَ السَّأمُ وَغَضَبُ اللَّهِ وَلَعْنَتُهُ إِخْوَانَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِيرِ، أَتُحَيُّونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِمَا لَمْ يُحَيِّهِ اللَّهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفُحْشَ وَلَا التَّفَحُّشَ قَالُوا قَوْلًا فَرَدَدْنَا عَلَيْهِمْ، إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ حُسَّدٌ، وَهُمْ لَا يَحْسُدُونَا عَلَى شَيْءٍ كَمَا يَحْسُدُونَا عَلَى السَّلَامِ، وَعَلَى آمِينَ»[(٢)].

## باسی حەسوودیبردنی جوولەكەكان بە بڕواداران لەسەر ئامینكردن، بەهەمان شێوە هەندێ لە نەفامان سەرزەنشتی پێشەوا و نوێژخوێنان دەكەن لەسەر ئامینكردن لە كاتی قورئانخوێندنی پێشنوێژ لقێكە لە ڕەفتاری جوولەكەكان، وە ئیرەییبردنیانە بە شوێنكەوتووانی پێغەمبەر ﷺ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: جوولەكەیەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: (السَّامُ عَلَيْك) واتە: مردن لەسەر تۆ ئەی موحەممەد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر تۆش، عائیشە ﵂ وتی: خەریك بوو وەڵامی بدەمەوە، زانیم پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە وەڵامی بدەمەوە، بۆیە بێدەنگ بووم، پاشان جوولەكەیەكی دیكە هاتە

---

(١) إسناده معلول بالإرسال.

(٢) صحيح.

ژوورەوە، وتی: (السَّامُ عَلَيْكَ) واتە: مردن لەسەر تۆ، فەرمووی: لەسەر تۆش، خەریك بوو وەڵامی بدەمەوە، زانیم پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە وەڵامی بدەمەوە، پاشان سێیەم کەس هاتە ژوورەوە، وتی: (السَّامُ عَلَيْكَ) واتە: مردن لەسەر تۆ، خۆم پێ ڕانەگیرا وتم: مردن و خەشم و قینی خوا و نەفرینی لەسەرتان، برای مەیموون و بەرازەکان، ئایا بەشێوەیەك سڵاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن کە خوا ﷻ نەیکردووە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا جنێوی ناشرین و ناپەسەندی خۆش ناوێ، ئەوان قسەیەکیان وت: ئێمەیش وەڵامیان دانەوە، بەڕاستی جوولەکە خەڵکێکی حەسوود و ئیرەییبەرن، ئەوان حەسوودی بە ئێمە نابەن لەسەر شتێك ئەوەندەی حەسوودیبردنیان پێیان لەسەر سڵاو و لەسەر ئامین.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَ إِذَا جَهِلَ فَلَمْ يَقُلْ آمِينَ أَوْ نَسِيَهُ كَانَ عَلَى الْمَأْمُومِ إِذَا سَمِعَهُ يَقُولُ وَلَا الضَّالِّينَ عِنْدَ خَتْمِهِ قِرَاءَةَ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، أَنْ يَقُولَ: آمِينَ. إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ الْمَأْمُومَ أَنْ يَقُولَ: آمِينَ، إِذَا قَالَ إِمَامُهُ: وَلَا الضَّالِّينَ، كَمَا أَمَرَهُ أَنْ يَقُولَ آمِينَ إِذَا قَالَهُ إِمَامُهُ

٥٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ؛ فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَقُولُ: آمِينَ، وَالْإِمَامُ يَقُولُ: آمِينَ، فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەگەر پێشنوێژ نەیزانی، یان لە بیری چوو نەیوت: ئامین، ئەوە پێویستە لەسەر نوێژخوێن ئەگەر گوێی لێ بوو پێشنوێژ لە کۆتایی خوێندنی سوورەتی فاتیحە وتی: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، بڵێ: ئامین، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە نوێژخوێن بڵێ: ئامین، ئەگەر پێشنوێژەکەی وتی: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، هەر وەك چۆن فەرمانی پێ کردوە بڵێ: ئامین ئەگەر پێشنوێژەکەی وتی ئامین

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر پێشنوێژ وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ ئێوەیش بڵێن: ئامین، چونکە فریشتەکان دەڵێن:

---

(١) صحيح.

ئامین، وە پێشنوێژیش دەڵێ: ئامین، جا هەر کەسێك ئامینکردنەکەی یەکانگیر بێتەوە لەگەڵ ئامینکردنی فریشتەکان، ئەوا لە گوناهی پێشووی دەبووردرێ.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي تَكْبِيرِهِ فِي الصَّلَاةِ فِي كُلِّ خَفْضٍ وَرَفْعٍ بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٥٧٦- عَنْ وَاسِعِ بْنِ حَيَّانَ، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ كُلَّمَا وَضَعَ، اللَّهُ أَكْبَرُ كُلَّمَا رَفَعَ» هَذَا لَفْظُ حَدِيثِ الْحَسَنِ بْنِ مُحَمَّدٍ، وَقَالَ ابْنُ مَنِيعٍ: عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُ أَكْبَرُ» كُلَّمَا رَفَعَ وَوَضَعَ، وَزَادَ ثُمَّ يَقُولُ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ عَنْ يَمِينِهِ»، «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ» عَنْ يَسَارِهِ[١].

## باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (الله أكبر) کردن لەنێو نوێژ، لە کاتی هەموو داچەمین و بەرزبوونەوەیەك، بە دەستەواژەیەکی (عَام) گشتی مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: واسیعی کوڕی حەیان دەگێڕێتەوە، ئەو پرسیاری لە ئیبنو عومەر رضي الله عنهما کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: هەر کاتێ دابەزیبایە بۆ سوژدە (الله أكبر)ی دەکرد، وە هەر کاتێ بەرز بووبایەوە (الله أكبر)ی دەکرد. ئەمە دەستەواژەی حەسەنی کوڕی موحەممەدە، ئیبنو مەنیع دەڵێ: لە ئیبنو عومەرەوە رضي الله عنهما پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (الله أكبر) هەر کاتێ بەرز بووبایەوە و دابەزیبایە، ئەوەیشی زیاد کرد، پاشان دەیفەرموو: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) بەلای ڕاستیدا، (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) بەلای چەپیدا.

٥٧٧- عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا عِنْدَ الْمَقَامِ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ رَفْعٍ وَوَضْعٍ، فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، فَقُلْتُ: إِنِّي رَأَيْتُ رَجُلًا يُصَلِّي يُكَبِّرُ فِي كُلِّ رَفْعٍ وَوَضْعٍ، فَقَالَ: أَوَلَيْسَ تِلْكَ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَا أُمَّ لَكَ؟[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عیکریمە دەڵێ: پیاوێکم بینی لەلای مەقامی (ئیبراهیم) بۆ هەموو بەرزبوونەوەیەك و داچەمینێك (الله أكبر)ی دەکرد، هاتم بۆ لای ئیبنو عەباس ﵄ وتم: من پیاوێکم بینی نوێژی دەکرد بۆ هەموو بەرزبوونەوەیەك و داچەمینێك (الله أكبر)ی دەکرد، وتی: ئایا نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەیە نەبوو؟ لەبار دایکت بچیت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ هَذِهِ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرْتُهَا لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يُكَبِّرُ فِي بَعْضِ الرَّفْعِ لَا فِي كُلِّهَا، وَلَمْ يُكَبِّرِ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ رَفْعِهِ رَأْسَهُ عَنِ الرُّكُوعِ وَإِنَّمَا كَانَ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ رَفْعٍ خَلَا عِنْدَ رَفْعِهِ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ

٥٧٨- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ، يَقُولُ وَهُوَ قَائِمٌ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلَاةِ كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيَهَا وَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْمَثْنَى بَعْدَ الْجُلُوسِ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو دەستەواژەیەی کە باسم کرد دەستەواژەیەکی (عَام) گشتییە مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ بەرزبوونەوەکانیدا تەکبیری دەکرد نەك لە هەمووی، پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەرزکردنەوەی سەری لە ڕکووع تەکبیری نەکرد، بەڵکوو تەکبیری دەکرد لە هەموو بەرزبوونەوەکانی دیکە جگە لە کاتی سەربەرزکردنەوەی لە ڕکووع

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە ئەبو هوڕەیرە ﵁ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەستابایە بۆ ئەنجامدانی نوێژی فەڕز، تەکبیر (الله أكبر)ی دەکرد کاتێ بەپێوە بوو، پاشان تەکبیری دەکرد کاتێ بچووبایە ڕکووع، پاشان کاتێ سەری بەرز بکردبایەوە لە ڕکووع دەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، هەر بەپێوە وەستا بوو دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) پاشان تەکبیری دەکرد کاتێ بچووبایە سوژدە، پاشان تەکبیری دەکرد کاتێ سەری بەرز دەکردەوە، پاشان تەکبیری دەکرد

---

(١) صحيح.

كاتێ بچووبایە سوژدە، پاشان هەموو نوێژەكەی بەو شێوەیە دەكرد هەتا نوێژەكەی تەواو دەكرد، وە تەكبیری دەكرد كاتێ هەڵدەستا لە دانیشتنی ڕكاتی دووەم، پاشان ئەبو هورەیرە دەیوت: نوێژەكەی من لە نوێژی هەمووتان زیاتر بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت.

٥٧٩- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ يُصَلِّي بِنَا فَيُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، وَحِينَ يَرْكَعُ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ، وَبَعْدَ مَا يَرْفَعُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ بَعْدَ مَا يَرْفَعُ مِنَ السُّجُودِ، وَإِذَا جَلَسَ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ، وَيُكَبِّرُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ، فَإِذَا سَلَّمَ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَقْرَبُكُمْ شَبَهًا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَعْنِي صَلَاتَهُ - مَا زَالَتْ هَذِهِ صَلَاتُهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا[١].

واتە: ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﷺ نوێژی بۆ دەكردین، كاتێ هەڵساپەوە تەكبیر (الله أكبر)ی دەكرد، كاتێ بەپێوە بووایە كاتێكیش ڕكووعی دەبرد، وە ئەگەر بیویستایە سوژدە ببات، وە دوای ئەوەی سەری بەرز دەكردەوە لە ڕكووع، وە ئەگەر بیویستایە سوژدە ببات دوای ئەوەی سەری بەرز دەكردەوە لە سوژدە، وە ئەگەر دانیشتبایە، وە ئەگەر بیویستبایە لەدوای دووەم ڕكات هەستێتەوە تەكبیری دەكرد، بەهەمان شێوەی لە دووەم ڕكاتی كۆتاییدا تەكبیری دەكرد، كاتێ سەلامی دایەوە وتی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە شێوازی نوێژی من لە هەمووتان زیاتر لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێ، بەردەوام بەو شێوەیە نوێژی دەكرد هەتا دنیای بەجێ هێشت.

٥٨٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: اشْتَكَى أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ، أَوْ غَابَ فَصَلَّى بِنَا أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ فَجَهَرَ بِالتَّكْبِيرِ حِينَ افْتَتَحَ، وَحِينَ رَكَعَ، وَحِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، وَحِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، وَحِينَ سَجَدَ، وَحِينَ رَفَعَ، وَحِينَ قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ حَتَّى قَضَى صَلَاتَهُ عَلَى ذَلِكَ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي صَلَاتِكَ، فَخَرَجَ فَقَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي وَاللَّهِ مَا أُبَالِي اخْتَلَفَتْ صَلَاتُكُمْ أَوْ لَمْ تَخْتَلِفْ، هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ: وَحِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، إِنَّمَا أَرَادَ حِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَأَرَادَ الْإِهْوَاءَ لِلسُّجُودِ كَبَّرَ، لَا أَنَّهُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ كَبَّرَ، وَكَذَلِكَ أَرَادَ فِي خَبَرِ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁ حِينَ ذَكَرَ صَلَاتَهُ خَلْفَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، فَقَالَ: وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرُّكُوعِ كَبَّرَ إِنَّمَا أَرَادَ نَهَضَ مِنَ الرُّكُوعِ فَأَرَادَ الْإِهْوَاءَ إِلَى السُّجُودِ كَبَّرَ.

واتە: سەعیدی کوڕی حاریس دەڵێ: ئەبو هورەیرە ﵁ نەخۆش کەوت یان دیار نەبوو، ئەبو سەعیدی خودری ﵁ نوێژی بۆ کردین کاتێ نوێژی دابەست بەدەنگی بەرز (الله أكبر)ی کرد، کاتێکیش کە چووە ڕکووع، کاتێکیش کە وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، کاتێکیش سەری لە سوژدە بەرز کردەوە، کاتێکیش سوژدەی برد، کاتێکیش بەرز بۆیەوە، کاتێکیش لە دووەم ڕکات هەستا هەتا نوێژەکەی تەواو کرد بەو شێوەیە، پێی وترا: خەڵکەکە جیاوازییان تێ کەوت سەبارەت بە نوێژەکەت، دواتر چوو لەسەر مینبەر ڕاوەستا و وتی: ئەی خەڵکینە سوێند بە خوا بە خەیاڵمدا نایەت نوێژەکەتان جیاوازە یان جیاواز نییە، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی (سەعیدی کوڕی حاریس): وە کاتێ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، مەبەستی پێی ئەوە بووە دوای (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) کاتێ ویستوویەتی بچێتە سوژدە (الله أكبر)ی کردووە، نەك ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع (الله أكبر)ی دەکرد، بەهەمان شێوە لە فەرموودەکەی عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ کاتێ باسی نوێژی خۆی کرد لەپشت عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁، وتی: وە ئەگەر هەستابایەوە لە ڕکووع تەکبیری دەکرد، مەبەستی لەو هەستانەوە ئەوە بووە کاتێ ویستوویەتی دابەزێت بۆ سوژدە تەکبیری کردووە.

٥٨١- عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ عَلِيٍّ فَكَانَ يُكَبِّرُ إِذَا سَجَدَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ لِي عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ ﵁: صَلَّى بِنَا هَذَا مِثْلَ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي هَذَا الْخَبَرِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرَهَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ غَيْلَانَ بْنِ جَرِيرٍ فِي هَذَا الْخَبَرِ، وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرُّكُوعِ كَبَّرَ، إِنَّمَا أَرَادَ وَإِذَا نَهَضَ مِنَ الرُّكُوعِ فَأَرَادَ السُّجُودَ كَبَّرَ، عَلَى مَا ذَكَرَ الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ، ثُمَّ يَقُولُ - وَهُوَ قَائِمٌ: رَبَّنَا ولَكَ الْحَمْدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، وَكَذَلِكَ خَبَرُ أَبِي عَامِرٍ عَنْ فُلَيْحٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ ذَكَرَ التَّكْبِيرَ

حِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، أَيْ أَنَّهُ يُكَبِّرُ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، ذَكَرَ تَكْبِيرَ أُخْرَى عِنْدَ الْإِهْوَاءِ إِلَى السُّجُودِ فَلَمَّا ذَكَرَ التَّكْبِيرَةَ عِنْدَ رَفعِ الرَّأْسِ مِنَ السُّجُودِ بَعْدَ التَّكْبِيرَةِ حِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ بَانَ وَثَبَتَ أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ التَّكْبِيرَ حِينَ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ إِذَا أَرَادَ الْإِهْوَاءَ إِلَى السُّجُودِ، وَكَذَلِكَ فِي خَبَرِ أَبِي سَلَمَةَ مِنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: وَحِينَ يَرْكَعُ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ بَعْدَمَا يَرْفَعُ مِنَ الرُّكُوعِ، فَفِي هَذَا مَا بَانَ أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَأَرَادَ السُّجُودَ لَا أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَوْ أَبَحْنَا لِلْمُصَلِّي أَنْ يُكَبِّرَ فِي كُلِّ خَفْضٍ وَرَفعٍ وكَانَ عَلَيْهِ أَنْ يُكَبِّرَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ عِنْدَ الْإِهْوَاءِ إِلَى السُّجُودِ لَكَانَ عَدَدُ التَّكْبِيرِ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ سِتَّةً وَعِشْرِينَ تَكْبِيرَةً لَا اثْنَتَيْنِ وَعِشْرِينَ تَكْبِيرَةً، وَفِي خَبَرِ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ عَدَدَ التَّكْبِيرِ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ اثْنَتَانِ وَعِشْرُونَ تَكْبِيرَةً لَا أَكْثَرَ مِنْهَا[1].

واتە: موتەریفی کوڕی عەبدوڵای کوڕی شیخیر دەڵێ: لەپشت عەلی نوێژم کرد، کاتێ بچووبایە سوژدە تەکبیر (الله أكبر)ی دەکرد، هەروەها ئەگەر سەری بەرز بکردبایەوە، کاتێ تەواو بوو عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ پێی وتم: بەهەمان شێوەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەدا بەڵگەی تێدایە ئەو دەستەواژەی کە حەمادی کوڕی زەید باسی کرد لە غەیلانی کوڕی جەریر لەم فەرموودەدا: کاتێ بەرز بووبایەوە لە ڕکووع تەکبیری دەکرد، مەبەستی ئەوە بووە کاتێ هەستابایەوە لە ڕکووع و بیویستایە بچێتە سوژدە تەکبیری دەکرد، وەك زوهری باسی کرد لە ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسی کوڕی هیشام، پاشان دەیوت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، کاتێ لە ڕکووع هەڵدەستایەوە، پاشان بەڕاوەستانەوە دەیوت: (رَبَّنَا ولَكَ الْحَمْدُ)، ئینجا تەکبیری دەکرد کاتێ دادەبەزی بۆ سوژدە، بەهەمان شێوە فەرموودەی ئەبو عامر لە فولەیحەوە لە سەعیدی کوڕی حاریس لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ باسی تەکبیری کرد کاتێ کە وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: ئەو تەکبیری دەکرد لە کاتی سەربەرزکردنەوەی لە ڕکووع، باسی تەکبیرێکی دیکەی کردووە لە کاتی دابەزینی بۆ سوژدە، جا کاتێ باسی تەکبیری کرد لە کاتی سەربەرزکردنەوەی لە سوژدە لەدوای ئەو تەکبیرەی کە وتی:

---

(١) صحيح.

(سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ڕوون بۆیەوە و جێگیر بوو، مەبەستی ئەو تەكبیرە بووە كاتێ كە وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) كاتێ ویستی بچێتە سوژدە، هەروەها لە فەرموودەی ئەبو سەلەمە لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ وتی: وە كاتێ دەچێتە ڕكووع، وە كاتێ ویستی بچێتە سوژدە دوای ئەوەی سەری بەرز دەكردەوە لە ڕكووع، ئا لەمەدا ڕوون بووەتەوە ئەو تەكبیری دەكرد ئەگەر سەری بەرز بكردبایەوە لە ڕكووع و مەبەستی سوژدە بووایە، نەك ئەو تەكبیری دەكرد لە كاتێ سەربەرزكردنەوەی لە ڕكووع، ئەگەر ڕێگە بدەین بە نوێژخوێن لە هەموو دابەزین و بەرزبوونەوەیەك تەكبیر بكات، ئەوە پێویست دەبوو لەسەری لە كاتی سەربەرزكردنەوە لە ڕكووع تەكبیر بكات، پاشان كاتێ ویستی بچێتە سوژدە تەكبیر بكات، ئەوە ژمارەی تەكبیرەكان لە چوار ڕكاتدا دەگەیشتە بیست و شەش تەكبیر نەك بیست و دوو، لە فەرموودەكەی عیكریمە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ ڕوون بووەتەوە ژمارەی تەكبیر لە چوار ڕكاتدا بیست و دوو تەكبیر بووە نەك زیاتر.

**٥٨٢-** عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: صَلَّيْتُ الظُّهْرَ بِالْبَطْحَاءِ خَلْفَ شَيْخٍ أَحْمَقَ، فَكَبَّرَ اثْنَتَيْنِ وَعِشْرِينَ تَكْبِيرَةً، إِذَا سَجَدَ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ تِلْكَ سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ[١].

واتە: عیكریمە دەڵێ: بە ئیبنو عەباسم ﷺ وت: لە (الْبَطْحَاء)[٢] نوێژم كرد لەپشت پیاوێكی بەساڵاچوی ناحاڵییەوە، بیست و دوو تەكبیری كرد، ئەگەر سوژدەی ببردایە، ئەگەر بچووبایە ڕكووع و ئەگەر سەری بەرز بكردایەتەوە لە ڕكووع (واتە: دوای وتنی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) و كاتێ دادەبەزی بۆ سوژدە) ئیبنو عەباس ﷺ وتی: ئەوە سوننەتی باوكی قاسمە ﷺ.

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ إِرَادَةِ الْمُصَلِّي الرُّكُوعَ وَبَعْدَ رَفْعِ رَأْسِهِ مِنَ الرُّكُوعِ

**٥٨٣-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ حَتَّى يُحَاذِيَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَبَعْدَمَا يَرْفَعُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَا يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) شوێنێكی ناسراوە لە مەككە، لە سەرووی گۆڕستانی (المعك) لە بنچینەدا بریتییە لە جێگایەكی نەرم و فراوان لم و زیخی تێدا بێت و بۆ پشوودان گونجاو بێت.

(٣) صحيح.

## باسی دەستبەرزکردنەوە کاتێ نوێژخوێن دەیەوێت بچێتە ڕکووع، وە دوای سەربەرزکردنەوەشی لە ڕکووع

واتە: سالیم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﭭ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی دادەبەست دەستەکانی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی هەردوو شانی، هەروەها کاتێکیش بیویستبایە بچێتە ڕکووع، وە کاتێکیش بەرز دەبۆیەوە لە ڕکووع، لە نێوانی هەردوو سوژدەکە دەستی بەرز نەدەکردەوە.

٥٨٤- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَيَصْنَعُ مِثْلَ ذَلِكَ إِذَا قَضَى قِرَاءَتَهُ وَأَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَيَصْنَعُهُ إِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَا يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ صَلَاتِهِ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ كَذَلِكَ وَكَبَّرَ[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﭬ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر هەستابایە بۆ نوێژی فەڕز تەکبیری دەکرد و دەستەکانی تا ئاستی هەردوو شانی بەرز دەکردەوە، وە کاتێ قورئانخوێندنی تەواو دەکرد و دەیویست بچێتە ڕکووع بەهەمان شێوەی دەکرد، هەروەها کاتێ لە ڕکووعەوە بەرز بووبایەوە بە هەمان شێوەی دەکرد، دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە لە هیچ کام لە نوێژەکانی بەدانیشتنەوە، وە کاتێ لە دوو ڕکاتی یەکەم هەستابایەوە (واتە: تەحیاتی یەکەم) دەستەکانی بەرز دەکردەوە و (الله أكبر)ی دەکرد.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِرَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ إِرَادَةِ الرُّكُوعِ وَعِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٥٨٥- عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، أَنَّهُ رَأَى مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ ﭬ إِذَا صَلَّى كَبَّرَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَحَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي هَكَذَا.[٢]

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە بەرزکردنەوەی هەردوو دەست، کاتێ ویستی بچێتە ڕکووع و کاتێ سەربەرز بکاتەوە لە ڕکووع

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە، ئەو مالیکی کوڕی حوەیریسی ﷺ بینی ئەگەر نوێژی دەست پێ بکردایە تەکبیری دەکرد و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، وە ئەگەر بیویستبا بچێتە ڕکووع دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە ئەگەر سەری بەرز بکردبایەوە لە ڕکووع دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە باسی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

**٥٨٦-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ قَالَ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ شَبَبَةٌ مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَحِيمًا رَفِيقًا، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّا قَدِ اشْتَهَيْنَا أَهْلِينَا وَاشْتَقْنَا سَأَلَنَا عَمَّا تَرَكْنَا بَعْدَنَا فَأَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَأَقِيمُوا فِيهِمْ وَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ»، وَذَكَرَ أَشْيَاءَ أَحْفَظُهَا وَأَشْيَاءَ لَا أَحْفَظُهَا، «وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ مَالِكَ بْنَ الْحُوَيْرِثِ وَالشَّبَبَةَ الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ أَنْ يُصَلُّوا كَمَا رَأَوَا النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، وَقَدْ أَعْلَمَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، فَفِي هَذَا مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِرَفْعِ الْيَدَيْنِ إِذَا أَرَادَ الْمُصَلِّي الرُّكُوعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَكُلُّ لَفْظَةٍ رُوِيَتْ فِي هَذَا الْبَابِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا رَكَعَ فَهُوَ مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أُعْلِمْتُ أَنَّ الْعَرَبَ قَدْ تُوقِعُ اسْمَ الْفَاعِلَ عَلَى مَنْ أَرَادَ الْفِعْلَ قَبْلَ أَنْ يَفْعَلَهُ كَقَوْلِ اللَّهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ ﴿٦﴾﴾ المائد، فَإِنَّمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ بِغَسْلِ أَعْضَاءِ الْوُضُوءِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ الْمَرْءُ إِلَى الصَّلَاةِ لَا بَعْدَ الْقِيَامِ إِلَيْهَا، فَمَعْنَى قَوْلِهِ: ﴿قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴿٦﴾﴾ المائدة، أَيْ إِذَا أَرَدْتُمُ الْقِيَامَ إِلَيْهَا، فَكَذَلِكَ مَعْنَى قَوْلِهِ: يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا رَكَعَ، أَيْ إِذَا أَرَادَ الرُّكُوعَ كَخَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَابْنِ عُمَرَ ﷺ اللَّذَيْنِ ذَكَرَاهُ وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، خَرَّجْنَا هَذِهِ الْأَخْبَارَ بِتَمَامِهَا فِي كِتَابِ «الْكَبِيرِ»، وَكَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴿٦١﴾﴾ النور،

---

(١) صحيح.

إِنَّمَا أَمَرَ بِالسَّلَامِ إِذَا أَرَادَ الدُّخُولَ لَا بَعْدَ دُخُولِ الْبَيْتِ، هَذِهِ لَفْظَةٌ إِذَا جُمِّعَتْ مِنَ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ طَالَ الْكِتَابُ بِتَقَصِّيهَا.

**واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەڵێ: هاتین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵە گەنجێکی هاوتەمەنی یەك بووین، بیست شەو لەلای ماینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی زۆر بەبەزەیی و نەرمونیان بوو، کاتێ هەستی کرد ئێمە حەز دەکەین بگەڕێینەوە بۆ لای خێزانەکانمان، پرسیاری لێ کردین دەربارەی ئەوانەی بەجێمان هێشتوون لە کەسوکارمان، ئێمەیش هەواڵمان پێ دا، فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ نێو کەسوکارتان، لەلایان بمێننەوە و فێریان بکەن، وە فەرمانیان پێ بکەن. وە هەندێ شتی باس کرد لەبیرم ماوە و هەندێکیشی باس کرد لەبیرم نەماوە، فەرمووی: نوێژ بکەن وەکو چۆن منتان بینی نوێژم کرد، جا کاتێ کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و بەتەمەنترینتان پێشنوێژیتان بۆ بکات.**

ئەبو بەکر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە مالیکی کوڕی حوەیریس و ئەو گەنجانەی لەگەڵی بوون نوێژ بکەن وەکوو چۆن بینییان پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، مالیکی کوڕی حوەیریس زانیاری دا پێغەمبەر ﷺ: (كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا كَبَّرَ فِي الصَّلَاةِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ) واتە: دەستەکانی بەرز دەکردەوە کاتێ تەکبیر (الله أكبر)ی بکردایە بۆ نوێژ، بەهەمان شێوە ئەگەر ڕکووعی ببردایە و ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە بەرزکردنەوەی هەردوو دەست ئەگەر نوێژخوێن ویستی بچێتە ڕکووع، هەروەها ئەگەر ویستی سەری بەرز بکاتەوە لە ڕکووع، وە هەر دەستەواژەیەکی دیکەش لەم بەشەدا گێڕدرابێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی بەرز دەکردەوە کاتێ ڕکووعی ببردایە، لەو شێوازەیە کە ڕامگەیاندووە هەندێ جار عەرەب ناوی بکەر (اسْمَ الْفَاعِلَ) دەهێنێ لەسەر ئەو کەسەی دەیەوێ کارەکە بکات پێش ئەوەی ئەنجامی بدات وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ ۝٦﴾، واتە: ئەی باوەڕداران ئەگەر هەستان بۆ نوێژکردن ئەوە ڕوخسارتان بشۆن. کاتێ فەرمانی کردووە بە شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ ئەگەر بەندە ویستی هەستێت بۆ نوێژ نەك دوای هەستانی بۆ نوێژ، جا مانای فەرماییشتی خوا ﷻ: ﴿قُمۡتُمۡ إِلَى

ﭐلصَّلَوٰةِ ﴿٦﴾﴾، واته: ئەگەر ویستتان هەستن بۆ نوێژ، بەهەمان شێوە مانای وتەکەی: (يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا رَكَعَ) واته: دەستەکانی بەرز دەکردەوە. ئەگەر بیویستایە ڕکووع بباتـ، وەك فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئیبنو عومەر ﵄ کە باسی کردووە: (وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ) واته: ئەگەر بیویستایە ڕکووعی ببردایە، ئەم فەرموودانەمان بەتێروتەسەلی باس کردووە لە کتێبی (الْكَبِير)، بەهەمان شێوە فەرمایشتی خوا ﷻ: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ ﴿٦١﴾﴾، واته: وە ئەگەر چوونەماڵێکیشەوە ئەوە سەلام لە یەکدی بکەن. کاتێك فەرمانی کردووە بە سەلامکردن ئەگەر ویستی بچێتە ژوورەوە نەك دوای چوونە ژوورەوە، ئەمە دەستەواژەیەکە ئەگەر بەڵگە کۆ بکرێتەوە لە قورئان و سوننەت کتێبەکە زۆر درێژ دەبێتەوە.

## بَابُ الِاعْتِدَالِ فِي الرُّكُوعِ وَالتَّجَافِي وَوَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ

**٥٨٧-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ اعْتَدَلَ قَائِمًا، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، وَرَكَعَ، ثُمَّ اعْتَدَلَ وَلَمْ يَصُبَّ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْ، وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلًا، ثُمَّ هَوَى إِلَى الْأَرْضِ سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، ثُمَّ تَجَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَفَتَحَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَقَعَدَ عَلَيْهَا، ثُمَّ اعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلًا، ثُمَّ هَوَى سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ، وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ كَمَا صَنَعَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ، ثُمَّ صَنَعَ كَذَلِكَ حَتَّى إِذَا كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي تَنْقَضِي فِيهَا الصَّلَاةُ أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وقَعَدَ عَلَى شِقِّهِ مُتَوَرِّكًا، ثُمَّ سَلَّمَ[1].

## باسی ڕێکبوونەوە لە ڕکووعدا و دوورخستنەوەی هەردوو دەست لە تەنیشتەکان و دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان

واته: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ بەڕێکی دەوەستا، -دواتر باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان فەرمووی:

---

(١) صحيح.

(اللّٰهُ أَكْبَرُ) و ڕكووعی برد، پاشان پشتی ڕاست كرد، سەریشی نە خستە خوار و نە بەرزی كردەوە، دەستەكانی خستە سەر هەردوو ئەژنۆی، پاشان (هەستایەوە) فەرمووی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دەستەكانی بەرز كردەوە، پاشان بەڕێكی وەستا تا هەموو ئێسكەكانی لە جێگای خۆیان جێگیر بوون، پاشان دابەزی بۆ زەوی و سوژدەی برد، ئینجا فەرمووی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ) و دواتر هەردوو باڵی دوور خستەوە لە هەردوو بنباڵی، وە پەنجەی پێیەكانی كردەوە، پاشان قاچی چەپی درێژ كرد و لەسەری دانیشت، ئینجا ڕێك بۆیەوە هەتا هەموو ئێسكەكانی لەجێگای خۆیان جێگیر بوون، پاشان چووە سوژدە، ئینجا وتی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ) پاشان قاچی چەپی درێژ كرد و لەسەری دانیشت، ئینجا ڕێك بۆیەوە هەتا هەموو ئێسكەكانی لەجێگای خۆیان جێگیر بوون، پاشان هەستایەوە، پاشان لە ڕكاتی دووەم بەهەمان شێوەی كرد، هەتا كاتێ لە دوو ڕكاتی یەكەم هەستایەوە (الله أكبر)ی كرد و دەستەكانی بەرز كردەوە تا ئاستی شانەكانی وەكوو چۆن لە دەستپێكردنی نوێژدا ئەنجامی دا، پاشان بەهەمان شێوەی دەكرد هەتا دەگەیشتە ئەو ڕكاتەی كۆتایی پێ دەهات قاچی چەپی دوا دەخست و لەسەری دادەنیشت بە(تَوَرُّك) پاشان سەلامی دەدایەوە.

تێبینی: (التَّورُّك): دانیشتنی كۆتایی: قاچی ڕاستی لەسەر پەنجەكانی دادەنێت و قاچی چەپیشی بەلای ڕاستدا دەباتە دەرەوە و نەرمەی ڕانی چەپی ئەلكێنێ بە زەوی.

٥٨٨- عَنْ عَمْرو بْنِ عَطَاءِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: إِنِّي لَأَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ، فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالُوا فِي آخِرِ الْحَدِيثِ: صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّي النَّبِيُّ ﷺ[1].

واتە: عەمری كوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ لەنێو دە كەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، یەكێكیان ئەبو قەتادە ﷺ بوو وتی: من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر باسی فەرموودەكەیان كرد بەدوورودرێژی، لە كۆتایی فەرموودەكەدا وتیان: ڕاستت كرد پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە نوێژی دەكرد.

---

(١) صحيح.

٥٨٩- عَنِ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ قَالَ: اجْتَمَعَ نَاسٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فِيهِمْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ﷺ: دَعُونِي أُحَدِّثُكُمْ وَأَنَا أَعْلَمُكُمْ بِهَذَا قَالُوا: فَحَدِّثْ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ دَخَلَ الصَّلَاةَ وَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ رَكَعَ فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ كَالْقَابِضِ عَلَيْهَا فَلَمْ يَصُبَّ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْهُ، وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَاسْتَوَى قَائِمًا، حَتَّى عَادَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعِهِ[١].

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: خەڵکێك لە ئەنصارەکان کۆبوونەوە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی و ئەبو حومەیدی ساعیدی و ئەبو ئوسەیدی ساعیدییان ﷺ تێدا بوو باسی نوێژی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، ئەبو حومەید ﷺ وتی: ڕێگەم بدەن (چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ) بۆ باس بکەم چونکە من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتیان: باسی بکە، وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەچاکترین شێوە دەستنوێژی گرت، پاشان چووە نێو نوێژەوە، تەکبیری کرد و دەستەکانیشی بەرز کردەوە تا ئاستی هەردوو شانی، پاشان ڕکووعی برد، دەستەکانی خستە سەر هەردوو ئەژنۆی وەکوو ئەوەی هەردووکیانی گرتبێت، نە سەری خستە خوار و نە بەرزی کردەوە، دەستەکانیشی دوور خستەوە لە هەردوو تەنیشتی، پاشان سەری بەرز کردەوە و بەڕێکی ڕاوەستا هەتا هەموو ئێسکەکانی گەڕایەوە بۆ جێگای خۆی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِإِعَادَةِ الصَّلَاةِ إِذَا لَمْ يَطْمَئِنَّ الْمُصَلِّي فِي الرُّكُوعِ أَوْ لَمْ يَعْتَدِلْ فِي الْقِيَامِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٥٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ»، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مِرَارٍ، فَقَالَ الرَّجُلُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَعْلَمُ غَيْرَ هَذَا قَالَ: فَقَالَ: «إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ بِمَا

---

(١) صحيح.

تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ جَالِسًا، وَافْعَلْ ذَلِكَ فِي صَلَاتِكَ كُلِّهَا»(١).

## باسی فەرمانکردن بە دووبارەکردنەوەی نوێژ، ئەگەر نوێژخوێن دڵنیا و ئارام نەبۆیەوە لە ڕکووعبردنەکەی، یان ڕێك نەبۆیەوە لە هەستانەوەی دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو مزگەوتەوە و پیاوێکیش هاتە ژوورەوە نوێژی کرد، پاشان سڵاوی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێرەوە نوێژ بکە، چونکە بەڕاستی تۆ نوێژت نەکردووە، هەتا سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، پیاوەکە وتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەحەق ناردووە لەمە چاکتر نازانم، وتی: فەرمووی: (ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ (الله أكبر) بکە، پاشان چەندە ئەزانی لە قورئان بخوێنە، پاشان ڕکووع ببە هەتا لە ڕکووعەکەتدا ئارام دەگری بەتەواوی، پاشان هەستەوە هەتا بەتەواوی ڕێك دەبیتەوە، پاشان سوژدە ببە هەتا لە سوژدەکەتدا ئارام دەگری، پاشان سەرت بەرز بکەرەوە (و دابنیشە) هەتا دڵنیا دەبیت دانیشتووی، وە لە هەموو نوێژەکەتدا بەو شێوەیە بکە.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ صَلَاةَ مَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ غَيْرُ مُجْزِئَةٍ، لَا أَنَّهَا نَاقِصَةٌ مُجْزِئَةٌ كَمَا تَوَهَّمَ بَعْضُ مَنْ يَدَّعِي الْعِلْمَ

٥٩١- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةُ مَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»(٢).

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی بێگومان ئەو کەسەی نوێژ دەکات لە کاتی ڕکووعبردن و سوژدەدا پشتی ڕاست نەکاتەوە نوێژەکەی نادروستە، نەك بە مانای ئەوەی نوێژەکەی ناتەواوە و دروستە، وەك یەکێك لەوانەی بانگەشەی زانستی کردووە و بەهەڵەدا چووە لەو بۆچوونەدا

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی ئەو کەسە دروست نییە پشتی ڕاست نەکاتەوە لە کاتی ڕکووعبردن و سوژدەدا.

٥٩٢- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لِأَحَدٍ - أَوْ لِرَجُلٍ - لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَلَا فِي السُّجُودِ»[١].

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی هیچ کەس -یان هیچ پیاوێك- دروست نییە کە پشتی ڕاست نەکاتەوە لە کاتی ڕکووعبردن و سوژدەدا.

٥٩٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ، عَنْ أَبِيهِ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ - وَكَانَ أَحَدَ الْوَفْدِ - قَالَ: صَلَّيْنَا خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمَحَ بِمُؤَخَّرِ عَيْنَيْهِ إِلَى رَجُلٍ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، فَلَمَّا قَضَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ قَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»[٢].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەلی کوڕی شەیبان دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، عەلی کوڕی شەیبان ﷺ -یەکێك بوو لە (شەش) نوێنەرەکان (کە لە کیندەوە هاتبوون لە ناوچەی شام)- وتی: لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان کرد، بە تیلەی چاوی ئاماژەی کرد بۆ پیاوێك کە پشتی ڕێك نەکردبوو لە ڕکووع و سوژدەدا، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، بێگومان نوێژی ئەو کەسە دروست نییە پشتی ڕاست نەکاتەوە لە کاتی ڕکووعبردن و سوژدەدا.

## بَابُ تَفْرِيجِ أَصَابِعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ وَضْعِهِمَا عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ فِي الرُّكُوعِ

٥٩٤- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَكَعَ فَرَّجَ أَصَابِعَهُ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## باسی بڵاوکردنەوەی پەنجەکانی هەردوو دەست لە کاتی دانانیان لەسەر ئەژنۆکان لە ڕکووعدا

واتە: عەلقەمەی کوڕی وائیل دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﵁، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ڕکووعی ببردایە پەنجەکانی بڵاو دەکردەوە.

## بَابُ ذِكْرِ نَسْخِ التَّطْبِيقِ فِي الرُّكُوعِ وَالْبَيَانِ عَلَى أَنَّ وَضْعَ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ نَاسِخٌ لِلتَّطْبِيقِ، إِذِ التَّطْبِيقُ كَانَ مُقَدَّمًا وَوَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ مُؤَخَّرًا بَعْدَهُ، فَالْمُقَدَّمُ مَنْسُوخٌ وَالْمُؤَخَّرُ نَاسِخٌ

**٥٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ قَالَ: فَكَبَّرَ، وَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ طَبَّقَ يَدَيْهِ بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ فَرَكَعَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ سَعْدًا، فَقَالَ: صَدَقَ أَخِي، كُنَّا نَفْعَلُ هَذَا، ثُمَّ أُمِرْنَا بِهَذَا يَعْنِي الْإِمْسَاكَ بِالرُّكَبِ[1].

## باسی نەسخبوونەوەی حوکمی (التَّطْبِيق) لە ڕکووعدا، وە ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان نەسخکەرەوەی حوکمی (التَّطْبِيق)ە، چونکە (التَّطْبِيق) لە سەرەتاوە بوو، وە دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان لە کۆتاییەوە بوو لەدوای ئەو، جا حوکمی ئەوەی سەرەتا نەسخ بۆتەوە، وە حوکمی ئەوەی دوایی نەسخکەرەوەیە

واتە: عەبدوڵا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری نوێژی کردین، وتی: (الله أكبر)ی کرد، کاتێ ویستی بچێتە ڕکووع پەنجەکانی کرد بە نێو یەکدا و خستیە نێوان هەردوو ئەژنۆی و ڕکووعی برد، ئەو هەواڵە گەیشت بە سەعد، وتی: براکەم ڕاستی کرد، ئێمە ئەوەمان دەکرد، پاشان فەرمانمان پێ کرا بەمە، واتە: دەستگرتن بە ئەژنۆ.

تێبینی: (التَّطْبِيق) لە ڕکووعدا واتە: لێکدانی هەردوو لەپی دەست و دانانیان لە نێوان هەردوو ئەژنۆ.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ التَّطْبِيقَ غَيْرُ جَائِزٍ بَعْدَ أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِوَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ، وَأَنَّ التَّطْبِيقَ مَنْهِيٌّ عَنْهُ لَا أَنَّ هَذَا مِنْ فِعْلِ الْمُبَاحِ، فَيَجُوزُ التَّطْبِيقُ وَوَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ جَمِيعًا كَمَا ذَكَرْنَا أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْقِرَاءَةِ فِي الصَّلَوَاتِ وَاخْتِلَافَهُمْ فِي السُّوَرِ الَّتِي كَانَ يَقْرَأُ فِيهَا ﷺ فِي الصَّلَاةِ كَاخْتِلَافِهِمْ فِي عَدَدِ غَسْلِ النَّبِيِّ ﷺ أَعْضَاءَ الْوُضُوءِ، وَكُلُّ ذَلِكَ مُبَاحٌ، فَأَمَّا التَّطْبِيقُ فِي الرُّكُوعِ فَمَنْسُوخٌ مَنْهِيٌّ عَنْهُ، وَالسُّنَّةُ وَضْعُ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ

**٥٩٦-** عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ إِذَا رَكَعْتُ وَضَعْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَرَآنِي أَبِي سَعْدٌ، فَنَهَانِي، وَقَالَ: إِنَّا كُنَّا نَفْعَلُهُ، ثُمَّ نُهِينَا، ثُمَّ أُمِرْنَا أَنْ نَرْفَعَهُمَا إِلَى الرُّكَبِ[1].

## باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی (التَّطْبِيق) دروست نییە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان، بێگومان (التَّطْبِيق) قەدەغە کراوە نەك بەمانای ئەوەی ئەنجامدانی(التَّطْبِيق) و دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان دروست و ڕێگەپێدراو بێت پێکەوە، وەك چۆن باسی فەرموودەی پێغەمبەرمان ﷺ کرد دەربارەی قورئانخوێندن لە نوێژەکاندا و جیاوازییان لەو سورەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا دەیخوێند، وە وەك جیاوازییان لەوەی پێغەمبەر ﷺ چەند جار ئەندامەکانی دەستنوێژی شۆردووە، هەموو ئەوانە جیاوازی ڕێگەپێدراون، بەڵام (التَّطْبِيق) لە ڕکووع و سوژدەدا حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە و هەڵوەشێنراوەتەوە، قەدەغەی لێ کراوە، سوننەت بریتییە لە دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: من ئەگەر ڕکووعم ببردایە هەردوو دەستم دەخستە نێوان هەردوو ئەژنۆم، سەعد کە باوکم بوو بینیمی، قەدەغەی لێ کردم و وتی: ئێمە ئەوەمان دەکرد، پاشان لێمان قەدەغە کرا، دواتر فەرمانمان پێ کرا دەستەکانمان لەسەر ئەژنۆکانمان دابنێین.

**٥٩٧-** عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ ﷺ أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ثُمَّ إِذَا أَنْتَ رَكَعْتَ فَأَثْبِتْ يَدَيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ حَتَّى يَطْمَئِنَّ كُلُّ عَظْمٍ مِنْكَ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

واتە: ریفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك چووە نێو مزگەوتەوە نوێژی کرد، دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد، وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر تۆ ڕکووعت برد دەستەکانت جێگیر بکە لەسەر ئەژنۆکانت هەتا هەر یەك لە ئێسکەکانت ئارام دەبێت.

## بَابُ وَضْعِ الرَّاحَةِ عَلَى الرُّكْبَةِ فِي الرُّكُوعِ وَأَصَابِعِ الْيَدَيْنِ عَلَى أَعْلَى السَّاقِ الَّذِي يَلِي الرُّكْبَتَيْنِ

٥٩٨- عَنْ سَالِمٍ الْبَرَّادِ قَالَ: أَتَيْنَا عُقْبَةَ بْنَ عَمْرٍو أَبَا مَسْعُودٍ ﷺ فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا عَنْ صَلَاةِ، رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ بَيْنَ أَيْدِينَا فِي الْمَسْجِدِ، وَكَبَّرَ، فَلَمَّا رَكَعَ كَبَّرَ، وَوَضَعَ رَاحَتَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَجَعَلَ أَصَابِعَهُ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ، ثُمَّ جَافَى بِمِرْفَقَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي[١].

## باسی دانانی نێولەپ لەسەر ئەژنۆ لە ڕکووعدا، وە پەنجەکانی دەستیش لەسەر بەرزایی قاچ کە لە خوار هەردوو ئەژنۆوە دێت

واتە: سالیمی بەڕاد دەڵێ: هاتین بۆ لای عوقبەی کوڕی عەمر ئەبو مەسعود ﷺ وتمان: باسی نوێژی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ بکە، لەنێو مزگەوت هەستا لە نێوانماندا تەکبیری کرد، کاتێ ڕکووعی برد تەکبیری کرد، لەپی هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆکانی، پەنجەکانی لە خوارەوەی ئەژنۆکانی دانا، پاشان ئەنیشکەکانی دوور خستەوە لە هەردوو کەلەکەی، پاشان وتی: ئا بەو شێوەیە پێغەمبەری خوامان ﷺ بینی نوێژی دەکرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِتَعْظِيمِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ فِي الرُّكُوعِ

٥٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ[٢].

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بەمەزنڕاگرتنی پەروەردگار لە ڕکووعدا

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵام لە ڕکووعدا پەروەردگار بەگەورە ڕاگرن.

٦٠٠- عَن عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ ﵁، يَقُولُ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ۝٧٤ ﴾ الواقعة، قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﵁ دەڵێ: کاتێ (ئەو ئایەتە) دابەزی: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ۝٧٤ ﴾ پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو: لە ڕکووعەکانتاندا بیخوێنن.

٦٠١- «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ بِمِثْلِهِ»[٢].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﵁ بەهەمان شێوە دەگێڕێتەوە.

٦٠٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَشَفَ السِّتْرَ فَرَأَى النَّاسَ قِيَامًا وَرَاءَ أَبِي بَكْرٍ يُصَلُّونَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ أَنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ لِنَفْسِهِ أَوْ تُرَى لَهُ، وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَأَكْثِرُوا فِيهِ الدُّعَاءَ؛ فَإِنَّهُ قَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ[٣].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پەردەی لادا بینی خەڵکەکە لەپشت ئەبو بەکر ڕیزیان بەستووە نوێژ دەکەن، فەرمووی: خوایە ئەوەی فەرمانت پێ کردم بیگەیەنم بە بەندەکانت گەیاندم، بەڕاستی مژدەدانی پێغەمبەرایەتی نەما جگە لە خەوی چاك کەسێکی موسوڵمان ببینێ یان خەوی پێوە ببینن، من قەدەغەم لێ کراوە لە ڕکووع یان لە سوژدەدا قورئان بخوێنم، بەڵام لە ڕکووعدا پەروەردگار بەگەورە ڕابگرن، وە لە سوژدەشدا بپاڕێنەوە چونکە بێگومان گونجاو و شیاوە لێتان وەربگیرێ.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## بَابُ التَّسْبِيحِ فِي الرُّكُوعِ

٦٠٣- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَكَانَ رُكُوعُهُ مِثْلَ قِيَامِهِ، فَقَالَ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»[١].

## باسی تەسبیحکردن (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) لە ڕکووعدا

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، ئەندازەی ڕکووعبردنی وەکو ڕاوەستانی وا بوو، لە ڕکووعەکەیدا فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم.

٦٠٤- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ» ثَلَاثًا[٢].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕکووعیدا سێ جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم.

## بَابُ التَّحْمِيدِ مَعَ التَّسْبِيحِ وَمَسْأَلَةِ اللَّهَ الْغُفْرَانَ فِي الرُّكُوعِ

٦٠٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ»[٣].

## باسی ستاییشکردن لەگەڵ تەسبیحکردن و داوای لێخۆشبوون لە خوا لە کاتی ڕکووعدا

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لە ڕکووع و سوژدەیدا دەیفەرموو: خوایە پاکی و بێگەردی و ستاییش هەر بۆ تۆیە، ئەی خوایە داوای لێخۆشبوونت

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

لێ دەکەم. قورئانی لەیەك دەدایەوە. (واتە: مەبەستی ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە بوو: ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ۝٧٤﴾ الواقعة).

## بَابُ التَّقْدِيسِ فِي الرُّكُوعِ

٦٠٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبُوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلَائِكَةِ وَالرُّوحِ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الِاخْتِلَافُ فِي الْقَوْلِ فِي الرُّكُوعِ مِنَ الِاخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، فَجَائِزٌ لِلْمُصَلِّي أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ كُلَّ مَا رُوِّينَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ».

## باسی بەگەورەڕاگرتنی خوا ﷻ لە ڕکووعدا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکووعدا دەیفەرموو: ئەی پەروەردگاری پاك و بێگەرد گەورەیی و مەزنی شیاوی تۆیە، ئەی پەروەردگاری فریشتەکان و جبریل.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم جیاوازییە لە ڕکووعدا دەوترێ لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراوە، دروستە بۆ نوێژخوێن لە ڕکووعەکەیدا هەریەك لەو زیکرانە بڵێ کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاومانەتەوە کە لە ڕکووعیدا فەرموویەتی.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا دَعَا فِي صَلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ أَنَّ صَلَاتَهُ تَفْسُدُ

٦٠٧- «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَكَعَ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، أَنْتَ رَبِّي، خَشَعَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمَيَّ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ»، مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ لِلْمُصَلِّي فَرِيضَةً أَنْ يَدْعُوَ أَوْ يَجْتَهِدَ فِي سُجُودِهِ، وَإِنْ كَانَ مَا يَدْعُو بِهِ لَيْسَ مِنَ الْقُرْآنِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا خَاطَبَهُمْ بِهَذَا الْأَمْرِ، وَهُمْ فِي مَكْتُوبَةٍ يُصَلُّونَهَا خَلْفَ الصِّدِّيقِ، لَا فِي تَطَوُّعٍ، وعَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ»، فَذَكَرَ الدُّعَاءَ بِتَمَامِهِ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ الدُّعَاءَ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ - وَإِنْ لَيْسَ ذَلِكَ الدُّعَاءُ فِي الْقُرْآنِ - جَائِزٌ لَا كَمَا قَالَ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مَنْ دَعَا فِي الْمَكْتُوبَةِ بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ فَسَدَتْ صَلَاتُهُ حَتَّى زَعَمَ أَنَّ مَنْ قَالَ: لَا حَوْلَ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ فِي الْمَكْتُوبَةِ فَسَدَتْ صَلَاتُهُ، وَزَعَمَ أَنَّهُ لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ: لَا حَوْلَ، وَزَعَمَ أَنَّهُ إِنِ انْفَرَدَ فَقَالَ: لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ جَازَ؛ لِأَنَّ فِي الْقُرْآنِ: ﴿لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ﴿٣٩﴾﴾ الكهف، فَيُقَالَ لَهُ فَهَذِهِ الْأَلْفَاظُ الَّتِي ذَكَرْنَاهَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ وفِي الرُّكُوعِ، وَمَا سَنَذْكُرُهُ بِمَشِيئَةِ اللَّهِ وَإِرَادَتِهِ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، وَفِي السُّجُودِ، وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ التَّشَهُّدِ قَبْلَ السَّلَامِ، وَأَمْرُ النَّبِيِّ ﷺ الْمُصَلِّي بِأَنْ يَتَخَيَّرَ مِنَ الدُّعَاءِ مَا أَحَبَّ بَعْدَ التَّشَهُّدِ فِي أَيِّ مَوْضِعٍ مِنَ الْقُرْآنِ، وَقَدْ دَعَا النَّبِيُّ ﷺ فِي أَوَّلِ صَلَاتِهِ، وَفِي الرُّكُوعِ، وَعِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ، وَفِي السُّجُودِ، وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ بِأَلْفَاظٍ لَيْسَتْ تِلْكَ الْأَلْفَاظُ فِي الْقُرْآنِ، فَجَمِيعُ ذَلِكَ يَنُصُّ عَلَى ضِدِّ مَقَالَةِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ صَلَاةَ الدَّاعِي بِمَا لَيْسَ فِي الْقُرْآنِ تَفْسُدُ».

## باسی بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە نوێژخوێن ئەگەر لە نوێژە فەرزەکەیدا پاڕایەوە بەوەی لە قورئاندا نییە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ڕکووعی ببردایە دەیفەرموو: خوایە ڕکووعم بۆ تۆ برد بڕوام بە تۆ هێنا و تەسلیمی تۆ بووم، تۆ پەروەردگاری منی، بیستن و چاو و مۆخ و ئێسك و دەمارم ملکەچی تۆ بوو، وە ئەوەیشی پێیەکانم هەنگاوی پێ دەنێت بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییانە.

ئەبو بەکر دەڵێ: وە لە ئیبنو عەباسەوە ﭭ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: بەڵام لە سوژدەدا زۆر بپاڕێنەوە، ئەوە ڕوون بۆتەوە و جێگیر بووە ئەو کەسەی نوێژی فەرز دەکات دەتوانێت لە سوژدەکەیدا بپاڕێتەوە و داوا بکات، ئەگەرچی ئەوەی پێی دەپاڕێتەوە لە قورئاندا نەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دواندنی بەم فەرمانە کاتێ ئەوان لە نوێژی فەرزدا بوون لەپشت ئەبو بەکر، نەك لە نوێژی سوننەت، وە لە عەلییەوە کاتێك

پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە بۆ نوێژی فەرز تەکبیری دەکرد و دەستەکانی بەرز دەکردەوە، پاشان دەیفەرموو: ڕووم کردە ئەو زاتەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، نزاکەی بەتەواوی باس کرد، لەمەدا ئەو ڕوون دەبێتەوە و جێگیر دەبێت پاڕانەوە لە نوێژی فەرزدا -ئەگەرچی ئەو پاڕانەوە لە قورئانیشدا نەهاتبێت- دروستە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە هەر کەسێك لە نوێژی فەرزدا بپاڕێتەوە بەوەی لە قورئاندا نەبێت نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت، تەنانەت پێی وایە ئەوەی لە نوێژی فەرز بڵێ: (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت، پێی وایە (لَا حَوْلَ) لە قورئاندا نییە، وە پێی وایە ئەگەر بەجیا بڵێ: (وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) دروستە، چونکە لەنێو قورئاندا: ﴿لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ ۝٣٩﴾ هەیە، پێی دەوترێ: ئەو دەستەواژانەی کە باسمان کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی دەستپێکردنی نوێژ، وە لە ڕکووعدا، هەروەها ئەو دەستەواژانەش کە لە داهاتوودا باسی دەکەین بەویستی خوا، لە کاتی سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع و لە سوژدە، وە لە نێوان هەردوو سوژدەکە و دوای تەواوبوونی تەحیات و پێش سەلامدانەوە، وە فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی سەرپشك بێت لە پاڕانەوە لەوەی پێی خۆشە دوای تەحیات لە هەر جێگایەك لە قورئان، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای نوێژەکەیدا پاڕاوەتەوە، هەروەها لە ڕکووع و لە کاتی سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع و لە سوژدە و لە نێوان هەردوو سوژدە، بە دەستەواژەیەك ئەو دەستەواژانە لە قورئاندا نییە، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە پاڕانەوە لەنێو نوێژی فەرز بەوەی لە قورئاندا نەهاتووە بەتاڵی دەکات.

## بَابُ الِاعْتِدَالِ وَطُولِ الْقِيَامِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٦٠٨- عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ قَالَ: اجْتَمَعَ نَاسٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فِيهِمْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﵃ فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ حُمَيْدٌ: دَعُونِي أُحَدِّثْكُمْ فَأَنَا أَعْلَمُكُمْ بِهَذَا قَالُوا: فَحَدِّثْ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ دَخَلَ الصَّلَاةَ، وَكَبَّرَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ رَكَعَ فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ كَالْقَابِضِ عَلَيْهِمَا فَلَمْ يَصُبَّ رَأْسَهُ وَلَمْ يُقْنِعْهُ، وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَاسْتَوَى قَائِمًا حَتَّى عَادَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ ذَكَرَ بَقِيَّةَ الْحَدِيثِ، فَقَالَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ: هَكَذَا كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی ڕێك وەستان و زۆر ڕاوەستان دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی ساعیدی ﷺ دەڵێ: خەڵکێك لە ئەنصارەکان کۆ بوونەوە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی و ئەبو حومەیدی ساعیدی و ئەبو ئوسەیدی ساعیدییان ﷺ تێدا بوو باسی نوێژی پێغەمبەریان ﷺ کرد، حومەید وتی: ڕێگەم بدەن (چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ) بۆ باس بکەم چونکە من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتیان: باسی بکە، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەچاکترین شێوە دەستنوێژی گرت، پاشان چووە نێو نوێژەوە، تەکبیری کرد و دەستەکانیشی بەرز کردەوە تا ئاستی هەردوو شانی، پاشان ڕکووعی برد، دەستەکانی خستە سەر هەردوو ئەژنۆی وەکوو ئەوەی هەردووکیانی گرتبێت، نە سەری خستە خوار و نە بەرزی کردوە، دەستەکانیشی دوور خستەوە لە هەردوو تەنیشتی، پاشان سەری بەرز کردەوە و بەڕێکی وەستا هەتا هەموو ئێسکەکانی گەڕایەوە بۆ جێگای خۆی. -ئینجا ئەوەی مابوو لە فەرموودەکە باسی کرد- خەڵکەکە هەموویان وتیان: نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بوو.

٦٠٩- عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: قَالَ لَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: إِنِّي لَا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ، بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، قَالَ ثَابِتٌ: وَكَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئًا لَا أَرَاكُمْ تَصْنَعُونَهُ، كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ انْتَصَبَ قَائِمًا حَتَّى نَقُولَ قَدْ نَسِيَ[1].

واتە: سابیت دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ پێمانی وت: بێگومان کە نوێژتان بۆ بکەم درێغی و کەمتەرخەمی تێدا ناکەم وەکوو چۆن بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ دەکرد، بەو شێوە نوێژتان بۆ دەکەم، سابیت وتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی شتێکی دەکرد، وا نابینم ئێوە کردبێتان، ئەگەر سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع دەوەستا تا دەمانوت: بەڕاستی بیری چووە (کە لە نوێژدایە).

---

(١) صحيح.

## بَابُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الرُّكُوعِ وَالْقِيَامِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٦١٠- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَرَفْعُ رَأْسِهِ بَعْدَ الرُّكُوعِ، وَالسُّجُودُ، وَجُلُوسُهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[1].

## باسی یەکسانیکردن لە نێوان ماوەی ڕکووعبردن و ماوەی هەستانەوەی دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێ: ئەندازەی مانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکووع و سەربەرزکردنەوەی لەدوای ڕکووع و سوژدەبردنی و دانیشتنی لە نێوان هەردوو سوژدەکەدا نزیك بوون لە یەکدییەوە.

## بَابُ قَوْلِ الْمُصَلِّي سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ مَعَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ مَعًا

٦١١- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ، وَهُوَ قَائِمٌ: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[2].

## باسی نوێژخوێن لەگەڵ سەربەرزکردنەوەی لە ڕکووع بڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)

واتە: ئەبو بەکری کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە ئەبو هوڕەیرە ﵁ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەڵدەستایەوە لە ڕکووعبردن دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) پاشان بەپێوە دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ التَّحْمِيدِ وَالدُّعَاءِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٦١٢- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ، فَذَكَرَا بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَا: فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ - يَعْنِي مِنَ الرُّكُوعِ - قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَمِلْءَ السَّمَاوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ»[1].

### باسی سوپاس و ستاییشکردن و پاڕانەوە دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووعبردن

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی بکردایە بە نوێژ تەکبیری دەکرد، دواتر باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد، وتیان: کاتێ سەری لە ڕکووع بەرز بکردایەتەوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَمِلْءَ السَّمَاوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ)، واتە: خوا گوێبیستی ئەو کەسەیە کە سوپاسی دەکات، ئەی پەروەردگار سوپاس هەر بۆ تۆیە پڕاوپڕی ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی، وە پڕاوپڕی ئەو شتەی جگە لەمانە تۆ بتەوێ.

٦١٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَاوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَا وَالْمَجْدِ أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیفەرمووایە: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَمِلْءَ السَّمَاوَاتِ، وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَا وَالْمَجْدِ أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ)، واتە: خوایە ستاییش بۆ تۆ بە پڕاوپڕی ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی، وە پڕاوپڕی ئەو شتەی جگە لەمانە تۆ بتەوێ، خاوەنی وەسف و پیاهەڵدانی جوان و گەورەیی، ڕەواترین وتەیە کە بەندە دەیڵێت، هەمووشمان بەندەی تۆین، هیچ بەربەستێك نییە لەبەردەم بەخشینت، وە هیچ دەوڵەمەندی و خاوەن پلەوپایەیەك پلەوپایەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ و ڕزگاری ناکات لە تۆ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ فَضِيلَةِ التَّحْمِيدِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ مَعَ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: إِذَا قَالَ الْإِمَامُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ أَنَّ الْإِمَامَ لَا يَجُوزُ لَهُ أَنْ يَزِيدَ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ عَلَى قَوْلِهِ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ

٦١٤ - عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، فَقَالَ رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنِ الَّذِي تَكَلَّمَ آنِفًا؟» قَالَ رَجُلٌ: أَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلَاثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلًا»[1].

## باسی فەزڵ و گەورەیی سوپاس و ستاییشکردنی خوا لەدوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع، لەگەڵ ئەودا بەڵگەیەی تێدایە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا فەرمووی: ئەگەر پێشنوێژ وتی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، مەبەستی ئەوە نەبووە دروست نییە بۆ پێشنوێژ لەدوای وتنی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) نزای دیکە بکات

واتە: ڕیفاعەی کوڕی ڕافیعی ﷺ دەڵێ: ئێمە ڕۆژێك لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان دەکرد، کاتێ سەری بەرز کردەوە لە ڕکووعدا فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) پیاوێك لە پشتیەوە وتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ)، واتە: ئەی پەروەردگار سوپاس هەر بۆ تۆیە سوپاس و ستاییشێکی زۆر خاوێن و پڕ لە فەڕ و بەرەکەت، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تەواو کرد فەرمووی: ئەو کەسە کێ بوو کەمێك پێش ئێستا ئەوەی وت؟ پیاوێك وتی: من بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی سی و ئەوەندە فریشتەم بینی دەستپێشخەرییان دەکرد کامەیان یەکەم جار بینووسێت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْقُنُوتِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ لِلْأَمْرِ يَحْدُثُ، فَيَدْعُو الْإِمَامُ فِي الْقُنُوتِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِيرَةِ مِنْ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ

٦١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَمَّا رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ مِنْ آخِرِ رَكْعَةٍ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ بِمَكَّةَ» زَادَ أَحْمَدُ: «مِنَ الْمُسْلِمِينَ». وَقَالُوا: «اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْ عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[1].

## باسی خوێندنی قونوت دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع لەبەر ڕووداوێکی نەخوازرا و ڕوو بدات، جا پێشنوێژ دوای ئەوەی سەری بەرز دەکاتەوە لە ڕکووع لە ڕکاتی کۆتایی لە نوێژی فەرز قونوت دەخوێنێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز کردەوە لە کۆتا ڕکات (لە نوێژی بەیانی)، فەرمووی: خوایە: وەلیدی کوڕی وەلید و سەلەمەی کوڕی هیشام و عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکەی، هەروەها ئەو لاوازانەی لە مەککەن، پێشەوا ئەحمەد ئەوەیشی زیاد کردووە (لە موسوڵمانان) وتیان (پێغەمبەر ﷺ لە قونوتدا دەیفەرموو): خوایە هۆزی (مُضَر) بگرە و سزای توندیان بدە، ساڵەکانیان وەکوو ساڵەکانی قاتوقڕی سەردەمی یوسفی لێ بکە (واتە: تووشی قاتوقڕی و برسێتی گرانییان بکە).

## بَابُ الْقُنُوتِ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

٦١٦- عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْنُتُ فِي الْمَغْرِبِ وَالصُّبْحِ[2].

## باسی خوێندنی قونوت لە نوێژی ئێوارەدا

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی ئێوارە و بەیانیاندا قونوتی دەخوێند.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



## بَابُ الْقُنُوتِ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ

٦١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ فَرَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ فَقَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، قَنَتَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ»[1].

## باسی خوێندنی قونوت لە نوێژی عیشادا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی عیشای بکردایە و سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووعدا دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئینجا قونوتی دەخوێند و دەیفەرموو: خوایە: عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکەی، خوایە سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەی، خوایە وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەی، خوایە باوەڕدارە لاوازەکانی خەڵکی مەککە ڕزگار بکەی، خوایە هۆزی (مُضَر) بگرە و سزایان بدە، ساڵەکانیان وەکوو ساڵەکانی یوسفی لێ بکە (واتە: تووشی قاتوقڕی و برسێتی گرانییان بکە).

## بَابُ الْقُنُوتِ فِي الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا وَتَأْمِينِ الْمَأْمُومِينَ عِنْدَ دُعَاءِ الْإِمَامِ فِي الْقُنُوتِ ضِدَّ مَا يَفْعَلُهُ الْعَامَّةُ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ فَيَضِجُّونَ بِالدُّعَاءِ مَعَ دُعَاءِ الْإِمَامِ

٦١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَنَتَ النَّبِيُّ ﷺ شَهْرًا مُتَتَابِعًا فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَالصُّبْحِ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، فِي الرَّكْعَةِ الْأَخِيرَةِ يَدْعُو عَلَى حَيٍّ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ، وَعُصَيَّةَ، وَيُؤَمِّنُ مَنْ خَلْفَهُ «. قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ يَدْعُوهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ فَقَتَلُوهُمْ. قَالَ عِكْرِمَةُ: هَذَا مِفْتَاحُ الْقُنُوتِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

### باسی خوێندنی قونوت لە هەموو نوێژەکاندا و ئامینکردنی نوێژخوێنان لە کاتی پاڕانەوەی پێشنوێژ لە قونوتدا، بە پێچەوانەی ئەوەی خەڵك دەیکەن لە قونوتی نوێژی ویتر لەگەڵ پێشنوێژدا نزا دەکەن

واتە: ئیبو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مانگێك قونوتی خوێند بەدوای یەکدا لە کۆتا ڕکاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشا و بەیانی کاتێ بیفەرمووایە: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، نزای لە گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی نەوەکانی سولەیم و ڕەعل و زەکوان و عوصەیە دەکرد، ئەوانەیشی لە پشتیەوە بوون ئامینیان دەکرد. ئیبنو عەباس ﷺ وتی: خەڵکانێکی (قورئانخوێنی) نارد بۆ نێویان بانگیان بکەن بۆ ئیسلام بەڵام ئەوان کوشتیانن. عیکریمە وتی: ئەمە کلیلی قونوت بوو.

### بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَقْنُتُ دَهْرَهُ كُلَّهُ وَإِنَّهُ إِنَّمَا كَانَ يَقْنُتُ إِذَا دَعَا لِأَحَدٍ، أَوْ يَدْعُو عَلَى أَحَدٍ

٦١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَقْنُتُ إِلَّا أَنْ يَدْعُوَ لِأَحَدٍ، أَوْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ، وَكَانَ إِذَا قَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» قَالَ: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، اللَّهُمَّ أَنْجِ» وَذَكَرَ الْحَدِيثَ[1].

### باسی ڕوونکردنەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەدرێژایی ساڵ قونوتی نەدەخوێند، بەڵکوو کاتێ قونوتی دەخوێند نزای بۆ کەسێك بکردایە، یان نزای لە کەسێك بکردایە

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ قونوتی نەدەخوێند مەگەر نزای بۆ کەسێك بکردایە، یان نزای لە کەسێك بکردایە، وە کاتێ کە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، دەیفەرموو: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) (قونوتی دەخوێند و دەیفەرموو): خوایە ڕزگاری بکە، وە فەرموودەکەی باس کرد.

---

(١) صحيح.

٦٢٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَقْنُتُ إِلَّا إِذَا دَعَا لِقَوْمٍ أَوْ دَعَا عَلَى قَوْمٍ[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قونوتی نەدەخوێند مەگەر نزای بۆ خەڵکێك بکردایە یان نزای لە خەڵکێك بکردایە.

## بَابُ تَرْكِ الْقُنُوتِ عِنْدَ زَوَالِ الْحَادِثَةِ الَّتِي لَهَا يَقْنُتُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا تَرَكَ الْقُنُوتَ بَعْدَ شَهْرٍ لِزَوَالِ تِلْكَ الْحَادِثَةِ الَّتِي كَانَ لَهَا يَقْنُتُ، لَا نَسْخًا لِلْقُنُوتِ، وَلَا كَمَا تَوَهَّمَ مَنْ قَالَ إِنَّهُ لَا يَقْنُتُ أَكْثَرَ مِنْ شَهْرٍ

٦٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَنَتَ فِي صَلَاةٍ شَهْرًا، يَقُولُ فِي قُنُوتِهِ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، اللَّهُمَّ أَنْجِ سَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، اللَّهُمَّ أَنْجِ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، اللَّهُمَّ أَنْجِ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينِ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ يَدْعُ لَهُمْ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «أَوَ مَا تَرَاهُمْ قَدْ قَدِمُوا»[٢].

## باسی وازهێنان لە قونوت لە کاتی نەمانی ڕووداوی نەخوازرا و کە بەهۆیەوە قونوت دەخوێنرێ، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ وازی لە قونوت هێنا دوای مانگێك لەبەر نەمانی ئەو ڕووداوەی کە بەهۆیەوە قونوتی خوێند، نەك بەهۆی نەسخبوونەوەی حوکمی قونوت، وە نە بەمانای وتەی ئەو کەسەی بەهەڵەدا چووە وا دەزانێ نابێت زیاتر لە مانگێك قونوت بخوێنرێ

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك لە نوێژێکدا قونوتی دەخوێند، لە قونوتەکەیدا دەیفەرموو: خوایە وەلیدی کوڕی وەلید ڕزگار بکەی، خوایە سەلەمەی کوڕی هیشام ڕزگار بکەی، خوایە: عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە ڕزگار بکەی، خوایە باوەڕدارە لاوازەکانی خەڵکی مەککە ڕزگار بکەی، خوایە هۆزی (مُضَر) بگرە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

و سزایان بدە،ساڵەکانیان وەکوو ساڵەکانی یوسفی لێ بکە (واتە: قاتوقڕی و برسێتی و گرانی بخەیتە نێویان)، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانییانێك قونوتی نەخوێند و دوعای بۆ نەکردن، منیش ئەوەم بۆ باس کرد، ئەویش فەرمووی: ئەی نابینی ئەوان هاتنەوە (واتە: ڕزگاریان بوو بەهۆی دوعاکە).

## بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ غَلِطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهَا بَعْضُ مَنْ لَمْ يُنْعِمِ النَّظَرَ فِي أَلْفَاظِ الْأَخْبَارِ، وَلَمْ يَسْتَوْعِبْ أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْقُنُوتِ، فَاحْتَجَّ بِهَا وَزَعَمَ أَنَّ الْقُنُوتَ فِي الصَّلَاةِ مَنْسُوخٌ مَنْهِيٌّ عَنْهُ

**٦٢٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ حِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» فِي الرَّكْعَةِ الْأَخِيرَةِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ الْعَنْ فُلَانًا وَفُلَانًا»، دَعَا عَلَى نَاسٍ مِنَ الْمُنَافِقِينَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران»[1].

## باسی کۆمەڵە فەرموودەیەك یەكێك لەوانەی کە ڕۆنەچووە لە دەستەواژەی فەرموودەکان بەهەڵە لێی تێگەیشتووە و کردوویەتی بە بەڵگە و پێی وایە: خوێندنی قونوت لە نوێژی بەیانیدا حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە و قەدەغەی لێ کراوە

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو کاتێ سەری بەرز کردەوە لە ڕکووع لە نوێژی بەیانیدا فەرمووی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) لە ڕکاتی کۆتاییدا، پاشان فەرمووی: خوایە نەفرین بکە لە فڵان و فڵانە کەس، نزای لە خەڵکانێك لە دووڕووەکان کرد، دواتر خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: بەڕاستی بەدەست تۆ نییە (ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ شتێك لەو کارەدا چ خوا تەوبەیان لێ وەربگرێ یان سزایان بدات چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن.

---

(١) صحيح.

٦٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْعُو عَلَى أَرْبَعَةِ نَفَرٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران، قَالَ: فَهَدَاهُمُ اللَّهُ لِلْإِسْلَامِ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ أَيْضًا. وعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو عَلَى أَحْيَاءَ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران. قَالَ: ثُمَّ هَدَاهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي هَذِهِ الْأَخْبَارِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ اللَّعْنَ مَنْسُوخٌ بِهَذِهِ الْآيَةِ لَا أَنَّ الدُّعَاءَ الَّذِي كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو لِمَنْ كَانَ فِي أَيْدِي أَهْلِ مَكَّةَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَنَّ يُنَجِّيَهُمُ اللَّهُ مِنْ أَيْدِيهِمْ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ تَكُونَ الْآيَةُ نَزَلَتْ:﴿ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران، فِي قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ فِي يَدَيْ قَوْمٍ كُفَّارٍ يُعَذَّبُونَ، وَإِنَّمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الْآيَةَ:﴿ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران، فِيمَنْ كَانَ يَدْعُو النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِمْ بِاللَّعْنِ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَالْكُفَّارِ، فَأَعْلَمَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ لَيْسَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ فِي هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَلْعَنُهُمْ فِي قُنُوتِهِ، وَأَخْبَرَ أَنَّهُ إِنْ تَابَ عَلَيْهِمْ فَهَدَاهُمْ لِلْإِيمَانِ أَوْ عَذَّبَهُمْ عَلَى كُفْرِهِمْ وَنِفَاقِهِمْ فَهُمْ ظَالِمُونَ وَقْتَ كُفْرِهِمْ وَنِفَاقِهِمْ لَا مَنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو لَهُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْ يُنَجِّيَهُمْ مِنْ أَيْدِي أَعْدَائِهِمْ مِنَ الْكُفَّارِ، فَالْوَلِيدُ بْنُ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةُ بْنُ هِشَامٍ، وَعَيَّاشُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفُونَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ لَمْ يَكُونُوا ظَالِمِينَ فِي وَقْتِ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ بِأَنْ يُنَجِّيَهُمْ مِنْ أَيْدِي أَعْدَائِهِمُ الْكُفَّارِ، وَلَمْ يَتْرُكِ النَّبِيُّ ﷺ الدُّعَاءَ لَهُمْ بِالنَّجَاةِ مِنْ أَيْدِي كُفَّارِ أَهْلِ مَكَّةَ إِلَّا بَعْدَمَا نَجَوْا مِنْ أَيْدِيهِمْ لَا لِنُزُولِ هَذِهِ الْآيَةِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي الْكُفَّارِ وَالْمُنَافِقِينَ الَّذِينَ كَانُوا يَدْعُو النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْهِمْ بِاللَّعْنِ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَالْكُفَّارِ، الَّذِينَ كَانُوا ظَالِمِينَ لَا مَظْلُومِينَ، أَلَا تَسْمَعُ خَبَرَ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ يَدْعُ لَهُمْ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «أَوَمَا تُرَاهُمْ قَدْ قَدِمُوا»، فَأَعْلَمَ ﷺ أَنَّهُ إِنَّمَا تَرَكَ الْقُنُوتَ وَالدُّعَاءَ بِأَنْ نَجَّاهُمُ اللَّهُ، إِذِ اللَّهُ قَدِ اسْتَجَابَ لَهُمْ فَنَجَّاهُمْ لَا لِنُزُولِ الْآيَةِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي غَيْرِهِمْ مِمَّنْ هُوَ ضِدُّهُمْ، إِذْ مَنْ دَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِأَنْ يُنَجِّيَهُمْ مُؤْمِنُونَ مَظْلُومُونَ، وَمَنْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو عَلَيْهِمْ بِاللَّعْنِ كُفَّارٌ وَمُنَافِقُونَ ظَالِمُونَ فَأَمَرَ اللَّهُ ﷻ نَبِيَّهُ ﷺ بِأَنْ يَتْرُكَ لَعْنَ مَنْ كَانَ يَلْعَنُهُمْ، وَأَعْلَمَ أَنَّهُمْ ظَالِمُونَ، وَأَنْ لَيْسَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مِنْ أَمْرِهِمْ شَيْءٌ، وَأَنَّ اللَّهَ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ أَوْ تَابَ عَلَيْهِمْ،

---

(١) حديث صحيح.

فَتَفَهَّمُوا مَا بَيَّنْتُهُ تَسْتَيْقِنُوا بِتَوْفِيقِ خَالِقِكُمْ غَلَطَ مَنِ احْتَجَّ بِهَذِهِ الْأَخْبَارِ أَنَّ الْقُنُوتَ مِنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مَنْسُوخٌ بِهَذِهِ الْآيَةِ».

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نزای لە چوار کەس کرد، دواتر خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: بەڕاستی بەدەست تۆ نییە (ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ شتێك لەو کارەدا چ خوا تەوبەیان لێ وەربگرێ یان سزایان بدات چونکە بەڕاستی ئەوانە ستەمکارن. وتی: خوا هیدایەتی دان بۆ ئیسلام.

ئەبو بەکر گوتوویەتی: ئەم فەرموودەیە (غَرِيب)ە.

وە ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نزای لە چەند هۆز و شوێنێکی عەرەب کرد، دواتر خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾. وتی: پاشان خوا هیدایەتی دان بۆ ئیسلام.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودانە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی نەفرینکردن بەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە نەك ئەو پاڕانەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پاڕاوەتە بۆ ئەو موسوڵمانانەی لەژێر دەستی خەڵکی مەککە بوون کە خوا ڕزگاریان بکات، چونکە دروست نییە ئەم ئایەتە: ﴿ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، دابەزی بێت بۆ خەڵکانێکی باوەڕدار کە لەژێر دەستی بێباوەڕاندا سزا دەدران، بەڵکوو خوا ئەم ئایەتەی: ﴿ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، دابەزاند بۆ ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ نزای لێ کردن بە نەفرین لە دووڕوو و بێباوەڕەکان، خوا ئاگاداری کردەوە هیچ شتێکی ئەو بێباوەڕانە بە دەستی پێغەمبەر ﷺ نییە کە لە قونوتەکەیدا نزای لێ کردن بە نەفرین، وە خوا هەواڵی پێ دا ئەگەر لێیان خۆش بێت و هێدایەتیان بدات بۆ ئیمان یان سزایان بدات لەسەر بێباوەڕی و دووڕوویيان ئەوە بە هۆی بێباوەڕی و ستەمکردنیانە، کاتێ کە بێباوەڕ و دووڕوو بوون، نەك ئەو باوەڕدارانەی پێغەمبەر ﷺ نزای بۆ کردن ڕزگاریان بێت لە دەستی بێباوەڕان، جا وەلیدی کوڕی وەلید و سەلەمەی کوڕی هیشام و عیاشی کوڕی ئەبو ڕەبیعە و لاوازەکانی خەڵکی مەککە ستەمکار نەبوون لە کاتی نزاکردنی پێغەمبەر ﷺ، بەوەی ڕزگاریان بکات لە دەستی دوژمنە بێباوەڕەکان، پێغەمبەر ﷺ دەستبەرداری نزاکردن نەبوو بۆ ڕزگاربوونیان لە چنگی بێباوەڕانی مەککە دوای ئەوە نەبێت کە ڕزگار بوون لە دەستیان نەك لەبەر دابەزینی ئەم ئایەتەی

کە دەربارەی بێباوەڕان و دووڕووەکان دابەزی، ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ نزای لێ کردن بە نەفرین لە دووڕوو و بێباوەڕەکان، ئەوانەی کە ستەمکار بوون نەك ستەملێکراو، ئایا فەرموودەکەی یەحیای کوڕی ئەبو کەسیرت نەبیستووە لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ: پێغەمبەر ﷺ بەیانییەك نزای بۆ نەکردن، ئەوەم بۆی باس کرد، فەرمووی: ئایا نایانبینی هاتوونەتە پێشەوە بۆ موسوڵمانبوون، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ دا بۆیە وازی لە قونوت و پاڕانەوە هێنا بەوەی ڕزگاریان بکات، چونکە خوا نزاکەی لێ وەرگرتن و ڕزگاری کردن، نەك وازی هێنا بێت لە قونوت و پاڕانەوە لەبەر دابەزینی ئەو ئایەتەی کە دەربارەی غەیری ئەوان دابەزی، ئەوانەی کە دوژمنیان بوون، چونکە ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ نزای بۆ کردن باوەڕدارێکی ستەملێکراو بوون، وە ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ نزای لێ کردن بە نەفرین بێباوەڕان و دووڕووە ستەمکارەکان بوون، خوا ﷻ فەرمانی کرد بە پێغەمبەر ﷺ واز لە نەفرینکردن بهێنێ لەوانەی کە نەفرینی لێ دەکردن، هەواڵیشی پێ دا کە ئەوان ستەمکارن، پێغەمبەر ﷺ هیچی بە دەست نییە لە کاروباری ئەواندا، خوا ﷻ ئەگەر بیەوێت سزایان دەدات یان لێیان خۆش دەبێت، جا ئەوەی ڕوونم کردەوە لێی تێ بگەن دڵنیایی وەردەگرن بە یارمەتی خوای بەدیهێنەرتان، ئەو کەسەی ئەم فەرموودانەی کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی قونوتکردن لە نوێژی بەیانیدا هەڵوەشێنراوەتەوە (نەسخ بۆتەوە) بەم ئایەتە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ مَعَ الْإِهْوَاءِ لِلسُّجُودِ

**٦٢٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا[١].

## باسی تەکبیر (الله أكبر) کردن لەگەڵ دابەزین بۆ سوژدە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بیویستایە بچێتە سوژدە (الله أكبر)ی دەکرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ التَّجَافِي بِالْيَدَيْنِ عِنْدَ الْإِهْوَاءِ إِلَى السُّجُودِ

٦٢٥- عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ ، قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، ثُمَّ يَهْوِي إِلَى الْأَرْضِ، وَيُجَافِي يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ[1].

## باسی دوورخستنەوەی هەردوو دەست لە تەنیشتەکان لە کاتی چوونە سوژدە

واتە: عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ لەنێو دە کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو، یەکێکیان ئەبو قەتادە بوو ئەبو حومەید وتی: من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ، باسی هەندێك لە فەرموودەکەی کرد، وتی: پاشان وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ) پاشان دادەبەزی بۆ زەوی و (سوژدەی دەبرد) دەستەکانی لە هەردوو کەلەکەی دوور دەخستەوە.

## بَابُ الْبَدْءِ بِوَضْعِ الرُّكْبَتَيْنِ عَلَى الْأَرْضِ قَبْلَ الْيَدَيْنِ إِذَا سَجَدَ الْمُصَلِّي، إِذْ هَذَا الْفِعْلُ نَاسِخٌ لِمَا خَالَفَ هَذَا الْفِعْلَ مِنْ فِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْأَمْرِ بِهِ

٦٢٦- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ إِذَا سَجَدَ[2].

## باسی نوێژخوێن کاتێ چووە سوژدە سەرەتا هەردوو ئەژنۆ لەسەر زەوی دادەنێ پێش دەستەکانی، چونکە ئەم کارە ئەو فەرموودانەی نەسخ کردۆتەوە کە پێچەوانەی ئەم کارەن لە کرداری پێغەمبەر ﷺ و فەرمانکردنی پێی

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچووایەتە سوژدە هەردوو ئەژنۆی پێش دەستەکانی دادەنا.

---

(١) صحيح.

(٢) حديث ضعيف.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَدْئِهِ بِوَضْعِ الْيَدَيْنِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ عِنْدَ إِهْوَائِهِ إِلَى السُّجُودِ مَنْسُوخٌ، غَلِطَ فِي الِاحْتِجَاجِ بِهِ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَفْهَمْ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُ مَنْسُوخٌ، فَرَأَى اسْتِعْمَالَ الْخَبَرِ وَالْبَدْءَ بِوَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْأَرْضِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ

٦٢٧- عَنِ نافع عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّهُ كَانَ يَضَعُ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ، وَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ[1].

## باسی ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە لە کاتی سوژدەبردندا هەردوو دەستی پێش ئەژنۆکانی داناوە نەسخ کراوەتەوە، هەندێ لەوانەش کە کردوویانە بە بەڵگە بە هەڵەدا چووە کە نەیزانیوە نەسخ بووەتەوە، بۆیە کاری پێ کردووە و پێی وا بووە سەرەتا دەستەکان پێشی ئەژنۆکان دادەنرێن

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر رضي الله عنهما (لە کاتی دابەزینی بۆ سوژدە) دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی دادەنا، وە وتی: پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَمْرَ بِوَضْعِ الْيَدَيْنِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ عِنْدَ السُّجُودِ مَنْسُوخٌ، وَأَنَّ وَضْعَ الرُّكْبَتَيْنِ قَبْلَ الْيَدَيْنِ نَاسِخٌ، إِذْ كَانَ الْأَمْرُ بِوَضْعِ الْيَدَيْنِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ مُقَدَّمًا، وَالْأَمْرُ بِوَضْعِ الرُّكْبَتَيْنِ قَبْلَ الْيَدَيْنِ مُؤَخَّرًا، فَالْمُقَدَّمُ مَنْسُوخٌ، وَالْمُؤَخَّرُ نَاسِخٌ

٦٢٨- عَنْ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا نَضَعُ الْيَدَيْنِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ، فَأُمِرْنَا بِالرُّكْبَتَيْنِ قَبْلَ الْيَدَيْنِ[2].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) هذا الحديث أخرجه ابن حبان من طريق المصنف كما في **إتحاف المهرة** ٩٥/٥ (٥٠٠١) ولم نعثر عليه في صحيح ابن حبان، وهذا الحديث بهذا الإسناد لا يصلح لإثبات حكم فضلا عن نسخ غيره، إذ إن فيه راويين ضعيفين الأول: إبراهيم بن إسماعيل قال: ابن حبان في الثقات ٨٣/٨، وابن نمير كما في **تهذيب الكمال** ١٠١/١: ((في روايته عن أبيه بعض المناكير)). والثاني: أبوه إسماعيل بن يحيى. قال الأزدي والدارقطني: ((متروك)) **تهذيب الكمال** ٢٥٩/١، **وتهذيب التهذيب** ٣٣٦/١ قال الحازمي في **الاعتبار**: ١٢٢: ((أما حديث سعيد ففي إسناده مقال، ولو كان محفوظا لدل على النسخ، غير أن المحفوظ عن مصعب، عن أبيه، حديث نسخ التطبيق)). وقال الحافظ ابن حجر: ((وهذا لو صح لكان قاطعا للنزاع، ولكنه من أفراد إبراهيم بن إسماعيل بن سلمة بن كهيل، عن أبيه، وهما ضعيفان)). **فتح الباري** ٢٩١/٢.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە دانانی هەردوو دەست پێش ئەژنۆکان لە کاتی دابەزین بۆ سوژدە نەسخ کراوەتەوە، وە دانانی هەردوو ئەژنۆ پێش دەستەکان نەسخکەرەوەیە، چونکە لە سەرەتادا هەردوو دەست پێش ئەژنۆکان دەخرا بۆ سوژدە، بەڵام فەرمانکردن بە دانانی هەردوو ئەژنۆ پێش دەستەکان لەدواییدا بوو، جا ئەوەی سەرەتا نەسخ کراوەتەوە، ئەوەی دواییش نەسخکەرەوەیە

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: ئێمە (کاتێ دابەزیباین بۆ سوژدە) دەستەکانمان پێش هەردوو ئەژنۆمان دادەنا، دواتر فەرمانمان پێ کرا بە دانانی هەردوو ئەژنۆ پێش هەردوو دەست.

## بَابُ الْبَدْءِ بِرَفْعِ الْيَدَيْنِ مِنَ الْأَرْضِ قَبْلَ الرُّكْبَتَيْنِ عِنْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ السُّجُودِ

٦٢٩- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ إِذَا رَفَعَ[١].

## باسی دەستپێکردن بە بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە زەوی پێش ئەژنۆکان لە کاتی بەرزکردنەوەی سەر لە سوژدە

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتێ بچووایەتە سوژدە) هەردوو ئەژنۆی پێش دەستەکانی دادەنا، وە ئەگەر هەستابایەوە لە سوژدە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە پێش ئەژنۆکانی.

## بَابُ وَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الْأَرْضِ فِي السُّجُودِ إِذْ هُمَا يَسْجُدَانِ كَسُجُودِ الْوَجْهِ

٦٣٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: إِنَّ الْيَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ، فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَهُ فَلْيَرْفَعْهُمَا[٢].

---

(١) حديث ضعيف.

(٢) إسناده صحيح.

## باسی دانانی هەردوو دەست لەسەر زەوی لە کاتی سوژدەبردن، چونکە ئەو دووانە سوژدە دەبەن وەکوو سوژدەبردنی نێوچاوان

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: بەڕاستی دەستەکان سوژدە دەبەن وەکوو چۆن ڕوخسار سوژدە دەبات، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە ڕوخساری لەسەر زەوی دانا (بەمەبەستی سوژدەبردن) با دەستەکانیشی دابنێت، وە ئەگەر ڕوخساری بەرز کردەوە با دەستەکانیشی بەرز بکاتەوە.

## بَابُ ذِكْرِ عَدَدِ الْأَعْضَاءِ الَّتِي تَسْجُدُ مِنَ الْمُصَلِّي فِي صَلَاتِهِ إِذَا سَجَدَ الْمُصَلِّي

٦٣١- عَنْ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا سَجَدَ الْعَبْدُ سَجَدَ مَعَهُ سَبْعَةُ آرَابٍ: وَجْهُهُ، وَكَفَّاهُ، وَرُكْبَتَاهُ، وَقَدَمَاهُ»[١].

## باسی ژمارەی ئەو ئەندامانەی کە نوێژخوێن سوژدەیان پێ دەبات لەنێو نوێژەکەی کاتێ سوژدەی برد

واتە: عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ﷺ دەگێڕێتەوە ئەو گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر بەندە سوژدەی برد حەوت ئەندامی جەستەی لەگەڵیدا سوژدە دەبەن: نێوچاوانی و هەردوو لەپی و هەردوو ئەژنۆی و هەردوو پێیەکانی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالسُّجُودِ عَلَى الْأَعْضَاءِ السَّبْعَةِ اللَّوَاتِي يَسْجُدْنَ مَعَ الْمُصَلِّي إِذَا سَجَدَ

٦٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ، وَلَا أَكُفُّ شَعَرًا وَلَا ثَوْبًا»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەرمانکردن بە سوژدەبردن لەسەر حەوت ئەندامەکەی جەستە ئەوانەی لەگەڵ نوێژخوێن سوژدە دەبەن، کاتێ سوژدەی برد

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووویەتی: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە ببەم، دەستکاری قژ نەکەم (بۆ ئەوەی لە خۆڵ بیپارێزم)، هەروەها جلوبەرگیش.

٦٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظَمٍ، وَلَا أَكُفُّ شَعَرًا وَلَا ثَوْبًا»[1].

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووویەتی: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە ببەم، دەستکاری قژ نەکەم (بۆ ئەوەی لە خۆڵ بیپارێزم)، هەروەها جلوبەرگیش.

## بَابُ ذِكْرِ تَسْمِيَةِ الْأَعْضَاءِ السَّبْعَةِ الَّتِي أُمِرَ الْمُصَلِّي بِالسُّجُودِ عَلَيْهِنَّ

٦٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄قَالَ: أُمِرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ: عَلَى وَجْهِهِ، وَكَفَّيْهِ، وَرُكْبَتَيْهِ، وَقَدَمَيْهِ، وَنُهِيَ أَنْ يَكُفَّ شَعَرًا أَوْ ثَوْبًا[2].

## باسی ناونانی ئەو حەوت ئەندامەی کە فەرمان کراوە بە نوێژخوێن سوژدەیان لەسەر ببات

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: فەرمان کرا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەوت ئەندام سوژدە ببات: لەسەر نێوچاوانی و هەردوو لەپی دەستی و هەردوو ئەژنۆی و هەردوو پێی، وە قەدەغەی لێ کرا دەستکاری قژ یان جلوبەرگ بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٦٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، مِثْلَهُ، إِلَّا أَنَّهُ قَالَ: «أَوْ يَكُفَّ ثِيَابَهُ أَوْ شَعْرَهُ»، وَكَانَ ابْنُ طَاوُسٍ يُمِرُّ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ يَقُولُ: هُوَ وَاحِدٌ[1].

**واتە:** ئیبنو عەباس ﭬ دەگێڕێتەوە وەکوو ئەوەی پێشوو، ئەوە نەبێ وتی: یان دەستکاری جلوبەرگی یان قژی بکات. جا ئیبنو تاوس دەستی دەهێنا بەسەر نێوچاوان و لووتیدا و دەیوت: هەردووکیان یەکێکن.

**٦٣٦** - عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعٍ، وَلَا أَكُفُّ الشَّعْرَ وَلَا الثِّيَابَ الْجَبْهَةِ وَالْأَنْفِ، وَالْيَدَيْنِ، وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَالْقَدَمَيْنِ»[2].

**واتە:** ئیبنو عەباس ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئەندام سوژدە ببەم: نێوچاوان، لووت، هەردوو دەست، هەردوو ئەژنۆ، هەردوو پێ، وە دەستکاری قژ نەکەم (بۆ ئەوەی لە خۆڵ بیپارێزم)، هەروەها جلوبەرگیش.

## بَابُ إِمْكَانِ الْجَبْهَةِ وَالْأَنْفِ مِنَ الْأَرْضِ فِي السُّجُودِ

**٦٣٧-** عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيُّ ﭬ قَالَ: اجْتَمَعَ نَاسٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فِيهِمْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﭬ، فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: دَعُونِي أُحَدِّثْكُمْ، فَأَنَا أَعْلَمُكُمْ بِهَذَا قَالُوا: فَحَدِّثْ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ دَخَلَ الصَّلَاةَ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ سَجَدَ فَأَمْكَنَ جَبْهَتَهُ وَأَنْفَهُ مِنَ الْأَرْضِ، وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ: هَكَذَا كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[3].

## باسی جێگیرکردنی نێوچاوان و لووت لەسەر زەوی لە سوژدەدا

**واتە:** عەباسی کوڕی سەهلی ساعیدی ﭬ دەڵێ: خەڵکێك لە ئەنصارەکان کۆ بوونەوە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی و ئەبو حومەیدی ساعیدی و ئەبو ئوسەیدی

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.
(٣) صحيح.

ساعیدییان ﭫ تێدا بوو باسی نوێژی پێغەمبەریان ﷺ کرد، ئەبو حومەید وتی: ڕێگەم بدەن (چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ) بۆ باس بکەم، چونکە من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتیان: باسی بکە، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەچاکترین شێوە دەستنوێژی گرت، پاشان چووە نێو نوێژەوە، -دواتر باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان سوژدەی برد نێوچاوان و لووتی خستە سەر زەوی، دەستەکانیشی لە هەردوو تەنیشتی دوور خستەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە، (گێڕەرەوەی فەرموودەکە) وتی: خەڵکەکە هەموویان وتیان: نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە بوو.

## بَابُ إِثْبَاتِ الْيَدَيْنِ مَعَ الْوَجْهِ عَلَى الْأَرْضِ حَتَّى يَطْمَئِنَّ كُلُّ عَظْمٍ مِنَ الْمُصَلِّي إِلَى مَوْضِعِهِ

٦٣٨- عَن عَلِيِّ بْنِ يَحْيَى بْنِ خَلَّادٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ رِفَاعَةَ ﭬ فِي الْحَدِيثِ الطَّوِيلِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلرَّجُلِ الَّذِي صَلَّى وَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِإِعَادَةِ الصَّلَاةِ قَالَ: «ثُمَّ إِذَا أَنْتَ سَجَدْتَ فَأَثْبِتْ وَجْهَكَ وَيَدَيْكَ حَتَّى يَطْمَئِنَّ كُلُّ عَظْمٍ مِنْكَ إِلَى مَوْضِعِهِ»[1].

## باسی جێگیرکردنی هەردوو دەست لەگەڵ نێوچاوان لەسەر زەوی، تا هەموو ئێسکەکانی نوێژخوێن دەچنەوە جێگای خۆیان

واتە: عەلی کوڕی یەحیای کوڕی خەلاد دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە مامی ریفاعە ﭬ لە فەرموودەیەکی درێژدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ بەو پیاوەی فەرموو کە نوێژی کرد، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، دواتر فەرمووی: پاشان تۆ ئەگەر سوژدەت برد ڕوخسار و هەردوو دەستت (لەسەر زەوی) جێگیر بکە هەتا هەر یەك لە ئێسکەکانت ئارام دەبێت و دەچێتەوە جێی خۆی.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ السُّجُودِ عَلَى أَلْيَتَيِ الْكَفِّ

**٦٣٩-** عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَسْجُدُ عَلَى أَلْيَتَيِ الْكَفِّ[١].

### باسی سوژدەبردن لەسەر هەدوو لەپی دەست

واتە: بەڕاء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سوژدەی دەبرد لەسەر لەپی هەردوو دەستی.

## بَابُ وَضْعِ الْيَدَيْنِ حَذْوَ الْمَنْكِبَيْنِ فِي السُّجُودِ

**٦٤٠-** عَنْ عَبَّاس بْن سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ فَكَبَّرَ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ سَجَدَ فَأَمْكَنَ أَنْفَهُ وَجَبْهَتَهُ وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ حَتَّى رَجَعَ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ حَتَّى فَرَغَ[٢].

### باسی دانانی هەردوو دەست تا ئاستی هەردوو شان لە سوژدەدا

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی ساعیدی ﷺ دەڵێ: (خەڵکێك لە ئەنصارەکان) ئەبو حومەیدی ساعیدی و ئەبو ئوسەیدی ساعیدی و سەهلی کوڕی سەعد و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ کۆ بوونەوە، ئەبو حومەید وتی: من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ، هەستا و تەکبیر (الله أکبر)ی کرد -دواتر باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان سوژدەی برد لووت و نێوچاوانی خستە سەر زەوی، دەستەکانیشی لە هەردوو تەنیشتی دوور خستەوە، وە لەپی هەردوو دەستی تا ئاستی سەرشانی دانا، پاشان سەری بەرز کردەوە هەتا هەریەك لە ئێسکەکانی هاتەوە جێگەی خۆی، تا تەواوی کرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ وَضْعِ الْيَدَيْنِ فِي السُّجُودِ حِذَاءَ الْأُذُنَيْنِ، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ

٦٤١- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَقُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «فَرَأَيْتُهُ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ فَرَفَعَ يَعْنِي يَدَيْهِ فَرَأَيْتُ إِبْهَامَيْهِ بِحِذَاءِ أُذُنَيْهِ»، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: «ثُمَّ هَوَى فَسَجَدَ، فَصَارَ رَأْسُهُ بَيْنَ كَفَّيْهِ مِقْدَارَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ»[١].

## باسی ڕێگەدان بە دانانی هەردوو دەست لە سوژدەدا تا ئاستی گوێیەکان، ئەمەش لەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراون

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە، وتم: هەر دەبێت تەماشای نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، بینیم کاتێ نوێژی دەست پێ کرد (الله أكبر)ی کرد و دەستەکانی بەرز کردەوە سەر پەنجەکانیم بینی تا ئاستی گوێیەکانی دەبوو، -دواتر باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان دابەزی و سوژدەی برد، سەری لە نێوان هەردوو لەپی دەستیدا بوو بەئەندازەی دەستبەرزکردنەوەی کاتێ دەستی کرد بە نوێژ (واتە: دەستەکانی لە ئاستی گوێیەکانی بوون).

## بَابُ ضَمِّ أَصَابِعِ الْيَدَيْنِ فِي السُّجُودِ

٦٤٢ - عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ ضَمَّ أَصَابِعَهُ[٢].

## باسی دانەپاڵی پەنجەکانی هەردوو دەست لە سوژدەدا

واتە: عەلقەمەی کوڕی وائیل دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سوژدەی ببردایە پەنجەکانی دەخستە پاڵ یەکدی و دەینووساندن بەیەکەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ اسْتِقْبَالِ أَطْرَافِ أَصَابِعِ الْيَدَيْنِ مِنَ الْقِبْلَةِ فِي السُّجُودِ

**٦٤٣-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ نَفَرٍ ﷺ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رَأَيْتُهُ إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ، وَلَا قَابِضَهُمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِهِ الْقِبْلَةَ، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ، جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الْأَخِيرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَجَلَسَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ[١].

## باسی ڕووکردنی پەنجەکانی هەردوو دەست بەرەو قیبلە لە کاتی سوژدەدا

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاء دەگێڕێتەوە، ئەو دانیشتبوو لەگەڵ چەند کەسێك ﷺ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ وتی: من شارەزاترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم کاتێ تەکبیری بکردبایە دەستەکانی دەخستە ئاستی هەردوو شانی، وە کاتێ بچووایەتە ڕکووع دەستەکانی دەخستە سەر ئەژنۆکانی، پاشان پشتی دەچەماندەوە هەتا ڕاست دەبۆیەوە کەمێ زیاتر بۆ خوارەوە، کاتێ بەرز ببوایەتەوە ڕێك دەوەستا هەتا هەموو بڕبڕەیەکی پشتی دەهاتەوە جێی خۆی، وە کاتێ بچووایەتە سوژدە دەستەکانی دادەنا نە ڕایدەخست نە کۆی دەکردەوە، وە بەسەر پەنجەکانی ڕووی دەکردە قیبلە، وە کاتێ دابنیشتایە بۆ ڕکاتی دووەم لەسەر قاچی چەپی دادەنیشت، وە کاتێ دابنیشتایە بۆ ڕکاتی کۆتایی قاچی چەپی پێش دەخست و لەسەر نەرمایی ڕانی دادەنیشت.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الِاعْتِدَالِ فِي السُّجُودِ وَالنَّهْيِ عَنِ افْتِرَاشِ الذِّرَاعَيْنِ الْأَرْضَ

٦٤٤- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَعْتَدِلْ، وَلَا يَفْتَرِشْ ذِرَاعَيْهِ افْتِرَاشَ السَّبُعِ»[١].

## باسی ڕێکبوونەوە لە سوژدە و ڕێگریکردن لە ڕاخستنی هەردوو باڵ لەسەر زەوی

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە سوژدەی برد با ڕێك بێتەوە، با باڵەکانی ڕانەخات وەکوو چۆن دڕندە (سەگ و کەمتیار و شێر و هاوشێوەیان) ڕایدەخات.

٦٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَبْسُطْ ذِرَاعَيْكَ كَبَسْطِ السَّبُعِ، وَادْعَمْ عَلَى رَاحَتَيْكَ وَتَجَافَ عَنْ ضَبْعَيْكَ، فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ سَجَدَ كُلُّ عُضْوٍ مِنْكَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ نوێژت کرد باڵەکانت وەکوو باڵی دڕندە (سەگ و کەمتیار و شێر و هاوشێوەیان) درێژ مەکە، لەپی دەستەکانت بخەرە زەوی، نێوەڕاستی هەردوو قۆڵت لە یەکدی دوور بخەرەوە، چونکە تۆ ئەگەر ئەوەت کرد هەموو ئەندامێکت سوژدە دەبات.

## بَابُ رَفْعِ الْعَجِيزَةِ وَالْإِلْيَتَيْنِ فِي السُّجُودِ

٦٤٦- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: وَصَفَ لَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ ﷺ السُّجُودَ فَوَضَعَ يَدَيْهِ بِالْأَرْضِ وَرَفَعَ عَجِيزَتَهُ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

(٣) صحيح.

## باسی بەرزکردنەوەی سمت لە کاتی سوژدەبردن

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێ: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ وەسفی سوژدەی بۆ کردین هەردوو دەستی خستە زەوی و سمتی بەرز کردەوە، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەو شێوەیەی دەکرد.

## بَابُ تَرْكِ التَّمَدُّدِ فِي السُّجُودِ وَاسْتِحْبَابِ رَفْعِ الْبَطْنِ عَنِ الْفَخِذَيْنِ

**٦٤٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى جَخَّى[١].

## باسی وازهێنان لە خۆدرێژکردن لە سوژدەدا
## وە چاکتر وایە سك بەرز بکرێتەوە لە هەردوو ئەژنۆ

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بکردایە خۆی درێژ نەدەکرد و سك و سنگی لە ڕانەکانی بەرز دەکردەوە.

## بَابُ التَّجَافِي فِي السُّجُودِ

**٦٤٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكِ بْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ إِبْطَاهُ[٢].

## باسی دوورخستنەوەی باڵەکان لە تەنیشتەکان لە کاتی سوژدەبردن

واتە: عەبدوڵای کوڕی مالیکی کوڕی بوحەینە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بکردبایە و (سوژدەی ببردبایە) هەردوو دەستی لە یەکدی دوور

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

دەخستەوە هەتا بنباڵی دەردەکەوت (واتە: دەستەکان و باسکەکانی دوور دەخستەوە لە تەنیشتەکانی).

**٦٤٩**- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ جَافَى حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سوژدەی ببردبایە هەردوو دەستی لە تەنیشتەکانی جیا دەکردەوە هەتا سپیایی بنباڵی دەردەکەوت.

**٦٥٠**- عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَمِيرَةَ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا سَجَدَ يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ[٢].

واتە: عەدی کوڕی عەمیرەی حەزرەمی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سوژدەی ببردبایە (هێندە دەستەکانی لە کەلەکەکانی دوور دەخستەوە هەتا) سپیایی بنباڵی دەبینرا.

## بَابُ فَتْحِ أَصَابِعِ الرِّجْلَيْنِ فِي السُّجُودِ وَالِاسْتِقْبَالِ بِأَطْرَافِهِنَّ الْقِبْلَةَ

**٦٥١**- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُهُ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ بْنُ رِبْعِيٍّ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ اعْتَدَلَ قَائِمًا، وَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ هَوَى إِلَى الْأَرْضِ سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَفَتَحَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ[٣].

## باسی کردنەوەی پەنجەی پێیەکان لە سوژدە و ڕووکردنی سەرەپەنجەکان بۆ لای قیبلە

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: لەنێو دە هاوەڵی پێغەمبەردا ﷺ - گوێم لێ بوو کە یەکێکیان ئەبو قەتادەی کوڕی ڕیبعی ﷺ بوو - وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ ڕێك ڕادەوەستا، -باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان دابەزی بۆ زەوی و سوژدەی برد، پاشان وتی: (الله أكبر) پاشان هەردوو باڵی لە بنباڵەکانی دوور خستەوە و پەنجەی پێیەکانیشی کردەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

**٦٥٢-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، أَنَّهُ كَانَ جَالِسًا مَعَ نَفَرٍ ﷺ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرُوا صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ ﷺ: أَنَا كُنْتُ أَحْفَظَكُمْ لِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، رَأَيْتُهُ إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مِنْهُ مَكَانَهُ، وَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلَا قَابِضَهُمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ(١).

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاء دەگێڕێتەوە، ئەو دانیشتبوو لەگەڵ چەند کەسێك ﷺ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ وتی: من شارەزاترینتانم بە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم کاتێ تەکبیری بکردایە دەستەکانی دەخستە ئاستی هەردوو شانی، وە کاتێ بچووایەتە ڕکووع دەستەکانی دەخستە سەر ئەژنۆکانی، پاشان پشتی دەچەماندەوە هەتا ڕاست دەبۆیەوە کەمێ زیاتر بۆ خوارەوە، کاتێك هەستابایەوە ڕێك دەوەستا هەتا هەموو بڕبڕەیەکی پشتی دەهاتەوە جێی خۆی، وە کاتێ بچووایەتە سوژدە دەستەکانی دادەنا نە ڕایدەخست نە کۆی دەکردەوە، وە سەری پەنجەکانی ڕووەو قیبلە دەکرد.

## بَابُ ضَمِّ الْفَخِذَيْنِ فِي السُّجُودِ

**٦٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَفْتَرِشْ يَدَيْهِ افْتِرَاشَ الْكَلْبِ، وَلْيَضُمَّ فَخِذَيْهِ»(٢).

## باسی کۆکردنەوەی هەردوو قاچ لە سوژدەدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە سوژدەی برد با باڵی درێژ نەکات وەکوو چۆن سەگ دەستی درێژ دەکات، وە با هەردوو ڕانی بگەیەنێتە یەکدی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ضَمِّ الْعَقِبَيْنِ فِي السُّجُودِ

٦٥٤- عَن عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ مَعِي عَلَى فِرَاشِي، فَوَجَدْتُهُ سَاجِدًا رَاصًّا عَقِبَيْهِ مُسْتَقْبِلًا بِأَطْرَافِ أَصَابِعِهِ الْقِبْلَةَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِعَفْوِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَبِكَ مِنْكَ، أُثْنِيَ عَلَيْكَ لَا أَبْلُغُ كُلَّ مَا فِيكَ»، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ ﵂، أَخَذَكِ شَيْطَانُكِ؟»، فَقَالَتْ: أَمَا لَكَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: «مَا مِنْ آدَمِيٍّ إِلَّا لَهُ شَيْطَانٌ»، فَقُلْتُ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَأَنَا، وَلَكِنِّي دَعَوْتُ اللَّهَ عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ»[1].

### باسی نووساندنی هەردوو پاژنەی پێیەکان بە یەکدییەوە

واتە: عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ لێ ون بوو کە لەگەڵمدا بوو لەسەر جێگاکە، کاتێ بینیمەوە لە سوژدەدا بوو هەردوو پاژنەی پێی نووساند بەیەکەوە، پەنجەکانی ڕووبەڕووی قیبلە بوو، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەبوونت، وە پەنا دەگرم بە لێبووردنت لە سزاکانت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە شوێنەواری سیفاتەکانت، ستاییشت دەکەم، ناتوانم بەجۆرێ ستاییشت بکەم کە شیاوتە، کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەی عائیشە ﵂ ئایا شەیتانەکەت خەیاڵی بردیت؟ وتی: ئەی تۆ شەیتانت نییە؟ فەرمووی: هەر یەکێك لە نەوەکانی ئادەم شەیتانێکی هەیە، وتم: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: منیش، بەڵام داوام لە خوا کرد لێی، ئەویش موسوڵمان بوو.

## بَابُ نَصْبِ الْقَدَمَيْنِ فِي السُّجُودِ، فِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ عَائِشَةَ ﵂: فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَاطِنِ قَدَمَيْهِ وَهُمَا مُنْتَصِبَتَانِ

٦٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ ﵁ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي الْفِرَاشِ، فَجَعَلْتُ أَطْلُبُهُ بِيَدِي، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَاطِنِ قَدَمَيْهِ وَهُمَا مُنْتَصِبَتَانِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لَا أُحْصِي مَدْحَكَ، وَلَا ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی دانانی هەردوو قاچ لە سوژدەدا کە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ لە عائیشەوە ﷺ هاتووە: دواتر دەستەکانم دای لە نێوەڕاستی پێیەکانی، هەردوو قاچی چەقاندبوو

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﷺ دەڵێ: شەوێك پێغەمبەرم ﷺ لێ ونبوو لەسەر جێگاکە، (بە دەستم) دەگەڕام بە دوایدا، دواتر دەستەکانم دای لە نێوەڕاستی پێیەکانی، (ئەو لە سوژدەدا بوو) هەردوو پێی دانابوو، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خوایە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەبوونت، (واتە: بەهۆی کردەوە چاکەکانم لە گوناهەکانم خۆش بە)، وە پەنا دەگرم بە لێبووردنت لە سزاکانت (واتە: ئەگەر گوناهێکم کرد و شیاوی سزادان بووم من پەنا دێنم بۆ لات لێم خۆش بیت)، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە شوێنەواری سیفاتەکانت، ناتوانم پیاهەڵدان و ستاییشکردنت بژمێرم، وەکوو ئەوەی تەنها تۆ دەتوانیت ستاییشی خۆت بکەیت.

## بَابُ وَضْعِ الْكَفَّيْنِ عَلَى الْأَرْضِ وَرَفْعِ الْمِرْفَقَيْنِ فِي السُّجُودِ

٦٥٦- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ، وَارْفَعْ مِرْفَقَيْكَ[١].

## باسی دانانی هەردوو لەپی دەست لەسەر زەوی و بەرزکردنەوەی ئەنیشکەکان لە سوژدەدا

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سوژدەت برد هەردوو لەپی دەستت دابنێ و ئەنیشکەکانت بەرز بکەرەوە.

٦٥٧- عَنْ مَيْمُونَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَجَدَ لَوْ أَنَّ بَهْمَةً أَرَادَتْ أَنْ تَمُرَّ مِنْ تَحْتِ يَدِهِ مَرَّتْ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: مەیمونە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سوژدەی ببردایە (دەستەکانی لە تەنیشتەکانی دوور دەخستەوە) تەنانەت ئەگەر کاوڕێك بیویستایە تێپەڕ ببوایە تێپەڕ دەبوو.

٦٥٨- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلَّا وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ، وَقَرِينُهُ مِنَ الْمَلَائِكَةِ» قَالُوا: وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَإِيَّايَ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ، فَلَا يَأْمُرُنِي إِلَّا بِخَيْرٍ»[1].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك لە ئێوە نییە ئیللا بەردەوام هاوەڵێك لە جنۆکە و هاوەڵێك لە فریشتەی لەگەڵدایە، وتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: منیش، بەڵام خوا ﷻ یارمەتی دام زاڵ بووم بەسەریدا تا موسوڵمان بوو، فەرمانم پێ ناکات بە چاکە نەبێت.

## بَابُ طُولِ السَّجْدَةِ وَالتَّسْوِيَةِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الرُّكُوعِ وَبَيْنَ الْقِيَامِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ الرُّكُوعِ

٦٥٩- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷛ قَالَ: كَانَ رُكُوعُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَرَفْعُهُ رَأْسَهُ بَعْدَ الرُّكُوعِ، وَسُجُودُهُ وَجُلُوسُهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[2].

## باسی درێژی سوژدەبردن و یەکسانی لە نێوانی و نێوان ڕکووع و نێوان هەستانەوە دوای سەربەرزکردنەوە لە ڕکووع

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷛ دەڵێ: ئەندازەی مانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکووع و سەربەرزکردنەوەی لەدوای ڕکووع و سوژدەبردنی و دانیشتنی لە نێوان هەردوو سوژدەکەدا نزیك بوون لە یەکدییەوە.

٦٦٠- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷛ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَذَكَرَ أَنَّهُ قَرَأَ فِي رَكْعَةٍ الْبَقَرَةَ، وَالنِّسَاءَ، ثُمَّ رَكَعَ، فَكَانَ رُكُوعُهُ مِثْلَ قِيَامِهِ، ثُمَّ سَجَدَ فَكَانَ سُجُودُهُ مِثْلَ رُكُوعِهِ[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم كرد، -دواتر باسی فەرموودەكەی كرد- باسی كرد پێغەمبەر ﷺ لە ڕكاتێكدا سوڕەتی (الْبَقَرَةَ) و (النِّسَاءَ) ی خوێند، پاشان ڕكووعی برد، جا ڕكووعبردنی وەكوو ڕاوەستانی وا بوو، پاشان سوژدەی برد، سوژدەبردنیشی وەكو ڕكووعی وا بوو.

٦٦١- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ قِيَامُ النَّبِيِّ ﷺ، وَرُكُوعُهُ، وَسُجُودُهُ، وَجُلُوسُهُ، لَا يُدْرَى أَيُّهُ أَفْضَلُ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يُرِيدُ أَفْضَلَ: أَطْوَلُ[١].

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەستان و ڕكووع و سوژدە و دانیشتی نەدەزانرا كامەیان درێژتر بوو. ئەبو بەكر دەڵێ: مەبەستی لە (أَفْضَلَ): (أَطْوَل)ە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ فِي السُّجُودِ

٦٦٢- عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ بِهَذَا الْإِسْنَادِ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَقْرَةِ الْغُرَابِ. قَالَ سَلْمُ بْنُ جُنَادَةَ: فِي الْفَرَائِضِ، وَقَالَا جَمِيعًا: وَافْتِرَاشِ السَّبُعِ، وَأَنْ يُوَطِّنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ كَمَا يُوَطِّنَهُ الْبَعِيرُ[٢].

### باسی قەدەغەكردن لە سوژدەبردنێك وەكوو دەنوكدانی قەلەڕەش وا بێت

واتە: عەبدولحەمیدی كوڕی جەعفەر ﷺ بەم سەنەدە گێڕاویەتەوە (مەبەستی سەنەدێكە لە پێشەوە هێناویەتی) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە لە دەنووكدانی قەلەڕەش (واتە: سوژدەبردنێ ئەوەندە كورت بێت وەكوو دەنكودانی قەلەڕەش وا بێت)، سەلمی كوڕی جونادە وتی: لە نوێژی فەڕزدا، وە (یەحیا و عاصم) وتیان: هەموو نوێژەكانە، هەروەها لە درێژكردنی باڵ لە سوژدەدا وەكوو دڕندە (سەگ و كەمتیار و شێر و هاوشێوەكانیان لە گیانلەبەرانی دیكە)، وە قەدەغەی كردووە پیاوێك شوێنێك دیاری بكات بۆ نوێژكردن وەكوو چۆن حوشتر لە شوێنە كۆنەكەی خۆی نەبێت ئەژنۆ دانادات.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ إِتْمَامِ السُّجُودِ وَالزَّجْرِ عَنِ انْتِقَاصِهِ وَتَسْمِيَةِ الْمُنْتَقِصِ رُكُوعَهُ وَسُجُودَهُ سَارِقًا أَوْ هُوَ سَارِقٌ مِنْ صَلَاتِهِ

**٦٦٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْوَأُ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ صَلَاتَهُ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يَسْرِقُ صَلَاتَهُ؟ قَالَ: «لَا يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلَا سُجُودَهَا»[1].

## باسی سوژدەبردن بەتەواوی، وە سەرزەنشتکردنی کەموکوڕیکردن تیایدا، وە ناونانی ئەو کەسەی کەموکوڕی لە ڕکووع و سوژدەیدا دەکات بە دز، یان دزیکردن لە نوێژەکەیدا

واتە: عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپترینی خەڵکی دزی دەکات ئەو کەسەیە کە دزی لە نوێژەکەی دەکات، وتیان: چۆن دزی لە نوێژەکەی دەکات؟ فەرمووی: ڕکووع و سوژدە بەتەواوی نابات.

**٦٦٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْعَصْرَ فَبَصُرَ بِرَجُلٍ يُصَلِّي، فَقَالَ: «يَا فُلَانُ اتَّقِ اللَّهَ، أَحْسِنْ صَلَاتَكَ، أَتَرَوْنَ أَنِّي لَا أَرَاكُمْ، إِنِّي لَأَرَى مِنْ خَلْفِي كَمَا أَرَى مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، أَحْسِنُوا صَلَاتَكُمْ وَأَتِمُّوا رُكُوعَكُمْ وَسُجُودَكُمْ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری بۆ کردین پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد، فەرمووی: ئەی فڵانە کەس لە خوا بترسە، نوێژەکەت بەچاکی ئەنجام بدە، ئایا وا دەزانن من ناتانبینم، بەڕاستی من لە پشتمەوە دەبینم وەکوو چۆن پێشم دەبینم، نوێژەکانتان بەچاکی بکەن و ڕکووع و سوژدەکانتان بەتەواوی ببەن.

**٦٦٥-** عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَصْحَابِهِ، ثُمَّ جَلَسَ فِي طَائِفَةٍ مِنْهُمْ، فَدَخَلَ رَجُلٌ، فَقَامَ يُصَلِّي، فَجَعَلَ يَرْكَعُ وَيَنْقُرُ فِي سُجُودِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَتَرَوْنَ هَذَا، مَنْ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مَاتَ عَلَى هَذَا مَاتَ عَلَى غَيْرِ مِلَّةِ مُحَمَّدٍ، يَنْقُرُ صَلَاتَهُ كَمَا يَنْقُرُ الْغُرَابُ الدَّمَ، إِنَّمَا مَثَلُ الَّذِي يَرْكَعُ وَيَنْقُرُ فِي سُجُودِهِ كَالْجَائِعِ لَا يَأْكُلُ إِلَّا التَّمْرَةَ وَالتَّمْرَتَيْنِ، فَمَاذَا تُغْنِيَانِ عَنْهُ، فَأَسْبِغُوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ، أَتِمُّوا الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»[١].

واتە: ئەبو عەبدوڵای ئەشعەری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە هاوەڵەكانی كرد، پاشان دانیشت لەنێو كۆمەڵێكیاندا، پیاوێك هاتە ژوورەوە، دەستی كرد بە نوێژ، ئینجا ڕكووعی برد و بەپەلە سوژدەی برد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە دەبینن، هەر كەسێك لەسەر ئەو حاڵە بمرێ ئەوا لەسەر ڕێبازی جگە لە موحەممەد مردووە، نوێژەكەی دەكات بەپەلە وەكوو چۆن قەلەڕەش دەنوك دەدا لە زەوی، بێگومان نموونەی ئەو كەسەی ڕكووع دەبات و لە سوژدەدا پەلە دەكات وەك كەسێكی برسی وایە تەنها خورمایەك یان دوو خورما بخوات، چی لە برسێتییەكەی كەم دەكاتەوە، بۆیە بەچاكی دەستنوێژ بگرن، سزا و لەناوچوون بۆ ئەو كەسانەی كەمتەرخەمی دەكەن لە شۆردنی پشتی پێیان، ڕكووع و سوژدە بەتەواوی ببەن.

## بَابُ إِيجَابِ إِعَادَةِ الصَّلَاةِ الَّتِي لَا يُتِمُّ الْمُصَلِّي فِيهَا سُجُودَهُ، إِذِ الصَّلَاةُ الَّتِي لَا يُتِمُّ الْمُصَلِّي رُكُوعَهَا وَلَا سُجُودَهَا غَيْرُ مُجْزِئَةٍ عَنْهُ

٦٦٦- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»[٢].

## باسی پێویستە ئەو نوێژە دووبارە بكرێتەوە كە نوێژخوێن بەچاكی سوژدەی تێدا نابات، چونكە ئەو نوێژەی ڕكووع و سوژدەی ناتەواوە لە ئەستۆی خاوەنەكەی دەمێنێتەوە و نوێژەكەی بۆ نانووسرێ

واتە: ئەبو مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ دروست نییە بۆ پیاوێك پشتی تێدا ڕاست نەكاتەوە لە ڕكووع و لە سوژدەدا.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**٦٦٧-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ وَكَانَ أَحَدَ الْوَفْدِ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمَحَ بِمُؤَخَّرِ عَيْنِهِ إِلَى رَجُلٍ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، فَلَمَّا قَضَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ قَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»[١]

**واتە:** عەبدوڕەحمانی کوڕی عەلی دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، عەلی کوڕی شەیبان ﷺ یەکێك بوو (لە شەش) نوێنەرەکە (کە لە کیندەوە هاتبوون لە ناوچەی شام). وتی: لەپشت پێغەمبەری خواوە ﷺ نوێژمان کرد، بە تیلەی چاوی سەرنجی پیاوێکی دا کە پشتی ڕێك نەدەکردەوە لە ڕکووع و سوژدەدا، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، بێگومان نوێژی ئەو کەسە تەواو نییە پشتی ڕاست نەکاتەوە لە ڕکووع و سوژدەدا.

## بَابُ التَّسْبِيحِ فِي السُّجُودِ

**٦٦٨-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ» ثَلَاثًا، وَفِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى» ثَلَاثًا»[٢].

## باسی تەسبیحکردن (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) لە سوژدەدا

**واتە:** حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕکووعیدا سێ جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری مەزنم، پاشان سوژدەی دەبرد و سێ جار دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزم.

**٦٦٩** - عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ سَجَدَ، فَقَالَ فِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد، -باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان سوژدەی برد و سێ جار فەرمووی: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) واتە: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزم.

**٦٧٠-** عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾﴾الأعلى، قَالَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ: «اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: کاتێ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾﴾ دابەزی، پێغەمبەر ﷺ پێیانی فەرموو: لە سوژدەکانتاندا بیخوێنن.

## بَابُ الدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ

**٦٧١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي الْفِرَاشِ، فَجَعَلْتُ أَطْلُبُهُ بِيَدِي، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَاطِنِ قَدَمَيْهِ وَهُمَا مُنْتَصِبَتَانِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ[٢].

## باسی پاڕانەوە لە سوژدەدا

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: شەوێك پێغەمبەری خوام ﷺ لێ ونبوو لەسەر جێگاکە، بە دەستەکانم دەگەڕام بە دوایدا، دواتر دەستەکانم بەر نێوەڕاستی پێیەکانی کەوت (ئەو لە سوژدەدا بوو) هەردوو پێی دانابوو، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خوایە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەبوونت (واتە: بەهۆی کردەوە چاکەکانم لە گوناهەکانم خۆش بە)، وە پەنا دەگرم بە لێبووردنت لە سزاکانت (واتە: ئەگەر گوناهێکم کرد و شیاوی سزادان بووم من پەنا دێنم بۆ لات لێم خۆش بیت)، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە شوێنەواری سیفاتەکانت، ناتوانم پیاهەڵدان و ستاییشکردنت بژمێرم، وەکوو ئەوەی تەنها تۆ دەتوانیت ستاییشی خۆت بکەیت.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**٦٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجُلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوژدەیدا دەیفەرموو: خوایە لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە، ئەو گوناهانەی بچووك و کەمن و ئەوانەشی کە زۆرە، ئەو گوناهانەش لە سەرەتاوە کردوومە و ئەوانەشی دواهەمینە، ئەو گوناهانەش بەئاشکراو ئەوانەشی بەپەنهان کردوومە.**

**٦٧٣-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ كَبَّرَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: ثُمَّ إِذَا سَجَدَ قَالَ فِي سُجُودِهِ: «اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، وَأَنْتَ رَبِّي، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ»[٢].

**واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژی فەرز (الله أكبر) ی دەکرد، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان سوژدەی برد لە سوژدەکەیدا فەرمووی: ئەی خوایە تەنها سوژدەم بۆ تۆ برد و بڕوام بە تۆ هێنا و تەسلیمی تۆ بووم، ڕوخسارم سوژدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە، وە بیستن و بینینی پێ داوە، پاکی و بێگەردی و پیرۆزی بۆ خوا کە چاکترینی دروستکارەکانە.**

## بَابُ الْأَمْرِ فِي الِاجْتِهَادِ فِي الدُّعَاءِ فِي السُّجُودِ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ، وَمَا يُرْجَى فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ مِنْ إِجَابَةِ الدُّعَاءِ

**٦٧٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السِّتَارَةَ وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: «وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی فەرمانکردن لە زۆر پاڕانەوە لە سوژدەدا لەنێو نوێژی فەرز، چونکە لەو کاتەدا ئومێد دەکرێ نزا و پاڕانەوە گیرا بێت

واتە: ئیبنو عەباس ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی لادا تەماشی کرد خەڵکەکەش ڕیزیان بەستبوو لەپشت ئەبو بەکر، فەرمووی: لە سوژدەشدا زۆر بپاڕێنەوە جێگای ئومێدە لێتان وەربگیرێ.

## بَابُ إِبَاحَةِ السُّجُودِ عَلَى الثِّيَابِ اتِّقَاءَ الْحَرِّ وَالْبَرْدِ

٦٧٥- عَنْ أَنَسٍ ﭬ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ، فَإِذَا أَرَادَ أَحَدُنَا أَنْ يَسْجُدَ بَسَطَ ثَوْبَهُ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَسَجَدَ عَلَيْهِ[١].

## باسی ڕێگەدان بە سوژدەبردن لەسەر جلوبەرگ لەبەر خۆپاراستن لە گەرما و سەرما

واتە: ئەنەس ﭬ دەڵێ: ئێمە نوێژمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لە گەرمای سەختدا، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێمە بیویستایە سوژدە ببات جلەکەی ڕادەخست بەهۆی سەختی گەرماکە و سوژدەی لەسەری دەبرد.

٦٧٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَابِتِ بْنِ صَامِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﭬ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى فِي مَسْجِدِ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، وَعَلَيْهِ كِسَاءٌ مُلْتَفٌّ بِهِ، يَضَعُ يَدَيْهِ، يَقِيهِ الْكِسَاءُ بَرْدَ الْحَصَا[٢].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی سابیتی کوڕی صامیت دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﭬ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتی نەوەکانی عەبدولئەشهەل نوێژی کرد، پۆشاکێکی پێچابوو بەخۆیەوە دەستی خستبۆیە نێویەوە تا پۆشاکەکە لە ساردی بەردەکان بیپارێزێ.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ السُّنَّةِ فِي الْجُلُوسِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

**٦٧٧-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالُوا: مَا كُنْتَ أَقْدَمَنَا لَهُ صُحْبَةً، وَلَا أَطْوَلَنَا لَهُ تَبَاعَةً قَالَ: بَلَى قَالُوا: فَاعْرِضْ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ وَاعْتَدَلَ قَائِمًا، حَتَّى يَقَرَّ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلًا، ثُمَّ يَقْرَأُ ثُمَّ يَرْفَعُ يَدَيْهِ، وَيُكَبِّرُ وَيَرْكَعُ فَيَضَعُ رَاحَتَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَلَا يَصُبُّ رَأْسَهُ، وَلَا يُقْنِعُهُ، ثُمَّ يَقُولُ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ مُعْتَدِلًا، حَتَّى يَقَرَّ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَسْجُدُ فَيُجَافِي جَنْبَيْهِ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، فَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى، فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا، وَيَفْتَحُ أَصَابِعَ رِجْلِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ يَقُومُ فَيَصْنَعُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَقُومُ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ فَيَصْنَعُ مِثْلَ مَا صَنَعَ حِينَ افْتَتَحَ الصَّلَاةَ[1].

### باسی دانیشتن لە نێوان دوو سوژدەکەی نێو نوێژ سوننەتە

واتە: موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ لەنێو دە کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتیان: تۆ لە ئێمە لە پێشتر نەبووی لە هاوەڵیکردنی و لە ئێمە زیاتر شوێنکەوتووی نەبووی، وتی: بەڵێ، وتیان: باسی بکە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی سەر شانەکانی، پاشان تەکبیری دەکرد و بەڕێکی دەوەستا هەتا هەموو ئێسکەکانی لە جێگای خۆی جێگیر دەبوو بەڕێکی، پاشان قورئانی دەخوێند، پاشان هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە و تەکبیری دەکرد و ڕکووعی دەبرد لەپی هەردوو دەستی دەخستە سەر ئەژنۆکانی، نە سەری دەخستە خوار و نە بەرزی دەکردەوە، پاشان (سەری بەرز دەکردەوە و) دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە هەتا ئاستی سەر شانەکانی بەڕێکی، دەوەستا هەتا هەموو ئێسکەکانی

---

(١) صحيح.

لە جێگای خۆی جێگیر دەبوو بەڕێکی، پاشان (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی دەکرد و سوژدەی دەبرد هەردوو دەستی لە هەردوو تەنیشتەکانی دوور دەخستەوە، پاشان سەری بەرز دەکردەوە و قاچی چەپی دەنوشتاندەوە و لەسەری دادەنیشت، پەنجەکانی پێی ڕاستی دەکردەوە، پاشان هەڵدەستا لە ڕکاتەکەی دیکەشدا بەو شێوەیەی دەکرد، پاشان لە دوو سوژدەکە هەڵدەستایەوە هەر وەکوو ئەوەی دەکرد کە کاتێ نوێژی دەست پێ کرد.

**٦٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: إِنَّ مِنَ السُّنَّةِ فِي الصَّلَاةِ أَنْ تُضْجِعَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى وَتَنْصِبَ الْيُمْنَى إِذَا جَلَسْتَ فِي الصَّلَاةِ(١).

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: بەڕاستی لە سوننەت و شێوازی نوێژ ئەوەیە ئەگەر لەنێو نوێژ دانیشتی قاچی چەپت درێژ بکەیت لە ژێرتدا و قاچی ڕاستیش بچەقێنی.

**٦٧٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: مِنْ سُنَّةِ الصَّلَاةِ أَنْ تُضْجِعَ رِجْلَكَ الْيُسْرَى، وَتَنْصِبَ الْيُمْنَى قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ أَضْجَعَ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى(٢).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذِهِ الزِّيَادَةُ الَّتِي فِي خَبَرِ ابْنِ عُيَيْنَةَ لَا أَحْسَبُهَا مَحْفُوظَةً، أَعْنِي قَوْلَهُ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ أَضْجَعَ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى.

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: بەڕاستی لە سوننەت و شێوازی نوێژ ئەوەیە (ئەگەر لەنێو نوێژ دانیشتی) قاچی چەپت درێژ بکەیت لە ژێرتدا و قاچی ڕاستیش بچەقێنی. وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەنێو نوێژ دابنیشتبایە قاچی چەپی درێژ دەکرد و قاچی ڕاستی دەچەقاند.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم زیادەیەی کە لە فەرموودەکەی ئیبنو عویەینە هاتووە پێم وایە پارێزراو نییە، مەبەستم ئەم وتەیە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەنێو نوێژ دابنیشتبایە قاچی چەپی درێژ دەکرد و قاچی ڕاستی دادەنا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، وَهَذَا مِنْ جِنْسِ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، فَجَائِزٌ أَنْ يُقْعِيَ الْمُصَلِّي عَلَى الْقَدَمَيْنِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، وَجَائِزٌ أَنْ يَفْتَرِشَ الْيُسْرَى وَيَنْصِبَ الْيُمْنَى.

٦٨٠- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ طَاوُسًا يَقُولُ: قُلْنَا لِابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ فِي الْإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ، فَقَالَ: هِيَ السُّنَّةُ، فَقُلْنَا: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرِّجْلِ، فَقَالَ: بَلْ هِيَ سُنَّةُ نَبِيِّكَ ﷺ[(١)].

## باسی ڕێگەپێدان بە دانانی سمت لەسەر هەردوو پاژنە لە نێوان دوو سوژدەکەدا، ئەمەش لە شێوازی ئەو جیاوازییانەیە کە ڕێگەپێدراون، جا دروستە نوێژخوێن سمتی لەسەر هەردوو پاژنەی دابنێت لە نێوان دوو سوژدەکە، وە دروستە قاچی چەپی درێژ بکات و قاچی ڕاستی بچەقێنێ

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئەو گوێی لە تاوس بوو دەیوت: پرسیارمان لە ئیبنو عەباس ﵄ کرد سەبارەت بە دانانی سمت لەسەر هەردوو پاژنە؟ وتی: ئەوە سوننەتە، وتمان: ئێمە بەزەحمەتمان دەزانی، وتی: بەڵکوو ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە ﷺ.

٦٨١- عَنِ الْعَبَّاس بْن سَهْلِ بْنِ سَعْدِ بْنِ مَالِكِ بْنِ سَاعِدٍ قَالَ: جَلَسْتُ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ فِي الضُّحَى مَعَ أَبِي أُسَيْدٍ مَالِكِ بْنِ رَبِيعَةَ وَمَعَ أَبِي حُمَيْدٍ ﵄ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُمَا مِنْ رَهْطِهِ مِنْ بَنِي سَاعِدَةَ، وَمَعَ أَبِي قَتَادَةَ الْحَارِثِ بْنِ رِبْعِيٍّ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ - وَأَنَا أَسْمَعُ: أَنَا أَعْلَمُ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْكُمَا، كُلٌّ يَقُولُهَا لِصَاحِبِهِ، فَقَالُوا لِأَحَدِهِمْ: قُمْ فَصَلِّ بِنَا حَتَّى نَنْظُرَ أَتُصِيبُ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَمْ لَا؟ فَقَامَ أَحَدُهُمَا فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ قَرَأَ بَعْضَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ رَكَعَ، فَأَثْبَتَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى اطْمَأَنَّ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَاعْتَدَلَ حَتَّى رَجَعَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ وَقَعَ سَاجِدًا عَلَى جَبِينِهِ وَرَاحَتَيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ وَصُدُورِ قَدَمَيْهِ رَاجِلًا بِيَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ مَا تَحْتَ مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ ثَبَتَ حَتَّى اطْمَأَنَّ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَاعْتَدَلَ عَلَى عَقِبَيْهِ وَصُدُورِ قَدَمَيْهِ حَتَّى رَجَعَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ عَادَ لِمِثْلِ ذَلِكَ قَالَ: ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ أُخْرَى مِثْلَهَا قَالَ: ثُمَّ سَلَّمَ فَأَقْبَلَ عَلَى صَاحِبَيْهِ، فَقَالَ لَهُمَا: كَيْفَ رَأَيْتُمَا؟ فَقَالَا لَهُ: أَصَبْتَ صَلَاةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، هَكَذَا كَانَ يُصَلِّي[(٢)].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدی کوڕی مالیکی کوڕی ساعد دەڵێ: لە کاتی چێشتەنگاو دانیشتبووم لە بازاڕی مەدینە لەگەڵ ئەبو ئوسەید مالیکی کوڕی ڕەبیعە و لەگەڵ ئەبو حومەید ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ -ئەو دووانە لە کەسوکاری ئەو بوون لە نەوەکانی ساعیدە-، وە لەگەڵ ئەبو قەتادە حاریسی کوڕی ڕەبعی، هەندێکیان بە هەندێکی دیکەی وت -منیش گوێم دەگرت-: من لە شارەزاترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەریەکە و بە هاوەڵەکەی ئەوەی دەوت، بە یەکێکیانیان وت: هەستە نوێژمان بۆ بکە هەتا تەماشا بکەین وەکوو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژ دەکەی یان نا؟ یەکێکیان هەستا ڕووی کردە قیبلە، پاشان (الله أکبر)ی کرد، پاشان هەندێ لە قورئانی خوێند، پاشان چووە ڕکووع، هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆکانی جێگیر کرد تاوەکوو هەموو ئێسکەکانی گەڕانەوە شوێنی خۆیان، پاشان سەری بەرز کردەوە و ڕێك بۆیەوە، تاوەکوو هەموو ئێسکەکانی گەڕانەوە شوێنی خۆیان، پاشان وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، پاشان سوژدەی برد لەسەر نێوچاوانی و هەردوو لەپی و ئەژنۆکانی و سنگی هەردوو قاچی، هەردوو دەستی بڵاو کردبۆیەوە هەتا سپیایی بنباڵیم بینی لە خوار شانەکانی پاشان جێگیر بوو تا هەموو ئێسکەکانی ئارام بوونەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە ڕێك بۆیەوە لەسەر هەردوو پاژنەی تا هەموو ئێسکەکانی دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان، پاشان گەڕایەوە وەکوو ئەوەی کرد، پاشان هەستا بەهەمان شێوە ڕکاتێکی دیکەی کرد، وتی: پاشان سەلامی دایەوە ڕووی کردە هەردوو هاوەڵەکەی، پێی وتن: پێتان چۆن بوو؟ پێیان وت: شێوەی نوێژی پێغەمبەری خوات ﷺ پێکا، ئەو بەو شێوەیە نوێژی دەکرد.

## بَابُ طُولِ الْجُلُوسِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

٦٨٢- عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ قَالَ: قَالَ لَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ: إِنِّي لَا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِنَا قَالَ ثَابِتٌ: فَكَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئًا لَا أَرَاكُمْ تَصْنَعُونَهُ، كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ قَعَدَ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ[١].

---

(١) صحيح.

## باسی دانیشتنی درێژ لە نێوان هەردوو سوژدەکە

واتە: سابیت دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ پێیانی وت: من کەمتەرخەمی ناکەم لەوەی نوێژتان بۆ بکەم وەکوو چۆن بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ دەکردین، سابیت وتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بینی شتێکی دەکرد، وا نابینم ئێوە کردبێتان، ئەگەر سەری بەرز بکردبایەوە لە سوژدە لە نێوانی هەردوو سوژدەکە ئەوەندە دادەنیشت تا کەسێك دەیوت: بەڕاستی بیری چوو (بچێتە سوژدە).

## بَابُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ السُّجُودِ وَبَيْنَ الْجُلُوسِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ أَوْ مُقَارَبَةِ مَا بَيْنَهُمَا

٦٨٣- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ سُجُودُ النَّبِيِّ ﷺ وَرُكُوعُهُ وَقُعُودُهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ[١].

## باسی یەکسانی مانەوە لە نێوان سوژدە و نێوان دانیشتنی هەردوو سوژدەکە یان نزیك لە یەکدی

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: ئەندازەی مانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە سوژدە و ڕکووع و دانشتنی لە نێوان هەردوو سوژدەکەدا نزیك بوون لە یەکدییەوە.

## بَابُ الدُّعَاءِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

٦٨٤- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ يُصَلِّي، فَجِئْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَافْتَتَحَ الْبَقَرَةَ، فَقُلْتُ يُرِيدُ الْمِائَةَ، فَجَاوَزَهَا، فَقُلْتُ: يُرِيدُ الْمِائَتَيْنِ، فَجَاوَزَهَا، فَقُلْتُ: يُخْتِمُ، فَخَتَمَ ثُمَّ افْتَتَحَ النِّسَاءَ، فَقَرَأَهَا، ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ، ثُمَّ رَكَعَ قَرِيبًا مِمَّا قَرَأَ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَالَ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ»، قَرِيبًا مِمَّا رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ نَحْوًا مِمَّا رَفَعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَقَالَ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي» نَحْوًا مِمَّا سَجَدَ، ثُمَّ سَجَدَ نَحْوًا مِمَّا رَفَعَ، ثُمَّ قَامَ فِي الثَّانِيَةِ قَالَ الْأَعْمَشُ: فَكَانَ لَا يَمُرُّ بِآيَةِ تَخْوِيفٍ إِلَّا اسْتَعَاذَ أَوِ اسْتَجَارَ، وَلَا آيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا سَأَلَ، وَلَا آيَةِ - يَعْنِي - تَنْزِيهٍ إِلَّا سَبَّحَ»[٢].

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

## باسی پاڕانەوە لە نێوان هەردوو سوژدەکە

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەو هەستا نوێژی دەکرد، منیش هاتم لە تەنیشتی وەستام و دەستم پێ کرد، بە سوڕەتی (الْبَقَرَةَ) دەستی پێ کرد، وتم: لە سەد ئایەت دەوەستێ، تێی پەڕاند و ڕۆیشت، وتم: لە دوو سەد ئایەت دەوەستێ تێی پەڕاند و ڕۆیشت، وتم: تەواوی دەکات، تەواوی کرد ئینجا دەستی کرد بە سوڕەتی (النِّسَاءَ) و هەمووی خوێند، پاشان سوڕەتی (آلَ عِمْرَانَ)ی خوێند، پاشان ڕکووعی برد ماوەی نزیك لە قورئانخوێندنەکەی مایەوە، پاشان بەرز بۆیەوە و فەرمووی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، ماوەی نزیك لە ڕکووعەکەی مایەوە، پاشان سوژدەی برد بەئەندازەی وەستانەکەی، پاشان لە سوژدە بەرز بۆیەوە و دانیشت و فەرمووی: (رَبِّ اغْفِرْ لِي)، بەئەندازەی سوژدەکەی مایەوە، پاشان سوژدەی برد بەئەندازەی بەرزبوونەوەکەی بۆ دانیشتن مایەوە، پاشان بۆ ڕکاتی دووەم هەستایەوە، ئەعمەش وتی: بەلای ئایەتی باسی سزا و ترساندن تێ نەدەپەری حەتمەن پەنای دەگرت (بە خوا لێی)، وە بەلای ئایەتی باسی ڕەحمەت و خۆشییەکانی تێ نەدەپەڕی حەتمەن داوای دەکرد، وە بەلای ئایەتی باسی پاك و بێگەردی و مەزنی خوا تێ نەدەپەڕی حەتمەن (سبحان الله)ی دەکرد.

## بَابُ الْجُلُوسِ بَعْدَ رَفْعِ الرَّأْسِ مِنَ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ قَبْلَ الْقِيَامِ إِلَى الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ وَإِلَى الرَّكْعَةِ الرَّابِعَةِ

٦٨٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَطَاءٍ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُهُ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ اعْتَدَلَ قَائِمًا، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ هَوَى إِلَى الْأَرْضِ سَاجِدًا، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، ثُمَّ جَافَى عَضُدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَفَتَحَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَقَعَدَ عَلَيْهَا، وَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ هَوَى سَاجِدًا، وَقَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ»، ثُمَّ ثَنَى رِجْلَهُ وَقَعَدَ فَاعْتَدَلَ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ، ثُمَّ نَهَضَ[1].

---

(١) صحيح.

## باسی دانیشتن دوای سەربەرزکردنەوە لە سوژدەی دووەم، پێش هەستان بۆ ڕکاتی دووەم یان ڕکاتی چوارەم

واتە: موحەممەدی کوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ لەنێو دە کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یەکێکیان ئەبو قەتادەی کوڕی ریبعی بوو ﷺ، وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هەستابایە بۆ نوێژ ڕێك ڕادەوەستا، -باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- وتی: پاشان دابەزی بۆ زەوی و سوژدەی برد، پاشان وتی: (الله أكبر) پاشان هەردوو باڵی لە بنباڵەکانی دوور خستەوە و پەنجەی پێیەکانیشی کردەوە. پاشان قاچی چەپی درێژ کرد و لەسەری دانیشت، ئینجا ڕێك بۆیەوە هەتا هەموو ئێسکەکانی لە جێگای خۆیان جێگیر بوون، پاشان چووە سوژدە، وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ) پاشان قاچی چەپی درێژ کرد و لەسەری دانیشت، ئینجا ڕێك بۆیەوە هەتا هەموو ئێسکەکانی لە جێگای خۆیان جێگیر بوون، پاشان هەستایەوە.

**٦٨٦-** عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، أَنَّهُ «رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي، فَإِذَا كَانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلَاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْتَوِي جَالِسًا»[١].

واتە: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو پێغەمبەری ﷺ بینی نوێژی دەکرد، جا ئەگەر لە ڕکاتی تاکدا بووایە (واتە: ڕکاتی یەکەم و سێیەم نەك دووەم و چوارەم چونکە دانیشتنیان تێدایە) هەڵنەدەستا هەتا بەتەواوی دادەنیشت. (ئەو دانیشتنە پێی دەوترێ دانیشتنی (الإستراحه) واتە: پشوودان).

## بَابُ الِاعْتِمَادِ عَلَى الْيَدَيْنِ عِنْدَ النُّهُوضِ إِلَى الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ وَإِلَى الرَّابِعَةِ

**٦٨٧-** عَنْ أَبِي قِلَابَةَ قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ ﷺ مَا بَيْنَنَا، فَيَقُولُ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَصَلَّى فِي غَيْرِ وَقْتِ صَلَاةٍ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ اسْتَوَى قَاعِدًا، ثُمَّ قَامَ وَاعْتَمَدَ عَلَى الْأَرْضِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی خۆدانە سەر هەردوو دەست لە کاتی هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم و ڕکاتی چوارەم

واتە: ئەبو قیلابە دەڵێ: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ لە نێوانماندا بوو، دەیوت: ئایا چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەرتان ﷺ بۆ باس بکەم؟ نوێژی کرد کاتی هیچ نوێژێك نەبوو، کاتێ سەری بەرز کردەوە لە سوژدەی دووەم لە ڕکاتی یەکەم ئەندازەیەك دانیشت ئینجا هەردوو دەستی لەسەر زەوی دانا و هەستایەوە.

## بَابُ التَّكْبِيرِ عِنْدَ النُّهُوضِ مِنَ الْجُلُوسِ مَعَ الْقِيَامِ مَعًا

٦٨٨- عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، فَقَالَ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ الفاتحة، ثُمَّ قَرَأَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ، حَتَّى بَلَغَ: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقَالَ: آمِينَ، فَقَالَ النَّاسُ: آمِينَ، فَلَمَّا رَكَعَ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ سَجَدَ، فَلَمَّا رَفَعَ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَلَمَّا سَجَدَ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ قَائِمًا مَعَ التَّكْبِيرِ، فَلَمَّا قَامَ مِنَ الثِّنْتَيْنِ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

## باسی تەکبیرکردن لە کاتی هەستانەوە لە دانیشتن لەگەڵ ڕاوەستان پێکەوە

واتە: نوعەیمی موجمیر دەڵێ: لەپشت ئەبو هورەیرە ﷺ نوێژم کرد وتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾، پاشان سورەتی فاتیحەی خوێند، هەتا گەیشتە: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾، وتی: ئامین، خەڵکەکەیش وتیان: ئامین، کاتێ ڕکووعی برد وتی: ( الله کبر) وە کاتێ سەری بەرز کردەوە لە ڕکووع وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، پاشان وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان سوژدەی برد، کاتێ بەرز بۆیەوە وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، کاتێ سوژدەی برد وتی: (اللَّهُ أَكْبَرُ)، پاشان لەگەڵ (اللَّهُ أَكْبَرُ)ەکە هەستایەوە، کاتێ هەستایەوە لەدوای دوو ڕکاتەکەی (دوای تەحیات)، وتی: (اللَّهُ أَكْبَر)، کاتێ سەلامی دایەوە وتی: سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە نوێژی من لە هی هەمووتان زیاتر بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت.

---

(١) صحيح.




## بَابُ سُنَّةِ الْجُلُوسِ فِي التَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ

٦٨٩- عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ السَّاعِدِيِّ قَالَ: اجْتَمَعَ أَبُو حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَأَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ، وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ﷺ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: «جَلَسَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَأَقْبَلَ بِصَدْرِ الْيُمْنَى عَلَى قِبْلَتِهِ، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى وَكَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ»[1].

### باسی شێوازی دانیشتن لە تەحیاتی یەکەم

واتە: عەباسی کوڕی سەهلی ساعیدی دەڵێ: ئەبو حومەیدی ساعیدی و ئەبو ئوسەیدی ساعیدی و سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی و موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کۆ بوونەوە، ئەبو حومەید ﷺ وتی: من زاناترینتانم بە چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، -دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد- وتی: دانیشت قاچی چەپی ڕاخست و سنگی قاچی ڕاستیشی ڕوو کردە قیبلە، لەپی دەستی ڕاستیشی لەسەر ئەژنۆی ڕاستی دانا، وە لەپی دەستی چەپیشی لەسەر ئەژنۆی چەپی دانا، بە پەنجەی (شایەتمانی) ئاماژەی کرد.

٦٩٠- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَقُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، وَقَالَ: «وَثَنَى رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى»[2].

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ مەدینە، وتم: هەر دەبێ تەماشای نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم، -دواتر باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: وە قاچی چەپی نوشتاندەوە و لەسەری دانیشت، قاچی ڕاستیشی چەقاند.

٦٩١- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ افْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.



واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کاتێ لە نوێژدا دانیشت (بۆ تەحیات) قاچی چەپی درێژ کرد و قاچی ڕاستیشی چەقاند.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الِاعْتِمَادِ عَلَى الْيَدِ فِي الْجُلُوسِ فِي الصَّلَاةِ

٦٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ فِي الصَّلَاةِ أَنْ يَعْتَمِدَ عَلَى يَدِهِ الْيُسْرَى، وَقَالَ الْحُسَيْنُ بْنُ مَهْدِيٍّ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَعْتَمِدَ الرَّجُلُ عَلَى يَدَيْهِ فِي الصَّلَاةِ(١).

## باسی سەرزەنشتکردن لەسەر خۆدانە سەر دەست لە دانیشتنی نێو نوێژدا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد لەوەی ئەگەر پیاو لە نوێژدا دانیشت خۆ بداتە دەستی چەپی. حوسەینی کوڕی مەهدی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد لەوەی پیاو لە نوێژدا خۆی بداتە سەر دەستەکانی.

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ عِنْدَ الْقِيَامِ مِنَ الْجِلْسَةِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ لِلتَّشَهُّدِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَكَذَلِكَ فِي خَبَرِ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ، وَخَبَرِ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ جَعْفَرٍ

٦٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ، يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي ذَلِكَ كُلِّهِ حَذْوَ الْمَنْكِبَيْنِ(٢).

## باسی بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لە کاتی هەستانەوە لە دانیشتنی تەحیات لە دوو ڕکاتی یەکەم. ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ کە دەگێڕێتەوە، هاتووە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە دوو ڕکاتی یەکەم هەستابایەوە (الله أكبر)ی دەکرد و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، هەروەها لە فەرموودەی ئەبو حومەیدی ساعیدی و فەرموودەی عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەریش هاتووە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچووبایە نێو نوێژەوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە کاتێ بیویستایە ڕکووع ببات، وە کاتێ سەری بەرز بکردایەتەوە لە ڕکووع، وە کاتێ هەستابایەوە لە ڕکووع، وە کاتێ هەستابایەوە لە دووەم ڕکات، لە هەموو ئەوانەدا دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا ئاستی هەردوو شانی.

٦٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ كَبَّرَ، ثُمَّ جَعَلَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا سَجَدَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَلَا يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ، وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ[(١)].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەستی بە نوێژ بکردایە (الله أكبر)ی دەکرد، پاشان هەردوو دەستی تا ئاستی سەرشانی بەرز دەکردەوە، کاتێکیش ڕکووعی ببردایە بەهەمان شێوەی ئەوی دەکرد، کاتێکیش سوژدەی ببردایە بەهەمان شێوی ئەوەی دەکرد، وە کاتێ لە سوژدە هەستابایەوە هەردوو دەستی بەرز نەدەکردەوە، وە ئەگەر هەستابایەوە لە دووەم ڕکات بەهەمان شێوەی دەکرد (دەستی بەرز دەکردەوە).

٦٩٥- وَرَوَاهُ عُثْمَانُ بْنُ الْحَكَمِ الْجُذَامِيُّ قَالَ: أنا ابْنُ جُرَيْجٍ، أَنَّ ابْنَ شِهَابٍ، أَخْبَرَهُ بِهَذَا الْإِسْنَادِ، مِثْلَهُ، وَقَالَ: «كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ»[(٢)].

واتە: وە عوسمانی کوڕی حەکەمی جوزامی گێڕاویەتەوە دەڵێ: ئیبنو جورەیج بۆی باس کردین ئیبنو شیهاب هەواڵی پێ داوە بەم سەنەدە وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، وتی: تەکبیری کرد و هەردوو دەستی بەرز کردەوە تا ئاستی هەردوو شانی.

## بَابُ إِدْخَالِ الْقَدَمِ الْيُسْرَى بَيْنَ الْفَخِذِ الْيُمْنَى وَالسَّاقِ فِي الْجُلُوسِ فِي التَّشَهُّدِ

٦٩٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَعَدَ فِي الصَّلَاةِ جَعَلَ قَدَمَهُ الْيُسْرَى بَيْنَ فَخِذِهِ وَسَاقِهِ، وَوَضَعَ يَدِهِ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ، وَأَشَارَ عَبْدُ الْوَاحِدِ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ[(٣)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی دانانی قاچی چەپ لە نێوان ڕانی ڕاست و لاقدا لە دانیشتنی تەحیات

واتە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لەنێو نوێژ دابنیشتایە قاچی چەپی دەخستە نێوان ڕان و لاقی دەستی چەپیشی لەسەر ئەژنۆی چەپی دادەنا، دەستی ڕاستیشی لەسەر ئەژنۆی ڕاستی دادەنا، بە پەنجەی (شایەتمان) ئاماژەی دەکرد (لە کاتی گێڕانەوەکەدا) عەبدولواحید بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی کرد.

## بَابُ وَضْعِ الْفَخِذِ الْيُمْنَى عَلَى الْفَخِذِ الْيُسْرَى فِي الْجُلُوسِ فِي التَّشَهُّدِ

٦٩٧- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَكَبَّرَ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَحِينَ أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ رَفَعَ يَدَيْهِ، وَحِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ رَفَعَ يَدَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ وَجَافَى يَعْنِي فِي السُّجُودِ وَفَرَشَ فَخِذَهُ الْيُسْرَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ يَعْنِي فِي الْجُلُوسِ فِي التَّشَهُّدِ(١).

## باسی دانانی ڕانی ڕاست لەسەر ڕانی چەپ لە دانیشتنی تەحیاتدا

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژم کرد، کاتێ چووە نێو نوێژەوە (الله أكبر)ی کرد، وە کاتێ ویستی ڕکووع ببات تەکبیری کرد، وە کاتێ سەری بەرز کردەوە لە ڕکووع هەردوو دەستی بەرز کردەوە، وە لەپی هەردوو دەستی دانا و لە بنباڵی دووری خستەوە واتە: لە سوژدەدا، وە ڕانی چەپی ڕاخست و بە پەنجەی هەڕەشە ئاماژەی دەکرد، واتە: لە دانیشتنی تەحیاتدا.

٦٩٨- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ كَبَّرَ، وَحِينَ رَكَعَ، وَحِينَ رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَقَالَ حِينَ سَجَدَ: هَكَذَا، وَجَافَى يَدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ، وَوَضَعَ فَخِذَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى(٢).

واتە: وائیلی کوڕی حوجری حەزڕەمی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوە کاتێ (الله أكبر)ی کرد و کاتێ ڕکووعی برد و کاتێ سەری بەرز کردەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لە ڕکووع، وە وتی: کاتێ سوژدەی برد بەو شێوەی کرد، هەردوو دەستی لە بنباڵی دوور خستەوە، وە ڕانی ڕاستی لەسەر ڕانی چەپی دانا.

**٦٩٩-** عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ: التَّحِيَّةَ، وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى تَحْتَ الْيُمْنَى[١].

**واتە: عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دووەم ڕکاتدا تەحیاتی دەخوێند، قاچی چەپی لەژێر قاچی ڕاستی ڕادەخست.**

## بَابُ السُّنَّةِ فِي الْجُلُوسِ فِي الرَّكْعَةِ الَّتِي يُسَلِّمُ فِيهَا

**٧٠٠-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُهُ فِي عَشْرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ رضي الله عنهم قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا كَانَتِ الرَّكْعَةُ الَّتِي تَنْقَضِي فِيهَا الصَّلَاةُ، أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَقَعَدَ عَلَى شِقِّهِ مُتَوَرِّكًا، ثُمَّ سَلَّمَ، وَفِي خَبَرِ أَبِي عَاصِمٍ: أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَجَلَسَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ مُتَوَرِّكًا[٢].

## باسی شێوازی دانیشتن لەو ڕکاتەی کە سەلامی تێدا دەداتەوە

**واتە: موحەممەدی کوڕی عەتاء دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەبو حومەیدی ساعیدی رضي الله عنه لەنێو دە کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یەکێکیان ئەبو قەتادە بوو رضي الله عنهم، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەگەیشتە کۆتا ڕکاتی نوێژ، قاچی چەپی دوا دەخست و لەسەری دادەنیشت بە (تَوَرُّك) پاشان سەلامی دەدایەوە.**

**٧٠١-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْلِسُ فِي آخِرِ صَلَاتِهِ عَلَى وَرِكِهِ الْيُسْرَى[٣].

**واتە: ئیبنو مەسعود رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە کۆتایی نوێژەکەیدا لەسەر سمتی چەپی دادەنیشت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٧٠٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، أنا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَّمَهُ التَّشَهُّدَ فِي الصَّلَاةِ قَالَ: كُنَّا نَحْفَظُهُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ كَمَا نَحْفَظُ حُرُوفَ الْقُرْآنِ الْوَاوَ وَالْأَلِفَ، فَإِذَا جَلَسَ عَلَى وَرِكِهِ الْيُسْرَى قَالَ: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَدْعُو لِنَفْسِهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ وَيَنْصَرِفُ»[١].

**واته: عەبدوڕحمانی كوڕی ئەسوەد دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە، عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ بۆی باس كردین، پێغەمبەر ﷺ فێری تەحیاتی كرد لەنێو نوێژدا، (گێڕەرەوە) وتی: ئێمە لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە ﷺ لەبەرمان دەكرد وەكوو چۆن پیتەكانی قوڕئان (وَاو) وە (اِلف)مان لەبەر دەكرد، جا كاتێ لەسەر سمتی چەپی دابنیشتایە دەیفەرموو: هەرچی گەورەیی و مەزنی هەیە تەنها بۆ خوایە، وە هەرچی نوێژ و وتەی جوان و كردەوە پاكەكان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەكەت (زیادەی هەموو چاكەیەك) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاكەكان، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، پاشان سەلامی دەدایەوە و لێ دەبۆیەوە.**

## بَابُ التَّشَهُّدِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ وَفِي الْجِلْسَةِ الْآخِيرَةِ

**٧٠٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا جَلَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي التَّشَهُّدِ قُلْنَا: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ مِنْ عِبَادِهِ، السَّلَامُ عَلَى فُلَانٍ وَفُلَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تَقُولُوا السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ؛ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلَامُ، وَلَكِنْ إِذَا جَلَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، وَالسَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، فَإِنَّكُمْ إِذَا قُلْتُمْ ذَلِكَ أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ لِيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَلْيَدْعُ بِهِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## باسی خوێندنی تەحیات لە دووەم ڕکاتدا و لە دانیشتنی کۆتایی

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە کاتێ دانیشتباین (بۆ تەحیات خوێندن) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو نوێژدا دەمانوت: سەلام لەسەر خوا لە بەندەکانیەوە، سەلام لەسەر فڵان و فڵان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەڵێن سەلام لەسەر خوا، چونکە بەڕاستی خوا خۆی سەلامە، بەڵام ئەگەر یەکێك لە ئێوە دانیشت لە نوێژدا با بڵێ: هەرچی گەورەیی و مەزنی هەیە تەنها بۆ خوایە، وە هەرچی نوێژ و وتەی جوان و کردەوە پاکەکان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەت (زیادەی هەموو چاکەیەك) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکان، ئێوە ئەگەر ئەوەتان وت هەموو بەندەیەکی چاك دەگرێتەوە لە ئاسمانەکان و زەوی، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، (فەرمووی: پاشان بڵێن): وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، پاشان هەر پاڕانەوەیەك پێی خۆشە با پێی بپاڕێتەوە.

**٧٠٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي التَّشَهُّدِ وَحَدِيثُ الْأَعْمَشِ إِلَى قَوْلِهِ: وَرَسُولُهُ، وَزَادَ فِي حَدِيثِ مَنْصُورٍ: ثُمَّ يَتَخَيَّرُ فِي الْمَسْأَلَةِ مَا شَاءَ[١].

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی تەحیات وەکوو فەرموودەکەی پێشوو، وە فەرموودەکەی ئەعمەش تا (وَرَسُولُهُ)، لە فەرموودەکەی مەنصوردا زیادی کردووە: (ثُمَّ يَتَخَيَّرُ فِي الْمَسْأَلَةِ مَا شَاءَ) واتە: پاشان سەرپشك بێت لە پاڕانەوە بە ویستی خۆی.

**٧٠٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا الْقُرْآنَ، وَكَانَ يَقُولُ: «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، سَلَامٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، سَلَامٌ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری تەحیاتی دەکردین وەکوو چۆن فێری سوڕەتێکی قوڕئانی دەکردین، دەیفەرموو: هەرچی پیرۆزی و نوێژ و وتەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

جوان و كردەوە پاكەكان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەكەت (زیادەی هەموو چاكەیەك) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، سڵاو لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاكەكان، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە ﷺ.

## بَابُ إِخْفَاءِ التَّشَهُّدِ وَتَرْكِ الْجَهْرِ بِهِ

٧٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تُخْفِيَ التَّشَهُّدَ(١).

### باسی خوێندنی تەحیات بەپەنهان و بەبێ دەنگبەرزكردنەوە

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: سوننەت وایە: تەحیات بەدەنگی نزم بخوێنرێ.

٧٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي التَّشَهُّدِ: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾ ﴾«الإسراء»(٢).

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی تەحیات دابەزی: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: كاتێك كە نوێژ دەكەی دەنگ بەرز مەكەوە، وە دەنگیش نزم مەكەوە.

## بَابُ الِاقْتِصَارِ فِي الْجِلْسَةِ الْأُولَى عَلَى التَّشَهُّدِ وَتَرْكِ الدُّعَاءِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ

٧٠٨- عَنِ ابْنِ إِسْحَاقَ قَالَ: وَحَدَّثَنِي عَنْ تَشَهُّدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ، وَفِي آخِرِهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ النَّخَعِيُّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: وَكُنَّا نَحْفَظُهُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ كَمَا نَحْفَظُ حُرُوفَ الْقُرْآنِ حِينَ أَخْبَرَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَّمَهُ إِيَّاهُ قَالَ فَكَانَ يَقُولُ إِذَا جَلَسَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ وَفِي آخِرِهَا عَلَى وَرِكِهِ الْيُسْرَى: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

---

(١) حديث صحيح.

(٢) صحيح.

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ﷺ» قَالَ: ثُمَّ إِنْ كَانَ فِي وَسَطِ الصَّلَاةِ نَهَضَ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ تَشَهُّدِهِ، وَإِنْ كَانَ فِي آخِرِهَا دَعَا بَعْدَ تَشَهُّدِهِ بِمَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوَ، ثُمَّ يُسَلِّمُ»[١]

## باسی کورتهەڵهێنانی تەحیات لە دانیشتنی یەکەم لەسەر شایەتمان، هەروەها وازهێنان لە پاڕانەوە لەدوای تەحیاتی یەکەم

واتە: ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی یەزیدی نەخەعی چۆنییەتی تەحیاتی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ باس کردم لە نێوەڕاستی نوێژ (ڕکاتی دووەم) و لە کۆتاییەکەی، لە باوکیەوە وتی: ئێمە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ لەبەرمان دەکرد وەکوو چۆن پیتەکانی قورئان لەبەر دەکەین، کاتێ هەواڵی پێ داین پێغەمبەر ﷺ فێری کردووە، وتی: کاتێ لە نێوەڕاستی نوێژ (ڕکاتی دووەم) و کۆتایی دابنیشتبایە لەسەر سمتی چەپی دەیفەرموو: هەرچی گەورەیی و مەزنی هەیە تەنها بۆ خوایە، وە هەرچی نوێژ و وتەی جوان و کردەوە پاکەکان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەت (زیادەی هەموو چاکەیەك) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکان، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە ﷺ. پاشان وتی: ئەگەر لە نێوەڕاستی نوێژ بوو (ڕکاتی دووەم) هەڵدەستێتەوە، کاتێ شایەتمانەکەی تەواو دەکات، وە ئەگەر لە کۆتا ڕکاتدا بوو دوای شایەتمانەکەی دەپاڕێتەوە بەوەی دەیەوێ پێی بپاڕێتەوە، پاشان سەلام دەداتەوە.

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي التَّشَهُّدِ

٧٠٩- عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا يَدْعُو فِي صَلَاةٍ لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَجِلْتَ أَيُّهَا الْمُصَلِّي»، ثُمَّ عَلَّمَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَسَمِعَ رَجُلًا يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّهَا الْمُصَلِّي ادْعُ تُجَبْ، وَسَلْ تُعْطَ»[٢].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

## باسی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحیاتدا

واتە: فەزالەی کوڕی عوبەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو لەنێو نوێژ دەپاڕایەوە نە ستاییشی خوای کرد نە صەڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەلەت کرد ئەی نوێژخوێن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردن، وە گوێی لە پیاوێك بوو صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی نوێژخوێن بپاڕێرەوە وەڵامت دەدرێتەوە، داواش بکە پێت دەدرێت.

٧١٠- عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا يُصَلِّي لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ وَلَمْ يُمَجِّدْهُ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَانْصَرَفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَجِلَ هَذَا»، فَدَعَاهُ، وَقَالَ لَهُ وَلِغَيْرِهِ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَمْجِيدِ رَبِّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ وَلْيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَدْعُو بِمَا شَاءَ»[(١)].

واتە: فەزالەی کوڕی عوبەیدی ئەنصاری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد (لە نوێژەکەی دووعای دەکرد، لە سەرەتای دووعاکەیدا) سوپاس و ستاییشی خوای نەکرد و وەسفی مەزنی نەکرد، صەڵاواتیشی لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەدا، دواتر ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە پەلەی کرد، (ئەوەی پێویست بوو سەرەتا بیکات لە سوپاس و ستاییشکردنی خوا، نەیکرد)، دواتر بانگی کرد، بە ئەو و جگە لە ئەوی فەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با بەگەورەدانانی پەروەردگاری و ستاییشکردنی دەست پێ بکات، وە با صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، پاشان بۆ هەر شتێك دەیەوێ بپاڕێتەوە.

## بَابُ صِفَةِ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي التَّشَهُّدِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا سُئِلَ: قَدْ عَلِمْنَا السَّلَامَ عَلَيْكَ، وَكَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكَ فِي التَّشَهُّدِ؟

٧١١- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ حَتَّى جَلَسَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ عِنْدَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمَّا السَّلَامُ فَقَدْ عَرَفْنَاهُ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ إِذَا نَحْنُ

---

(١) صحيح.

صَلَّيْنَا فِي صَلَاتِنَا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَصَمَتَ حَتَّى أَحْبَبْنَا أَنَّ الرَّجُلَ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ: إِذَا أَنْتُمْ صَلَّيْتُمْ عَلَيَّ فَقُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ ﷺ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[1].

## باسی چۆنییەتی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحیاتدا، وەبەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ پرسیاری لێ کرا وترا: زانیمان چۆن سەلام دەکەین لەسەرت، بەڵام چۆن صەڵاوات لەسەرت بدەین لە تەحیات؟

واتە: ئەبو مەسعود عوقبەی کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پیاوێك هات هەتا لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت ئێمەیش لەلای بووین، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زانیمان چۆن سەلام دەکەین لەسەرت، بەڵام چۆن صەڵاوات لەسەرت بدەین کاتێ ئێمە لەناو نوێژەکانماندا بووین، صەڵاواتی خوات لەسەر بێت؟ وتی: ئەوەندە بێدەنگ بوو هەتا حەزمان دەکرد ئەو پیاوە پرسیاری لێ نەکردایە، پاشان فەرمووی: (ئەگەر صەڵاواتتان دا لەسەرم بڵێن: خوایە صەڵاوات بڕێژە بەسەر موحەممەد پێغەمبەری ﷺ نەخوێندەوار، وە لەسەر خانەوادە و کەسوکاری موحەممەد، هەروەك صەڵاواتت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و لەسەر خانەوادەی ئیبراهیم، خوایە بەرەکەت بڕێژە بەسەر موحەممەد پێغەمبەری نەخوێندەوار، وە لەسەر خانەوادە و کەسوکاری موحەممەد، هەروەك فەڕ و پیرۆزیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و لەسەر خانەوادە و کەسوکاری ئیبراهیم بەڕاستی تۆ ستاییشکراو و خاوەنی شکۆ و بەرزیت).

## بَابُ وَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ فِي التَّشَهُّدِ الْأَوَّلِ وَالثَّانِي وَالْإِشَارَةِ بِالسَّبَّابَةِ مِنَ الْيَدِ الْيُمْنَى

**٧١٢-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْأَنْصَارِيِّ يَقُولُ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، فَقَلَّبْتُ الْحَصَا، فَقَالَ: لَا تُقَلِّبِ الْحَصَا، وَلَكِنِ افْعَلْ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ، قُلْتُ: وَكَيْفَ رَأَيْتَهُ يَفْعَلُ؟

---

(١) إسناده حسن.

قَالَ: هَكَذَا، فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَيَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ السَّبَّابَةَ، وَقَالَ الْمَخْزُومِيُّ فِي حَدِيثِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَعَقَدَ أُصْبُعَيْنِ وَحَلَّقَ الْوُسْطَى وَأَشَارَ بِالَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى[١].

## باسی دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان لە تەحیاتی یەکەم و دووەم، ئاماژەکردنیش بە پەنجەی هەڕەشەکردنی دەستی ڕاست

واتە: عەلی کوڕی عەبدوڕەحمانی ئەنصاڕی دەڵێ: لە تەنیشتی ئیبنو عومەر ﵄ نوێژم دەکرد وردە بەردم هەڵاوگێڕ دەکرد، ئیبنو عومەر ﵄ پێی وتم: بەرد هەڵاوگێڕ مەکە، بەڵام ئەوە بکە وەك چۆن بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکرد، وتم: بینیت پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەیکرد؟ وتی: بەم شێوەیە دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دانا و دەستی ڕاستیشی لەسەر ڕانی ڕاستی، پەنجەی هەڕەشەکردنی بەرز کردەوە. مەخزومی وتی: دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانا، دواتر دوو پەنجەکەی (پەنجە گەورەکەی و پەنجەی نێوەڕاستی دەستی ڕاستی) گرت و کردی بە ئەڵقە و بازنەیەك، وە بەو پەنجەیش ئاماژەی کرد کە لە تەنیشت پەنجە گەورەکەیە (پەنجەی شایەتمان)، دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دانا.

## بَابُ التَّحْلِيقِ بِالْوُسْطَى وَالْإِبْهَامِ عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِالسَّبَّابَةِ فِي التَّشَهُّدِ

**٧١٣-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ فِي مَنْ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي، فَلَمَّا جَلَسَ افْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، ثُمَّ وَضَعَ حَدَّ مِرْفَقِهِ الْأَيْمَنِ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ عَقَدَ يَعْنِي ثِنْتَيْنِ ثُمَّ حَلَّقَ، وَجَعَلَ يُشِيرُ بِالسَّبَّاحَةِ يَدْعُو[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.



**باسی نوێژخوێن لە تەحیات پەنجەی نێوەڕاست لەگەڵ پەنجە گەورەکە دەکات بە ئەڵقە لە کاتی ئاماژەکردن بە پەنجەی هەڕەشەکردن (شایەتمان)**

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: من لەوانە بووم کە (بە نوێنەری) هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتم: هەر دەبێ تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم بزانم چۆن نوێژ دەکات، کاتێ دانیشت قاچی چەپی ڕاخست، پاشان دەستی چەپی خستە سەر ڕانی چەپی، پاشان ئەنیشکی لای ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانا، دواتر دوو پەنجەکەی (پەنجە گەورەکەی و پەنجەی نێوەڕاستی دەستی ڕاستی) گرت و کردی بە ئەڵقە و بازنەیەك، پەنجەی شایەتمانیشی بەرز کردەوە و نزای پێ دەکرد.

**بَابُ صِفَةِ وَضْعِ الْيَدَيْنِ عَلَى الرُّكْبَتَيْنِ فِي التَّشَهُّدِ وَتَحْرِيكِ السَّبَّابَةِ عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِهَا**

**٧١٤-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: لَأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ يُصَلِّي، فَكَبَّرَ، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ قَعَدَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ وَرُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَجَعَلَ حَدَّ مِرْفَقِهِ الْأَيْمَنِ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ قَبَضَ ثِنْتَيْنِ مِنْ أَصَابِعِهِ وَحَلَّقَ حَلْقَةً، ثُمَّ رَفَعَ إِصْبَعَهُ، فَرَأَيْتُهُ يُحَرِّكُهَا يَدْعُو بِهَا(١).

**باسی چۆنییەتی دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆکان لە تەحیاتدا و جوڵاندنی پەنجەی هەڕەشەکردن لە کاتی ئاماژەپێکردنی**

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: وتم: بەدڵنیاییەوە سەیری نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم کە چۆن نوێژ دەکات؟ وتی: سەیرم کرد نوێژی دەکرد، دواتر (الله أكبر)ی کرد، -باسی هەندێ لە فەرموودەکەی کرد- پاشان دانیشت و قاچی چەپی ڕاخست و دەستی چەپی لەسەر ڕان و ئەژنۆی چەپی دانا، وە ئەنیشکی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانا، دواتر دوو پەنجەی لە پەنجەکانی (دەستی ڕاستی) گرت و کردی بە ئەڵقە و بازنەیەك، (پەنجە گەورەکەی و پەنجەی نێوەڕاستی)، پاشان پەنجەی (شایەتمانی) بەرز کردەوە بینیم دەیجوڵاند، نزا و دوعای پێ دەکرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ حَنْيِ السَّبَّابَةِ عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِهَا فِي التَّشَهُّدِ

٧١٥- عَنْ مَالِكٍ الْخُزَاعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الصَّلَاةِ وَاضِعاً يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَهُوَ يُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ[1].

### باسی لارکردنەوەی پەنجەی شایەتمان لە کاتی ئاماژەپێکردنی لە تەحیاتدا

واتە: مالیکی خوزاعی دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەنێو نوێژدا دەستی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانابوو، بە پەنجەی (شایەتمان) ئاماژەی دەکرد.

٧١٦- عَنْ مَالِكِ بْنِ نُمَيْرٍ الْخُزَاعِيِّ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ أَنَّ أَبَاهُ ﷺ حَدَّثَهُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا فِي الصَّلَاةِ وَاضِعًا ذِرَاعَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، رَافِعًا أُصْبُعَهُ السَّبَّابَةَ قَدْ أَحْنَاهَا شَيْئًا وَهُوَ يَدْعُو[2].

واتە: مالیکی کوڕی نومەیری خوزاعی -کە خەڵکی بەصرەیە- دەگێڕێتەوە باوکی ﷺ بۆی باس کرد ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی دانیشتبوو لەنێو نوێژدا باڵی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانابوو، کەمێك لاری کردبۆیەوە دەپاڕایەوە.

## بَابُ بَسْطِ يَدِ الْيُسْرَى عِنْدَ وَضْعِهِ عَلَى الرُّكْبَةِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ

٧١٧- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ وَرَفَعَ إِصْبَعَهُ الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ الْيُمْنَى فَيَدْعُو بِهَا، وَيَدُهُ الْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِهِ بَاسِطُهَا عَلَيْهِ[3].

### باسی کردنەوەی پەنجەکانی دەستی چەپ<br>لە کاتی دانانی لەسەر ئەژنۆی چەپ لە نوێژدا

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دابنیشتبایە بۆ نوێژ دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنا، وە ئەو پەنجەی بەرز دەکردەوە کە بەدوای پەنجەگەورەدا دێت، نزای پێ دەکرد، (پەنجەکانی) دەستی چەپیشی لەسەر ئەژنۆی درێژ دەکرد.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## بَابُ النَّظَرِ إِلَى السَّبَّابَةِ عِنْدَ الْإِشَارَةِ بِهَا فِي التَّشَهُّدِ

٧١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﭭ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا تَشَهَّدَ وَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ السَّبَّابَةِ لَا يُجَاوِزُ بَصَرُهُ إِشَارَتَهُ[1].

## باسی تەماشاکردنی پەنجەی هەڕەشەکردن لە کاتی ئاماژەپێکردن لە تەحیاتدا

واتە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر تەحیاتی بخوێندایە دەستی چەپی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا، دەستی ڕاستیشی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنا، وە بە پەنجەی هەڕەشەپێکردنی (واتە: شایەتمان) ئاماژەی دەکرد، چاوی لەسەر ئاماژەکەی لا نەدەبرد.

## بَابُ الْإِشَارَةِ بِالسَّبَّابَةِ إِلَى الْقِبْلَةِ فِي التَّشَهُّدِ

٧١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﭭ، أَنَّهُ رَأَى رَجُلًا يُحَرِّكُ الْحَصَا بِيَدِهِ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: لَا تُحَرِّكِ الْحَصَا وَأَنْتَ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَلَكِنِ اصْنَعْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ إِلَى الْقِبْلَةِ وَرَمَى بِبَصَرِهِ إِلَيْهَا أَوْ نَحْوَهَا، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ[2].

## باسی ئاماژەکردن بە پەنجەی هەڕەشەکردن بۆ لای قیبلە لە کاتی تەحیات

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە، ئەو پیاوێکی بینی لە کاتی نوێژدا بە دەستی بەردی دەجوڵانەوە، کاتێ نوێژی تەواو کرد، عەبدوڵا پێی وت: کاتێ لەنێو نوێژدای بەرد مەجوڵێنەوە چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیە، بەڵام ئەوە بکە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی، وتی: دەستی ڕاستی خستە سەر ڕانی ڕاستی، وە بەو پەنجەی ئاماژەی کرد کە بەدوای پەنجە گەورەدا دێت ڕووبەڕووی قیبلە، بە چاویشی تەماشای پەنجەی کرد، یان بەرەولای ئەو شوێنە، وتی: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ بەمشێوەی دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الدُّعَاءِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ وَقَبْلَ السَّلَامِ بِمَا أَحَبَّ الْمُصَلِّي ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يُدْعَى فِي الْمَكْتُوبَةِ إِلَّا بِمَا فِي الْقُرْآنِ

**٧٢٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: أَلَا وَإِنَّا كُنَّا لَا نَدْرِي مَا نَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ إِلَّا أَنْ نُسَبِّحَ وَنُكَبِّرَ وَنَحْمَدَ رَبَّنَا، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَلِمَ فَوَاتِحَ الْخَيْرِ وَجَوَامِعَهُ، فَقَالَ: إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عَبَّادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ﷺ، ثُمَّ يَتَخَيَّرُ أَحَدُكُمْ مِنَ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ، فَلْيَدْعُ بِهِ[١].

**باسی ڕێگەدان بە پاڕانەوە لەدوای تەحیات و پێش سەلامدانەوە بەوەی نوێژخوێن پێی خۆشە، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە دروست نییە لە نوێژی فەرز بپاڕێتەوە جگە لەو دەستەواژانە نەبێت کە لە قوڕئاندایە**

واتە: عەبدوڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: ئێمە نەماندەزانی چی بڵێین لە هەردوو ڕکاتەکە تەنها ئەوە نەبێت پاك و بێگەردی و بەگەورەدانان و ستاییشی پەروەردگارمان دەکرد، بێگومان موحەممەد کلیلی کۆکەرەوەی چاکەکانی دەزانی فەرمووی: ئەگەر دانیشتن لە دووەم ڕکات (بۆ تەحیات) بڵێن: هەرچی گەورەیی و مەزنی هەیە تەنها بۆ خوایە، وە هەرچی نوێژ و وتەی جوان و کردەوە پاکەکان هەیە تەنها بۆ خوایە، سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەت (زیادەی هەموو چاکەیەك) لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکان، (ئەگەر ئەوەی وت هەموو بەندەیەکی چاك دەگرێتەوە لە ئاسمانەکان و زەوی)، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، پاشان هەر یەکێك لە ئێوە چ پاڕانەوەیەکی پێی خۆشە با پێی بپاڕێتەوە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّعَوُّذِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ وَقَبْلَ السَّلَامِ

**٧٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَمَنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[١].

### باسی فەرمانکردن بە پەناگرتن بە خوا لەدوای تەحیات و پێش سەلامدانەوە

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لەئێوە تەحیاتی (کۆتایی تەواو کرد) با پەنا بگرێت بە خوا لە چوار شت: (بڵێت): خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ و لە سزای نێوگۆڕ و لە شەڕ و ئاشووبی مەسیحی دەجال و لەشەڕ و ئاشووبی ژیان و مردن ( دەجال: واتە: فێڵباز و ساختەچی).**

**٧٢٢-** عَنِ ابْنِ جُرِيجٍ أَخْبَرَنِي ابْنُ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ بَعْدَ التَّشَهُّدِ كَلِمَاتٍ كَانَ يُعَظِّمُهُنَّ جِدًّا، قُلْتُ فِي الْمَثْنَى كِلَيْهِمَا؟ قَالَ: بَلْ فِي الْمَثْنَى الْأَخِيرِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ، قُلْتُ: مَا هُوَ؟ قَالَ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[٢].

**واتە: ئیبنو جورەیج دەگێڕێتەوە، ئیبنو تاوس هەواڵی پێ دام لە باوکیەوە ﵁، ئەو لەدوای تەحیات چەند وشەیەکی دەوت، زۆر بە مەزنی دادەنان، وتم: لە هەردوو تەحیاتەکەدا؟ وتی: بەڵکوو لە دوو ڕکاتی کۆتایی دوای تەحیات، وتم: کامەیە؟ وتی: پەنا دەگرم بە خوا لە سزای نێوگۆڕ، وە پەنا دەگرم بە خوا لە سزای دۆزەخ، وە پەنا دەگرم بە خوا لە شەڕی مەسیحی دەجال، وە پەنا دەگرم بە خوا لەسزای ناوگۆڕ، وە پەنا دەگرم بە خوا لە شەڕ و ئاشووبی ژیان و مردن).**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الِاسْتِغْفَارِ بَعْدَ التَّشَهُّدِ وَقَبْلَ السَّلَامِ

**٧٢٣-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ مِنْ آخِرِ مَا يَقُولُ بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»[١].

## باسی داوای لێخۆشبوون لەدوای تەحیات و پێش سەلامدانەوە

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کۆتا شت کە دەیفەرموو لە نێوان تەحیات و سەلامدانەوە ئەمە بوو: خوایە لێم خۆش بە لەو گوناهەی پێشم خستووە و لەوەیشی لە داهاتوودا ئەنجامی دەدەم، وە ئەوەی شاردوومەتەوە و ئەوەیشی بەئاشکرا کردوومە، وە ئەوەیشی زیادەڕەویم تێدا کردووە، وە ئەوەیشی تۆ لە من زاناتری پێی، تۆ یەکەم و کۆتاییت (واتە: لە پێش زاتی تۆ کەس نەبووە، لە کۆتاییشدا تەنها زاتی تۆ دەمێنێتەوە)، هیچ پەرستراوێکی بە هەق نییە جگە لە تۆ.

**٧٢٤-** عَنْ مِحْجَنِ بْنِ الْأَدْرَعِ ﷺ قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ قَضَى صَلَاتَهُ وَهُوَ يَتَشَهَّدُ وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِاللَّهِ الْوَاحِدِ الصَّمَدِ الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ غُفِرَ لَهُ، غُفِرَ لَهُ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[٢].

واتە: میحجەنی کوڕی ئەدرەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوتەوە، لەپڕ پیاوێکی بینی لە کۆتایی نوێژەکەیدا بوو تەحیاتی دەخوێند و دەیوت: خوایە من داوات لێ دەکەم بە خوای تاك و تەنهای بێنیاز، ئەو خوایەی نە لەکەس بووە و نە کەسیش لە ئەو بووە، کەس لە هاووێنە و هاوتای ئەو نییە لە گوناهەکانم خۆش بێت، بەڕاستی تۆ لێخۆشبووی بەبەزەییت، پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرمووی: بێگومان خوا لێی خۆش بوو، خوا لێی خۆش بوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ مَسْأَلَةِ اللَّهِ الْجَنَّةَ بَعْدَ التَّشَهُّدِ وَقَبْلَ التَّسْلِيمِ وَالِاسْتِعَاذَةِ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ

٧٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِرَجُلٍ: «مَا تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ؟» قَالَ: أَتَشَهَّدُ ثُمَّ أَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ، أَمَا وَاللَّهِ مَا أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ وَلَا دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حَوْلَهُمَا نُدَنْدِنُ»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: الدَّنْدَنَةُ الْكَلَامُ الَّذِي لَا يُفْهَمُ.

### باسی داواکردنی بەهەشت لە خوا و پەناگرتن بە خوا لە ئاگر لەدوای خوێندنی تەحیات و پێش سەلامدانەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: لە نوێژدا چی دەڵێی؟ وتی: تەحیات دەخوێنم پاشان دەڵێم: ئەی خوایە من داوای بەهەشتت لێ دەکەم و پەنات پێ دەگرم لە ئاگر. بەڵام سوێند بە خوا من نە لە نزای تۆ تێ دەگەم نە لە نزای موعاز (موعاز پێشنوێژی بۆ خەڵکانێك دەکرد) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئێمەش لە دەوری ئەو دووانە نزا دەکەین. (واتە: لە نێوان داوای بەهەشت و پەناگرتن بە خوا لە ئاگر نزا دەکەین).

ئەبو بەکر دەڵێ: (الدَّنْدَنَة): قسەیەکە کەسی بەرانبەر لێی تێ ناگات.

## بَابُ التَّسْلِيمِ مِنَ الصَّلَاةِ عِنْدَ انْقِضَائِهَا

٧٢٦- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ[٢].

### باسی سەلامدانەوەی نوێژ دوای تەواوبوونی نوێژەکە

واتە: عامری کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ سەلامی دەدایەوە بەلای ڕاست هەتا سپیایی گۆنای دەبینرا، وە بەلای چەپیدا هەتا سپیایی گۆنای دەبینرا.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٧٢٧-** عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ. فَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لَمْ نَسْمَعْ هَذَا مِنْ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ إِسْمَاعِيلُ: أَكُلَّ حَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ سَمِعْتَ؟ قَالَ: لَا قَالَ: وَالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: لَا قَالَ: فَالنِّصْفُ قَالَ: لَا قَالَ: فَهَذَا فِي النِّصْفِ الَّذِي لَمْ تَسْمَعْ[١].

**واتە:** سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی سەلامی دەدایەوە بەلای ڕاست و بەلای چەپیدا هەتا سپیایی گۆنای دەبینرا. زوهری وتی: ئەم فەرموودەیەمان نەبیستووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئیسماعیل وتی: هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەرت ﷺ بیستووە؟ وتی: نەخێر، وتی: دوو لەسەر سێیت بیستووە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەی نیوەی؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەم فەرموودەیە لەو نیوەیەیە کە تۆ نەتبیستووە.

## بَابُ صِفَةِ السَّلَامِ فِي الصَّلَاةِ

**٧٢٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، وَعَنْ شِمَالِهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ خَدِّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ»[٢].

### باسی چۆنییەتی سەلامدانەوە لە نوێژدا

**واتە:** عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دەدایەوە بەلای ڕاستیدا هەتا سپیایی گۆنای دەبینرا، دەیفەرموو: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وبَركاتُهُ)، وە بەلای چەپیشیدا هەتا سپیایی گۆنای دەبینرا دەیفەرموو: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وبَركاتُهُ).

## بَابُ إِبَاحَةِ الِاقْتِصَارِ فِي الصَّلَاةِ عَلَى تَسْلِيمَةٍ وَاحِدَةٍ مِنَ الصَّلَاةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تُجْزِئُ، وَهَذَا مِنَ اخْتِلَافِ الْمُبَاحِ، فَالْمُصَلِّي مُخَيَّرٌ بَيْنَ أَنْ يُسَلِّمَ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً وَبَيْنَ أَنْ يُسَلِّمَ تَسْلِيمَتَيْنِ كَمَذْهَبِ الْحِجَازِيِّينَ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٧٢٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُسَلِّمُ فِي الصَّلَاةِ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ يَمِيلُ إِلَى الشِّقِّ الْأَيْمَنِ شَيْئاً(١).

## باسی ڕێگەدراوە نوێژ کۆتایی پێ بهێنرێ بە یەك سەلامدانەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی یەك سەلامدانەوە دروستە، ئەمەش لە جیاوازییانەیە کە ڕێگەیان پێ دراوە، جا نوێژخوێن ئازادە لەوەی یەك سەلام بداتەوە و یان دوو سەلام بداتەوە، وەکوو مەزهەبی حیجازییەکان

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژدا یەك سەلامی دەدایەوە سەرەتا ڕووی لەپێشی خۆی (قیبلە) بوو دەستی پێ دەکرد کەمێك بەلای ڕاستدا لای دەکردەوە.

**٧٣٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا كَانَتْ تُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً قُبَالَةَ وَجْهِهَا، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ(٢).

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە، لە باوکی، لە عائیشەوە ﵂، یەك سەلامی دەدایەوە ڕووی لەپێشی خۆی بوو، دەیوت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ).

**٧٣١-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ أَنَّهُ كَانَ يُسَلِّمُ وَاحِدَةً: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ(٣).

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁، ئەو یەك سەلامی دەدایەوە، دەیوت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ).

**٧٣٢-** عَنِ الْقَاسِمِ قَالَ: رَأَيْتُ عَائِشَةَ ﵂ «تُسَلِّمُ وَاحِدَةً»، وَعَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بِهَذَا مِثْلَهُ، وَزَادَ: وَلَا تَلْتَفِتُ عَنْ يَمِينِهَا وَلَا، عَنْ شِمَالِهَا» (٤)

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده صحيح.

(٣) إسناده صحيح.

(٤) إسناده صحيح.

واتە: قاسم دەڵێ: عائیشەم ﵂ بینی یەك سەلامی دەدایەوە، وە عوبەیدوڵا گێراویەتەوە بەهەمان شێوە، ئەوەیشی زیاد کردووە: نە بەلای ڕاستی ئاوڕی دایەوە نە بەلای چەپی.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الْإِشَارَةِ بِالْيَدِ يَمِينًا وَشِمَالًا عِنْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ قُلْنَا بِأَيْدِينَا السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَمِينًا وَشِمَالًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا لِي أَرَى أَيْدِيَكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمُسٍ، لِيَسْكُنْ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردنی ئاماژەکردن بە دەست بەلای ڕاست و چەپ لە کاتی سەلامدانەوە لە نوێژ

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﵁ دەڵێ: ئێمە ئەگەر لەپشت پێغەمبەر ﷺ نوێژمان بکردبایە بە دەستەکانمان دەمانوت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، بەلای ڕاست و چەپ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە دەبینم دەستەکانتان بەرز کردۆتەوە دەڵێی کلکی ڕەوە ئەسپن لە ترسی دڕندە هەڵهاتوون، با هەر یەکێك لە ئێوە ئارام بێت لە نوێژەکەیدا.

## بَابُ حَذْفِ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٣٤** - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «حَذْفُ السَّلَامِ سُنَّةٌ»[٢].

## باسی سەلامدانەوە بەپەلە لە نوێژدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سەلامدانەوە بەپەلە بەبێ درێژکردنەوەی وشەی (السَّلَامِ) سوننەتە. (واتە: ئەگەر سەلامی دایەوە سووك سەلام بداتەوە درێژی نەکات).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**٧٣٥-** عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حَذْفُ السَّلَامِ سُنَّةٌ» [١].

واتە: ئەوزاعی دەگێڕێتەوە بە هەمان سەنەد دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەلامدانەوە بەپەلە بەبێ درێژکردنەوەی وشەی (السَّلَامِ) سوننەتە.

## بَابُ الثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ ﷻ بَعْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٣٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ فِي الصَّلَاةِ لَا يَجْلِسُ إِلَّا مِقْدَارَ مَا يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجِلَالِ وَالْإِكْرَامِ» [٢].

## باسی ستاییشی خوا ﷻ دوای سەلامدانەوە لە نوێژ

واتە: عەبدوڵای كوڕی مەسعود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سەلامی بدابایەوە دانەدەنیشت، مەگەر بەئەندازەی ئەوەی كە دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی (سەلامەتی لە هەموو كەموكوڕی و ناتەواوییەك) سەلامەتیش لە تۆوەیە، بەرزی و پیرۆزی بۆ تۆیە ئەی خاوەندەسەڵات و گەورەیی و ڕێز و شكۆ.

## بَابُ الِاسْتِغْفَارِ مَعَ الثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ بَعْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٣٧-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ صَلَاتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجِلَالِ وَالْإِكْرَامِ» [٣].

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی داوای لێخۆشبوون لەگەڵ ستاییشی خوا دوای سەلامدانەوە لە نوێژدا

واتە: سەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سەلامی بدابایەوە لە نوێژەکە، سێ جار داوای لێخۆشبوون (أستغفر الله)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی و سەلامیش هەر لە تۆوەیە، بەرزی و پیرۆزی بۆ تۆیە ئەی خاوەن دەسەڵات و گەورەیی و ڕێز (دواتر ڕووی دەکردە خەڵکی).

**٧٣٨-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُسَلِّمَ مِنَ الصَّلَاةِ اسْتَغْفَرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجِلَالِ وَالْإِكْرَامِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ»[١].

واتە: سەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەلامی بدابایەوە لە نوێژ، سێ جار داوای لێخۆشبوون (أستغفر الله)ی دەکرد، پاشان دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی، وە سەلامەتیش لە تۆوەیە، بەرزی و پیرۆزی بۆ تۆیە ئەی خاوەندەسەڵات و گەورەیی و ڕێز، پاشان سەلامی دەدایەوە.

## بَابُ التَّهْلِيلِ وَالثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ بَعْدَ السَّلَامِ

**٧٤٠-** عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ ﷺ، يَخْطُبُ عَلَى هَذَا الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ يَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، لَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ، أَهْلَ النِّعْمَةِ وَالْفَضْلِ وَالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»[٢][٣].

## باسی تەهلیلکردن (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) و ستاییشکردنی خوا لەدوای سەلامدانەوە

واتە: ئەبو زوبەیر دەڵێ: گوێم لێ بوو عەبدوڵای کوڕی زوبەیر ﷺ لەسەر ئەم مینبەرە وتاری دەدا و دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ سەلامی بدابایەوە لەدوای نوێژ

---

(١) صحيح.

(٢) لە ڕیزبەندییەکە ژمارە (٧٣٩) پەڕێنراوە، چونکە لە نوسخەی عەرەبی کتێبەکە بەم شێوەیەیە (بەهەڵە پەڕێنراوە).

(٣) صحيح.

دەیفەرموو: هیچ پەرستزاوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، جگە لەو کەس ناپەرستین، خاوەنی بەخشش و فەزڵ و چاکە و ستاییشی جوانە، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، بە دڵسۆزییەوە پەرستشی بۆ دەکەین ئەگەر چی بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێت.

**٧٤١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عِنْدَ انْقِضَاءِ صَلَاتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمَلَكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ، لَهُ النِّعْمَةُ وَالْفَضْلُ وَالثَّنَاءُ الْحَسَنُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ»[1].

واتە: عەبدوڵای کوڕی زوبەیر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی تەواوبوونی نوێژەکەی پێش ئەوەی لە شوێنی خۆی هەستێ دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێهاوبەش، هەموو موڵك و ستاییش بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، هیچ هێز و توانایەك بوونی نییە مەگەر (بە یارمەتی) خوا، جگە لەو کەس ناپەرستین، خاوەنی بەخشش و فەزڵ و چاکە و ستاییشی جوانە، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوا، بەدڵسۆزییەوە پەرستشی بۆ دەکەین ئەگەر چی بێبڕوایانیش پێیان ناخۆش بێت.

**٧٤٢-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمَلَكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[2].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای نوێژ دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێهاوبەش، هەموو موڵك و ستاییش بۆ ئەوە و بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، خوایە ڕێگری نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیبەخشی و بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوە، هیچ خاوەنپایە و دەسەڵاتێك دەسەڵاتەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ و ڕزگاری ناکات لە تۆ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ جَامِعِ الدُّعَاءِ بَعْدَ السَّلَامِ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ

**٧٤٣-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ فَسَلَّمَ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَالْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»[١].

### باسی کۆکەرەوەی پاڕانەوەکان لەدوای سەلامدانەوە پاش نوێژ

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لە نوێژەکەی دەبۆیەوە و سەلامی دەدایەوە، دەیفەرموو: خوایە لێم خۆش بە لەو گوناهەی پێشم خستووە و لەوەیشی لە داهاتوودا ئەنجامی دەدەم، وە ئەوەی شاردوومەتەوە و ئەوەیشی بەئاشکرا کردوومە، وە ئەوەیشی زیادەڕەویم تێدا کردوە، وە ئەوەیشی تۆ لە من زاناتری پێی، تۆ یەکەم و کۆتاییت (واتە: لە پێش زاتی تۆ کەس نەبووە، لە کۆتاییشدا تەنها زاتی تۆ دەمێنیتەوە)، هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە تۆ.

**٧٤٤-** عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نَغْدُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَجِيءُ الرَّجُلُ وَتَجِيءُ الْمَرْأَةُ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقُولُ إِذَا صَلَّيْتُ؟ قَالَ: قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي، فَقَدَ جَمَعَ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ»[٢].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشجەعی دەگێڕێتەوە لەباوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە بەیانیان دەکردەوە دەهاتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەم پیاو و هەم ئافرەت، دواتر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێم لە نوێژدا کاتێ نوێژم کرد؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە لێم خۆش بە و بەزەییت پێمدا بێتەوە و ڕێنماییم بکە و لەشساغ و سەلامەتم بکە و ڕزق و ڕۆزیم بدە، ئەوە دنیا و دواڕۆژی بۆت کۆ کردۆتەوە.

**٧٤٥-** عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي مَرْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ كَعْبًا ﷺ، حَلَفَ لَهُ بِالَّذِي فَلَقَ الْبَحْرَ لِمُوسَى، إِنَّا نَجِدُ فِي التَّوْرَاةِ أَنَّ دَاوُدَ نَبِيَّ اللَّهِ كَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلَاتِهِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

جَعَلْتَهُ لِي عِصْمَةً، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي جَعَلْتَ فِيهَا مَعَاشِي، اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِعَفْوِكَ مِنْ نِقْمَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[١].

واتە: عەتائی کوڕی ئەبو مەڕوان دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، کەعب ﷺ سوێندی بۆی خواردووە بەو خوایەی کە دەریاکەی بۆ موسا (عليه السلام) لەت کرد، ئێمە دەبینین لە تەوڕاتدا: داود (عليه السلام) کاتێ نوێژی تەواو بکردایە دەیفەرموو: خوایە ئاینەکەم بۆ چاك بکە کە کردووتە بە پارێزەرم، دنیاشم بۆ بۆ چاك بکە کە بژێویمت تێدا داناوە، خوایە پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە توڕەبوونت، وە پەنا دەگرم بە لێبووردنت لە سزاکانت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە شوێنەواری سیفاتەکانت، خوایە هیچ بەربەستێك نییە لەبەردەم بەخشینت، وە هیچ بەخشەرێك نییە لەبەردەم ڕێگریکردنت، وە هیچ دەوڵەمەندی و خاوەن پلەوپایەیەك، پلەوپایەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ و ڕزگاری ناکات لە تۆ.

## بَابُ التَّعَوُّذِ بَعْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٤٦**- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، وَعَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ قَالَا: كَانَ سَعْدٌ ﷺ يُعَلِّمُ بَنِيهِ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ كَمَا يُعَلِّمُ الْمُكْتِبُ الْغِلْمَانَ يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ بِهِنَّ دُبُرَ الصَّلَاةِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[٢].

## باسی پەناگرتن بە خوا لەدوای سەلامدانەوەی نوێژ

واتە: موصعەبی کوڕی سەعد و عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی دەڵێن: سەعد ﷺ منداڵەکانی فێری ئەم وشانە دەکرد وەکوو چۆن مامۆستا منداڵی فێری نووسین دەکات، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای هەموو نوێژێك پەنای بە خوا دەگرت

---

(١) إسناده فيه مقال.

(٢) صحيح.

بەو وشانە: خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە ڕەزیلی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە ترسنۆکی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی بگەڕێمەوە بۆ تەمەنی پیری کە توانای هیچم نەمێنێ، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە فیتنە و ئاشووبی دونیا و سزای نێوگۆڕ.

**٧٤٧-** عَنْ مُسْلِمِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

واتە: موسلیمی کوڕی ئەبو بەکر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لەدوای نوێژ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێباوەڕی (سپڵەیی) و هەژاری و سزای نێوگۆڕ.

## بَابُ فَضْلِ التَّسْبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّكْبِيرِ بَعْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ

**٧٤٨-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، ذَهَبَ أَهْلُ الْأَمْوَالِ الدُّثُورُ بِالْأُجُورِ، يَقُولُونَ كَمَا نَقُولُ وَيُنْفِقُونَ وَلَا نُنْفِقُ قَالَ: «أَوَلَا أُخْبِرُكَ بِعَمَلٍ إِذَا أَنْتَ عَمِلْتَهُ أَدْرَكْتَ مَنْ قَبْلَكَ وَفُتَّ مَنْ بَعْدَكَ إِلَّا مَنْ قَالَ مِثْلَ قَوْلِكَ، تَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ، تُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَتَحْمَدُ وَتُكَبِّرُ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ»[٢].

## باسی فەزڵ و گەورەیی (سُبْحَانَ اللَّهِ) و (الْحَمْدُ لِلَّهِ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ) کردن لەدوای سەلامدانەوە لە نوێژ

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەوڵەمەندەکان بە پاداشتەوە پێشمان کەوتن، ئەوەی ئێمە دەیڵێین ئەوانیش دەیڵێن، ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ئێمە نیمانە ببەخشین، فەرمووی: ئایا کردەوەیەکت پێ نیشان بدەم ئەگەر تۆ ئەنجامی بدەیت دەگەی بەوانەی پێش خۆت، وە پێشی دوای خۆت دەکەویت مەگەر کەسێك وەکوو ئەوەی تۆ بڵێ، دوای هەموو نوێژێك سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ) بەهەمان شێوە (الْحَمْدُ لِلَّهِ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ) بکە، هەروەها کاتێکیش چوویتە سەر جێگاکەت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٧٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: جَاءَ الْفُقَرَاءُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ مِنَ الْأَمْوَالِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَى وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَلَهُمْ فُضُولٌ يَحُجُّونَ بِهَا وَيَعْتَمِرُونَ وَيُجَاهِدُونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، فَقَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَمْرٍ إِنْ أَخَذْتُمْ بِهِ أَدْرَكْتُمْ مَنْ سَبَقَكُمْ وَلَمْ يُدْرِكْكُمْ أَحَدٌ مِنْ بَعْدِكُمْ، وَكُنْتُمْ خَيْرَ مَنْ أَنْتُمْ بَيْنَ ظَهْرَيْهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ مِثْلَ أَعْمَالِكُمْ تُسَبِّحُونَ وَتَحْمَدُونَ وَتُكَبِّرُونَ خَلْفَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ» قَالَ: فَاخْتَلَفْنَا بَيْنَنَا، فَقَالَ بَعْضُنَا: نُسَبِّحُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَنَحْمَدُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَنُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ: «تَقُولُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ حَتَّى تُتِمَّ مِنْهُنَّ كُلِّهِنَّ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەژارەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: دەوڵەمەندەکان بە پلەوپایەی بەرز و ناز و نیعمەتی بەردەوام و هەمیشەییەوە پێشمان کەوتن، نوێژ دەکەن وەکوو چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، ڕۆژوو دەگرن وەکوو چۆن ئێمە ڕۆژوو دەگرین، ئەوان ماڵ و سامانی زیادەیان هەیە حەج و عومرە و جیهاد و خێر و خێراتی پێ دەکەن، فەرمووی: ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر دەستی پێوە بگرن دەگەن بە ئەوانەی پێشتان کەوتوون، کەس نەگات بە ئێوە لەدوای ئێوە، وە چاکترینن لەو نێوەندەدا مەگەر کەسێك وەکوو ئەو کارەی ئێوە بکات؟ تەسبیحات و تەحمید و تەکبیر دەکەن لەدوای هەموو نوێژێك سی و سێ جار، وتی: لەنێو خۆماندا جیاوازیمان تێ کەوت، هەندێکمان وتی: سی و سێ جار (سبحان الله) دەکەین، سی و سێ جار (الحمد لله) دەکەین، سی و چوار جار تەکبیر دەکەین، دواتر گەڕامەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) هەتا هەموویان تەواو دەکەیت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ التَّهْلِيلِ بَعْدَ التَّسْبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّكْبِيرِ بَعْدَ السَّلَامِ مِنَ الصَّلَاةِ تَكْمِلَةَ الْمِائَةِ، وَمَا يُرْجَى فِي ذَلِكَ مِنْ مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ السَّالِفَةِ وَإِنْ كَانَتْ كَثِيرَةً

٧٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَبَّحَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَذَلِكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، ثُمَّ قَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، غُفِرَتْ لَهُ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی چاکتر وایە لەدوای سەلامدانەوەی نوێژ (٣٣ جار سبحان الله) و (٣٣ جار الحمد لله) و (٣٣ جار الله أكبر) بكات، دواتر یەك جار (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بكات تا ببێتە سەد دانە، جا ئومێد دەكرێ بەهۆی ئەوەوە خوا لە گوناهەكانی ڕابردووی خۆش ببێت ئەگەر چی زۆریش بێت**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لەدوای هەموو نوێژێك سی و سێ جار (سبحان الله) بكات، وە سی و سێ جار (الله أكبر) بكات، وە سی و سێ جار (الحمد لله) بكات، ئەوە دەكاتە نەوەد و نۆ، پاشان بە: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، سەد دانەی تەواو كرد، خوا لە هەموو گوناهەكانی خۆش دەبێت، ئەگەر چی بەقەد كەفی دەریاش بێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِمَسْأَلَةِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ فِي دُبُرِ الصَّلَوَاتِ الْمَعُونَةَ عَلَى ذِكْرِهِ وَشُكْرِهِ وَحُسْنِ عِبَادَتِهِ، وَالْوَصِيَّةِ بِذَلِكَ

**٧٥١-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا بِيَدِي، فَقَالَ لِي: «يَا مُعَاذُ ﷺ، وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ»، فَقُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ قَالَ: «يَا مُعَاذُ إِنِّي أُوصِيكَ، لَا تَدَعَنَّ أَنْ تَقُولَ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ»، وَأَوْصَى بِذَلِكَ مُعَاذٌ الصُّنَابِحِيَّ، وَأَوْصَى بِهِ الصُّنَابِحِيُّ أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْحُبُلِيَّ، وَأَوْصَى بِهِ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ عُقْبَةَ بْنَ مُسْلِمٍ[١].

**باسی فەرمان بەوەی بەندە لەدوای هەموو نوێژەكان داوای یارمەتی لە پەروەردگاری بكات، لەسەر یادكردنی و سوپاسكردنی و چاك پەرستشكردنی، وەسییەتیشی پێ بكات بە خەڵكی**

واتە: موعازی كوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك دەستی گرتم و فەرمووی: ئەی موعاز، سوێند بە خوا من خۆشم ئەوێی، وتم: باوك و دایكم بە قوربانت بێت سوێند بە خوا منیش خۆشم ئەوێی، فەرمووی: ئەی موعاز وەسییەتت

---

(١) صحيح.

بۆ دەکەم لەدوای هەموو نوێژێك دەستبەرداری ئەم نزایە مەبە، بڵێ: پەروەردگارم یارمەتیم بدە لەسەر یادکردن و سوپاسکردن و چاك پەرستشکردنت. موعازیش وەسییەتی پێ کرد بە صونابحی، صونابحیش وەسییەتی پێ کرد بە ئەبو عەبدوڕەحمانی حوبولی، ئەبو عەبدوڕەحمانیش وەسییەتی پێ کرد بە عوقبەی کوڕی موسلیم.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ زِيَادَةِ التَّهْلِيلِ مَعَ التَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ وَالتَّحْمِيدِ تَمَامَ الْمِائَةِ وَأَنْ نَجْعَلَ كُلَّ وَاحِدٍ خَمْسًا وَعِشْرِينَ تَكْمِلَةَ الْمِائَةِ

**٧٥٢-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: أُمِرْنَا أَنْ نُسَبِّحَ، فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَنَحْمَدَهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَنُكَبِّرَهُ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، فَأُتِيَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي نَوْمِهِ فَقِيلَ لَهُ: أَمَرَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَنْ تُسَبِّحُوا فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ كَذَا وَكَذَا؟» قَالَ: نَعَمْ قَالَ: «فَاجْعَلُوهَا خَمْسًا وَعِشْرِينَ، وَاجْعَلُوا فِيهِ التَّهْلِيلَ»، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَافْعَلُوا»[1].

## باسی چاکتر وایە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) زیاد بکرێ لەگەڵ (سبحان الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) سەد دانەی تەواو، هەریەکەیان بیست و پێنج جار بێڵێین

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﵁ دەڵێ: فەرمانمان پێ کرا لەدوای نوێژ سی و سێ جار (سبحان الله) بکەین، وە سی و سێ جار (الحمد لله) بکەین، وە سی و چوار جار (الله أكبر) بکەین، پیاوێك لە ئەنصارەکان لە خەویدا بینی پێی وترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردوون لەدوای هەموو نوێژێك ئەوەندە و ئەوەندە (سبحان الله) بکەن؟ وتی: بەڵێ، وتی: بیکەن بە بیست و پێنج، (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه)یشی تێ بکەن. کاتێ بەیانی کردەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێ دا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە وا بکەن.

---

(١) صحيح.

## بَابُ فَضْلِ التَّحْمِيدِ وَالتَّسْبِيحِ وَالتَّكْبِيرِ يُوصَفُ بِالْعَدَدِ الْكَثِيرِ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ أَوْ غَيْرِ خَلْقِهِ

**٧٥٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَتْ جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ - وَكَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ - فَحَوَّلَ النَّبِيُّ ﷺ اسْمَهَا، وَسَمَّاهَا جُوَيْرِيَةَ، وَكَرِهَ أَنْ يُقَالَ: خَرَجَ مِنْ عِنْدِ بَرَّةَ - قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا فِي مُصَلَّايَ فَرَجَعَ حِينَ تَعَالَى النَّهَارُ وَأَنَا فِيهِ، فَقَالَ: «لَمْ تَزَالِي فِي مُصَلَّاكِ مُنْذُ خَرَجْتُ؟» قُلْتُ: نَعَمْ قَالَ: قَدْ قُلْتُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَّ بِمَا قُلْتِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ»(١).

**باسی فەزڵ و گەورەیی (الحمد لله) و (سبحان الله) و (الله أكبر) وەسف دەكرێ بە ژمارەیەكی یەكجار زۆر لە بەدیهێنراوەكانی خوا یان جگە لە بەدیهێنراوەكانی**

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: جوەیریەی كچی حاریس -پێشتر ناوی بەڕە بوو- پێغەمبەر ﷺ ناوی گۆڕی و ناوی لێنا جوەیریە، پێی ناخۆش بوو بوترێ: لەلای بەڕەوە دەرچوو، وتی: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو من لە شوێنی نوێژەكەم بووم، دواتر كاتێ خۆر بەرز بووبوو گەڕایەوە من هەر لە جێگای خۆم بووم، فەرمووی: لەو كاتەی من دەرچووم تۆ هەر لە نوێژگەكەی خۆتی؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: بێگومان چوار وشەم وت، ئەگەر بخرێنە سەر هەر تەرازوویەك لە هەموو زیكرەكان قورستر دەبن: پاك و بێگەردی و ستاییش بۆ خوا بەئەندازەی دروستكراوەكانی و ژمارەی بەدیهێنراوەكانی و بەئەندازەی ئەوەی پێی ڕازی بێت و بەئەندازەی قورسایی عەرشەكەی و بەئەندازەی كێشی وشەكانی.

**٧٥٤-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِهِ وَهُوَ يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ، فَقَالَ: «مَاذَا تَقُولُ يَا أَبَا أُمَامَةَ؟» قَالَ: أَذْكُرُ رَبِّي قَالَ: أَفَلَا أُخْبِرُكَ بِأَكْثَرَ - أَوْ أَفْضَلَ - مِنْ ذِكْرِكَ اللَّيْلَ مَعَ النَّهَارِ، وَالنَّهَارَ مَعَ اللَّيْلِ؟ أَنْ تَقُولَ: سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ مِلْءَ مَا خَلَقَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا فِي الْأَرْضِ وَالسَّمَاءِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ مِلْءَ مَا فِي الْأَرْضِ وَالسَّمَاءِ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا أَحْصَى كِتَابُهُ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ كُلِّ شَيْءٍ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ مِلْءَ كُلِّ شَيْءٍ، وَتَقُولُ الْحَمْدُ مِثْلَ ذَلِكَ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلایدا ئەو لێوی دەجولاندەوە، فەرمووی: چی دەڵێی ئەی ئەبو ئومامە؟ وتی: یادی پەروەردگارم دەکەم، فەرمووی: ئایا هەواڵت بدەمێ بە زۆرتر -یان بە چاکتر- لەوەی شەو لەگەڵ ڕۆژ یان ڕۆژ لەگەڵ شەودا یادی خوا بکەی؟ بڵێ: پاك و بێگەردی بۆ خوا بەئەندازەی ئەوەی دروستی کردووە، وە پاك و بێگەردی بۆ خوا پڕاوپڕی ئەوەی دروستی کردووە، وە پاك و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی ئەوەی لەنێو زەوی و ئاسماندایە، وە پاك و بێگەردی بۆ خوا پڕاوپڕی ئەوەی لەنێو زەوی و ئاسماندایە، پاك و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی ئەوەی کتێبەکەی ژماردوویەتی، پاك و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی هەموو شتێك، پاك و بێگەردی بۆ خوا پڕاوپڕی هەموو شتێك، هەروەها وەکوو ئەوە ستاییشی خوا بکە. (واتە: جارێکی دیکە لە جیاتی (سُبْحَانَ اللَّه) وشەی (الحمد لله)یش دابنێ).

## بَابُ الْأَمْرِ بِقِرَاءَةِ الْمُعَوِّذَتَيْنِ فِي دُبُرِ الصَّلَاةِ

**٧٥٥-** عَنْ عُقْبَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَءُوا الْمُعَوِّذَاتِ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ»(١).

## باسی فەرمانکردن بە خوێندنی (الْمُعَوِّذَات) لەدوای هەموو نوێژێك

واتە: عوقبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: لەدوای هەموو نوێژێك (الْمُعَوِّذَات) بخوێنن. (الْمُعَوِّذَات): بریتییە لە سوڕەتی: (الإخلاص) و (الناس) و (الفلق).

## بَابُ فَضْلِ الْجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ الصَّلَاةِ مُتَطَهِّرًا

**٧٥٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ ثُمَّ جَلَسَ مَجْلِسَهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ لَمْ تَزَلِ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يُحْدِثْ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی فەزڵ و گەورەیی دانیشتن لەنێو مزگەوت دوای نوێژ بەدەستنوێژەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد پاشان لە نوێژگەکەی دانیشت کە نوێژی تێدا کردووە، بەردەوام فریشتەکان نزای بۆ دەکەن (دەڵێن): خوایە لێی خۆش بە، خوایە ڕەحمی پێ بکە، هەتا بێ دەستنوێژ نەبێت.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْجُلُوسِ فِي الْمَسْجِدِ بَعْدَ الْفَجْرِ إِلَى طُلُوعِ الشَّمْسِ

٧٥٧- عَنْ سِمَاكٍ، أَنَّهُ سَأَلَ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ ﷺ، كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ؟ قَالَ: كَانَ يَقْعُدُ فِي مُصَلَّاهُ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»[١].

## باسی چاکتر وایە لەدوای نوێژی بەیانی دابنیشێ تا خۆر هەڵدێت

واتە: سیماك پرسیاری لە جابری کوڕی سەمورە ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بەیانی بکردایە چی دەکرد؟ وتی: کاتێ نوێژی بەیانی بکردایە لە نوێژگەکەی دادەنیشت تا خۆر هەڵدەهات.

## جِمَّاعُ أَبْوَابِ اللِّبَاسِ فِي الصَّلَاةِ

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ

٧٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَيُصَلِّي أَحَدُنَا فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانَ؟»، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ لِلَّذِي سَأَلَهُ: أَتَعْرِفُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ؟ فَإِنَّهُ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَثِيَابُهُ مَوْضُوعَةٌ عَلَى الْمِشْجَبِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## کۆباسی پۆشاك لە نوێژدا
## باسی مۆڵەتدان بە نوێژکردن بە یەك پۆشاکەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێك هەستا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا هەر یەکێك لە ئێمە دەتوانێت بە یەك پۆشاکەوە نوێژ بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هەر یەکێکتان دوو پۆشاکی هەیە؟ (واتە: دروستە بە یەك پۆشاکەوە نوێژ بکەن). ئەبو هورەیرە ﷺ بەو پیاوەی وت کە پرسیاری کرد: ئایا ئەبو هورەیرە ﷺ دەناسیت؟ بێگومان ئەو بە یەك پۆشاکەوە نوێژ دەکات پۆشاکەکانیشی لە شوێنی جلهەڵواسەکەدا دانراوە.

ڕوونکردنەوە: (الثَّوْبِ) پۆشاك: دوو بەشە، زۆربەی عەرەب لەو سەردەمەدا دوو پارچە قوماشیان بەکار دەهێنا (رداء) لە پشتوێنە بەرەو سەرەوە، (إزار): لە پشتوێنە بەرەو خوارەوە.

**٧٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي أَنْظُرُ فِي الْمَسْجِدِ مَا أَكَادُ أَنْ أَرَى رَجُلًا يُصَلِّي فِي ثَوْبَيْنِ، وَأَنْتُمُ الْيَوْمَ تُصَلُّونَ فِي اثْنَيْنِ وَثَلَاثَةٍ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: سوێند بەوەی گیانی ئەبو هورەیرەی ﷺ بەدەستە بەڕاستی من خۆمم بینی، من تەماشای نێو مزگەوتم دەکرد، پیاوێك نەبوو بە دوو پۆشاکەوە نوێژ بکات، ئێوەیش ئەمڕۆ بە دوو یان سێ پۆشاکەوە نوێژ دەکەن.

**٧٦٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، وَسُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُصَلِّي فِي قَمِيصٍ وَاحِدٍ لَيْسَ عَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ: لَيْسَ بِذَلِكَ بَأْسٌ إِذَا كَانَ يُوَارِيهِ. وَقَالَ بُكَيْرٌ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ: قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: قَدْ كُنَّا نُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ حَتَّى جَاءَنَا اللَّهُ بِالثِّيَابِ، فَقَالَ: «لَا تُصَلُّوا إِلَّا فِي ثَوْبَيْنِ» فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ ﷺ: لَيْسَ فِي هَذَا شَيْءٌ، قَدْ كُنَّا نُصَلِّي فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ وَلَنَا ثَوْبَانُ، فَقِيلَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: أَلَا تَقْضِي بَيْنَ هَذَيْنِ - وَهُوَ مَعَهُمْ - قَالَ: أَنَا مَعِي»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب دەگێڕێتەوە، پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك بە کراسێکەوە نوێژی دەکات (پۆشاکی سەرەوە) باسی خوارەوەی لەگەڵ نییە، وتی: ئەوە

---

(١) صحیح.
(٢) صحیح.

هیچ گرفتێکی تێدا نییە ئەگەر ئەو پارچە قوماشە دایبپۆشی. بوکەیر وتی: سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێ: ئیبنو مەسعود ﷺ وتی: ئێمە بە یەك پۆشاكەوە نوێژمان دەكرد تا خوا دەرووی لێ كردینەوە، وتی: نوێژ مەكەن بە دوو پۆشاكەوە نەبێت، ئوبەی كوڕی كەعب ﷺ دەڵێ ئەم قسەیە هیچ بنەمایەكی نییە، ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژمان دەكرد لە یەك پۆشاكەوە، دوو پۆشاكیشمان هەبوو، بە عومەری كوڕی خەتاب ﷺ وترا: ئایا دادوەری لە نێوان ئەم دووانەدا ناكەی -ئەویش لەگەڵیان بوو- وتی: من دوو پۆشاكم لایە.

## بَابُ الْمُخَالَفَةِ بَيْنَ طَرَفَيِ الثَّوْبِ إِذَا صَلَّى الْمُصَلِّي فِي الرِّدَاءِ الْوَاحِدِ أَوِ الْإِزَارِ الْوَاحِدِ

٧٦١- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ قَدْ خَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ[١].

## باسی پێچەوانەكردنی هەردوو تەنیشتی پۆشاك ئەگەر نوێژخوێن نوێژی كرد بە یەك جلی سەرەوە یان بە یەك جلی خوارەوە

واتە: عومەری كوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ماڵی دایكی سەلەمە نوێژی دەكرد بە یەك پۆشاكەوە، هەردوو تەنیشتی جلەكانی پێچەوانە كردبۆیەوە (واتە: لای ڕاستی دابوو بە لای چەپدا و لای چەپیشی دابوو بە لای ڕاستیدا).

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ وَبِحَضْرَةِ الْمُصَلِّي ثِيَابٌ لَهُ غَيْرُ الثَّوْبِ الْوَاحِدِ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ

٧٦٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُخَالِفًا بَيْنَ طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ، وَثِيَابُهُ عَلَى الْمِشْجَبِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەپێدانی نوێژکردن بە یەك پۆشاکەوە، لە کاتێکدا نوێژخوێن پۆشاکی دیکەی لەبەردەستدا بێت جگە لەو پۆشاکەی نوێژی پێوە دەکات

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینی بە یەك پۆشاکەوە نوێژی دەکرد، تەنیشتەکانی بەپێچەوانە دابوو بەسەر هەردوو شانیدا، پۆشاکەکانیشی لە شوێنی جلهەڵواسەکەدا بوو.

## بَابُ عَقْدِ الْإِزَارِ عَلَى الْعَاتِقَيْنِ إِذَا صَلَّى الْمُصَلِّي فِي إِزَارٍ وَاحِدٍ ضَيِّقٍ

**٧٦٣-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رِجَالٌ يُصَلُّونَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عَاقِدِينَ أُزُرَهُمْ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ كَهَيْئَةِ الصِّبْيَانِ، فَيُقَالُ لِلنِّسَاءِ: لَا تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَسْتَوِيَ الرِّجَالُ جُلُوساً[١].

## باسی بەستنی تەنیشتی پۆشاکی بەشی خوارەوە لەسەر هەردوو شان ئەگەر نوێژخوێن بە یەك پۆشاکی بەشی خوارەوە نوێژی کرد و تەسك بوو

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پیاوانێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژیان دەکرد تەنیشتی پۆشاکەکانی بەشی خوارەوەیان لە لای ملیان بەستبوو هەر وەکوو منداڵ، (لەبەر نەبوونی پۆشاك) بە ئافرەتان دەوترا: سەرتان بەرز مەکەنەوە تا پیاوان لە سوژدەکانیان ڕاست دەبنەوە و دادەنیشن.

**٧٦٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كُنْتُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ عَلَيْهِ رِدَاءٌ إِمَّا بُرْدَةٌ أَوْ كِسَاءٌ قَدْ رَبَطُوهَا فِي أَعْنَاقِهِمْ، فَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ السَّاقَ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ الْكَعْبَيْنِ فَيَجْمَعُهُ بِيَدِهِ كَرَاهِيَةَ أَنْ تُرَى عَوْرَتُهُ[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ حەفتا کەسدا بووم لە هاوەڵانی صوففە یەکێکیان نەبوو جوبەی لەبەردا بێت، بەڵکوو پارچە قوماشێکی پێبوو، بەستبوویانەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

بە ملیانەوە، پارچە قوماشی وا بوو تا قولەپێی دەپۆشی، هی واشبوو دەگەیشتە پاژنەکان، بە دەستی کۆی دەکردەوە بۆ ئەوەی عەورەتی نەبینرێ.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ الْوَاسِعِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِ الْمُصَلِّي مِنْهُ شَيْءٌ بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٧٦٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»(١).

## باسی سەرزەنشتکردنی نوێژکردن بە یەك پۆشاکی فراوان هیچ لەسەر شان و ملی نەبێت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی کورت و ناڕوون (مُجْمَل) نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە بە یەك پۆشاکەوە نوێژ نەکات بە جۆرێ هیچ لەسەر شان و ملی نەبێت. (بەڵام ئەگەر تەنها یەك پۆشاکی هەبوو نەیدەتوانی شانیشی پێ دابپۆشێ ئەوە ئاساییە شانی دانەپۆشێ و نوێژ بکات).

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الزَّجْرَ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِ الْمُصَلِّي مِنْهُ شَيْءٌ، إِذَا كَانَ الثَّوْبُ وَاسِعًا، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَبَاحَ الصَّلَاةَ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ الضَّيِّقِ إِذَا شَدَّهُ الْمُصَلِّي عَلَى حَقْوِهِ

**٧٦٦** - عَنْ نَافِعٍ قَالَ: رَآنِي ابْنُ عُمَرَ ﷺ، وَأَنَا أُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ: أَلَمْ أَكُنْ أُكْسِكَ ثَوْبَيْنِ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى قَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَرْسَلْتُكَ فِي حَاجَةٍ أَكُنْتَ مُنْطَلِقًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ؟ قُلْتُ: لَا قَالَ: فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَزَيَّنَ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا لَمْ يَكُنْ لِأَحَدِكُمْ إِلَّا ثَوْبٌ وَاحِدٌ فَلْيَشُدَّ بِهِ حَقْوَهُ، وَلَا يَشْتَمِلْ بِهِ اشْتِمَالَ الْيَهُودِ»(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی فەرموودەیەکی ڕوونکەرەوە (الْمُفَسَّر) بۆ ئەو دەستەواژە (مُجْمَل) ەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی سەرزەنشتکردنی نوێژکردن بە یەک پۆشاکەوە لە کاتێکدایە هیچ شتێك بەسەر شان و ملی نەبێت، ئەگەر پۆشاکەکە فراوان بوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی داوە نوێژخوێن بە یەك پۆشاکی تەسکەوە نوێژ بکات، ئەگەر نوێژخوێن لەسەر کەلەکەی بەستی**

واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ بینیمی بە یەك پۆشاکەوە نوێژم دەکرد، وتی: ئایا دوو پۆشاکم پێ نەدایت؟ وتی: وتم: بەڵێ، وتی: ئایا ئەگەر ڕاتبسپێرم بۆ کارێك بە یەك جلەوە دەچیت بۆی؟ وتم: نەخێر، وتی: بێگومان خوا لەپێشترە کە لە کاتی نوێژدا پۆشاکی جوان و پاکی بۆ لەبەر بکەی، پاشان وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە هیچی لەلا نەبوو جگە لە یەك پۆشاك نەبێت، با لەسەر کەلەکەی ببەستێتەوە، وە پۆشەکەکانتان دامەدەنەوە وەکوو داداناوەی جوولەکەکان.

**٧٦٧-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْحَارِثِ، أَنَّهُ أَتَى جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، هُوَ وَنَفَرٌ قَدْ سَمَّاهُمْ، فَلَمَّا دَخَلْنَا عَلَيْهِ وَجَدْنَاهُ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُلْتَحِفًا بِهِ قَدْ خَالَفَ بَيْنَ طَرَفَيْهِ، وَرِدَاؤُهُ قَرِيبٌ مِنْهُ لَوْ تَنَاوَلَهُ أَبْلَغَهُ قَالَ: فَلَمَّا سَلَّمَ سَأَلْنَاهُ عَنْ صَلَاتِهِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ: أَفْعَلُ هَذَا لِيَرَانِي الْحَمْقَى أَمْثَالُكُمْ فَيُفْشُوَ عَنْ جَابِرٍ رُخْصَةٌ رَخَّصَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَجِئْتُهُ لَيْلَةً لِبَعْضِ أَمْرِي فَوَجَدْتُهُ يُصَلِّي وَعَلَيَّ ثَوْبٌ وَاحِدٌ قَدِ اشْتَمَلْتُ بِهِ وَصَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: «مَا السُّرَى يَا جَابِرُ ﷺ؟» فَأَخْبَرْتُهُ بِحَاجَتِي فَلَمَّا فَرَغْتُ قَالَ: «يَا جَابِرُ مَا هَذَا الِاشْتِمَالُ الَّذِي رَأَيْتُ؟» فَقُلْتُ: كَانَ ثَوْبًا وَاحِدًا ضَيِّقًا، فَقَالَ: «إِذَا صَلَّيْتَ وَعَلَيْكَ ثَوْبٌ وَاحِدٌ فَإِنْ كَانَ وَاسِعًا فَالْتَحِفْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ ضَيِّقًا فَاتَّزِرْ بِهِ»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی حاریس دەگێڕێتەوە، ئەو هات بۆ لای جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ خۆی و چەند کەسێك ناوی هێنان، کاتێ چووینە ژوورەوە بۆ لای بینیمان یەك پۆشاکی لە خۆی پێچابوو نوێژی دەکرد تەنیشتەکانی بەپێچەوانە دابوو بەسەر شانیدا، عەباکەیشی نزیك بوو لێیەوە ئەگەر دەستی بۆی ببردایە پێی دەگەیشت، وتی:

---

(١) صحیح.

کاتێ سەلامی دایەوە پرسیارمان لێی کرد دەربارەی نوێژکردنی بە یەك پۆشاکەوە، وتی: بۆیە ئەمە دەکەم تا ناحاڵی وەکوو ئێوە تەماشام بکات، لە جابرەوە ئەو مۆڵەتە بڵاو بێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێی داوە، من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم لە یەکێك لە سەفەرەکانیدا، شەوێك هاتم بۆ لای بۆ هەندێ کاری خۆم بینیم نوێژی دەکرد، منیش جلێکم پێ بوو پێچام بەخۆمەوە و لە تەنیشتی نوێژم کرد، کاتێ تەواو بوو، فەرمووی: ئەم شەورەوییەت لە چی ئەی جابر ﷺ؟ منیش هەواڵم پێ دا، فەرمووی: ئەی جابر ئەو خۆداپۆشین و خۆپێچانەوە چی بوو کە بینیم؟ وتم: ئەوە پارچە پۆشاکێکی تەسك بوو، فەرمووی: ئەگەر نوێژت کرد و یەك پۆشاکت پێ بوو، ئەگەر فراوان بوو خۆتی پێ بپۆشە، وە ئەگەر تەسك بوو دەرقاچەکەی ببەستە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ فِي بَعْضِ الثَّوْبِ الْوَاحِدِ يَكُونُ بَعْضُهُ عَلَى الْمُصَلِّي وَبَعْضُهُ عَلَى غَيْرِهِ

٧٦٨- عَنْ مَيْمُونَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَعَلَيَّ مِرْطٌ، عَلَيَّ بَعْضُهُ وَعَلَيْهِ بَعْضٌ، وَأَنَا حَائِضٌ[١].

## باسی مۆڵەت دراوە یەك پۆشاك هەندێکی بەسەر نوێژخوێنەوە بێت هەندێکی دیکەی بەسەر کەسێکی دیکەوە

واتە: مەیمونە رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد من پۆشاکێکی سوفم بەسەرەوە بوو، هەندێکی بەسەر منەوە بوو هەندێکی دیکەشی بەسەر ئەوەوە بوو، لە کاتێکدا من لە حەیزدا بووم.

## بَابُ ذِكْرِ اشْتِمَالِ الْمَنْهِيِّ عَنْهُ فِي الصَّلَاةِ تَشَبُّهًا بِفِعْلِ الْيَهُودِ وَهُوَ تَجْلِيلُ الْبَدَنِ كُلِّهِ بِالثَّوْبِ الْوَاحِدِ

٧٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ فَلْيَشُدَّهُ عَلَى حَقْوِهِ، وَلَا تَشْتَمِلُوا كَاشْتِمَالِ الْيَهُودِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**باسی ئەو خۆ پێچانەوەی کە قەدەغەی لێ کراوە لەنێو نوێژدا، چونکە لە کردەوەی جوولەکەکان دەچێت، ئەویش بریتییە لە پۆشینی هەموو جەستە بە یەک پۆشاک (بەزەحمەت بتوانێ بجوڵێ تیایدا)**

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد بە یەك پۆشاکەوە با لەسەر کەلەکەی ببەستێت، وە پۆشەکەکانتان مەپێچن بە خۆتانەوە وەکوو چۆن جوولەکەکان دەیانپێچا بە خۆیانەوە.

**بَابُ الِاشْتِمَالِ الْمُبَاحِ فِي الصَّلَاةِ وَهُوَ عَقْدُ طَرَفَيِ الثَّوْبِ عَلَى الْعَاتِقِ، إِذَا كَانَ الثَّوْبُ وَاسِعًا يُمْكِنُ عَقْدُ طَرَفَيْهِ عَلَى الْعَاتِقَيْنِ فَيَسْتُرُ الْعَوْرَةَ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُخْتَصَرٍ غَيْرِ مُتَقَصًّى**

٧٧٠- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ فِي ثَوْبٍ مُشْتَمِلًا بِهِ»[1].

**باسی خۆپێچانەوەی ڕێگەپێدراو لە نوێژدا، ئەویش بریتییە لە گرێدانی هەردوو تەنیشتی پۆشاکەکە لەسەر شان، ئەگەر پۆشاکەکە فراوان بوو، دەگونجا هەردوو تەنیشتەکانی لەسەر شانەکان گرێ بدرێ، عەورەتی داپۆشێ، بە باسی فەرموودەیەکی کورت و پوخت نەك دوورودرێژ**

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی دایکی سەلەمە بە پارچە پۆشاکێکەوە نوێژی کرد پێچابووی بە خۆیەوە.

**بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُتَقَصِّي الْمُفَسِّرِ لِلَفْظَةِ الْمُخْتَصَرَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا قَبْلُ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِاشْتِمَالَ الْمُبَاحَ فِي الصَّلَاةِ وَضْعُ طَرَفَيِ الثَّوْبِ عَلَى الْعَاتِقَيْنِ**

٧٧١- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ مُشْتَمِلًا بِهِ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ وَاضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی فەرموودەیەکی تێر و تەسەل بۆ ئەو دەستەواژە کورتەی کە پێشتر باسمان کرد (فەرموودەی ژمارە ٧٧٠)، وە بەڵگەش لەسەر خۆپێچانەوەی ڕێگەپێدراو لە نوێژدا: دانانی هەردوو تەنیشتی پۆشاکە لەسەر شانەکان

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە ماڵی دایکی سەلەمە بە یەك پۆشاکەوەوە نوێژی دەکرد پێچابووی بەخۆیەوە چەمکی پۆشاکەکانی دابوو بەسەر شانیدا.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ

٧٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ»[1].

باسی قەدەغەکردنی بەردانەوەی هەردوو دەست لە نوێژدا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە شۆڕکردنەوەی هەردوو دەست لە نوێژدا، وە نەهیشی کردووە پیاو لە نوێژدا دەمی داپۆشێ.

## بَابُ إِجَازَةِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُخَالِطُهُ الْحَرِيرُ

٧٧٣- عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى فِي فَرُّوجٍ مِنْ حَرِيرٍ، ثُمَّ لَمْ يَلْبَثْ أَنْ نَزَعَهُ»[2].

باسی ڕێگەدان بە نوێژ لەو پۆشاکەی کە حەریری تێکەڵە

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی کرد بە کراسێك لە حەریر سەرقۆڵی تەسك بوو لەگەڵ نێوقەدەکەی لە پشتەوەش کرابۆیەوە، دواتر زۆر نەمایەوە لەبەری دایکەند.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

**٧٧٤-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يَذْكُرَا عُمَرَ هَذَا هُوَ الصَّحِيحُ، وَذِكْرُ عُمَرَ فِي هَذَا الْخَبَرِ وَهْمٌ، وَإِنَّمَا الصَّحِيحُ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی. (بوندار و ئەبو موسا) باسی عومەریان نەکرد، ئەمە ڕاست و دروستە، باسی عومەر لەم فەرموودەیەدا هەڵەیە، ئەوەی ڕاستە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوەیە: پێغەمبەرم ﷺ بینی.

## بَابُ نَفْيِ قَبُولِ صَلَاةِ الْحُرَّةِ الْمُدْرِكَةِ بِغَيْرِ خِمَارٍ

**٧٧٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةَ امْرَأَةٍ قَدْ حَاضَتْ إِلَّا بِخِمَارٍ»[٢].

## باسی نوێژی ئافرەتی ئازادی باڵغ وەرناگیرێ بەبێ سەرپۆش

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ نوێژی ئافرەتێك وەرناگرێ کەوتبێتە حەیزەوە (واتە: باڵغ بووبێ) تا خۆی دانەپۆشێ (جگە لە دەست و ڕوخسار).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ الرَّجُلُ فِيهِ أَهْلَهُ

**٧٧٦-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ يَقُولُ: سَأَلْتُ أُمَّ حَبِيبَةَ، هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُهَا فِيهِ؟ قَالَتْ: «نَعَمْ، إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِ أَذًى»[٣].

## باسی مۆڵەت دراوە پیاو بەو جلەوە نوێژ بکات کە پێیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی جووت دەبێت

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵄ دەڵێ: پرسیارم لە دایکی حەبیبە کرد، ئایا پێغەمبەر ﷺ بەو جلەوە نوێژی دەکرد کە سەرجێیی پێوە دەکرد؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر پیسی پێوە نەبینیبایە.

## بَابُ الْأَمْرِ بِزَرِّ الْقَمِيصِ وَالْجُبَّةِ إِذَا صَلَّى الْمُصَلِّي فِي أَحَدِهِمَا لَا ثَوْبَ عَلَيْهِ غَيْرَهُ

**٧٧٧-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ يَقُولُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَكُونُ فِي الصَّيْدِ فَتَحْضُرُ الصَّلَاةُ وَعَلَيَّ قَمِيصٌ قَالَ: «شُدَّهُ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ»[(١)].

## باسی فەرمانکردن بە بەستنی شەقی کراس و جوبە ئەگەر نوێژخوێن بە یەکێکیانەوە نوێژی کرد جگە لەوە جلی دیکەی لەبەر نەبوو

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوع ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەندێ جار من لە ڕاودام کاتی نوێژ دێت تەنها کراسێکم لەبەردایە؟ فەرمووی: کەلێنی کراسەکەت ببەستە ئەگەر چی بە دڕکێکیش بێت (بۆ ئەوەی عەورەتی دەرنەکەوێت).

**٧٧٨-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، قُلْتُ: أَكُونُ فِي الصَّيْدِ وَلَيْسَ عَلَيَّ إِلَّا قَمِيصٌ وَاحِدٌ أَوْ جُبَّةٌ وَاحِدَةٌ فَأَزُرُّهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ»[(٢)].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، وتم: من لە ڕاودام نوێژ دەکەم هیچم لەبەردا نییە جگە لە کراسێك یان جوبەیەك، ئایا کەلێنی کراسەکە ببەستم؟ فەرمووی: بەڵێ بیبەستە ئەگەر چی بە دڕکێکیش بێت (بۆ ئەوەی عەوڕەتی دەرنەکەوێت).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ مَحْلُولَ الْأَزْرَارِ إِذَا كَانَ عَلَى الْمُصَلِّي أَكْثَرُ مِنْ ثَوْبٍ وَاحِدٍ

**٧٧٩-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ ﵄ «يُصَلِّي مَحْلُولٌ أَزْرَارُهُ»، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَفْعَلُهُ» [(٣)].

---

(١) إسناده حسن.

(٢) إسناده حسن.

(٣) إسناده ضعيف.

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژکردن بەو پۆشاکەی بەشی پشتوێنە بەخواری کرابێتەوە، ئەگەر نوێژخوێن یەک پۆشاک زیاتری لەبەردا بوو

واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ئیبنو عومەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد بە پۆشاکێ بەشی لە پشتوێنە بەرەو خواری کرابۆیەوە و دانەخرابوو، لەوبارەوە پرسیارم لێ کرد، وتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەو شێوەیەی دەکرد.

٧٨٠- عَنِ الْوَلِيدِ، بِهَذَا مِثْلَهُ، غَيْرُ أَنَّهُ لَمْ يَقُلْ: فَسَأَلْتُهُ، وَقَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «يُصَلِّي مَحْلُولَ الْأَزْرَارِ»(١).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە. بەڵام نەیوت: لێم پرسی، وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە پۆشاکێ نوێژی دەکرد، بەشی لە پشتوێنە بەرەو خواری کرابۆیەوە و دانەخرابوو.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي إِسْبَالِ الْأُزُرِ فِي الصَّلَاةِ

٧٨١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى صَلَاةِ رَجُلٍ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا»(٢).

## باسی هەڕەشەکردن لە شۆڕکردنەوەی دەرقاچە (دەلینگ) لەنێو نوێژدا (زیاد لە پێویست)

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا تەماشای نوێژی کەسێك ناکات دەرقاچەکەی بخشێ (بە زەویدا) بەهۆی لووتبەرزی.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ كَفِّ الثِّيَابِ فِي الصَّلَاةِ

٧٨٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةٍ، وَلَا أَكُفَّ شَعَرًا وَلَا ثَوْبًا»(٣).

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) حديث صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی سەرکۆنەکردن لە دەستکاریکردنی جلوبەرگ لەنێو نوێژدا

واتە: ئیبنو عەباس ﭭ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فەرمانم پێ کراوە لەسەر حەوت ئێسك سوژدە ببەم، دەستکاری قژ و جلوبەرگ نەکەم (لەنێو نوێژدا).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ فِي ثِيَابِ الْأَطْفَالِ مَا لَمْ تُعْلَمْ نَجَاسَةٌ أَصَابَتْهَا، إِذْ فِي حَمْلِ النَّبِيِّ ﷺ بِنْتَ زَيْنَبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهاُ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ ثِيَابَهَا لَوْ كَانَتِ الصَّلَاةُ لَا تُجْزِئُ فِيهَا لَمْ يَحْمِلْهَا إِذْ لَا فَرْقَ بَيْنَ لُبْسِ الثَّوْبِ النَّجِسِ وَبَيْنَ حَمْلِهِ فِي الصَّلَاةِ

٧٨٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَحْمِلُ بِنْتَ أَبِي الْعَاصِ عَلَى عُنُقِهِ فِي الصَّلَاةِ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا[(١)].

## باسی مۆڵەتدراوە نوێژ بە پۆشاکی منداڵەوە بکرێ بە مەرجێ نەزانرێ پیسی بەرکەوتووە، چونکە لە هەڵگرتنی کچەکەی زەینەب لەلایەن پێغەمبەر ﷺ، بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەوەی ئەگەر جلوبەرگەکەی نوێژی پێوە دروست نەبووایە هەڵی نەدەگرت، چونکە جیاوازی نییە لە نێوان پۆشینی جلی پیس و لە نێوان هەڵگرتنی لە نوێژدا

واتە: ئەبو قەتادەی کوڕی ریبعی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو نوێژدا کچەکەی ئەبو عاصی هەڵدەگرت و دەیخستە سەر ملی، کاتێ سوژدەی ببردایە دایدەنا، وە کاتێ هەستابایەتەوە هەڵیدەگرتەوە.

٧٨٤ - عَن أَبِي بَكْرٍ قالَ: وَحَدَّثَنَا بِهِ الدَّوْرَقِيُّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ قَالَ: وَهُوَ يَحْمِلُ بِنْتَ زَيْنَبَ عَلَى عُنُقِهِ فَيَؤُمُّ النَّاسَ، فَإِذَا رَكَعَ وَضَعَهَا وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا[(٢)].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: دەورەقی بەم سەنەدە گێراویەتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو نوێژدا کچەکەی زەینەبی هەڵدەگرت و دەیخستە سەر ملی، دواتر پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، کاتێ بچووبایە ڕکووع دایدەنا، وە کاتێ هەستابایەوە هەڵیدەگرتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُصَلِّيَ إِذَا أَصَابَ ثَوْبَهُ نَجَاسَةٌ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ لَا يَعْلَمُ بِهَا لَمْ تَفْسُدْ صَلَاتُهُ

**٧٨٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَاجِدٌ وَحَوْلَهُ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِذْ جَاءَ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ بِسَلَى جَزُورٍ فَقَذَفَهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ يَرْفَعْ رَأْسَهُ فَجَاءَتْ فَاطِمَةُ فَأَخَذَتْهُ مِنْ ظَهْرِهِ وَدَعَتْ عَلَى مَنْ صَنَعَ ذَلِكَ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ عَلَيْكَ الْمَلَأَ مِنْ قُرَيْشٍ، أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ، وَعُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ، وَعُقْبَةَ بْنَ أَبِي مُعَيْطٍ، وَأُمَيَّةَ بْنَ خَلَفٍ، أَوْ أُبَيَّ بْنَ خَلَفٍ، شُعْبَةُ الشَّاكُّ، قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُمْ قُتِلُوا يَوْمَ بَدْرٍ وَأُلْقُوا فِي بِئْرٍ غَيْرَ أَنَّ أُمَيَّةَ أَوْ أُبَيَّ تَقَطَّعَتْ أَوْصَالُهُ فَلَمْ يُلْقَ فِي الْبِئْرِ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی نوێژخوێن ئەگەر پیسی بەر جلوبەرگی بکەوێت، ئەو لە نوێژدا بێت و پێی نەزانێت نوێژی بەتاڵ ناکاتەوە

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوژدەدا بوو خەڵکانێك لە قورەیش لە دەوروبەری بوون، لەپڕ عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت هات و نێوسکی وشتری فڕێ دایە سەر پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش سەری بەرز نەکردەوە (لە سوژدە)، دواتر فاتیمە هات بۆ لای لەسەر پشتی لای دا، نزای لەو کەسە کرد ئەو کارەی کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە دەسەڵاتدارانی قورەیش بگرە ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت و ئومەییەی کوڕی خەلەف یان ئوبەی کوڕی خەلەف- شوعبە گومانی هەبووە کە کامیانی فەرمووە- عەبدوڵا وتی: لە ڕۆژی بەدردا بینییانم کوژرابوون و فڕێ درابوونە نێو بیرەوە جگە لە ئومەییە یان ئوبەی نەبێت ئەندامانی جەستەی بڕا بوو، بۆیە فڕێ نەدرابۆیە نێو بیرەکەوە.

**٧٨٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ خَلَعُوا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا انْفَتَلَ قَالَ لَهُمْ: «مَا شَأْنُكُمْ خَلَعْتُمْ نِعَالَكُمْ؟» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ نَعْلَيْكَ، فَخَلَعْنَا

---

(١) صحيح.

نِعَالَنَا، فَقَالَ: «أَتَانِي آتٍ فَحَدَّثَنِي أَنَّ فِي نَعْلِي أَذًى فَخَلَعْتُهُمَا، فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَنْظُرْ فَإِذَا رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا فَلْيَمْسَحْهُمَا بِالْأَرْضِ ثُمَّ يُصَلِّي فِيهِمَا»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك نوێژی بۆ كردین نەعلەكانی داكەند و لەلای چەپی داینا، كاتێ خەڵكەكە بینییان پێغەمبەری خوا ﷺ نەعلەكانی داكەند، ئەوانیش نەعلەكانیان داكەند، كاتێ نوێژەكەی تەواو كرد پێیانی فەرموو: ئەوە چیتانە نەعلەكانتان داكەندووە؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمان بینی نەعلەكانت داكەند، ئێمەیش دامانكەند، فەرمووی: كەسێك (جبریل) هات بۆ لام هەواڵی پێ دام كە نەعلەكەم پیسی پێوەیە، منیش دامكەند، جا ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە هات بۆ مزگەوت با تەماشای نەعلەكانی بكات، ئەگەر پیسییەكی بە نەعلەكەیەوە بینی با بەزەوی بیسڕێ پاشان نوێژی پێوە بكات.

## جِمَاعُ أَبْوَابِ الْمَوَاضِعِ الَّتِي تَجُوزُ الصَّلَاةُ عَلَيْهَا، وَالْمَوَاضِعِ الَّتِي زُجِرَ عَنِ الصَّلَاةِ عَلَيْهَا

### بَابُ ذِكْرِ أَخْبَارٍ رُوِيَتْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ عَلَى الْأَرْضِ كُلِّهَا بِلَفْظٍ عَامٍّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

٧٨٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الْأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ» قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى» قَالَ: قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ «أَرْبَعُونَ سَنَةً، ثُمَّ أَيْنَ مَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ فَصَلِّ، فَهُوَ مَسْجِدٌ»[٢].

## كۆباسی ئەو جێگایانەی كە دروستە نوێژ لەسەریان بكرێ، وە ئەو جێگایانەی نوێژكردن تیایاندا سەرزەنشتكراوە

### باسی چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراونەتەوە دەربارەی ڕێگەدان بە نوێژكردن لەسەر هەموو زەوییەك بە دەستەواژەیەكی (عَام) گشتییە مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم مزگەوتێك لەسەر زەوی دروست کرا کامە بوو؟ فەرمووی: مزگەوتی حەڕام، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان کامیان؟ فەرمووی: مزگەوتی ئەقصاء، وتی: وتم: نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: چل ساڵ، پاشان لە هەر شوێنێك کاتی نوێژ هات نوێژەکەت بکە، ئەو جێگایە بۆ تۆ مزگەوتە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ وَفِي الْمَقْبَرَةِ إِذَا نُبِشَتْ

٧٨٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ، فَيُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، ثُمَّ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَى مَلَإٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءُوا، فَقَالَ: «يَا بَنِي النَّجَّارِ، ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا»، فَقَالُوا: لَا وَاللَّهِ مَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا مِنَ اللَّهِ قَالَ أَنَسٌ ﷺ فِيهِ قُبُورُ الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَتْ فِيهِ خَرِبٌ وَكَانَ فِيهِ نَخْلٌ قَالَ: فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وَبِالْخِرَبِ فَسُوِّيَتْ، وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ قَالَ فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ الْمَسْجِدِ، وَقَالَ: «اجْعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً»(١).

## باسی ڕێگەدان بە نوێژکردن لە پەچای ڕانە مەڕدا، لە گۆڕستانیش ئەگەر گۆڕەکان دەربهێنرێن

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە لەهەر جێگایەك کاتی نوێژ بهاتایە نوێژی دەکرد، وە لە پەچای ڕانەمەڕیشدا نوێژی دەکرد، پاشان فەرمانی کرد بە دروستکردنی مزگەوتێك، وتی: ناردی بە دوای پیاوماقوڵانی نەوەکانی نەجاردا، ئەوانیش هاتن، فەرمووی: ئەی نەوەکانی نەجاڕ نرخی ئەم زەوییەتانم پێ بڵێن؟ وتیان: نا بە خوا داوای نرخەکەی تەنها لە خوا دەکەین، ئەنەس ﷺ وتی: لەو زەوییەدا گۆڕی هاوبەشدانەران و کەلاوەی ڕوخاو و دارخورمای تێدا بوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد گۆڕی هاوبەشدانەران دەربهێنن، دواتر دەرهێنران، کەلاوە ڕوخاوەکانیش تەخت کران و دارخورماکانیش بڕدران، وتی: دارخورماکانیان لە پێشەوەی قیبلەی مزگەوتەکە ڕیز کرد، وتی: ئەملا و ئەولایشی بە بەرد دروست کرد.

---

(١) صحيح.

**بَابُ الزَّجْرِ عَنِ اتِّخَاذِ الْقُبُورِ مَسَاجِدَ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ فَاعِلَ ذَلِكَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ، وَفِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ قَوْلَهُ ﷺ: «أَيْنَ مَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ فَصَلِّ فَهُوَ مَسْجِدٌ» وَقَوْلَهُ: «جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا» لَفْظَةٌ عَامَّةٌ مُرَادُهَا خَاصٌّ عَلَى مَا ذَكَرْتُ. وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي قَدْ كُنْتُ أَعْلَمْتُ فِي بَعْضِ كُتُبِنَا أَنَّ الْكُلَّ قَدْ يَقَعُ عَلَى الْبَعْضِ عَلَى مَعْنَى التَّبْعِيضِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: جُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا جَمِيعَ الْأَرَضِينَ، إِنَّمَا أَرَادَ بَعْضَهَا لَا جَمِيعَهَا، إِذْ لَوْ أَرَادَ جَمِيعَهَا، كَانَتِ الصَّلَاةُ فِي الْمَقَابِرِ جَائِزَةٌ وَجَازَ اتِّخَاذُ الْقُبُورِ مَسَاجِدَ، وَكَانَتِ الصَّلَاةُ فِي الْحَمَّامِ وَخَلْفَ الْقُبُورِ فِي مَعَاطِنِ الْإِبِلِ كُلُّهَا جَائِزَةٌ، وَفِي زَجْرِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ فِي هَذَا الْمَوْضِعِ دَلَالَةٌ عَلَى صِحَّةِ مَا قُلْتُ»**

٧٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ، وَمَنْ يَتَّخِذُ الْقُبُورَ مَسَاجِدَ»[١].

**باسی سەرزەنشتکردن لەوەی گۆڕەکان بکرێن بە مزگەوت، بەڵگەش لەسەر ئەوە بکەری ئەو کارە لە خراپترینی نێو خەڵکە، ئەم دەستەواژەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە هەر شوێنێك کاتی نوێژ هات نوێژەکەت بکە ئەوە مزگەوتە. وە فەرموودەی: هەموو زەویمان بۆ کراوە بە مزگەوت. دەستەواژەیەکی (عام) گشتییە، مەبەست پێی (خاص) تایبەتە وەك باسم کرد. ئەمە لەو شێوازەیە کە لە هەندێ لە کتێبەکانماندا زانیاریم داوە وشەی (الْكُلّ) هەندێ جار بە مانای (الْبَعْض) هەندێ بەکار دێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەی: هەموو زەویمان بۆ کراوە بە مزگەوت. مەبەستی هەموو زەوی نییە، بەڵکوو مەبەستی هەندێکی بووە نەك هەمووی، ئەگەر مەبەستی هەمووی بووایە ئەوە نوێژکردن لە گۆڕستانەکان دروست دەبوو، وە دروستیش بوو گۆڕەکان بکرێن بە مزگەوت، هەروەها نوێژ لە حەمام و پشت گۆڕ و لە پەچای وشتردا هەمووی دروست بوو، جا لە سەرزەنشتکردنی پێغەمبەر ﷺ لەم شوێنەدا بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوەی وتم**

---

(١) إسناده حسن.

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لەخراپترینی خەڵکی ئەوانەن ڕۆژی دواییان بەسەردا دێت و زیندوون، هەروەها ئەوانەیشی گۆڕەکانیان کردووە بە مزگەوت.

٧٩٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، وَأُمَّ حَبِيبَةَ ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا فِي الْحَبَشَةِ، فِيهَا تَصَاوِيرُ، فَذَكَرَتَا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، دایکی سەلەمە و دایکی حەبیبە باسی کەنیسەیەکیان کرد لە زەوی حەبەشە بینیبوویان وێنەیان تێدا بوو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، فەرمووی: بێگومان ئەوان ئەگەر پیاوچاکێك لەنێویاندا بمردایە مزگەوتێکیان لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکرد، پاشان ئەو وێنانەیان تیایدا دەکێشا، ئەوانە خراپترینی بەدیهێنراوەکانن لەلای خوا.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الصَّلَاةِ فِي الْمَقَابِرِ وَالْحَمَّامِ

٧٩١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ، إِلَّا الْحَمَّامَ وَالْمَقْبَرَةَ»(٢).

## باسی سەرزەنشتکردن لە نوێژکردن لەنێو گۆڕستان و حەمام (گەرماو)

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەوی هەموو مزگەوتە جگە لە حەمام و گۆڕستان.

٧٩٢ - عَنْ يَحْيَى بْن عَمَارَةَ الأَنْصَارِيِّ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ» (٣).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) هذا الحديث اختلف فيه، وروي موصولًا ومرسلًا.

(٣) هذا الحديث اختلف فيه، وروي موصولًا ومرسلا.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الصَّلَاةِ خَلْفَ الْقُبُورِ

**٧٩٣-** عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ اللَّيْثِيِّ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ ﷺ يَقُولُ: لَا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلَا تُصَلُّوا إِلَيْهَا[1].

### باسی قەدەغەکردن لە نوێژکردن لەپشت گۆڕەکانەوە

**واتە:** واسیلەی کوڕی ئەسقەعی لەیسی دەڵێ: گوێم لە ئەبو مەرسەدی غەنەوی ﷺ بوو دەیوت: لەسەر گۆڕەکان دامەنیشن و لەلایاندا نوێژ مەکەن.

**٧٩٤-** عَنْ بُسْرِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا إِدْرِيسَ قَالَ: سَمِعْتُ وَاثِلَةَ بْنَ الْأَسْقَعِ يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الْمَرْثَدِ الْغَنَوِيَّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: بِمِثْلِهِ[2].

**واتە:** لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الصَّلَاةِ فِي مَعَاطِنِ الْإِبِلِ

**٧٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا لَمْ تَجِدُوا إِلَّا مَرَابِضَ الْغَنَمِ، وَمَعَاطِنَ الْإِبِلِ فَصَلُّوا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، وَلَا تُصَلُّوا فِي مَعَاطِنِ الْإِبِلِ» وَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْعَلَاءِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَا تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ، وَصَلُّوْا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ»[3].

### باسی قەدەغەکردنی نوێژکردن لە پەچا و مۆڵگەی وشتر

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هیچ شوێنێکتان بەدی نەکرد (بۆ نوێژکردن) جگە لە پەچای مەڕ و پەچای وشتر، ئەوە نوێژ لە پەچای

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

مەڕدا بكەن و نوێژ لە پەچای وشتردا مەكەن، موحەممەدی كوڕی عەلاء (كە یەكێكە لە گێڕەرەوەی فەرموودەكە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پەچای وشتر نوێژ مەكەن، بەڵكوو لە پەچای مەڕدا نوێژ بكەن.

**٧٩٦-** عَنْ مُحَمَّد بنِ العَلاءِ أَنْبَأَنَا يَحْيَى عَنِ أَبِي بَكْرٍ عَنْ أَبِي صَالحٍ عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ عَلَى الْمَكَانِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيهِ

**٧٩٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ رُبَّمَا صَلَّى عَلَى الْمَكَانِ الَّذِي يُجَامِعُ عَلَيْهِ[٢].

## باسی ڕێگە دراوە بە نوێژكردن لەو جێگایەی كە جیماعی تێدا دەكات

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەندێ جار لەو جێگایە نوێژی كردووە كە جیماعی تێدا دەكرد.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ سُتْرَةِ الْمُصَلِّي

## بَابُ الصَّلَاةِ إِلَى السُّتْرَةِ

**٧٩٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ رَكَزَ الْحَرْبَةَ يُصَلِّي إِلَيْهَا وَقَالَ الْأَشَجُّ: إِنَّهُ كَانَ يَرْكُزُ الْحَرْبَةَ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى هَذَا[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## کۆباسی سوترەی نوێژخوێن

## باسی نوێژکردن بەرەو سوترە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ خەنجەرەکەی داکوتا بە زەویدا و بەرەوڕووی نوێژی دەکرد (واتە: دەیکرد بە سوترە). ئەشەج -کە یەکێکە لە سەنەدی فەرموودەکە، لە ئیبنو عومەرەوە- دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خەنجەرەکەی لەپێش خۆی داکوتا. وە هیچی لەمە زیاد نەکرد.

٧٩٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُرْكَزُ لَهُ الْحَرْبَةُ، يُصَلِّي إِلَيْهَا يَوْمَ الْعِيدِ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژن خەنجەری بۆ دادەکوترا بەرەوڕووی نوێژی دەکرد (واتە: دەیکرد بە سوترە).

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الصَّلَاةِ إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ

٨٠٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُصَلِّ إِلَّا إِلَى سُتْرَةٍ، وَلَا تَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْكَ، فَإِنْ أَبَى فَلْتُقَاتِلْهُ؛ فَإِنَّ مَعَهُ الْقَرِينَ»[٢].

## باسی قەدەغەکردن لە نوێژکردن بەبێ سوترە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ مەکە تا سوترە دانەنێیت، وە مەهێڵە کەس تێپەڕ ببێت بە پێشتدا، ئەگەر هەر سەرکێشی کرد ئەوە لەگەڵی بجەنگە، چونکە ئەوە هاوەڵی شەیتانی لەگەڵە (واتە: سوور بە لەسەر گێڕانەوەی و مەهێڵە بەپێشتدا تێپەڕ بێت ئەوەندەی لە تواناتدایە، نەك بگاتە ئاستی توندوتیژی و شەڕکردن لەگەڵی و لەیەکدیدان لەسەری).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الِاسْتِتَارِ بِالْإِبِلِ فِي الصَّلَاةِ

٨٠١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى رَاحِلَتِهِ قَالَ نَافِعٌ: وَرَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ يُصَلِّي إِلَى رَاحِلَتِهِ(١).

## باسی وشتر کردنە سوترە لە نوێژدا

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ڕووە و وشترەکەی نوێژی دەکرد، نافیع وتی: ئیبنو عومەرم بینی ڕووە و وشترەکەی نوێژی دەکرد (واتە: دەیکرد بە سوترە).

٨٠٢ - عَنِ الْأَشَجِّ، وَهَارُونُ بْنُ إِسْحَاقَ، وَلَمْ يَذْكُرَا الرُّؤْيَةَ، وَقَالَا: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي. قَالَ هَارُونُ: إِلَى رَاحِلَتِهِ، وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: إِلَى بَعِيرِهِ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ يَفْعَلُهُ(٢).

واتە: ئەشەج و هارونی کوڕی ئیسحاق گێڕاویانەتەوە و باسی بینینیان نەکردووە، وتیان: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد. هارون وتی: ڕووە و (رَاحِلَتِهِ) وشترەکەی، ئەبو سەعید وتی: ڕووە و (بَعِيرِهِ) وشترەکەی، ئیبنو عومەریش ﵄ بەو شێوەیەی دەکرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالدُّنُوِّ مِنَ السُّتْرَةِ الَّتِي يَتَسَتَّرُ بِهَا الْمُصَلِّي لِصَلَاتِهِ

٨٠٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﵁ قَالَ: عن النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ، وَلْيَدْنُ مِنْهَا، لَا يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ»(٣).

## باسی فەرمانکردن بە نزیکبوونەوە لەو سوترەیەی کە نوێژخوێن دەیکاتە بەربەست بۆ نوێژەکەی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد ڕووەو سوترەیەك، با نزیك ببێتەوە لێی، (بە ئەندازەی سێ باسك) تا شەیتان نوێژەکەی پێ نەبڕێت. (واتە: تاکوو وەسوەسەی بۆ دروست نەکات و نوێژەکەی لێ تێك بدات).

## بَابُ الدُّنُوِّ مِنَ الْمُصَلَّى إِذَا كَانَ الْمُصَلِّي يُصَلِّي إِلَى جِدَارٍ

٨٠٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَبَيْنَ الْجِدَارِ قَدْرُ مَمَرِّ الشَّاةِ[1].

## باسی نزیکبوونەوە لە نوێژگە، ئەگەر نوێژخوێن ڕووە و دیوار نوێژی کرد

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: لە نێوان نوێژگەی پێغەمبەری خوا ﷺ و نێوان دیوارەکەدا ئەندازەی تێپەڕبوونی مەڕێك هەبوو (ئەندازەی نێوان نوێژخوێن و شوێنی سوژدەکەی سێ باسك بێت، وە ئەندازەی نێوان شوێنی سوژدەکەی و سوترە ئەوەیە مەڕێك بتوانێت تێپەڕ بێت).

## بَابُ ذِكْرِ الْقَدْرِ الَّذِي يَكْفِي الِاسْتِتَارُ بِهِ فِي الصَّلَاةِ بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

٨٠٥- عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ تَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، وَلَا يَضُرُّ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[2].

## باسی ئەو ئەندازەیەی کە بەسە بۆ سوترە لە نوێژدا بە دەستەواژەی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: موسای کوڕی تەلحە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد ئاژەڵەکانیش بە پێشماندا تێ دەپەڕین، پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ﷺ فەرمووی: با (سوترەکە) وەکوو ئەو دارە بێت کە سواری وشتر دەیخاتە پشتی خۆی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، با لەپێشی هەر یەکێکتان بێت، هەرچی بەپێشیدا تێ پەڕی زیانی پێ ناگەیەنێت.

٨٠٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد و لەپێشی خۆیەوە شتێکی دانا وەکوو ئەو دارەی کە سواری وشتر دەیخاتە پشتی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات ئەوە دەبێتە بەربەست بۆی.

٨٠٧- عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قُلْتُ لِعَطَاءٍ: كَمْ مُؤَخَّرَةُ الرَّحْلِ الَّذِي سَعَلَ إِنَّهُ يَسْتُرُ الْمُصَلِّيَ؟ قَالَ: قَدْرُ ذِرَاعٍ[٢].

واتە: ئیبنو جوڕەیج دەڵێ: بە عەتائم وت: ئەندازەی (بەرزی) ئەو دارەی کە سواری وشتر دەیخاتە پشتی خۆی کە دەبێتە بەربەست بۆ نوێژخوێن چەندە، وتی: باسکێکە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِالِاسْتِتَارِ بِمِثْلِ آخِرَةِ الرَّحْلِ فِي الصَّلَاةِ فِي طُولِهَا، لَا فِي طُولِهَا وَعَرْضِهَا جَمِيعًا

٨٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُجْزِئُ مِنَ السُّتْرَةِ مِثْلُ مُؤَخَّرَةِ الرَّحْلِ، وَلَوْ بِدِقِّ شَعْرَةٍ»[٣].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخَافُ أَنْ يَكُونَ مُحَمَّدُ بْنُ الْقَاسِمِ وَهِمَ فِي رَفْعِ هَذَا الْخَبَرِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَالدَّلِيلُ مِنْ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أَرَادَ مِثْلَ آخِرَةِ الرَّحْلِ فِي الطُّولِ، لَا فِي الْعَرْضِ قَائِمٌ ثَابِتٌ مِنْهُ أَخْبَارُ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُرْكَزُ لَهُ الْحَرْبَةُ يُصَلِّي إِلَيْهَا، وَعَرْضُ الْحَرْبَةِ لَا يَكُونُ كَعَرْضِ آخِرَةِ الرَّحْلِ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف جدا.



**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا فەرمانی کردووە نوێژخوێن لە کاتی نوێژەکەیدا بەربەست دابنێ بە شتێ وەکوو ئەو دارەی کە سوار دەیخاتە پشتی، مەبەستی پێی درێژی ئەو دارەیە، نەك درێژی و پانی**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەندازەی ئەو دارەی لەپشت سواری وشترەوەیە دروستە بۆ سوترە، ئەگەرچی وەکوو تەڵەقژیش باریك بێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: ئەترسم موحەممەدی کوڕی قاسم هەڵەی کردبێت لە بەرزکردنەوەی ئەم فەرموودەیە، ئەبو بەکر دەڵێ: بەڵگەش لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکوو ئەو دارەی سواری وشتر پاڵی پێوە دەدات مەبەستی لە درێژییە نەك پانی، وەك لە فەرموودەی دیکەی پێغەمبەر ﷺ جێگیر بووە خەنجەری بۆ دەچەقێنرا بە زەویدا ڕووبەڕووی نوێژی دەکرد، جا پانی خەنجەر وەکوو پانی ئەو دارە نییە کە سواری وشتر پاڵی پێوە دەدات.

٨٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَيْهَا بِالْمُصَلَّى». يَعْنِي الْعَنَزَةَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي أَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ بِالِاسْتِتَارِ بِالسَّهْمِ فِي الصَّلَاةِ، مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّهُ ﷺ أَرَادَ بِالْأَمْرِ بِالِاسْتِتَارِ بِمِثْلِ آخِرَةِ الرَّحْلِ فِي طُولِهَا، لَا فِي طُولِهَا وَعَرْضِهَا جَمِيعًا».

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە نوێژگە خەنجەری کردبوو بە سوترە و نوێژی دەکرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: وە لە فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی تیر بکرێ بە سوترە لە نوێژدا، ئەوە ڕوون بۆتەوە و جێگیر بووە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرمانکردن بە سوترە وەکوو ئەو دارەی سواری وشتر پاڵی پێوە دەدات لە درێژیدا، نەك لە درێژی و پانی پێکەوە. (الْعَنَزَة: گۆچانێکە بچووکتر لە ڕم، وە وتراوە: خەنجەرە، پێم وایە لێرەدا مەبەستی پێی خەنجەرە، خوا زاناترە).

---

(١) صحيح.

٨١٠- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ وَهُوَ أَخُو عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ سَبْرَةَ الْجُهَنِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَتِرُوا فِي صَلَاتِكُمْ وَلَوْ بِسَهْمٍ»(١).

واتە: عەبدولمەلیك کە برای عەبدولعەزیزی کوڕی سوبرەی جوهەنییە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوترە و بەربەست لە نوێژەکانتاندا دابنێن ئەگەرچی بە تیرێکیش بێت.

## بَابُ الِاسْتِتَارِ بِالْخَطِّ إِذَا لَمْ يَجِدِ الْمُصَلِّي مَا يَنْصِبُ بَيْنَ يَدَيْهِ لِلِاسْتِتَارِ بِهِ

٨١١ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَضَعْ بَيْنَ يَدَيْهِ شَيْئًا، وَقَالَ مَرَّةً تلقَاء وجهه شَيْئًا، فَإِنْ لَمْ يَجِد شَيْئًا فَلْيَنْصب عَصَا، فَإِنْ لَمْ يَجِد عَصَا فَلْيَخط خَطًّا، ثُمَّ لاَ يضره مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيهِ، وَقَالَ الجَوَازُ فَلَيَضَع تلقاء وجهه شَيْئًا، والباقي مِثْلهُ سَوَاء»(٢).

## باسی بەربەستدانان بە هێڵکێشان ئەگەر نوێژخوێن شتێکی دەست نەکەوت بیخاتە پێشی خۆی بۆ سوترە

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: باوکی قاسم ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با شتێك بخاتە پێشی خۆی (وەکوو سوترە)، جارێکی دیکە فەرمووی: شتێ بەرەورووی خۆی دابنێت، ئەگەر هیچی دەست نەکەوت ئەوە با گۆچانێك دابنێت، ئەگەر گۆچانی دەست نەکەوت با هێڵێ بکێشێ، پاشان ئیدی ئەوەی بەپێشیدا ڕۆیشت زیانی پێ ناگەیەنێت. وە (موحەممەدی کوڕی مەنصوری) جەواز (کە یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیە) وتی: (پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی): شتێك بخاتە پێشی خۆی، ئیدی ئەوەی دیکە وەکوو هەمان فەرموودە گێڕاویانەتەوە.

٨١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ..(٣)

---

(١) حديث حسن.

(٢) هذا حديث ضعيف غير صحيح أعلّ بالإختلاف وبجهالة مداره.

(٣) انظر ما تقدم.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشەوە.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْمُرُورِ بَيْنَ الْمُصَلِّي وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْوُقُوفَ مُدَّةً طَوِيلَةً انْتِظَارَ سَلَامِ الْمُصَلِّي خَيْرٌ مِنَ الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي

**٨١٣-** عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ قَالَ: أَرْسَلَنِي زَيْدُ بْنُ خَالِدٍ ﷺ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ، أَسْأَلُهُ عَنِ الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ: لَوْ كَانَ أَنْ يَقُومَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ[١].

## باسی هەڕەشەکردن لە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی ڕاوەستان بۆ ماوەیەکی درێژ تا نوێژخوێن سڵاو دەداتەوە چاکترە لە تێپەڕبوون بە بەردەمیدا

واتە: بوسری کوڕی سەعید دەڵێ: زەیدی کوڕی خالید ﷺ ناردمی بۆ لای ئەبو جوهەیم پرسیاری لێ بکەم: چی بیستووە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی بە پێش نوێژخوێندا تێ دەپەڕێ، چی لەسەری پێویستە بیکات؟ (ئەبو جوهەیم) وتی: ئەگەر چل ( ساڵ، یان چل مانگ، یان چل ڕۆژ) بوەستایە چاکتر بوو بۆی لەوەی بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت.

**٨١٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ مَا فِي الْمَشْيِ بَيْنَ يَدَيْ أَخِيهِ مُعْتَرِضًا، وَهُوَ يُنَاجِي رَبَّهُ، كَانَ أَنْ يَقِفَ فِي ذَلِكَ الْمَكَانِ مِائَةَ عَامٍ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يَخْطُوَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە بیزانیایە چی بۆ هەیە لەوەی تێ دەپەڕێ بە پێش براکەیدا، لە کاتێکدا ئەو موناجاتی پەروەردگاری دەکات، ئەوە سەد ساڵ لەو جێگایە بوەستایە پێی خۆشتر بوو لەوەی هەنگاوێك بنێت (و بە بەردەمیدا تێ پەڕێ).

---

(١) إسناده.

(٢) إسناده ضعيف

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ التَّغْلِيظَ فِي الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، إِذَا كَانَ الْمُصَلِّي يُصَلِّي إِلَى سُتْرَةٍ، وَإِبَاحَةِ الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي إِذَا صَلَّى إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ

٨١٥- عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ فَرَغَ مِنْ طَوَافِهِ، أَتَى حَاشِيَةَ الْمَطَافِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الطَّوَّافِينَ أَحَدٌ[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی هەڕەشەکردن لە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا، (واتە: بە نێوان سوژدە و سوترەدا) ئەگەر نوێژخوێن سوترەی دانابوو، وە ڕێگە دراوە بە تیپەڕبوون بەپێشی نوێژخوێن ئەگەر بەبێ سوترە نوێژی کرد

واتە: موتەلیبی کوڕی ئەبو وەداعە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی کاتێ لێ بۆیەوە لە تەوافەکەی، هاتە کەناری شوێنی تەوافەکە دوو ڕکات نوێژی کرد، لە نێوان ئەو و تەوافکاراندا هیچ کەسێك نەبوو.

## بَابُ أَمْرِ الْمُصَلِّي بِالدَّرْءِ عَنْ نَفْسِهِ الْمَارَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَإِبَاحَةِ قِتَالِهِ بِالْيَدِ إِنْ أَبَى الْمَارُّ الِامْتِنَاعَ مِنَ الْمُرُورِ، بِذِكْرِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

٨١٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي، فَلَا يَدَعَنَّ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە نوێژخوێن ئەو کەسە دوور بخاتەوە بە بەردەمیدا تێپەڕ دەبێت، وە ڕێگەدان بە جەنگکردن لەگەڵی ئەگەر سەرکێشی کرد و ویستی لەو جێگاوە تێپەڕ بێت، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با نەهێڵێ کەس بەپێشیدا تێپەڕ ببێت، ئەگەر سەرکێشی کرد ئەوە با بجەنگێت لەگەڵی، چونکە ئەوە شەیتانە.

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ الْمُصَلِّي إِلَى سُتْرَةٍ بِمَنْعِ الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَبَاحَ لَهُ مُقَاتَلَتَهُ إِذَا صَلَّى إِلَى سُتْرَةٍ، لَا إِذَا صَلَّى إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ

٨١٧- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي إِلَى سَارِيَةٍ، فَذَهَبَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَمَنَعَهُ، فَذَهَبَ لِيَعُودَ، فَضَرَبَهُ ضَرْبَةً فِي صَدْرِهِ، وَكَانَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِمَرْوَانَ، فَلَقِيَهُ مَرْوَانُ فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنْ ضَرَبْتَ ابْنَ أَخِيكَ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ فَذَهَبَ أَحَدٌ يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَمْنَعْهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ، فَإِنَّمَا ضَرَبْتَ الشَّيْطَانَ»[١].

## باسی فەرموودەیەك (مُفَسَّر) شیکەرەوەی دەستەواژە (مُجْمَل) کورت و ناڕوونەکەیە کە باسم کرد، وە ڕوونکردنەوەی ئەوەش پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا فەرمانی کردوە بە نوێژخوێن سوترە دابنێت، تا ڕێگری لە خەڵك بکات بە بەردەمیدا تێپەڕ نەبن، وە ڕێگەیشی داوە بجەنگێ لەگەڵی ئەگەر لەلای سوترەیەك نوێژی کرد، نەك نوێژ بکات بەبێ سوترە

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعید دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، ئەو نوێژی بەرەوڕووی کۆڵەکەیەك دەکرد، پیاوێك لە نەوەکانی ئومەییە بەپێشیدا تێ پەڕی ئەویش ڕێگری لێ کرد، بەڵام نەچووە دواوە، پاشان دای لەسەر سنگی، ئەو پیاوە لە نەوەکانی ئومەییە بوو، چوو بۆ مەڕوانی باس کرد، دواتر مەڕوان کە گەیشت بە ئەبو سەعید وتی: چی وای لێ کردیت بدەی لە برازاکەت؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد و شتێکی کردە بەربەست بۆ خۆی، وە کەسێکی دیکە بەپێشیدا تێپەڕ بوو با ڕێگری لێ بکات، ئەگەر سەرکەشی کرد ئەوا با لەگەڵی بجەنگێت، چونکە ئەو کەسە شەیتانە، بێگومان منیش لە شەیتانم دا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالْإِيضَاحِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَبَاحَ لِلْمُصَلِّي مُقَاتَلَةَ الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيْهِ بَعْدَ مَنْعِهِ عَنِ الْمُرُورِ مَرَّتَيْنِ، لَا فِي الِابْتِدَاءِ إِذَا أَرَادَ الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيْهِ

**٨١٨-** عَنْ أَبِي صَالِحٍ قَالَ: بَيْنَمَا أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﵁ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يُصَلِّي، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِمِثْلِ حَدِيثِ سُلَيْمَانَ بْنِ الْمُغِيرَةِ الَّذِي بَعْدَهُ فِي الْبَابِ الثَّانِي، غَيْرَ أَنَّهُ زَادَ فِيهِ: وَإِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُهُ فَأَبَى أَنْ يَنْتَهِيَ قَالَ: وَمَرْوَانُ يَوْمَئِذٍ عَلَى الْمَدِينَةِ، فَشَكَا إِلَيْهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ مَرْوَانُ لِأَبِي سَعِيدٍ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﵁: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ شَيْءٌ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَلْيَمْنَعْهُ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»[1].

## باسی فەرموودەیەك (مُفَسِّر) ڕوونكەرەوەی دەستەواژە (مُجْمَل) كورت و ناڕوونەكەیە كە باسم كرد، وە ڕوونكردنەوەی ئەوەش پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا ڕێگەی داوە بە نوێژخوێن بجەنگێ لەگەڵ ئەو كەسەی تێپەڕ دەبێت بە بەردەمیدا دوو جار ڕێگری لێ بكات لە تێپەڕبوون، نەك سەرەتا بجەنگێ ئەگەر ویستی تێپەڕ بێت بە بەردەمیدا

واتە: ئەبو صالح دەڵێ: لە كاتێكدا ئەبو سەعیدی خودری ﵁ لە ڕۆژی هەینی نوێژی دەكرد، -دواتر باسی فەرموودەكەی كرد هەر وەكوو فەرموودەكەی سولەیمانی كوڕی موغیرە كە لەدوای ئەم فەرموودەیە دێت لە باسی دووەم-، ئەوە نەبێت ئەو ئەوەی زیاد كردووە لە فەرموودەكە: من ڕێگریم كرد بەڵام ئەو هەر نكووڵی كرد لەوەی وازبهێنێ، وتی: ئەو كاتە مەڕوان كاربەدەستی مەدینە بوو، بۆیە سكاڵای لەلای ئەو كرد، جا مەڕوان ئەو كارەی بۆ ئەبو سەعید گێڕایەوە و باسی كرد، ئەبو سەعیدیش ﵁ وتی: ئەگەر شتێك تێ پەڕی بە بەردەم هەریەكێكتان با دوو جار ڕێگری لێ بكات، ئەگەر سەركێشی كرد، با لەگەڵی بجەنگێت، چونكە ئەوە شەیتانە.

---

(١) صحیح.

## بَابُ إِبَاحَةِ مَنْعِ الْمُصَلِّي مَنْ أَرَادَ الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيْهِ بِالدَّفْعِ فِي النَّحْرِ فِي الِابْتِدَاءِ

٨١٩- عَنْ أَبِي صَالِحٍ قَالَ: بَيْنَمَا أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ يُصَلِّي إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ إِذْ جَاءَهُ شَابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ، فَأَرَادَ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَهُ فِي نَحْرِهِ، فَنَظَرَ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغًا إِلَّا بَيْنَ يَدَيْ أَبِي سَعِيدٍ، فَعَادَ، فَدَفَعَهُ فِي نَحْرِهِ أَشَدَّ مِنَ الدَّفْعَةِ الْأُولَى قَالَ: فَمَثُلَ قَائِمًا، ثُمَّ نَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ خَرَجَ: فَدَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ: وَدَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَلِابْنِ أَخِيكَ جَاءَ يَشْتَكِيكَ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلْيَدْفَعْ فِي نَحْرِهِ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»[1].

### باسی ڕێگەدراوە نوێژخوێن ڕێگری لەوکەسە بکات کە دەیەوێت بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت بەوەی پاڵی گەردنی بنێت

واتە: ئەبو صالح دەڵێ: لە کاتێکدا ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە ڕۆژی هەینی نوێژی دەکرد شتێکی کردبووە سوترە بۆ خۆی، لەپڕ گەنجێك لە نەوەکانی ئەبو موعەیت هات، ویستی بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت، ئەویش پاڵی نا بە سنگیەوە و دووری خستەوە، ئەویش هیچ جێگایەکی بەدی نەکرد تێپەڕ بێت بە بەردەمی ئەبو سەعید نەبێت، دواتر گەڕایەوە، ئەویش پاڵی نا بەسنگیەوە بەهێزتر لەوەی یەکەم، وتی: ئەویش هەستایەوە و قسەی بە ئەبو سەعید وت، پاشان چوو بۆ لای مەڕوان سکاڵای لەلای کرد لەوەی ئەبو سەعید ئازاری دا، وتی: ئەبو سەعیدیش هات بۆ لای مەڕوان، مەڕوان وتی: ئەوە چیتە لەگەڵ برازاکەتدا هاتووە سکاڵات لێ دەکات؟ ئەبو سەعید ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد کەسێك ویستی بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت، با پاڵ بە ملیەوە بنێت، ئەگەر سەرکێشی کرد با لەگەڵی بجەنگێت، چونکە ئەوە شەیتانە.

---

(١) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِقَوْلِهِ: «فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ» أَيْ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ مَعَ الَّذِي يُرِيدُ الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيْهِ لَا أَنَّ الْمَارَّ مِنْ بَنِي آدَمَ شَيْطَانٌ، وَإِنْ كَانَ اسْمُ الشَّيْطَانِ قَدْ يَقَعُ عَلَى عُصَاةِ بَنِي آدَمَ. قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ﴿١١٢﴾ ﴾ الأنعام**

٨٢٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُصَلِّ إِلَّا إِلَى سُتْرَةٍ، وَلَا تَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْكَ، فَإِنْ أَبَى فَلْتُقَاتِلْهُ؛ فَإِنَّ مَعَهُ الْقَرِينَ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە فەرموودەكەی: (فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)، واتە: بێگومان ئەو كەسەی دەیەوێ بە بەردەم نوێژەكەیدا تێپەڕ بێت شەیتانی لەگەڵدایە، نەك ئەو كەسەی تێپەڕ دەبێت لە نەوەكانی ئادەم شەیتان بێت، ئەگەرچی ناوی شەیتان هەندێ جار بەكار هاتووە بۆ ئەوانەی سەرپێچی دەكەن لە نەوەكانی ئادەم، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ﴿١١٢﴾ ﴾، واتە: لە شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكە كە بەنهێنی بە یەكدی ڕادەگەیەنن وتەی ڕازاوە و بریقەدار بۆ فریودانیان**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەبێ سوترە نوێژ مەكە، ڕێگەیش مەدە بە كەسێك بە بەردەمتدا تێپەڕ بێت، ئەگەر سەركێشی كرد ئەوە لەگەڵی بجەنگە، چونكە ئەو هاوەڵی شەیتانی لەگەڵدایە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ، وَأَمَامَ الْمُصَلِّي امْرَأَةٌ نَائِمَةٌ أَوْ مُضْطَجِعَةٌ

٨٢١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ مِنَ اللَّيْلِ، وَعَائِشَةُ ﵂ مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَوْلُهُ يُسَبِّحُ مِنَ اللَّيْلِ يُرِيدُ يَتَطَوَّعُ بِالصَّلَاةِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح بالذي بعده.

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژکردن ئەگەرچی لەپێش نوێژخوێن ئافرەتێك خەوتبێ یان ڕاکشابێ

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نوێژی دەکرد، عائیشەش ﵂ لە نێوانی ئەو و قیبلەدا ڕاکشا بوو. ئەبو بەکر دەڵێ: وتەی: لە شەودا تەسبیحی دەکرد. مەبەستی ئەوە بوو نوێژ سوننەتی دەکرد.

٨٢٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي صَلَاتَهُ بِاللَّيْلِ، وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ كَاعْتِرَاضِ الْجِنَازَةِ زَادَ الْمَخْزُومِيُّ مَرَّةً: فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَخَّرَنِي بِرِجْلِهِ[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نوێژی دەکرد منیش ڕاکشا بووم لە نێوان ئەو و قیبلەدا وەکوو ڕاکشانی جەنازە. مەخزومی (کە یەکێکە لە گێڕەرەوەی فەرموودەکە) ئەوەی زیاد کرد: کاتێ بیویستایە ویتر بکات بە قاچی دووری دەخستمەوە (یان بە قاچی هەڵیدەستاندم بۆ نوێژکردن).

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ عَلَى تَوْهِينِ خَبَرِ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ «لَا تُصَلُّوا خَلْفَ النَّائِمِ وَلَا الْمُتَحَدِّثِينَ» وَلَمْ يَرْوِ ذَلِكَ الْخَبَرَ أَحَدٌ يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِهِ

٨٢٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ وَأَنَا نَائِمَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَإِذَا كَانَ الْوِتْرُ أَيْقَظَنِي[٢].

## باسی ڕوونکردنەوە لەسەر لاوازکردنی فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی کەعب: (لَا تُصَلُّوا خَلْفَ النَّائِمِ وَلَا الْمُتَحَدِّثِينَ)، واتە: نوێژ مەکەن لەپشت کەسی خەوتوو یان لەنێو ئەوانەی قسە دەکەن. کەسێك ئەو فەرموودەیەی نەگێڕاوەتەوە دروست بێت بەڵگە لە فەرموودەکەی وەربگیرێت

واتە: هیشامی کوڕی عوڕوە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا نوێژی دەکرد منیش خەوتبووم لە نێوان ئەو و قیبلەدا، جا کاتێ بیویستایە ویتر بکات بەخەبەری دەهێنامەوە.

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا كَانَ يُوقِظُهَا إِذَا أَرَادَ الْوِتْرَ لِتُوتِرَ عَائِشَةُ أَيْضًا، لَا كَرَاهَةَ أَنْ يُوتِرَ وَهِيَ نَائِمَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ

٨٢٤- وَفِي حَدِيثِ وَكِيعٍ، وَابْنِ بِشْرٍ عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، زادا: وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَيْقَظَنِي، فَأَوْتَرْتُ وَفِي حَدِيثِ بُنْدَارٍ: يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، وَفِرَاشُنَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ أَقَامَنِي فَأُوتِرُ[1].

## باسی ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە عائیشەی ڕضي الله عنها بەخەبەر دەهێنایەوە ئەگەر بیویستایە ویتری بكردایە تا عائیشەش بەهەمان شێوە ویتر بكات، نەك لەبەر ئەوە پێی باش نەبووە ویتر بكات و عائیشەش لەپێشی خەوتبێت

واتە: لە فەرموودەكەی وەكیع و ئیبنو بیشر هاتووە لە هیشامی كوڕ عوڕوە: ئەوەیان زیاد كردووە: من ڕاكشا بووم لە نێوانی ئەو و قیبلەدا، كاتێ بیویستایە ویتر بكات بەخەبەری دەهێنامەوە، منیش ویترم دەكرد. لە فەرموودەی بوندار دەڵێ: شەونوێژی دەكرد و شوێنی خەوتنمان لە نێوان ئەو و قیبلە بوو، جا كاتێک ویستبای ویتر بكات، هەڵی دەستاندم و ویترم دەكرد.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الصَّلَاةِ مُسْتَقْبِلَ الْمَرْأَةِ

٨٢٥- عَنْ عَائِشَةَ ڕضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَقُومَ أَنْسَلُّ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيَّ[2].

### باسی قەدەغەكردنی نوێژكردن بەرەوڕووی ئافرەت

واتە: عائیشە ڕضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد لە كاتێكدا من لە بەردەمیدا ڕاكشا بووم، جا كاتێ بمویستایە هەستم ئەوا بەهێواشی لەسەرخۆم پێیەكانم ڕادەكێشا و لە جێگاكەم دەهاتمە دەرەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٨٢٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رُبَّمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ وَسَطَ السَّرِيرِ، وَأَنَا عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، تَكُونُ لِي الْحَاجَةُ، فَأَنْسَلُّ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ السَّرِيرِ كَرَاهَةَ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ بِوَجْهِي(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: زۆر جار پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە نێوەڕاستی جێگای خەوتنەکە شەونوێژی دەکرد، منیش لەسەر جێگاکە بووم لە نێوانی ئەو و نێوانی قیبلە، جا کاتێ پێویستییەکەم هەبووایە ئەوا بەهێواشی لەسەرخۆم پێیەکانم ڕادەکێشا و لە جێگاکەم دەهاتمە دەرەوە، حەزم نەدەکرد ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ ڕاست ببمەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ مَنْعِ الْمُصَلِّي الشَّاةَ تُرِيدُ الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيْهِ

٨٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فَمَرَّتْ شَاةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ فَسَاعَاهَا إِلَى الْقِبْلَةِ حَتَّى أَلْزَقَ بَطْنَهُ بِالْقِبْلَةِ(٢).

## باسی ڕێگەدراوە نوێژخوێن ڕێگری بکات لە بەرخ بیەوێت بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد بەرخێك بە پێشیدا تێپەڕ بوو، بەرەو قیبلە پاڵی نا هەتا سکی لکاند بە قیبلەوە.

## بَابُ مُرُورِ الْهِرِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي إِنْ صَحَّ الْخَبَرُ مُسْنَدًا؛ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْ رَفْعِهِ

٨٢٨- عَنْ عُبَيدِ اللهِ بنِ عَبدِ المجيدِ أَنْبَأَنَا عَبْدُالرَّحْمَنِ بنِ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبيهِ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْهِرَّةُ لَا تَقْطَعُ الصَّلَاةَ، إِنَّهَا مِنْ مَتَاعِ الْبَيْتِ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف (هذا حديث معلول).

## باسی تێپەڕبوونی پشیلە بە بەردەم نوێژخوێندا، ئەگەر فەرموودەکە سەنەدەکەی ڕاست بێت، چونکە لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی بەرزکردنەوەی (رفع) بۆ لای پێغەمبەر ﷺ

واتە: عوبەیدوڵای کوڕی عەبدولمەجید دەگێڕێتەوە، عەبدوڕەحمانی کوڕی زەناد هەواڵی پێ داین لە باوکیەوە لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پشیلە نوێژ نابڕێت، چونکە لە پێویستییەکانی نێو ماڵە.

**٨٢٩-** «حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي الزِّنَادِ بِهَذَا الْحَدِيثِ مَوْقُوفًا غَيْرَ مَرْفُوعٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: ابْنُ وَهْبٍ أَعْلَمُ بِحَدِيثِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مِنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمَجِيدِ»[١]

واتە: ئیبنو وەهب لە ئیبنو ئەبو زەنادەوە ئەم فەرموودەیەی بۆمان باس کردووە بە (مَوْقُوف)ی نەك (مَرْفُوع)ی. ئەبو بەکر دەڵێ: ئیبنو وەهب زاناترە بە فەرموودەی خەڵکی مەدینە لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدولمەجید.

تێبینی:

(مَوْقُوف): بریتییە لە هەر وت و کردەوە و بێدەنگبوونێك درابێتە پاڵ هاوەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ.

(مَرْفُوع): بریتییە لە هەر وتە و کردەوە و بێدەنگبوون و سیفەتێك درابێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي مُرُورِ الْحِمَارِ وَالْمَرْأَةِ وَالْكَلْبِ الْأَسْوَدِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي بِذِكْرِ أَخْبَارٍ مُجْمَلَةٍ، قَدْ تَوَهَّمَ بَعْضُ مَنْ لَمْ يَتَبَحَّرِ الْعِلْمَ أَنَّهُ خِلَافُ أَخْبَارِ عَائِشَةَ رضي الله عنها: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ

**٨٣٠-** عَنْ عَبدِ اللهِ بن صَامَتٍ عَن أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ وَالْكَلْبُ الْأَسْوَدُ قُلْتُ: يَا أَبَا ذَرٍّ: مَا بَالُ الْكَلْبِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْأَبْيَضِ مِنَ الْأَصْفَرِ مِنَ الْأَحْمَرِ؟ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: «الْكَلْبُ الْأَسْوَدُ شَيْطَانٌ»[٢].

---

(١) إسناده ضعيف (هذا حديث معلول).

(٢) صحيح.

**باسی هەڕەشەکردن و توندکردنەوە لە تێپەڕبوونی گوێدرێژ و ئافرەت و سەگی ڕەش بە بەردەم نوێژخوێندا، بە باسکردنی فەرموودەیەکی (مُجْمَل) پوخت و ناڕوون، هەندێ لەوانەی زۆر شارەزا نین لە زانست پێی وایە پێچەوانەی فەرموودەکەی عائیشەیە ﵂ کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد منیش ڕاکشا بووم لە نێوان ئەو و قیبلەدا**

واتە: عەبدوڵای کوڕی صامیت دەگێڕێتەوە لە ئەبو زەڕەوە ﵁ دەڵێ: گوێدرێژ و ئافرەت و سەگی ڕەش نوێژ دەبڕن، وتم: ئەی ئەبو زەڕ: سەگی ڕەش چی جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ زەرد و سوور؟ وتی: ئەی برازم پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وەکوو چۆن پرسیارت لێ کردم، فەرمووی: سەگی ڕەش شەیتانە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ هَذَا الْخَبَرَ فِي ذِكْرِ الْمَرْأَةِ لَيْسَ مُضَادٌّ خَبَرِ عَائِشَةَ ﵂ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ أَنَّ مُرُورَ الْكَلْبِ وَالْمَرْأَةِ وَالْحِمَارِ يَقْطَعُ صَلَاةَ الْمُصَلِّي لَا ثَوَى الْكَلْبِ وَلَا رَبْضَهُ وَلَا رَبْضَ الْحِمَارِ، وَلَا اضْطِجَاعَ الْمَرْأَةِ يَقْطَعُ صَلَاةَ الْمُصَلِّي، وَعَائِشَةُ إِنَّمَا أَخْبَرَتْ أَنَّهَا كَانَتْ تَضْطَجِعُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، لَا أَنَّهَا مَرَّتْ بَيْنَ يَدَيْهِ**

**٨٣١-** عَنْ عَبدِ اللهِ ابن صَامَتٍ عَن أَبِي ذَرٍّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُعَادُ الصَّلَاةُ مِنْ مَمَرِّ الْحِمَارِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْكَلْبِ الْأَسْوَدِ» قُلْتُ: مَا بَالُ الْأَسْوَدِ مِنَ الْكَلْبِ الْأَصْفَرِ، مِنَ الْكَلْبِ الْأَحْمَرِ، فَقَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَقَالَ: «الْكَلْبُ الْأَسْوَدُ شَيْطَانٌ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەم فەرموودەیەی سەبارەت بە باسی ئافرەت هاتووە پێچەوانەی فەرموودەکەی عائیشە ﵂ نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە بووە تێپەڕبوونی سەگ و ئافرەت و گوێدرێژ نوێژی نوێژخوێن دەبڕێ، نەک ڕاکشانی سەگ یان ڕاکشانی گوێدرێژ، وە نە ڕاکشانی ئافرەت نوێژی نوێژخوێن دەبڕێ، عائیشە هەواڵی داوە ئەو لەبەردەمی پێغەمبەر ﷺ ڕادەکشا لە کاتێکدا ئەو نوێژی دەکرد، نەک ئەو تێ دەپەڕی بە بەردەمیدا**

---

(١) صحيح.

واتە: عەبدوڵای کوڕی صامیت دەگێڕێتەوە لە ئەبو زەڕەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژ دووبارە دەکرێتەوە لە تێپەڕبوونی گوێدرێژ و ئافرەت و سەگی ڕەش (بە بەردەم نوێژخوێندا)، وتم: ئەی سەگی ڕەش چی جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ سەگی زەرد و سەگی سوور؟ ئەویش وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد وەکوو چۆن پرسیارت لێ کردم، فەرمووی: سەگی ڕەش شەیتانە.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَرَادَ بِالْمَرْأَةِ الَّتِي قَرَنَهَا إِلَى الْكَلْبِ الْأَسْوَدِ وَالْحِمَارِ وَأَعْلَمَ أَنَّهَا تَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْحَائِضَ دُونَ الطَّاهِرِ، وَهَذَا مِنْ أَلْفَاظِ الْمُفَسَّرِ كَمَا فَسَّرَ خَبَرَ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ فِي ذِكْرِ الْكَلْبِ فِي خَبَرِ أَبِي ذَرٍّ، فَأَجْمَلَ ذِكْرَ الْكَلْبِ فِي خَبَرِ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ فَقَالَ: يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ. وَبَيَّنَ فِي خَبَرِ أَبِي ذَرٍّ أَنَّ الْكَلْبَ الَّذِي يَقْطَعُ الصَّلَاةَ هُوَ الْأَسْوَدُ دُونَ غَيْرِهِ، وَكَذَلِكَ بَيَّنَ فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ الْمَرْأَةَ الْحَائِضَ هِيَ الَّتِي تَقْطَعُ الصَّلَاةَ دُونَ غَيْرِهَا**

**٨٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْكَلْبُ، وَالْمَرْأَةُ الْحَائِضُ» (١).

**باسی ڕوونکردنەوە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ باسی ئافرەتی کرد لەگەڵ سەگی ڕەش و گوێدرێژ، وە زانیاری دا ئافرەت نوێژ دەبڕێ، مەبەستی ئافرەتی حەیزدار بوو نەك پاك، ئەمەش لە دەستەواژە شیکەرەوەکانە وەك چۆن فەرموودەکەی ئەبو زەڕ فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و عەبدوڵای کوڕی موغەفەل ﷺ شی کردۆتەوە لە باسی سەگدا، جا باسی سەگ بەکورتی و ناڕوونی هاتووە لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە و عەبدوڵای کوڕی موغەفەل فەرموویەتی: سەگ و گوێدرێژ و ئافرەت نوێژ دەبڕن. بەڵام فەرموودەکەی ئەبو زەڕ ڕوونی کردۆتەوە، ئەو سەگەی نوێژ دەبڕێ سەگی ڕەشە نەك جگە لە ڕەش، هەروەها لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس ڕوونی کردۆتەوە: ئافرەتی حەیزدار نوێژ دەبڕێ نەك جگە لە حەیزدار**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەریەك لە سەگ و ئافرەتی حەیزدار نوێژ دەبڕێ.

---

(١) إسناده صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ رُوِيَ فِي مُرُورِ الْحِمَارِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي قَدْ يَحْسِبُ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّهُ خِلَافُ خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ: يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْحِمَارُ وَالْكَلْبُ وَالْمَرْأَةُ

**٨٣٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جِئْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ وَنَحْنُ عَلَى أَتَانٍ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِعَرَفَةَ، فَمَرَرْنَا عَلَى بَعْضِ الصُّفُوفِ، فَنَزَلْنَا عَنْهَا، وَتَرَكْنَاهَا تَرْتَعُ، فَلَمْ يَقُلْ لَنَا شَيْئًا[١].

## باسی فەرموودەیەك گێڕدراوەتەوە سەبارەت بە تێپەڕبوونی گوێدرێژ بە بەردەم نوێژخوێندا، هەندێ لە زانایان وا دەزانن پێچەوانەی فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ کەفەرموویەتی: هەریەك لە گوێدرێژ و سەگ و ژن نوێژ دەبڕێ

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: من و فەزل بەسەر گوێدرێژێکەوە هاتین، پێغەمبەریش ﷺ لە عەرەفە نوێژی بۆ خەڵك دەکرد، بەلای هەندێ لە ڕیزەکان تێ پەڕین، دواتر دابەزینە خوارەوە و وازمان لە گوێدرێژەکە هێنا بۆ خۆی بلەوەڕێ، پێغەمبەر ﷺ هیچی پێیان نەفەرموو.

**٨٣٤-** عَنْ مَالِكٍ، فِي خَبَرِ مَعْمَرٍ: وَمَرَّتِ الْأَتَانُ بَيْنَ يَدَيِ النَّاسِ، فَلَمْ يَقْطَعْ عَلَيْهِمُ الصَّلَاةَ، وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ مَالِكٍ: وَأَنَا عَلَى حِمَارٍ فَتَرَكْتُهُ بَيْنَ الصَّفِّ، وَدَخَلْتُ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمْ يَعِبْ عَلَيَّ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَيْسَ فِي هَذَا الْخَبَرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى الْأَتَانَ تَمُرُّ، وَلَا تَرْتَعُ بَيْنَ يَدَيِ الصُّفُوفِ، وَلَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُعْلِمَ بِذَلِكَ فَلَمْ يَأْمُرْ مَنْ مَرَّتِ الْأَتَانُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِعَادَةِ الصَّلَاةِ، وَالْخَبَرُ ثَابِتٌ صَحِيحٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الْكَلْبَ الْأَسْوَدَ، وَالْمَرْأَةَ الْحَائِضَ، وَالْحِمَارَ، يَقْطَعُ الصَّلَاةَ وَمَا لَمْ يَثْبُتْ خَبَرٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِضِدِّ ذَلِكَ لَمْ يَجُزِ الْقَوْلُ وَالْفُتْيَا بِخِلَافِ مَا ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

واتە: مالیك دەگێڕێتەوە لە فەرموودەی مەعمەڕدا هاتووە: گوێدرێژەکە بە نێوان خەڵکەکە تێ پەڕی نوێژی پێیان نەبڕی. وە لە فەرموودەی عەبدوڕەحماندا هاتووە لە مالیکەوە: من بەسەر گوێدرێژێکەوە بووم لە نێوان ڕیزەکاندا وازم لێی هێنا و چوومە ڕیزی نوێژەوە، هیچ ڕەخنەی لێ نەگرتم.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا باسی ئەوەی نەکردووە پێغەمبەر ﷺ گوێدرێژەکەی بینی تێ دەپەڕی، یان لە نێوان ڕیزەکاندا دەلەوەڕا، یان پێغەمبەر ﷺ ئاگادار کرابێتەوە و فەرمانی نەکردبێت بەو کەسەی گوێدرێژ بە بەردەمیدا تێ پەڕی نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، جا فەرموودەی جێگیر و ڕاست هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە سەگی ڕەش و ئافرەتی حەیزدار و گوێدرێژ نوێژ دەبڕێ، جا مادام فەرموودەیەك بە پێچەوانەی ئەمە لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگیر نەبووە، ئەوە دروست نییە بە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاست و جێگیر لە پێغەمبەرەوە ﷺ فتوا بدرێ.

**٨٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جِئْتُ أَنَا وَغُلَامٌ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ عَلَى حِمَارٍ، أَوْ حِمَارَيْنِ، فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، فَلَمْ يَنْصَرِفْ، وَجَاءَتْ جَارِيَتَانِ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَأَخَذَتَا بِرُكْبَتَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَفَرَعَ - «أَوْ فَرَّقَ - «بَيْنَهُمَا، وَلَمْ يَنْصَرِفْ»[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَيْسَ فِي هَذَا الْخَبَرِ أَنَّ الْحِمَارَ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّمَا قَالَ: فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ تَدُلُّ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ مَرَّ بَيْنَ يَدَيِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدَ نُزُولِهِ عَنِ الْحِمَارِ، لِأَنَّهُ قَالَ: فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي.

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: من و منداڵێکی نەوەکانی هاشم هاتین بەسەر گوێدرێژێکەوە یان دوو گوێدرێژ، دواتر بە پێشی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕۆیشتم ئەو نوێژی دەکرد، وازی نەهێنا لە نوێژەکەی، دوو کچی منداڵ لە نەوەکانی عەبدولموتەلیب (بەشەڕ هاتبوون) هاتن ئەژنۆی پێغەمبەری خوایان ﷺ گرت، ئەویش لە یەکدی جیای کردنەوە و وازی لە نوێژەکەی نەهێنا.

ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا ئەوەی تێدا نییە گوێدرێژەکە بە بەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕ بووبێت، بەڵکوو دەڵێ: بە پێشی پێغەمبەری خوادا ﷺ تێ پەڕیم ئەو نوێژی دەکرد، ئەم دەستەواژەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیبنو عەباس بە پێشی پێغەمبەری خوادا ﷺ تێ پەڕی دوای دابەزینی لەسەر گوێدرێژەکە، چونکە وتی: بە پێشی پێغەمبەری خوادا ﷺ تێ پەڕیم ئەو نوێژی دەکرد.

---

(١) صحيح.

**٨٣٦-** «إِلَّا أَنَّ عُبَيْدَ اللَّهِ بْنَ مُوسَى رَوَاهُ عَنْ شُعْبَةَ قَالَ: فَمَرَرْنَا بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ نَزَلْنَا فَدَخَلْنَا مَعَهُ فِي الصَّلَاةِ»(١).

**واتە: ئەوە نەبێت عوبەیدوڵای کوڕی موسا گێڕاویەتەوە لە شوعبەوە دەڵێ: بە بەردەمیدا تێپەڕین، پاشان دابەزین و لەگەڵیدا چووینە نێو نوێژەوە.**

**٨٣٧-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَذَا الْخَبَرُ ظَاهِرُهُ كَخَبَرِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ الْحِمَارَ إِنَّمَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، لَا بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَيْسَ فِيهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَلِمَ بِذَلِكَ، فَإِنْ كَانَ فِي الْخَبَرِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَلِمَ بِمُرُورِ الْحِمَارِ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ مَنْ كَانَ خَلْفَهُ فَجَائِزٌ أَنْ تَكُونَ سُتْرَةُ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ سُتْرَةً لِمَنْ خَلْفَهُ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ كَانَ يَسْتَتِرُ بِالْحَرْبَةِ إِذَا صَلَّى بِالْمُصَلَّى، وَلَوْ كَانَتْ سُتْرَتُهُ لَا تَكُونُ سُتْرَةً لِمَنْ خَلْفَهُ لَاحْتَاجَ كُلُّ مَأْمُومٍ أَنْ يَسْتَتِرَ بِحَرْبَةٍ، كَاسْتِتَارِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَا، فَحَمْلُ الْعَنَزَةِ لِلنَّبِيِّ ﷺ يَسْتَتِرُ بِهَا دُونَ أَنْ يَأْمُرَ الْمَأْمُومِينَ بِالِاسْتِتَارِ خَلْفَهُ كَالدَّالِ عَلَى أَنَّ سُتْرَةَ الْإِمَامِ تَكُونُ سُتْرَةً لِمَنْ خَلْفَهُ(٢).

**واتە: ئەبو بەکر دەڵێ ئەم فەرموودەیە ڕواڵەتەکەی وەکوو فەرموودەکەی عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵایە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ: گوێدرێژەکە بە بەردەم هاوەڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕ بوو نەك بە بەردەم پێغەمبەر ﷺ. هیچ بەڵگەیەکی تێدا نییە پێغەمبەر ﷺ بەوەی زانیبێت، ئەگەر لە فەرموودەکەدا ئەوە هاتبێت پێغەمبەر ﷺ زانیبێتی بە تێپەڕبوونی گوێدرێژەکە بە بەردەمی هەندێ لەوانەی لە پشتیەوە بوون، ئەوە دروستە سوترەی پێغەمبەر ﷺ ببێتە سوترەی ئەوانەی لە پشتیەوە نوێژیان دەکرد، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە نوێژگە نوێژی بکردایە خەنجەری دەکرد بە سوترە، ئەگەر سوترەی پێغەمبەر ﷺ نەبووایەتە سوترە بۆ ئەوانەی پشتەوەی ئەوە پێویست بوو هەر نوێژخوێنێك خەنجەرێکی بۆ خۆی بکردایە بە سوترە، وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ کردی، جا کە پێغەمبەر ﷺ خەنجەرێکی کردە سوترە بۆ خۆی بەبێئەوەی فەرمان بە نوێژخوێنانی پشتەوەی بکات سوترە دابنێن، وەکوو بەڵگە وایە سوترەی پێشنوێژ سوترەیە بۆ دواوەوەی خۆی.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٨٣٨-** عَنِ عَبْد الكَرِيم أَنَّ مُجَاهِدَا أَخْبَرَهُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جِئْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ عَلَى أَتَانٍ، فَمَرَرْنَا بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَةَ وَهُوَ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ، لَيْسَ شَيْءٌ يَسْتُرُهُ، يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ(١).

**واته:** عەبدولکەریم دەگێڕێتەوە موجاهید هەواڵی پێ داوە لە ئیبنو عەباسەوە ﵄ دەڵێ: من و فەزل بە گوێدرێژێك هاتین، بە بەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕ بووین لە عەرەفە، لەو کاتەدا نوێژی فەرزی دەکرد، شتێك نەبوو ببێتە بەربەست و سوترە لە نێوان ئێمە و ئەودا.

**٨٣٩-** قَالَ أَبو بَكر وَغَيْرُ جَائِز أَن يحتج بعبد الكريم عَنْ مُجَاهِد عَلَى الزُّهْرِي عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَهَذِهِ اللَّفْظَةُ قَدْ رُوِيَتْ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ خِلَافَ هَذَا الْمَعْنَى» (٢).

**واته:** ئەبو بەکر دەڵێ: دروست نییە گێڕانەوەی عەبدولکەریم لە موجاهید بە بەڵگە وەربگیرێ لەسەر زوهری لە عوبەیدوڵای کوڕی عەبدوڵا، ئەم دەستەواژایە لە ئیبنو عەباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە بە پێچەوانەی ئەم واتایە.

**٨٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: رُكِزَتِ الْعَنَزَةُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِعَرَفَاتٍ، فَصَلَّى إِلَيْهَا، وَالْحِمَارُ مِنْ وَرَاءِ الْعَنَزَةِ(٣).

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذَا الْخَبَرُ مُضَادُّ خَبَرِ عَبْدِ الْكَرِيمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ؛ لِأَنَّ فِي هَذَا الْخَبَرِ أَنَّ الْحِمَارَ إِنَّمَا كَانَ وَرَاءَ الْعَنَزَةِ، وَقَدْ رَكَزَ النَّبِيُّ ﷺ الْعَنَزَةَ بَيْنَ يَدَيْهِ بِعَرَفَةَ، فَصَلَّى إِلَيْهَا، وَفِي خَبَرِ عَبْدِ الْكَرِيمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: وَهُوَ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ لَيْسَ شَيْءٌ يَسْتُرُهُ يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ، وَخَبَرُ عَبْدِ الْكَرِيمِ، وَخَبَرُ الْحَكَمِ بْنِ أَبَانَ قَرِيبٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ؛ لِأَنَّ عَبْدَ الْكَرِيمِ قَدْ تَكَلَّمَ أَهْلُ الْمَعْرِفَةِ بِالْحَدِيثِ فِي الِاحْتِجَاجِ بِخَبَرِهِ، وَكَذَلِكَ خَبَرِ الْحَكَمِ بْنِ أَبَانَ، غَيْرَ أَنَّ خَبَرَ الْحَكَمِ بْنِ أَبَانَ تُؤَيِّدُهُ أَخْبَارٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ صِحَاحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ وَخَبَرُ عَبْدِ الْكَرِيمِ عَنْ مُجَاهِدٍ يَدْفَعُهُ أَخْبَارٌ صِحَاحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَهَذَا الْفِعْلُ الَّذِي ذَكَرَهُ عَبْدُ الْكَرِيمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَدْ ثَبَتَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَدْ زَجَرَ عَنْ مِثْلِ هَذَا الْفِعْلِ فِي خَبَرِ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ، وَلْيَدْنُ مِنْهَا، لَا يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ».

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: خەنجەرێك داكوترابوو لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات، نوێژی لەلای كرد، گوێدرێژەكەش لەپشت خەنجەرەكەوە بوو.

ئەبو بەكر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەكەی عەبدولكەریمە لە موجاهیدەوە (فەرموودەی ژمارە ٨٣٨) چونكە لەم فەرموودەیەدا گوێدرێژەكە لەپشت خەنجەرەكەوە بوو، پێغەمبەر ﷺ خەنجەری لە بەردەمی خۆی دانا لە عەرەفە، دواتر نوێژی لەلای كرد، وە لە فەرموودەكەی عەبدولكەریم لە موجاهیدەوە وتی: ئەو نوێژی فەرزی دەكرد، شتێك نەبوو ببێتە بەربەست و سوترە لە نێوان ئێمە و ئەودا. جا فەرموودەكەی عەبدولكەریم و فەرموودەكەی حەكەمی كوڕی ئەبان نزیكن لە یەكدییەوە لە ڕووی گواستنەوەوە، چونكە عەبدولكەریم شارەزایانی فەرموودەناس قسەیان لەسەر وەرگرتنی فەرموودەی كردووە، بەهەمان شێوە فەرموودەی حەكەمی كوڕی ئەبانیش، ئەوە نەبێت فەرموودەی حەكەمی كوڕی ئەبان، كۆمەڵە فەرموودەیەكی ڕاست لە ڕووی گواستنەوە پشتگیری لێ دەكەن، وە فەرموودەكەی عەبدولكەریم لە موجاهیدەوە كۆمەڵە فەرموودەیەكی ڕاست لە ڕووی گواستنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕووبەڕووی دەوەستنەوە، وە ئەم كردارەی كە عەبدولكەریم باسی كردووە لە موجاهید لە ئیبنو عەباسەوە، جێگیر بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو سەرزەنشتی ئەو كردارەی كردوە لە فەرموودەی سەهلی كوڕی حەسمە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە نوێژی كرد با ڕووەو سوترەیەك نوێژ بكات، وە با نزیك ببێتەوە لێی، تا شەیتان نوێژەكەی پێ نەبڕێت.

**٨٤١**- وَفِي خَبَرِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «اسْتَتِرُوا فِي صَلَاتِكُمْ وَلَوْ بِسَهْمٍ» وَفِي خَبَرِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ، وَلْيَدْنُ مِنْهَا». قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَهَذِهِ الْأَخْبَارُ كُلُّهَا صِحَاحٌ، قَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ الْمُصَلِّيَ أَنْ يَسْتَتِرَ فِي صَلَاتِهِ وَزَعَمَ عَبْدُ الْكَرِيمِ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ، وَهُوَ فِي فَضَاءٍ؛ لِأَنَّ عَرَفَاتٍ لَمْ يَكُنْ بِهَا بِنَاءٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَسْتَتِرُ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَقَدْ زَجَرَ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الْمُصَلِّي إِلَّا إِلَى سُتْرَةٍ. وَفِي خَبَرِ صَدَقَةَ بْنِ يَسَارٍ، سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُصَلُّوا إِلَّا إِلَى سُتْرَةٍ» وَقَدْ زَجَرَ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الْمُصَلِّي إِلَّا إِلَى سُتْرَةٍ، فَكَيْفَ يَفْعَلُ مَا يَزْجُرُ عَنْهُ

ﷺ؟ وَفِي خَبَرِ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ، كَالدَّالِ عَلَى أَنَّ الْحِمَارَ إِذَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي وَلَا سُتْرَةَ بَيْنَ يَدَيْهِ ضَرَّهُ مُرُورُ الْحِمَارِ بَيْنَ يَدَيْهِ»[١].

**واتە: وە لە فەرموودەکەی ڕەبیعی کوڕی سوبرەی جوهەنی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ: سوترە بۆ نوێژەکانتان دابنێن ئەگەرچی بە تیرێکیش بێت. وە لە فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودری لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با لەلای سوترەیەك نوێژ بکات، وە لێی نزیك بێتەوە. ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودانە هەموویان ڕاست و دروستن، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە نوێژخوێن لە نوێژەکەیدا سوترە دابنێت، بەڵام عەبدولکەریم لە موجاهید لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ وا گومان دەبات پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد بەبێ سوترە، ئەو لەدەشتدا بوو، چونکە عەڕەفە خانووی تێدا نەبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تا پێغەمبەر ﷺ بیکاتە سوترە بۆ نوێژەکەی، بێگومان پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە نوێژخوێن بەبێ سوترە نوێژ بکات، ئیدی چۆن خۆی کردەوەیەك دەکات کە سەرزەنشتی کردووە؟ وە فەرموودەکەی موسای کوڕی تەلحە وەکوو بەڵگە وایە لەسەر ئەوەی گوێدرێژ ئەگەر بە بەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ بوو سوترە لە بەردەمیدا نەبوو ڕۆیشتنی گوێدرێژ بە بەردەمیدا زیانی پێ دەگەیەنێ.**

**٨٤٢** - عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي وَالدَّوَابُّ تَمُرُّ بَيْنَ أَيْدِينَا، فَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ يَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[٢].

**واتە: موسای کوڕی تەلحە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە نوێژمان دەکرد ئاژەڵەکانیش بە پێشماندا تێ دەپەڕین، پرسیارمان کرد لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با (سوترەکە) وەکو ئەو دارە بێت کە سواری وشتر دەیخاتە پشتی خۆی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، با لەپێشی یەکێکتان بێت، هەرچی بە پێشیدا تێ پەڕی زیانی پێ ناگەیەنێت.**

**٨٤٣**- عَنْ مُوسَى بْنِ طَلْحَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِيَجْعَلْ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤَخِّرَةِ الرَّحْلِ، ثُمَّ لَا يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَفِي قَوْلِهِ ﷺ: «مِثْلُ مُؤَخِّرَةِ الرَّحْلِ يَكُونُ بَيْنَ يَدَيْ أَحَدِكُمْ، ثُمَّ لَا يَضُرُّهُ مَا مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ» دَلَالَةٌ وَاضِحَةٌ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ مُؤَخِّرَةِ الرَّحْلِ ضَرَّهُ مُرُورُ الدَّوَابِّ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَالدَّوَابُّ الَّتِي تَضُرُّ مُرُورُهَا بَيْنَ يَدَيْهِ هِيَ الدَّوَابُّ الَّتِي أَعْلَمَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهَا تَقْطَعُ الصَّلَاةَ، وَهُوَ الْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ الْأَسْوَدُ، عَلَى مَا أَعْلَمَ الْمُصْطَفَى ﷺ، لَا غَيْرَهُمَا مِنَ الدَّوَابِّ الَّتِي لَا تَقْطَعُ الصَّلَاةَ».

واتە: موسای کوڕی تەلحە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هەر یەکێك لە ئێوە لە پێشی خویدا شتێکی دانا وەکوو ئەو دارەی کە سواری وشتر دەیخاتە پشتی خۆی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، پاشان هەرچی بە بەردەمیدا بڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت.

ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: وەکو ئەو دارەی کە سواری دەیخاتە پشتی خۆی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، لە پێشی هەر یەکێکتانەوە بێت، پاشان هەرچی بە بەردەمیدا بڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت. بەڵگەیەکی ڕوونە ئەگەر لەپێشی خۆی سوترەیەك دانەنێت وەکوو ئەو دارەی سواری وشتر دەیخاتە پشتی خۆی بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، ئەوە تێپەڕبوونی ئاژەڵ بە بەردەمیدا زیانی پێ دەگەیەنێت، وە ئەو ئاژەڵانەی کە تێپەڕبوونیان بە بەردەم نوێژخوێندا زیان دەگەیەنن ئەو ئاژەڵانەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە ئەوانە نوێژ دەبڕن، ئەویش گوێدرێژ و سەگی ڕەشە، وەك پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە نەك غەیری ئەوان لەو ئاژەڵانەی نوێژ نابڕن.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الصَّلَاةِ وَبَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي ثِيَابٌ فِيهَا تَصَاوِيرُ

٨٤٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهُ كَانَ لَهَا ثَوْبٌ فِيهِ تَصَاوِيرُ مَمْدُودَةٌ إِلَى سَهْوَةٍ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَخِّرِيهِ عَنِّي، فَأَخَذَتْهُ، فَجَعَلَتْهُ وَسَائِدَ[١].

## باسی کەڕاهەتی هەیە نوێژخوێن نوێژ بکات و لە کاتی نوێژەکەیدا پۆشاکێك لە پێشییەوە هەبێت وێنەی تێدا بێت

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، لەماڵەکەیدا پارچە قوماشێك هەبوو وێنەی تێدا بوو کردبووی بە پەردە بۆ تاقەکە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەرەوڕووی دەکرد، فەرمووی: ئەی عائیشە دووری بخەرەوە لێم، منیش پارچە پارچەم کرد و کردم بە چەند سەرینێك.

---

(١) صحيح.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْكَلَامِ الْمُبَاحِ فِي الصَّلَاةِ وَالدُّعَاءِ وَالذِّكْرِ، وَمَسْأَلَةِ الرَّبِّ عَزَّ وَجَلَّ وَمَا يُضَاهِي هَذَا وَيُقَارِبُهُ

### بَابُ إِبَاحَةِ الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ

**٨٤٥-** عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي»(١).

## کۆباسی ئەو وتانەی ڕێگەیانپێدراوە لەنێو نوێژ، وەکوو پاڕانەوە و زیکر و یادکردنەوە و داواکردن لە پەروەردگار ﷻ و ئەوەیشی هاوشێوە و نزیک بێت لەوانەوە

### باسی ڕێگەدان بە نزا و پاڕانەوە لەنێو نوێژدا

واتە: ئەبو بەکری صدیق ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: نزا و پاڕانەوەیەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا پێی بپاڕێمەوە.

**٨٤٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، وَفِي بَيْتِي قَالَ: قُلِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»(٢).

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: نزا و پاڕانەوەیەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا و لە ماڵەکەمدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: بڵێ: خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە ستەمێکی زۆر، کەس لە گوناه خۆش نابێ مەگەر تۆ، لێم خۆش بە بە لێخۆشبوونێك لەلایەن خۆتەوە و ڕەحمم پێ بکە، بەڕاستی تۆ لێخۆشبووی میهرەبانیت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

٨٤٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾ النصر، إِلَى آخِرِهَا مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى صَلَاةً إِلَّا قَالَ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾، تا کۆتاییەکەی، پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینی نوێژێ بکات ئیللا دەیفەرموو: خوایە پاکی و بێگەردی و ستاییش هەر بۆ تۆیە، ئەی خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم.

٨٤٨- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَغْدُو إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَجِيءُ الرَّجُلُ، وَتَجِيءُ الْمَرْأَةُ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ أَقُولُ إِذَا صَلَّيْتُ؟ قَالَ: قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَعَافِنِي، وَارْزُقْنِي، فَقَدْ جُمِعَ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتُكَ[٢].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشجەعی دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁ دەڵێ: ئێمە بەیانیان دەکردەوە دەهاتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەم پیاو و هەم ئافرەت، جا دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بڵێم لە نوێژدا کاتێ نوێژم کرد؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە لێم خۆش بە و بەزەییت پێمدا بێتەوە و ڕێنماییم بکە و لەشساغ و سەلامەتم بکە و ڕزق و ڕۆزیم بدە، ئەوە دنیا و دواڕۆژی بۆت کۆ کردۆتەوە.

## بَابُ مَسْأَلَةِ الرَّبِّ جَلَّ وَعَلَا فِي الصَّلَاةِ مُحَاسَبَةً يَسِيرَةً، إِذِ الْمُحَاسَبَةُ بِجَمِيعِ ذُنُوبِهِ وَالْمُنَاقَشَةُ بِهَا تُهْلِكُ صَاحِبَهَا

٨٤٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي بَعْضِ صَلَاتِهِ: «اللَّهُمَّ حَاسِبْنِي حِسَابًا يَسِيرًا» فَلَمَّا انْصَرَفَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْحِسَابُ الْيَسِيرُ قَالَ: «يَنْظُرُ فِي كِتَابِهِ وَيَتَجَاوَزُ لَهُ عَنْهُ،إِنَّهُ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَوْمَئِذٍ، يَا عَائِشَةُ، هَلَكَ، وَكُلُّ مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ يُكَفِّرُ اللَّهُ بِهِ عَنْهُ، حَتَّى الشَّوْكَةُ تَشُوكُهُ» جَمِيعُهُمَا لَفْظًا وَاحِدًا»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) هذا الحديث بهذا التمام تفرد به ابن اسحاق، وجزء الأخير صحيح، أما أوله وهو قوله: (اللهم حاسبني حساباً يسيراً) فهي لفظة لا أعلم أحداً تابع فيها محمد بن اسحاق، وهي منكرة، ولا تحتمل عليه.

## باسی داواکردن لە پەروەردگار لە نوێژدا بەوەی لێپرسینەوەی ئاسانی لەگەڵ بکات، چونکە لێپرسینەوە و لێپێچینەوە لە هەموو گوناهەکان خاوەنەکەی لەناو دەبات

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێ لە نوێژەکانیدا دەیفەرموو: خوایە لێپرسینەوەم لەگەڵ بکەی لێپرسینەوەیەکی ئاسان، کاتێ نوێژی تەواو کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لێپرسینەوەی ئاسان چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە تەماشای خراپەکانی دەکات و چاوپۆشی لێ دەکات بۆی، چونکە هەر کەسێك مشتومڕی لەگەڵ بکرێت لەو ڕۆژەدا لەناو چووە، ئەی عائیشە، هەر شتێك تووشی بڕوادار ببێت دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانی، تەنانەت ئەگەر دڕکێکیش پێیدا بچێت.

## بَابُ إِبَاحَةِ التَّسْبِيحِ وَالتَّحْمِيدِ وَالتَّكْبِيرِ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ إِرَادَةِ الْمَرْءِ مَسْأَلَةَ حَاجَةٍ يَسْأَلُهَا رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَا يُرْجَى فِي ذَلِكَ مِنَ الِاسْتِجَابَةِ

٨٥٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ ﵂ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَلِّمْنِي كَلِمَاتٍ أَدْعُو بِهِنَّ فِي صَلَاتِي قَالَ: «سَبِّحِي اللَّهَ عَشْرًا، وَاحْمَدِيهِ عَشْرًا، وَكَبِّرِيهِ عَشْرًا، ثُمَّ سَلِيهِ حَاجَتَكِ يَقُلْ: نَعَمْ، نَعَمْ»(١).

## باسی ڕێگەدان بە تەسبیح (سبحان الله) و تەحمید (الحمد لله) و تەکبیر (الله أكبر)کردن لە نوێژدا، کاتێ بەندە بیەوێت داوای شتێ لە پەروەردگاری بکات، وە ئەوەشی ئومێدی پێ دەکرێ لەو پاڕانەوە لە وەرگرتن

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێ: دایکی سولەیم ﵂ هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کۆمەڵە وشەیەکم فێر بکە لە نوێژەکانمدا نزای پێ بکەم؟ فەرمووی: دە جار (سبحان الله) بکە، دە جار (الحمد لله) بکە، دە جار (الله أكبر) بکە، پاشان داوای پێویستی خۆتی لێ بکە، دەڵێ: بەڵێ بەڵێ.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ إِبَاحَةِ الِاسْتِعَاذَةِ فِي الصَّلَاةِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ

٨٥١- عَنْ عَمْرَةَ عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنِّي أُرِيتُكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ كَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ» قَالَتْ عَمْرَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَكُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ فِي صَلَاتِهِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»[١].

## باسی ڕێگەدان بە پەناگرتن لەنێو نوێژدا لە سزای نێوگۆڕ و لە سزای ئاگر

واتە: عەمرە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە ﵂ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئێوەم پێ نیشان درا لەنێو گۆڕەکانتان تووشی فیتنە دەبن وەکوو فیتنەی دەجال، عەمرە وتی: عائیشە ﵂ وتی: من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەیدا دەیفەرموو: ئەی خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزای ئاگر، وە لە سزای نێوگۆڕ.

## بَابُ الِاسْتِعَاذَةِ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ فِي الصَّلَاةِ

٨٥٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ» قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: فَقَالَ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ»[٢].

## باسی پەناگرتن لەنێو نوێژدا لە فیتنە و ئاشوبی دەجال، وە لە فیتنەی ژیان و مردن، وە لە گوناە و قەرزداری لە نوێژدا

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەیدا دەپاڕایەوە و دەیفەرموو: خوایە پەنات پێ دەگرم لە سزای نێوگۆڕ، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و ئاشوبی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

مەسیحی دەجال، وە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و ئاشوبی ژیان و مردن، وە پەنات پێ دەگرم لە گوناهـ و قەرزداری، عائیشە ﵂ وتی: کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ زۆر پەنا دەگری لە قەرزداری، فەرمووی: پیاو ئەگەر قەرزدار بوو قسە دەکات و درۆ دەکات، پەیمان دەدات و نایباتە سەر.

## بَابُ إِبَاحَةِ التَّحْمِيدِ وَالثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ فِي الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ عِنْدَمَا يَرَى الْمُصَلِّي أَوْ يَسْمَعُ مَا يَجِبُ عَلَيْهِ أَوْ يُرِيدُ شُكْرَ رَبِّهِ عَلَى ذَلِكَ

٨٥٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ قَالَ: كَانَ قِتَالٌ بَيْنَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَتَاهُمْ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ قَالَ لِبِلَالٍ: يَا بِلَالُ ﵁، إِذَا حَضَرَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ وَلَمْ آتِ فَمُرْ أَبَا بَكْرٍ ﵁ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، أَذَّنَ بِلَالٌ، ثُمَّ أَقَامَ، ثُمَّ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: تَقَدَّمْ، فَتَقَدَّمَ أَبُو بَكْرٍ، فَدَخَلَ فِي الصَّلَاةِ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ يَشُقُّ النَّاسَ، حَتَّى قَامَ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ قَالَ وَصَفَّحَ الْقَوْمُ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ لَا يَلْتَفِتُ، فَلَمَّا رَأَى أَبُو بَكْرٍ التَّصْفِيحَ لَا يُمْسَكُ عَنْهُ الْتَفَتَ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيِ امْضِهْ، فَلَمَّا قَالَ لَبِثَ أَبُو بَكْرٍ هُنَيْهَةً، يَحْمَدُ لِلَّهِ عَلَى قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: امْضِهْ، ثُمَّ مَشَى أَبُو بَكْرٍ الْقَهْقَرَى عَلَى عَقِبَيْهِ فَتَأَخَّرَ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ تَقَدَّمَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ إِذْ أَوْمَأْتُ إِلَيْكَ أَلَّا تَكُونَ مَضَيْتَ» قَالَ: لَمْ يَكُنْ لِابْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يَؤُمَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلنَّاسِ: «إِذَا نَابَكُمْ فِي صَلَاتِكُمْ شَيْءٌ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ وَلْيُصَفِّحِ النِّسَاءُ». وَقَالَ بْنُ أَبِي حَازِمٍ فِي حَدِيثِهِ: فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَكَذَا يَأْمُرُهُ أَنْ يُصَلِّيَ فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَهُ فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ رَجَعَ الْقَهْقَرَي وَرَاءَهُ. وَقَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى فِي حَدِيثِهِ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ رَسُولَ اللَّه ﷺ أَيْ كَمَا أَنْتَ فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ يَدَيْهِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ رَجَعَ الْقَهْقَرَي، قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَبَعْضُهُمْ يَزِيدُ عَلَى بَعْضٍ فِي الْحَدِيثِ[١].

## باسی ڕێگەدان بە سوپاس و ستاییشکردنی خوا ﷻ لەنێو نوێژی فەرز، کاتێ نوێژخوێن شتێ دەبینێ، یان شتێك دەبیستێ یان دەیەوێت سوپاسی خوا بکات لەسەر ئەوە

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێ: لە نێوان نەوەکانی عەمر شەڕ و ئاژاوەیەك ڕووی دا، هەواڵ گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ، نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان هات بۆ

---

(١) صحيح.

لایان بۆ ئەوەی نێوانیان چاك بكات، بە بیلالی فەرموو: ئەی بیلال ﷺ ئەگەر كاتی نوێژی عەسر هات و نەهاتمەوە (لە زمانی منەوە)، فەرمان بە ئەبو بەكر ﷺ بكە نوێژ بۆ خەڵكەكە بكات، كاتێ نوێژی عەسر هاتە پێش بیلال بانگی دا دواتر قامەتی كرد، ئینجا بە ئەبو بەكری وت: پێش بكەوە، ئەبو بەكر پێش كەوت چووە نێو نوێژەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە نێوان خەڵكەكەدا هات، هەتا لەپشت ئەبو بەكر ڕاوەستا، وتی: خەڵكەكە (كاتێ پێغەمبەریان ﷺ بینی) چەپڵەیان لێ دا، جا ئەبو بەكر كاتێ بچووایەتە نێو نوێژەوە ئاوڕی نەئەدایەوە، بەڵام كاتێ بینی خەڵكی هەر چەپڵە لێ دەدەن ئاوڕی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ئاماژەی بۆی كرد بەردەوام بە، كاتێ ئەوەی فەرموو: ئەبو بەكر تۆزێك مایەوە، سوپاسی خوای كرد لەسەر وتەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ: (كە فەرموویەتی: بەردەوام بە)، پاشان ئەبو بەكر پاشەوپاش هاتە دواوە، كاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بینی پێش كەوت و نوێژی بۆ خەڵكەكە كرد، كاتێ نوێژەكەی تەواو كرد فەرمووی: ئەی ئەبو بەكر چی وای لێ كردی كاتێ ئاماژەم بۆت كرد نوێژەكەت تەواو نەكرد؟ ئەبو بەكر وتی: بۆ كوڕی ئەبو قوحافە نییە پێشنوێژی پێغەمبەر ﷺ بكات. ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەڵكەكەی فەرموو: ئەگەر شتێكتان بۆ دروست بوو لەنێو نوێژدا با پیاوان (سبحان الله) بكەن، ئافرەتانیش چەپڵە لێ بدەن (بە بەری دەستی ڕاستی بدات لە پشتی دەستی چەپی)، ئیبنو ئەبو حازم لە فەرموودەكەیدا وتی: پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە ئاماژەی بۆی كرد، فەرمانی پێ كرد، نوێژ بكات، ئەبو بەكر دەستی بەرز كردەوە سوپاسی خوای كرد، پاشان پشتاوپشت گەڕایەوە دواوە، عەبدولئەعلا لە فەرموودەكەیدا وتی: پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ كرد، لە شوێنی خۆت بمێنەوە، ئەبو بەكریش هەردوو دەستی بەرز كردەوە، سوپاس و ستاییشی خوای كرد لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ پاشان پشتاوپشت گەڕایەوە دواوە، ئەبو بەكر ئیبنو خوزەیمە وتی: هەندێكیان بۆ هەندێكی دیكە زیادی كرد.

## بَابُ الْأَمْرِ بِالتَّسْبِيحِ لِلرِّجَالِ وَالتَّصْفِيقِ لِلنِّسَاءِ عِنْدَ النَّائِبَةِ تَنُوبُهُمْ فِي الصَّلَاةِ

٨٥٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَابَهُ فِي صَلَاتِهِ شَيْءٌ، فَلْيَقُلْ: سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّمَا هَذَا لِلنِّسَاءِ» يَعْنِي التَّصْفِيقَ(١).

## باسی فەرمانكردن بە (سبحان الله) بۆ پیاوان و چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتان كاتێ شتێكیان تووش دەبێت لەنێو نوێژدا

واتە: سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك شتێكی بۆ دروست بوو لەنێو نوێژەكەیدا، با بڵێ: (سبحان الله)، چونكە ئەوە بۆ ئافرەتانە، واتە: چەپڵەلێدان.

## بَابُ نَسْخِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ وَحَظْرِهِ بَعْدَمَا كَانَ مُبَاحًا

٨٥٥ - عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ، فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ سَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فِي الصَّلَاةِ وَتَرُدُّ عَلَيْنَا، فَقَالَ ﷺ: «إِنَّ فِي الصَّلَاةِ لَشُغْلًا»(٢).

## باسی نەسخبوونەوەی حوكمی سڵاوكردن لەنێو نوێژ و قەدەغەكردنی، دوای ئەوەی كە ڕێگەپێدراو بوو

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: ئێمە لەنێو نوێژدا سڵاومان لە پێغەمبەر ﷺ دەكرد، ئەویش وەڵامی دەدداینەوە، بەڵام كاتێ گەڕاینەوە لەلای نەجاشی سڵاومان لێ كرد وەڵامی نەداینەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لەنێو نوێژدا سڵاومان لێ دەكردی، تۆش وەڵامت دەداینەوە، ﷺ فەرمووی: بەڕاستی نوێژ سەرقاڵی خۆی هەیە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٨٥٦** - عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁ قَالَ: كَانَ يُكَلِّمُ الرَّجُلُ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلَاةِ، حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾ البقرة، زَادَ فِي حَدِيثِ هُشَيْمٍ: فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنِ الْكَلَامِ[١].

**واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁ دەڵێ: پیاو لە نوێژدا قسەی لەگەڵ تەنیشتەکەی دەکرد، تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾، لە فەرموودەکەی هوشەیم زیادی کردووە: فەرمانمان پێ کرا بە بێدەنگبوون و ڕێگریمان لێ کرا لە قسەکردن.**

**٨٥٧**- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ، بِمِثْلِ حَدِيثِ بُنْدَارٍ ﵁، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ يُكَلِّمُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ فِي الصَّلَاةِ بِالْحَاجَةِ، عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، حَتَّى نَزَلَتْ: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾ البقرة، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ[٢].

**واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید بۆی باس کردین، هەر وەکوو فەرموودەکەی بوندار ﵁ ئەوە نەبێت وتی: (لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو پێویستییەکی هەبووایە لەنێو نوێژ قسەی لەگەڵ هاوەڵەکەی دەکرد تا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾، دواتر فەرمانمان پێ کرا بە بێدەنگبوون.**

**٨٥٨**- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يُصَلِّي بِمِثْلِهِ وَقَالَ: فَرَدَّ عَلَيْنَا فَقَالَ: «إِنَّ فِي الصَّلَاةِ لَشُغْلًا»[٣].

**واتە: عەبدوڵا ﵁ دەڵێ: ئێمە سڵاومان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ ئەو نوێژی دەکرد، هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو. وتی: وەڵامی داینەوە و فەرمووی: بەڕاستی نوێژ سەرقاڵی خۆی هەیە.**

## بَابُ ذِكْرِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ جَهْلًا مِنَ الْمُتَكَلِّمِ وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَلَامَ لَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ إِذَا لَمْ يَعْلَمِ الْمُتَكَلِّمُ أَنَّ الْكَلَامَ فِي الصَّلَاةِ مَحْظُورٌ غَيْرُ مُبَاحٍ

**٨٥٩**- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّا كُنَّا حَدِيثَ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ، فَجَاءَ اللَّهُ بِالْإِسْلَامِ، وَإِنَّ رِجَالًا مِنَّا يَتَطَيَّرُونَ قَالَ: «ذَلِكَ شَيْءٌ يَجِدُونَهُ فِي صُدُورِهِمْ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

فَلَا يَصُدَّنَّهُمْ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رِجَالٌ يَأْتُونَ الْكَهَنَةَ قَالَ: «فَلَا تَأْتُوهُمْ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رِجَالٌ مِنَّا يَخُطُّونَ قَالَ: «كَانَ نَبِيٌّ مِنَ الْأَنْبِيَاءِ يَخُطُّ فَمَنْ وَافَقَ خَطَّهُ فَذَاكَ» قَالَ: وَبَيْنَا أَنَا أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَحَدَّقَنِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَاثُكْلَ أُمِّيَاهُ، مَا لَكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ قَالَ: فَضَرَبَ الْقَوْمُ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ - يَصْمُتُونَنِي - لَكِنِّي سَكَتُّ، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَعَانِي، فَبِأَبِي هُوَ وَأُمِّي، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَطُّ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، وَاللَّهِ مَا ضَرَبَنِي، وَلَا كَهَرَنِي، وَلَا شَتَمَنِي، وَلَكِنْ قَالَ: «إِنَّ صَلَاتَنَا هَذِهِ لَا يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلَامِ النَّاسِ، إِنَّمَا هِيَ التَّكْبِيرُ، وَالتَّسْبِيحُ، وَتِلَاوَةُ الْقُرْآنِ»[1].

## باسی قسەکردن لە نوێژدا بەنەزانی، بەڵگەش لەسەر ئەوەی قسەکردن نوێژ نابڕێت، ئەگەر قسەکەر نەیزانی قسەکردن لە نوێژدا قەدەغەیە و ڕێگەپێدراو نییە

واتە: موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی ﷺ دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمە لە سەرەتای سەردەمی نەفامیدا بووین خوا ئیسلامی بۆ هێناین، پیاوانێکمان تێدایە شومی و ڕەشبینی دەکەن، بۆ نموونە ئەگەر شتێك بەلای ڕاستیاندا تێ پەڕێ گەشبین دەبن، بەڵام بەلای چەپیاندا تێ پەڕێ ڕەشبین دەبن، فەرمووی: ئەوە شتێکە لە ناخیاندا دەیبیننەوە ڕێگرییان لێ ناکات (لەوەی مەبەستیانە و بۆی دەچن چونکە نە دەتوانێ زیانیان پێ بگەیەنێ و نە قازانج). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوانێکمان تێدایە دەچن بۆ لای فاڵگرەوە؟ فەرمووی: مەچن بۆ لایان، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوانێکمان تێدایە خەت دەکێشن؟ فەرمووی: پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران خەتی دەکێشا، هەر کەسێك خەتەکەی لەگەڵ خەتی ئەودا ڕێك بێتەوە ئەوە چاکە، وتی: لە کاتێکدا من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا بووم لەپڕ پیاوێك لەنێو خەڵکەکە پژمەیەکی کرد، وتم: خوا ڕەحمت پێ بکات، خەڵکەکە تەماشایان کردم بە تەماشاکردنێکی سەرزەنشتاوییەوە، وتم: لەناو چووم دایکم ونی کردم، چییە وا تەماشام دەکەن؟ وتی: خەڵکەکە بە دەستەکانیان دەیاندا لە ڕانیان، وتی: بینیم ئاماژەم بۆ دەکەن بێدەنگ بم، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بۆیەوە بانگی کردم،

---

(١) صحيح.

دایك و باوكم بەقوربانی بێت، مامۆستایەكم نەبینیوە نە پێش ئەو و نە دوای ئەویش وەك ئەو بە بەجوانی زانست فێر بكات، سوێند بە خوا نە ئازاری دام و نە سەرزەنشتی كردم و نە قسەی نەشیاوی پێ وتم، بەڵام فەرمووی: ئەم نوێژەی ئێمە دروست نییە خەڵكی قسەی تێدا بكات، بەڵكوو ئەوە تەسبیح و تەكبیر و خوێندنی قورئانە.

## بَابُ ذِكْرِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ وَالْمُصَلِّي غَيْرُ عَالِمٍ أَنَّهُ قَدْ بَقِيَ عَلَيْهِ بَعْضُ صَلَاتِهِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَلَامَ وَالْمُصَلِّي هَذِهِ صِفَتُهُ غَيْرُ مُفْسِدٍ لِلصَّلَاةِ

٨٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلَاتَيِ الْعَشِيِّ - وَأَكْبَرُ ظَنِّي أَنَّهَا الظُّهْرُ - رَكْعَتَيْنِ، فَأَتَى خَشَبَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَوَضَعَ عَلَيْهَا يَدَيْهِ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى، وَخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ، فَقَالُوا: قَصُرَتِ الصَّلَاةُ، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﷺ، فَهَابَا أَنْ يُكَلِّمَاهُ، وَرَجُلٌ قَصِيرُ الْيَدَيْنِ أَوْ طَوِيلُهُمَا يُقَالُ لَهُ: ذُو الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: أَقَصُرَتِ الصَّلَاةُ أَوْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ: «لَمْ تَقْصُرْ، وَلَمْ أَنْسَ»، فَقَالَ: بَلْ نَسِيتَ، فَقَالَ: «صَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟» قَالَ: نَعَمْ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ، وَسَجَدَ مِثْلَ سُجُودِهِ أَوْ أَطْوَلَ، ثُمَّ رَفَعَ»[1].

## باسی قسەكردن لەنێو نوێژدا بە مەرجێك نوێژخوێن نەزانێ چەند ڕكاتی ماوە لە نوێژەكەی، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی قسە بكرێ و نوێژخوێنیش تێی بگات نوێژەكەی بەتاڵ نابێتەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەكێك لە نوێژەكانی (نیوەڕۆ یان عەسری) بۆ كردین -زۆرترین گومانم ئەوەیە كە نوێژی نیوەڕۆ بوو- دوو ڕكات نوێژی بۆ كردین (پاشان سەلامی دایەوە)، دواتر چووە سەر تەختەیەك لە پێشەوەی مزگەوتەكە بوو، هەردوو دەستی لەسەری دانا، هەریەكەیان لەسەر ئەوی دیكە، خەڵكەكە بەپەلە هاتن بۆ لای وتیان: ئایا نوێژ كورت كراوەتەوە، لەنێو خەڵكەكەیشدا ئەبو بەكر و عومەریان ﷺ تێدا بوو؟ جورئەتیان نەكرد لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بكەن، پیاوێك هەردوو دەستی كورت بوو، یان درێژ بوو پێی دەوترا:

---

(١) صحيح.

(ذو الْيَدَيْنِ)، وتی: ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە ئەی پێغەمبەری خوا یان بیرت چوو؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ کورت نەکراوەتەوە و بیریشم نەچوو، وتی: بەڵکوو بیرت چوو، فەرمووی: ئایا (ذو الْيَدَيْنِ) ڕاست دەکات؟ وتی: بەڵێ، دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، پاشان سەلامی دایەوە، ئینجا (الله أكبر)ی کرد سوژدەی برد وەکوو سوژدەکانی دیکەی یان درێژتر، پاشان سەری بەرز کردەوە.

## بَابُ ذِكْرِ مَا خَصَّ اللَّهُ ﷻ بِهِ نَبِيَّهُ ﷺ وَأَبَانَ بِهِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أُمَّتِهِ مِنْ أَنْ أَوْجَبَ عَلَى النَّاسِ إِجَابَتَهُ وَإِنْ كَانُوا فِي الصَّلَاةِ، إِذَا دَعَاهُمْ لِمَا يُحْيِيهِمْ

٨٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَنَادَاهُ، فَالْتَفَتَ أُبَيٌّ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَعَلَيْكَ السَّلَامُ مَا مَنَعَكَ أَيْ أُبَيُّ إِذْ دَعَوْتُكَ أَنْ لَا تُجِيبَنِي؟» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُنْتُ فِي الصَّلَاةِ قَالَ: أَوَ لَيْسَ تَجِدُ فِي كِتَابَ اللَّهِ أَنْ: ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴿٢٤﴾﴾ الأنفال، قَالَ: بَلَى بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي قَالَ أُبَيٌّ: لَا أَعُودُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»[1].

## باسی ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ تایبەت کردووە لە ئوممەتەکەی لەوەی پێویستی کردووە لەسەر خەڵك ئەگەرچی لە نوێژیشدا بوون وەڵامی بدەنەوە ئەگەر بانگی کردن بۆ لای ئەو (ئایینەی) کە زیندوویان دەکاتەوە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلای ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ، ئەو نوێژی دەکرد، بانگی کرد، ئوبەی ئاوڕی دایەوە (وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە)، پاشان ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: (وعَلَيْكَ السَّلَامُ) ئەی ئوبەی چی ڕێگری لێ کردی کاتێ بانگم کردی وەڵامم نەدەیتەوە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە نوێژدا بووم، فەرمووی: ئەی تەماشای کتێبی خوات نەکردووە کە فەرموویەتی: ﴿ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴿٢٤﴾﴾، واتە: وەڵامی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بدەنەوە کاتێك کە بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئایینەی) کە زیندووتان دەکاتەوە. وتی: بەڵێ، باوك و دایکم بە قوربانت بێت، ئوبەی وتی: بە ویستی خوا دووبارەی ناکەمەوە.

---

(١) صحيح.

**٨٦٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا فِي الْمَسْجِدِ، فَدَعَانِي، فَلَمْ آتِهِ، فَقَالَ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْتِيَنِي» قُلْتُ: إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي قَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ ﷻ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأنفال، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُعَلِّمُكَ أَفْضَلَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ، فَلَمَّا ذَهَبَ يَخْرُجُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ»[1].

**واتە: ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلامدا من لە مزگەوت نوێژم دەکرد، بانگی کردم نەچووم بۆ لای، فەرمووی: چی ڕێگری لێ کردی نەیەیت بۆ لام؟ وتم: نوێژم دەکرد، فەرمووی: ئایا خوا ﷻ نەیفەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە وەڵامی خوا و پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە کاتێك بانگتان دەکەن بۆ لای ئەو (ئایینەی) کە زیندووتان دەکاتەوە. پاشان فەرمووی: ئایا سوڕەتێکت فێر بکەم کە چاکترین سوڕەتە لە قوڕئاندا؟ پێش ئەوەی دەربچم. کاتێ ڕۆیشت دەربچێت ئەوەم بیری خستەوە، فەرمووی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) بریتییە لەو حەوت ئایەتەی دووبارە دەبنەوە، وە ئەو قوڕئانە مەزنەی کە بۆم هێنراوە.**

**٨٦٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا أُصَلِّي، فَدَعَانِي، بِمِثْلِهِ غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: أَعْظَمُ سُورَةٍ[2].

**واتە: ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێ پەڕی بەلامدا من لە مزگەوت نوێژم دەکرد، بانگی کردم، -هەر وەکوو فەرموودەکەی پێشوو- ئەوە نەبێت (لەجیاتی (أَفْضَلَ سُورَةٍ)) فەرمووی: (أَعْظَمُ سُورَةٍ) واتە: گەورەترین سوڕەت.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَلَامَ الَّذِي لَا يَجُوزُ التَّكَلُّمُ بِهِ فِي غَيْرِ الصَّلَاةِ إِذَا تَكَلَّمَ بِهِ الْمُصَلِّي فِي صَلَاتِهِ جَهْلًا مِنْهُ أَنَّهُ لَا يَجُوزُ التَّكَلُّمُ بِهِ غَيْرُ مُفْسِدٍ لِلصَّلَاةِ

٨٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّلَاةَ، وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ فِي الصَّلَاةِ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا ﷺ، وَلَا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا، فَلَمَّا سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِلْأَعْرَابِيِّ: «لَقَدْ تَحَجَّرْتَ وَاسِعًا» يُرِيدُ رَحْمَةَ اللَّهِ»[1].

### باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو قسەیەی کە دروست نییە لە جگە لە نوێژ بوترێ ئەگەر نوێژخوێن بەنەزانین لە نوێژەکەیدا وتی، نوێژکەی بەتاڵ ناکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بۆ نوێژ و ئێمەیش لەگەڵیدا هەستاین، دەشتەکییەك لەنێو نوێژدا وتی: خوایە ڕەحم بە من و موحەممەدیش ﷺ بکە، وە ڕەحم بە کەسی دیکە مەکە لەگەڵماندا، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە بە دەشتەکییەکەی فەرموو: بەڕاستی فراوانیت بەرتەسك کردەوە، مەبەستی ڕەحمەتی خوا بوو.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَلِمَةَ إِذَا جَرَتْ عَلَى لِسَانِ الْمُصَلِّي مِنْ غَيْرِ تَعَمُّدٍ مِنْهَا لَهَا، وَلَا إِرَادَةٍ مِنْهَا لِنُطْقِهَا، لَمْ تُفْسِدْ عَلَيْهِ صَلَاتَهُ وَلَمْ يَجِبْ عَلَيْهِ إِعَادَةُ تِلْكَ الصَّلَاةِ، إِنْ كَانَ قَابُوسُ بْنُ أَبِي ظَبْيَانَ يَجُوزُ الِاحْتِجَاجُ بِخَبَرِهِ فَإِنَّ فِي الْقَلْبِ مِنْهُ

٨٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِمِنًى فَخَطَرَتْ مِنْهُ كَلِمَةٌ قَالَ: فَسَمِعَهَا الْمُنَافِقُونَ، فَقَالَ: فَأَكْثَرُوا، فَقَالُوا: إِنَّ لَهُ قَلْبَيْنِ، أَلَا تَسْمَعُونَ إِلَى قَوْلِهِ وَكَلَامِهِ فِي الصَّلَاةِ إِنَّ لَهُ قَلْبًا مَعَكُمْ، وَقَلْبًا مَعَ أَصْحَابِهِ، فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۝١﴾ الأحزاب، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦ ۝٤﴾ الأحزاب»[2].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی وشە ئەگەر لەسەر زمانی نوێژخوێن دەرچوو بەبێ ئەنقەست و بەبێئەوەی بیەوێت دەری ببڕێت، نوێژەکەی بەتاڵ ناکات و دووبارەکردنەوەی لەسەر پێویست (واجب) نابێت، ئەمە ئەگەر قابووسی کوڕی زەبیان کە لەم سەنەدەدا هاتووە دروست بێت فەرموودەی لێ وەربگیرێت، بەڕاستی لە دڵدا شتێك هەیە دەربارەی**

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مینا نوێژی کرد لەپڕ قسەیەك لە دەمی دەرچوو، وتی: دووڕووەکان گوێیان لێ بوو، زیادیان کرد و وتیان: بەڕاستی دوودڵی هەیە، ئایا گوێتان لە قسەکەی نەبوو، هەروەها ئەوەیشی لە نوێژدا وتی، دڵێکی لەگەڵ ئێوەیە و دڵێکی لەگەڵ هاوەڵەکەیەتی، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ ۝١ ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام لە خوا بترسە بە گوێی کافران و دووڕووەکان مەکە. تا فەرمایشتی: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۝٤ ﴾، واتە: خوا بۆ هیچ ئادەمییەك دوو دڵی لەنێو سینەیدا دانەناوە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ الْمُبَاحَةِ فِي الصَّلَاةِ

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمَشْيِ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ الْعِلَّةِ تَحْدُثُ

**٨٦٦-** عَنِ الْأَزْرَقِ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّهُ رَأَى أَبَا بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيَّ ﷺ يُصَلِّي، وَعِنَانُ دَابَّتِهِ فِي يَدِهِ، فَلَمَّا رَكَعَ انْفَلَتَ الْعِنَانُ مِنْ يَدِهِ، وَانْطَلَقَتِ الدَّابَّةُ قَالَ: فَنَكَصَ أَبُو بَرْزَةَ عَلَى عَقِبَيْهِ، وَلَمْ يَلْتَفِتْ حَتَّى لَحِقَ الدَّابَّةَ، فَأَخَذَهَا، ثُمَّ مَشَى كَمَا هُوَ، ثُمَّ أَتَى مَكَانَهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ، فَقَضَى صَلَاتَهُ، فَأَتَمَّهَا، ثُمَّ سَلَّمَ قَالَ: إِنِّي قَدْ صَحِبْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوٍ كَثِيرٍ حَتَّى عَدَّ غَزَوَاتٍ، فَرَأَيْتُ مِنْ رُخَصِهِ وَتَيْسِيرِهِ، وَأَخَذْتُ بِذَلِكَ، وَلَوْ أَنِّي تَرَكْتُ دَابَّتِي حَتَّى تَلْحَقَ بِالصَّحَرَاءِ، ثُمَّ انْطَلَقْتُ شَيْخًا كَبِيرًا أَخْبِطُ الظُّلْمَةَ كَانَ أَشَدَّ عَلَيَّ[1].

---

(١) صحيح.

## کۆباسی ئەو کردەوانەی کە ڕێگەپێدراون لە نوێژدا

## باسی مۆڵەتدان بە ڕۆیشتن لە نوێژدا لە کاتی دروستبوونی هەر هۆکارێك کە پێویست بەوە بکات

واتە: ئەزرەقی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە، ئەو ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ بینی نوێژی دەکرد، ڕەشمەی وشترەکەی بە دەستەوە بوو، کاتێ ڕکووعی برد ڕەشمەکە لە دەستی دەرچوو، وشترەکە ڕۆیشت، وتی: ئەبو بەرزە پاشەوپاش بەدوای خۆیدا گەڕایەوە، ئاوڕی نەدایەوە هەتا گەیشت بە وشترەکە، ئینجا ڕەشمەکەی گرت، دواتر بەوشێوەیە گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی کە نوێژی تێدا کرد، نوێژەکەی تەواو کرد، پاشان سەلامی دایەوە، وتی: من لە غەزایەکی زۆردا هاوەڵیی پێغەمبەری خوام ﷺ کردووە، بینیم ئەو مۆڵەتی دەدا و ئاسانکاری دەکرد، منیش ئەوەم وەرگرت، ئەگەر من وازم لە وشترەکەم بهێنایە هەتا دەچووە دەشتایی، پاشان بەم تەمەنی پیرییەوە لە تاریکیدا بگەڕایەم بە دوایدا قورستر بوو لەسەرم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْمَشْيِ الْقَهْقَرَى فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ الْعِلَّةِ تَحْدُثُ

٨٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: أَنَّ الْمُسْلِمِينَ بَيْنَمَا هُمْ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ مِنْ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَأَبُو بَكْرٍ ﷺ يُصَلِّي بِهِمْ لَمْ يَفْجَأْهُمْ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَدْ كَشَفَ سِتْرَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلَاةِ، ثُمَّ تَبَسَّمَ فَضَحِكَ: فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ، وَظَنَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُرِيدُ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، أَنْ أَتِمُّوا صَلَاتَكُمْ[1].

## باسی مۆڵەتدان بەگەڕانەوە بۆ دواوە لە نوێژدا لەکاتی دروستبوونی هۆکارێك

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: موسوڵمانان کاتێ لە نوێژی بەیانیدا بوون لە ڕۆژی دووشەممە، ئەبو بەکریش ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردن، لەپڕ پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لا دا، تەماشای کرد هەموویان بەڕیز وەستاون

---

(١) صحيح.

لە نوێژدا، پاشان بزەیەکی کرد و پێ کەنی، ئینجا ئەبو بەکر پاشەوپاش گەڕایەوە بۆ دواوە تا بگاتە ڕیزەکە، گومانی وا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت دەربچێت بۆ نوێژ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی ئاماژەی بۆ کردن، نوێژەکەتان تەواو بکەن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي حَمْلِ الصِّبْيَانِ فِي الصَّلَاةِ وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ هَذَا الْفِعْلَ يُفْسِدُ صَلَاةَ الْمُصَلِّي، وَزَعَمَ أَنَّ هَذَا عَمَلٌ لَا يَجُوزُ فِي الصَّلَاةِ جَهْلًا مِنْهُ لِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ

٨٦٨- عَن أَبِي قَتَادَةَ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَؤُمُّ النَّاسَ، وَعَلَى عَاتِقِهِ أُمَامَةُ بِنْتُ زَيْنَبَ، فَإِذَا رَكَعَ وَضَعَهَا، وَإِذَا رَفَعَ مِنَ السُّجُودِ أَعَادَهَا[1].

## باسی مۆڵەتدان بە هەڵگرتنی منداڵ لە نوێژدا، وە بەڵگەش لەسەر دژی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ئەو کردەوەیە نوێژ تێك دەدات و فاسیدی دەکات، وە پێی وایە ئەو کردەوەیە دروست نییە لە نوێژدا، بەهۆی نەزانینی بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، ئومامەی کچی زەینەبیش لەسەر شانی بوو، کاتێ ڕکووعی ببردایە دایدەنا، وە کاتێ لە سوژدە بەرز بووایەتەوە، دووبارە هەڵیدەگرتەوە بۆ سەرشانی.

## بَابُ الْأَمْرِ بِقَتْلِ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ فِي الصَّلَاةِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ قَتْلَهَا وَقَتْلَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى الِانْفِرَادِ يُفْسِدُ الصَّلَاةَ

٨٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَ بِقَتْلِ الْأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ الْعَقْرَبِ وَالْحَيَّةِ»[2].

## باسی فەرمانکردن بە کوشتنی مار و دووپشك لە نوێژدا، بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە کوشتنیان، وە کوشتنی هەر یەکێکیان بەتەنها نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە کوشتنی هەردوو (گیانداره زیانبەخشه) ڕەشەکە لە نوێژدا: کە دووپشك و مارن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ النَّائِبَةِ تَنُوبُ الْمُصَلِّي

٨٧٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ لَا يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ، فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّفِّ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَكَذَا، يَأْمُرُهُ أَنْ يُصَلِّيَ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە ئاوڕدانەوە لە نوێژدا کاتێ شتێك لە نوێژەکەیدا ڕوو دەدات

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەبو بەکر ﷺ لە نوێژدا ئاوڕی نەئەدایەوە، کاتێ خەڵکەکە زۆر چەپڵەیان لێ دا ئاوڕی دایەوە، بینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕیزەکەدایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە ئاماژەی بۆی کرد، فەرمانی پێ کرد نوێژەکەی بکات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي اللَّحْظِ فِي الصَّلَاةِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَلْوِيَ الْمُصَلِّي عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ

٨٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلْتَفِتُ فِي صَلَاتِهِ يَمِينًا وَشِمَالًا، وَلَا يَلْوِي عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە تەماشاکردن بە تیلەی چاو (لاچاو) لەنێو نوێژ، بەبێئەوەی نوێژخوێن ملی بسوڕێنێتەوە بۆ دواوەی

واتە: ئیبنو عەباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دەدایەوە بەلای ڕاست و چەپی لە نوێژەکەیدا، وە ملی نەدەسوڕاندەوە بۆ دواوەی.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف (معلول).

## بَابُ الرُّخْصَةِ لِلْمُصَلِّي فِي مُرَاقَبَةِ غَيْرِهِ مِنَ الْمُصَلِّينَ وَالنَّظَرِ إِلَيْهِمْ، هَلْ يُتِمُّونَ صَلَاتَهُمْ أَمْ لَا، لِيَأْمُرَهُمْ بَعْدَ الْفَرَاغِ مِنَ الصَّلَاةِ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ إِتْمَامِ الصَّلَاةِ

**٨٧٢-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ، عَنْ أَبِيهِ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ ﷺ، وَكَانَ أَحَدَ الْوَفْدِ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَحَ بِمُؤَخَّرِ عَيْنِهِ إِلَى رَجُلٍ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَذَا الْخَبَرُ لَيْسَ بِخِلَافِ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ، إِنِّي لَأَرَى مِنْ خَلْفِي كَمَا أَرَى مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ وَإِنْ كَانَ يَرَى مِنْ خَلْفِهِ فِي الصَّلَاةِ قَدْ يَجُوزُ أَنْ يَنْظُرَ بِمُؤَخَّرِ عَيْنِهِ إِلَى مَنْ يُصَلِّي، لِيُعَلِّمَ أَصْحَابَهُ إِذَا رَأَوْهُ يَفْعَلُ هَذَا الْفِعْلَ أَنَّهُ جَايِزٌ لِلْمُصَلِّي أَنْ يَفْعَلَ مِثْلَ مَا فِعْلَ ﷺ» [١].

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژخوێن تەماشای جگە لە خۆی بکات لە نوێژخوێنان، ئایا نوێژەکانیان بەتەواوی ئەنجام دەدەن یان نا، بۆ ئەوەی دوای لێبوونەوەیان فەرمانیان پێ بکات بەوەی لەسەریان پێویستە لە تەواوکردنی نوێژ

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەلی کوڕی شەیبان دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە، عەلی کوڕی شەیبان ﷺ -یەکێك بوو لە (شەش) نوێنەرەکان (کە لە کیندەوە هاتبوون لە ناوچەی شام)- وتی: لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم کرد، بە تیلەی چاوی سەرنجی پیاوێکی دا پشتی ڕێك نەدەکردەوە لە ڕکووع و سوژدەدا. ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ نییە کە فەرموویەتی: من پشتەوەم دەبینم وەکوو چۆن پێشەوەم دەبینم. چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەگەرچی پشتەوەی خۆی دەبینی لەنێو نوێژدا، دروستە هەندێ جار بە تیلەی چاوی تەماشای ئەوە بکات کە نوێژ دەکات، تا هاوەڵانی فێر بکات، ئەگەر ئەویان بینی ئەو کارەی کرد، ئەوە دروستە بۆ نوێژخوێن ئەوە بکات کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی.

---

(١) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ الْتِفَاتِ الْمُصَلِّي فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ إِرَادَةِ تَعْلِيمِ الْمُصَلِّينَ بِالْإِشَارَةِ إِلَيْهِمْ بِمَا يَفْهَمُونَ عَنْهُ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ إِشَارَةَ الْمُصَلِّي بِمَا يُفْهَمُ عَنْهُ غَيْرُ مُفْسِدَةٍ صَلَاتَهُ

**٨٧٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ، وَهُوَ قَاعِدٌ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا فَرَآنَا قِيَامًا فَأَشَارَ إِلَيْنَا، فَقَعَدْنَا[١].

## باسی ڕێگەدراوە بە نوێژخوێن لە نوێژەکەیدا ئاوڕ بداتەوە کاتێ بیەوێت بە ئاماژە نوێژخوێنان فێر بکات بەوەی لێی تێ بگەن، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ئەوەی ئاماژەکردنی نوێژخوێن بە شتێ کەسی بەرانبەر لێی تێ بگات، نوێژەکەی فاسید ناکات

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت بەدانیشتنەوە نوێژی کرد، ئێمەیش لە پشتیەوە نوێژمان کرد، لای کردەوە بۆ لامان تەماشای کردین ڕاوەستاوین، ئاماژەی بۆ کردین ئینجا دانیشتین.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي بَصْقِ الْمُصَلِّي عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى

**٨٧٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَبْصَرَ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَحَكَّهَا بِحَصَاةٍ، وَنَهَى أَنْ يَبْزُقَ الرَّجُلُ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَعَنْ يَمِينِهِ، وَقَالَ: «لِيَبْزُقْ عَنْ شِمَالِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»[٢].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی نوێژخوێن تف بکاتە لای چەپی، یان ژێرپێی چەپی

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی کەوت بە بەڵغەمێك لە قیبلەی مزگەوت، بەردێکی هەڵگرت و کڕاندی، وە قەدەغەی کرد پیاو

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

تف بکاتە پێشی خۆی یان لای ڕاستی، فەرمووی: بەڵکوو با تف فڕێ بداتە لای چەپی یان ژێرپێی چەپی.

**٨٧٥-** عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يَقُولَانِ: قَدْ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نُخَامَةً فِي الْقِبْلَةِ، فَتَنَاوَلَ حَصَاةً، فَحَكَّهَا، ثُمَّ قَالَ: «لَا يَنْتَخِمَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْقِبْلَةِ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ رِجْلِهِ الْيُسْرَى»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی کەوت بە بەڵغەمێك لە قیبلەی مزگەوت، بەردێکی هەڵگرت و کڕاندی، پاشان فەرمووی: با هیچ یەکێك لە ئێوە تف بەرەوڕووی قیبلە نەکات، هەروەها بەلای ڕاستیشیدا، بەڵکوو با تف فڕێ بداتە لای چەپی یان ژێرپێی چەپی.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي بَصْقِ الْمُصَلِّي خَلْفَهُ، وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى إِبَاحَةِ لَيِّ الْمُصَلِّي عُنُقَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَبْصُقَ فِي صَلَاتِهِ، إِذِ الْبَزْقُ خَلْفَهُ غَيْرُ مُمْكِنٍ إِلَّا بِلَيِّ الْعُنُقِ

**٨٧٦-** عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتَ فِي الصَّلَاةِ فَلَا تَبْزُقَنَّ عَنْ يَمِينِكَ، وَلَكِنْ خَلْفَكَ، أَوْ تِلْقَاءَ شِمَالِكَ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِكَ الْيُسْرَى»(٢).

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژخوێن تف فڕێ بداتە پشتی خۆی، وە بەڵگەشی تێدایە لەسەر ڕێگەدان بە نوێژخوێن ڕووی وەربچەرخێنێ بۆ پشتی خۆی، ئەگەر ویستی لەنێو نوێژەکەی تف فڕێ بدات، چونکە تففڕێدان بۆ پشتەوە ناگونجێ تەنها بە ملسوڕدان نەبێت

واتە: تاریقی کوڕی عەبدوڵای موحاریبی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە نوێژدا بوویت تف فڕێ مەدەرە لای ڕاستت، بەڵکوو تف فڕێ بدە پشتت یان لای چەپت یان ژێرپێی چەپت.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ إِبَاحَةَ بَزْقِ الْمُصَلِّي تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى إِذَا لَمْ يَكُنْ عَنْ يَسَارِهِ فَارِغًا، وَإِبَاحَةِ دَلْكِ الْبُزَاقِ بِقَدَمِهِ إِذَا بَزَقَ فِي صَلَاتِهِ

٨٧٧- عَنْ طَارِقِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتَ فِي الصَّلَاةِ فَلَا تَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْكَ، وَلَا عَنْ يَمِينِكَ، وَلَكِنِ ابْزُقْ عَنْ تِلْقَاءِ شِمَالِكَ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَارِغًا فَتَحْتَ قَدَمِكَ الْيُسْرَى، ثُمَّ قُلْ بِهِ»[١].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی لە کاتێکدا ڕێگەدراوە بە نوێژخوێن تف بکاتە ژێرپێی چەپی ئەگەر لای چەپی بەتاڵ نەبوو، وە ڕێگەدراوە لە نوێژەکەیدا پێ بەسەر تفەکەیدا بهێنێ

واتە: تاریقی کوڕی عەبدوڵای موحاریبی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لە نوێژدا بوویت تف فڕێ مەدەرە پێشی خۆت، هەروەها لای ڕاستت، بەڵکوو تف فڕێ بدە لای چەپت، ئەگەر ئەو جێگایە بەتاڵ نەبوو، تف بکە ژێر پێی چەپت، پاشان پێی بەسەردا بهێنە.

٨٧٨- عَنْ أَبِي الْعَلَاءِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَتَنَخَّعَ فَدَلَكَهَا بِنَعْلِهِ الْيُسْرَى[٢].

واتە: ئەبو عەلائی کوڕی شیخیر دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ ئەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، بەڵغەمی فڕێ دا و بە نەعلەکەی پێی هێنا بە سەریدا.

٨٧٩ - عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فَبَزَقَ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»[٣].

واتە: موتەریف دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد تفی فڕێ دایە ژێرپێی چەپی.

---

(١) إسناده صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي بَزْقِ الْمُصَلِّي فِي ثَوْبِهِ وَدَلْكِهِ الثَّوْبَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ فِي الصَّلَاةِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْبُزَاقَ لَيْسَ بِنَجَسٍ، إِذْ لَوْ كَانَ نَجِسًا لَمْ يَأْمُرِ النَّبِيُّ ﷺ الْمُصَلِّي لِلْبَصْقِ فِي ثَوْبِهِ فِي الصَّلَاةِ

٨٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعْجِبُهُ الْعَرَاجِينُ أَنْ يُمْسِكَهَا بِيَدِهِ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ ذَاتَ يَوْمٍ، وَفِي يَدِهِ وَاحِدٌ مِنْهَا، فَرَأَى نُخَامَاتٍ فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَحَتَّهُنَّ حَتَّى أَنْقَاهُنَّ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ مُغْضَبًا، فَقَالَ: أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَسْتَقْبِلَهُ رَجُلٌ، فَيَبْصُقَ فِي وَجْهِهِ؟ إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ فَإِنَّمَا يَسْتَقْبِلُ رَبَّهُ، وَالْمَلَكُ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَا يَبْصُقْ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى، أَوْ عَنْ يَسَارِهِ، فَإِنْ عَجِلَتْ بِهِ بَادِرَةٌ فَلْيَقُلْ هَكَذَا فِي طَرَفِ ثَوْبِهِ، وَرَدَّ بَعْضَهُ فِي بَعْضٍ قَالَ الدَّوْرَقِيُّ: وَأَرَانَا يَحْيَى كَيْفَ صَنَعَ[1].

## باسی مۆڵەتدراوە نوێژخوێن لە کاتی نوێژ تف بکاتە نێو جلەکەی و بە بەشێکی دیکەی جلکەی بیدات بە لەپەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی تف پیس نییە، ئەگەر پیس بووایە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە نوێژخوێن نەدەکرد تف بکاتە نێو جلەکەی لە نوێژدا

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە پەلی دارخورما بوو کە بە دەستیەوە بێت، ڕۆژێك هاتە نێو مزگەتەوە یەك دانە بە دەستیەوە بوو، بەڵغەمێکی بینی لە قیبلەی مزگەوت، پێی کڕاند هەتا پاکی کردەوە، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە بەتوڕەییەوە، فەرمووی: ئایا کەسێکتان پێی خۆشە پیاوێك بەرەوڕووی بوەستێ و تف بەڕووی ئەودا فڕێ بدات؟ بێگومان یەکێك لە ئێوە ئەگەر هەستا بۆ نوێژ ئەوە بەو نوێژە ڕوو دەکاتە پەروەردگاری، فریشتەیش لای ڕاستیەوەیە، با تف فڕی نەداتە پێشی خۆی، هەروەها لای ڕاستیشی، بەڵکوو تف فڕێ بداتە ژێرپێی چەپی، یان لای چەپی، ئەگەر لەناکاو تفی بۆ هات با بەم شێوەیە بکات، تفی کردە نێو جلەکانی و هەندێکی بە هەندێکی دیکە دا بەلەپەوە.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي بَزْقِ الْمُصَلِّي فِي نَعْلِهِ لِيُخْرِجَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ

**٨٨١** - عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَلَا يَبْصُقْ أَمَامَهُ؛ فَإِنَّ رَبَّهُ أَمَامَهُ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ مَبْصَقًا فَفِي ثَوْبِهِ، أَوْ نَعْلِهِ، حَتَّى يَخْرُجَ بِهِ»[1].

## باسی مۆڵەتدراوە نوێژخوێن تف بکاتە نێو نەعلەکەی بۆ ئەوەی دەریبهێنێ لە مزگەوت

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژەکەیدا بوو، با تف نەکاتە پێش خۆی، چونکە پەروەردگاری لەپێشیەتی، وە با تف بکاتە لای چەپی، یان ژێرپێی، ئەگەر شوێنێنی بەدی نەکرد با بیکاتە نێو جلەکەی، یان نەعلەکەی، تا لە مزگەوت دەردەچێ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي مَنْعِ الْمُصَلِّي النَّاسَ مِنَ الْمُقَاتَلَةِ وَدَفْعِ بَعْضِهِمْ عَنْ بَعْضٍ إِذَا اقْتَتَلُوا

**٨٨٢** - عَنْ أَبِي الصَّهْبَاءِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فَقَالَ: لَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَجَاءَتْ جَارِيَتَانِ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، اقْتَتَلَتَا، فَأَخَذَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَنَزَعَ إِحْدَاهُمَا مِنَ الْأُخْرَى، ثُمَّ مَا بَالَى ذَلِكَ»[2].

## باسی مۆڵەتدان بەوەی نوێژخوێن ڕێگری لە جەنگکردن لەگەڵ خەڵك بکات و دووریان بخاتەوە لە یەکدی ئەگەر بەشەڕ هاتن

واتە: ئەبو صەهباء دەڵێ: ئێمە لەلای ئیبنو عەباس ﷺ بووین وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، دوو کچی منداڵ لە نەوەکانی عەبدولموتەلیب هاتن

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

بۆ لای شەڕیان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ گرتیانی و یەکێکیانی لەوی دیکە جیا کردەوە، پاشان هیچ گوێی پێ نەدا و نوێژی خۆی تەواو کرد.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي مُقَاتَلَةِ الْمُصَلِّي مَنْ رَامَ الْمُرُورَ بَيْنَ يَدَيْهِ

**٨٨٣-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ قَدْ أَمْلَيْتُ فِيمَا مَضَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلَا يَدَعَنَّ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»(١).

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژخوێن لەگەڵ ئەو کەسە بجەنگێت کە دەیەوێ بەزۆر تێپەڕ بێت بە بەردەمیدا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: پێشتر باسی ئەوەم کرد پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با نەهێڵێ کەس بە پێشیدا تێپەڕ ببێت، ئەگەر سەرکێشی کرد ئەوە با بجەنگێت لەگەڵی، چونکە ئەوە بێگومان لە شەیتانەوەیە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي عَدْلِ الْمُصَلِّي إِلَى جَنْبِهِ إِذَا قَامَ خِلَافَ مَا يَجِبُ عَلَيْهِ أَنْ يَقُومَ فِي الصَّلَاةِ

**٨٨٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَلَمَّا كَانَ بَعْضُ اللَّيْلِ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، فَذَكَرَ بَعْضَ الْحَدِيثِ، وَقَالَ: ثُمَّ قُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَحَوَّلَنِي عَنْ يَمِينِهِ(٢).

## باسی مۆڵەتدان بە ڕێکخستنی نوێژخوێن، ئەگەر هات و پێچەوانەی ئەوە ڕاوەستا کە پێویستە ڕاوەستێ لە نوێژدا

واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێ: شەو لەلای مەیمونەی پوورم مامەوە، کاتێ بەشێ لە شەو تێ پەڕ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی کرد، -دواتر هەندێ لە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

فەرمووده‌که‌ی باس کرد- وتی: پاشان له‌لای چه‌پیه‌وه‌ وه‌ستام (بۆ نوێژکردن له‌گه‌ڵی)، ئه‌ویش بردمی بۆ لای ڕاستی.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْإِشَارَةِ فِي الصَّلَاةِ وَالْأَمْرِ وَالنَّهْيِ

٨٨٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُشِيرُ فِي الصَّلَاةِ[١].

## باسی مۆڵه‌تدان به‌ نوێژخوێن له‌نێو نوێژه‌که‌یدا ئاماژه‌ بكات، وه‌ به‌ئاماژه‌کردن فه‌رمان بكات و قه‌ده‌غه‌ بكات (نه‌ك به‌قسه‌كردن)

واته‌: ئه‌نه‌س ﷺ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ (ئه‌گه‌ر پێویستی بکردایه‌) له‌نێو نوێژدا ئاماژه‌ی ده‌کرد.

٨٨٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا»[٢].

واته‌: جابر ﷺ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ نه‌خۆش كه‌وت به‌دانیشتنه‌وه‌ نوێژی كرد، ئێمه‌یش له‌ پشتیه‌وه‌ نوێژمان كرد، ئاماژه‌ی بۆ كردین ئینجا دانیشتین.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْإِشَارَةَ فِي الصَّلَاةِ بِمَا يُفْهَمُ عَنِ الْمُشِيرِ لَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ وَلَا يُفْسِدُهَا

٨٨٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فَإِذَا سَجَدَ وَثَبَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ عَلَى ظَهْرِهِ، فَإِذَا مَنَعُوهُمَا أَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ دَعُوهُمَا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ وَضَعَهُمَا فِي حِجْرِهِ، فَقَالَ: «مَنْ أَحَبَّنِي فَلْيُحِبَّ هَذَيْنِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده حسن.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی ئاماژەکردن لە نوێژدا بۆ ئەوەی ئاماژەبۆکراو تێ بگەیەنرێ، نە نوێژ دەبڕێ و نە بەتاڵی دەکات

واتە: عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، کاتێ سوژدەی برد، حەسەن و حوسەین چوونە سەر پشتی، کاتێ خەڵکەکە ڕێگرییان لێ کردن، ئاماژەی بۆ کردن وازیان لێ بێنن، کاتێ نوێژی تەواو کرد خستنیە باوەشی خۆی، فەرمووی: هەر کەسێك منی خۆش دەوێ با ئەم دووانەیشی خۆش بووێت.

## بَابُ الرُّخْصَةِ بِالْإِشَارَةِ فِي الصَّلَاةِ بِرَدِّ السَّلَامِ إِذَا سَلَّمَ عَلَى الْمُصَلِّي

٨٨٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَسْجِدَ قُبَا، وَدَخَلَ عَلَيْهِ رِجَالٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ، فَسَأَلْتُ صُهَيْبًا: كَيْفَ كَانَ يَصْنَعُ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ يُسَلَّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّي؟ قَالَ: كَانَ يُشِيرُ بِيَدِهِ»[١].

## باسی مۆڵەت دراوە نوێژخوێن ئەگەر سەلامی لێ کرا لەنێو نوێژدا بەئاماژە وەڵامی سەلامەکە بداتەوە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو مزگەوتی قوباء، پیاوانێکیش لە ئەنصارەکان چوون بۆ لای سڵاویان لێ دەکرد، پرسیارم لە صوهەیب کرد: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەنێو نوێژ سڵاوی لێ بکرایە چی دەکرد؟ فەرمووی: بە ئاماژەی دەستی وەڵامی سەلامی دەدایەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْإِشَارَةِ بِجَوَابِ الْكَلَامِ فِي الصَّلَاةِ إِذَا كَلَّمَ الْمُصَلِّي وَفِي الْخَبَرِ مَا دَلَّ عَلَى الرُّخْصَةِ فِي إِصْغَاءِ الْمُصَلِّي إِلَى مُكَلِّمِهِ وَاسْتِمَاعِهِ لِكَلَامِهِ فِي الصَّلَاةِ

٨٨٩- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى حِمَارٍ لَهُ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَكُنْتُ أُكَلِّمُهُ فَأَوْمَأَ إِلَيَّ بِيَدِهِ»[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی مۆڵەتدراوە بەئاماژە وەڵامی قسە بدرێتەوە لە نوێژدا، ئەگەر نوێژخوێن قسەی کرد، وە لە فەرموودەکەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی مۆڵەتدراوە نوێژخوێن گوێ بۆ ئەو کەسە بگرێت کە قسەی لەگەڵدا دەکات لە نوێژدا

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ نێو نەوەکانی موصتەلیق، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو بەسەر گوێدرێژێکەوە بوو نوێژی دەکرد، من قسەم لەگەڵی دەکرد ئەویش بەدەستی ئاماژەی بۆ کردم.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي تَنَاوُلِ الْمُصَلِّي الشَّيْءَ عِنْدَ الْحَادِثَةِ تَحْدُثُ

٨٩٠- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمًا، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَأَيْتُهُ هَوَى بِيَدِهِ لِيَتَنَاوَلَ شَيْئًا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ وُعِدْتُمُوهُ إِلَّا قَدْ عُرِضَ عَلَيَّ فِي مَقَامِي هَذَا، حَتَّى لَقَدْ عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ، وَأَقْبَلَ إِلَيَّ مِنْهَا شَرَرٌ حَتَّى حَاذَانِي مَكَانِي هَذَا، فَخَشِيتُ أَنْ يَغْشَاكُمْ»[١].

## باسی مۆڵەت دراوە نوێژخوێن دەست بۆ شتێك ببات لە کاتی هەر ڕووداوێك ڕوو بدات

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێ: ڕۆژێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژمان کرد، ڕاوەستانەکەی درێژ کردەوە، پاشان بینیم دەستی درێژ کرد بۆ شتێك، کاتێ سەلامی دایەوە فەرمووی: ئەوەی پەیمانتان پێ درابوو لەم جێگایەم خرایە ڕوو بۆم، تەنانەت ئاگریشم بۆ خرایە ڕوو، پشکۆیەکی ڕووبەڕووم هات تا نزیك بۆیەوە لەم جێگایەم، ترسام لەوەی بەرتان بکەوێت.

٨٩١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، ثُمَّ بَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئًا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ قَالَ: إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ لِيَجْعَلَهُ فِي وَجْهِي، فَقُلْتُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ، وَلَوْلَا دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ ﷺ لَأَصْبَحَ مُوثَقًا، يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی کرد، پاشان دەستی درێژ کرد وەکوو ئەوەی دەست بۆ شتێك ببات، کاتێ لە نوێژ بۆیەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بینیمان دەستت درێژ کرد؟ فەرمووی: ئیبلیس دوژمنی خوا هات بە پشکۆیەك لە ئاگر بۆ ئەوەی بیدات لە ڕوخسارم، سێ جار وتم: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، نەڕۆیشتە دواوە، پاشان ویستم بیگرم، لەبەر داواکەی سولەیمان برامان نەبووایە ئەوە (دەمگرت و دواتر) دەبەسترایەوە و وای لێ دەهات منداڵانی مەدینە گەمە و گاڵتەیان پێ دەکرد.

**٨٩٢-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ قَالَ: فَبَيْنَمَا هُوَ فِي الصَّلَاةِ مَدَّ يَدَهُ، ثُمَّ أَخَّرَهَا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَنَعْتَ فِي صَلَاتِكَ هَذِهِ مَا لَمْ تَصْنَعْ فِي صَلَاةٍ قَبْلَهَا قَالَ: «إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ قَدْ عُرِضَتْ عَلَيَّ، وَرَأَيْتُ فِيهَا.... قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ، حَبُّهَا كَالدُّبَّاءِ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَتَنَاوَلَ مِنْهَا، فَأُوحِيَ إِلَيْهَا أَنِ اسْتَأْخِرِي، فَاسْتَأْخَرَتْ، ثُمَّ عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ، بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ حَتَّى رَأَيْتُ ظِلِّي وَظِلَّكُمْ، فَأَوْمَأْتُ إِلَيْكُمْ أَنِ اسْتَأْخَرُوا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنْ أَقِرَّهُمْ، فَإِنَّكَ أَسْلَمْتَ وَأَسْلَمُوا، وَهَاجَرْتَ وَهَاجَرُوا، وَجَاهَدْتَ وَجَاهَدُوا، فَلَمْ أَرَ لِي عَلَيْكُمْ فَضْلًا إِلَّا بِالنُّبُوَّةِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانیمان کرد، وتی: لە کاتێکدا ئەو لە نوێژدا بوو دەستی درێژ کرد، پاشان کێشایەوە، کاتێ لە نوێژ بۆیەوە، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، لە نوێژەکەتدا شتێکت کرد پێشتر لە هیچ نوێژێك نەتکردبوو، فەرمووی: من بەهەشتم بینی بۆم عەرز کرا، بینیم هێشووەکانی شۆڕ بوونەوە، دەنکەکانی وەکوو کولەکە وا بوو، ویستم لێی ببەم، وەحی بۆ هات بکشێتەوە، ئەویش کشایەوە، پاشان لە نێوان من و ئێوەدا ئاگرم پێ نیشان درا، تا سێبەری خۆم سێبەری ئێوەم بینی، ئاماژەم بۆ کردن بچنە دواوە، وەحیم بۆ هات لە شوێن خۆیان بیانهێڵمەوە، (پێم وترا): چونکە تۆ موسوڵمان بوویت و ئەوانیش موسوڵمان بوون، کۆچت کردووە و کۆچیان کردووە، جیهادت کردووە و جیهادیان کردووە، هیچ فەزڵ و چاکەیەکی خۆمم نەبینی بەسەرتاندا جگە لە پێغەمبەرایەتی.

---

(١) إسناده حسن.

## بَابُ أَمْرِ النِّسَاءِ بِالتَّصْفِيقِ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ النَّائِبَةِ

٨٩٣- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ خَبَرَ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا نَابَكُمْ فِي صَلَاتِكُمْ شَيْءٌ فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْيُصَفِّحِ النِّسَاءُ»[١].

## باسی فەرمانکردن بە ئافرەتان لە نوێژدا چەپڵە لێ بدەن (بەو شێوەیەی شەرع دیاری کردووە) لە کاتی دروستبوونی ڕووداوێك

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعدم ﷺ باس کرد، لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئەگەر شتێکتان بۆ دروست بوو لەنێو نوێژدا با پیاوان (سبحان الله) بکەن، ئافرەتانیش چەپڵە لێ بدەن (بە پێشی دەستی ڕاستی بدات لە پشتی دەستی چەپی).

٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سبحان الله) بۆ پیاوانە و چەپڵەلێدانیش بۆ ئافرەتانە (بە پێشی دەستی ڕاستی بدات لە پشتی دەستی چەپی).

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي مَسْحِ الْحَصَى فِي الصَّلَاةِ مَرَّةً وَاحِدَةً

٨٩٥- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، حَدَّثَنِي مُعَيْقِيبٌ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قِيلَ لَهُ فِي الْمَسْحِ فِي الْمَسْجِدِ قَالَ: «إِنْ كُنْتَ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی مۆڵەتدراوە لەنێو نوێژدا دەستکاری وردەبەرد بکرێ لە کاتی سوژدەبردن

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕێتەوە، موعەیقیب ﷺ بۆی باس کردم، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبارەی دەستکاریکردنی بەرد (بەمەبەستی ڕێکخستن) لەنێو مزگەوت (لەنێو نوێژ لە کاتی سوژدەبردن)؟ فەرمووی: ئەگەر تۆ هەر دەستکاری دەکەی (ڕێکی دەخەی) با جارێك بێت.

٨٩٦- ثناه الدَّوْرَقِيُّ، ثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ هِشَامٍ بِهَذَا، وَقَالَ: عَنْ مُعَيْقِبٍ ﷺ[١].

واتە: هەمان فەرموودە لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە لە موعەیقیبەوە ﷺ.

٨٩٧- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ مَسْحِ الْحَصَى فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «وَاحِدَةٌ، وَلَوْ تُمْسِكُ عَنْهَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ مِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا سُودُ الْحَدَقِ»[٢].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی دەستکاری وردەبەرد لەنێو نوێژ (لە کاتی سوژدەبردن)؟ فەرمووی: یەك جار، خۆ ئەگەر دەستکاری نەکەی لە سەد وشتر چاکترە بۆ تۆ هەموویان ڕەشی قەترین بن.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ حَدِيثَ النَّفْسِ فِي الصَّلَاةِ مِنْ غَيْرِ نُطْقٍ بِاللِّسَانِ لَا يُفْسِدُ الصَّلَاةَ، إِذِ اللَّهُ بِرَأْفَتِهِ وَرَحْمَتِهِ قَدْ تَجَاوَزَ لِأُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا

٨٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَا يُنْطَقُ بِهِ، وَلَا يُعْمَلُ بِهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خەیاڵی نێو دڵ لە نوێژدا بەبێ دەربڕینی بەزمان نوێژ بەتاڵ ناکات، چونکە خوا بەبەزەیی و ڕەحمی خۆی چاوپۆشی لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ کردووە لەوەی دێت بە خەیاڵیاندا

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا ﷻ چاوپۆشی کردووە لە ئوممەتەکەم لە هەر شتێ بە خەیاڵیدا بێت، بەمەرجێ دەری نەبڕێ یان بەکردەوە ئەنجامی نەدات.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْبُكَاءَ فِي الصَّلَاةِ لَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ مَعَ إِبَاحَةِ الْبُكَاءِ فِي الصَّلَاةِ

٨٩٩ - عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مَا كَانَ فِينَا فَارِسٌ يَوْمَ بَدْرٍ غَيْرَ الْمِقْدَادِ ﷺ، وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا فِينَا إِلَّا نَائِمٌ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَحْتَ شَجَرَةٍ يُصَلِّي، وَيَبْكِي، حَتَّى أَصْبَحَ[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قِصَّةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ لَمَّا أَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِالصَّلَاةِ بِالنَّاسِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ رَجُلٌ رَقِيقٌ كَثِيرُ الْبُكَاءِ حِينَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مِنْ هَذَا الْبَابِ.

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی گریان لەنێو نوێژدا، نوێژ نابڕێ، لەگەڵ ڕێگەدان بە گریان لە نوێژدا

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی بەدر سوارمان لەنێودا نەبوو جگە لە میقداد ﷺ، بێگومان خۆمانم بینی یەکێکمان تێدا نەبوو ئیللا خەوتبوو تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێت لەژێر درەختێك نوێژی دەکرد و دەگریا هەتا ڕۆژ بۆیەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: باسەکەی ئەبو بەکری صدیق ﷺ کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، پێی وترا: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵناسکە زۆر دەگری کاتێ کە قورئان دەخوێنێ. ئەم باسە لەو بەشەیە.

---

(١) صحيح.

٩٠٠- عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي وَلِصَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ»[١].

واتە: موتەریف دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی نوێژی دەکرد لەسینەیەوە دەنگی گریانێکی بەکوڵ دەهات وەکوو گزەگزی دەنگی مەنجەڵێك ئاوی تێدا بکوڵێت.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّفْخَ فِي الصَّلَاةِ لَا يُفْسِدُ الصَّلَاةَ وَلَا يَقْطَعُهَا مَعَ إِبَاحَةِ النَّفْخِ عِنْدَ الْحَادِثَةِ تَحْدُثُ فِي الصَّلَاةِ

٩٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي ثُمَّ سَجَدَ، فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعْ رَأْسَهُ، فَجَعَلَ يَنْفُخُ وَيَبْكِي وَذَكَرَ الْحَدِيثَ وَقَالَ فَقَامَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ النَّارُ فَجَعَلْتُ أَنْفُخُهَا، فَخِفْتُ أَنْ تَغْشَاكُمْ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی فووکردن لە نوێژدا نوێژ بەتاڵ ناکات و نایبڕێ، لەگەڵ ئەوەی ڕێگەدراوە بە فووکردن لە کاتی ڕووداوێك لە نوێژدا ڕوو بدات

واتە: عەبدوڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: ڕۆژێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا نوێژی کرد، پاشان سوژدەی برد، ماوەیەك سەری بەرز نەکردەوە، فووی دەکرد و دەگریا، -باسی فەرموودەکەی کرد- وتی: دواتر هەستا، ستاییش و پیاهەڵدانی خوای کرد و فەرمووی: ئاگرم بۆ عەرز کرا، منیش فووم لێ کرد، ترسام لەوەی بتانپۆشێ.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي التَّنَحْنُحِ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ الِاسْتِئْذَانِ عَلَى الْمُصَلِّي، إِنْ صَحَّتْ هَذِهِ اللَّفْظَةُ فَقَدِ اخْتَلَفُوا فِيهَا

٩٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نُجَيٍّ الْحَضْرَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: كَانَتْ لِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَنْزِلَةٌ، لَمْ تَكُنْ لِأَحَدٍ مِنَ الْخَلَائِقِ، إِنِّي كُنْتُ أَجِيئُهُ فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ حَتَّى يَتَنَحْنَحَ فَأَنْصَرِفُ إِلَى أَهْلِي[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) اسناده ضعيف.

## باسی مۆڵەتدراوە بە کۆکەکردن لەنیو نوێژدا لە کاتی داوای مۆڵەتکردن لە نوێژخوێن، ئەگەر ئەم دەستەواژەیە تەواو بێت، چونکە ڕاوبۆچوونی جیایان لە بارەیەوە هەیە

واتە: عەبدوڵای کوڕی نەجی حەزرەمی دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: عەلی ﷺ وتی: من لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ پلەوپایەیەکم هەبوو هیچ یەکێك لە دروستکراوەکان نەیبوو، من دەهاتم بۆ لای سڵاوم لێ دەکرد، تا دەکۆکی، (ئەگەر کۆکەی بکردایە) دەگەڕامەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵم.

**٩٠٣-** وَرَوَاهُ عُمَارَةُ بْنُ الْقَعْقَاعِ، وَمُغِيرَةُ بْنُ مِقْسَمٍ جَمِيعًا، عَنِ الْحَارِثِ الْعُكْلِيِّ، عَنْ أَبِي زُرْعَةَ بْنِ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نُجَيٍّ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ. أُنظُرْ الكَلَام عَلَيهِ فِي الَّذِي قَبْلَه[١].

واتە: هەمان فەرموودە لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە.

**٩٠٤-** أَخْبَرَنَا عُمَارَةُ بْنُ الْقَعْقَاعِ، بِمَا ذَكَرْتُ مِنَ الْأَلْفَاظِ، أُنْظُرِ الكَلَامَ عَلَيْهِ فِي الَّذِي قَبْلَه.[٢]

واتە:: هەمان فەرموودە لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي إِصْلَاحِ الْمُصَلِّي ثَوْبَهُ فِي الصَّلَاةِ

**٩٠٥-** عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ كَبَّرَ، ثُمَّ الْتَحَفَ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ[٣].

## باسی مۆڵەتدراوە نوێژخوێن لەنێو نوێژدا پۆشاکەکەی چاك بکات

واتە: وائیلی کوڕی حوجر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچووایەتە نێو نوێژەوە هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، پاشان تەکبیری دەکرد، ئینجا پۆشاکەکەی دەپێچا بە

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) صحيح.

خۆیەوە و هەردوو دەستی دەخستە نێو پۆشاکەکەی، پاشان بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی گرت. پاشان فەرموودەکەی باس کرد.

**٩٠٦-** عَنْ عَفَّانِ بْنِ مُسْلِمٍ، حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، غَيْرَ أَنَّهُ لَيْسَ فِي حَدِيثِ عَفَّانَ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي ثَوْبِهِ[١].

واتە: عەفانی کوڕی موسلیم دەگێڕێتەوە، هەمام بۆی باس کردین، ئەوە نەبێت لە فەرموودەکەی عەفان ئەمە نەهاتووە: پاشان هەردوو دەستی خستە نێو پۆشاکەکەیەوە.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النُّعَاسَ فِي الصَّلَاةِ لَا يُفْسِدُ الصَّلَاةَ وَلَا يَقْطَعُهَا

**٩٠٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ؛ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَعَلَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسْتَغْفِرَ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي الْخَبَرِ دَلَالَةٌ عَلَى أَنَّ النُّعَاسَ لَا يَقْطَعُ الصَّلَاةَ، إِذْ لَوْ كَانَ النُّعَاسُ يَقْطَعُ الصَّلَاةَ لَمَا كَانَ لِقَوْلِهِ ﷺ: فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ مَعْنًى، وَقَدْ أَعْلَمَ بِهَذَا الْقَوْلِ أَنَّهُ إِنَّمَا أَمَرَنَا الِانْصِرَافَ مِنَ الصَّلَاةِ خَوْفَ سَبِّ النَّفْسِ عِنْدَ إِرَادَةِ الدُّعَاءِ لَهَا، لَا أَنَّهُ فِي غَيْرِ صَلَاةٍ إِذَا نَعَسَ»[٢].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خەوەنوچکە لە نوێژدا نوێژ بەتاڵ ناکات و نایبڕێت

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەنێو نوێژەکەیدا وەنەوزی هات، با بخەوێت هەتا خەوەکەی دەڕوات، چونکە بەڕاستی هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر نوێژی کرد وەنەوزی دەهات، لەوەیە بیەوێت داوای لێخۆشبوون بکات، جنێو بە خۆی بدات. ئەبوبەکر دەڵێ: لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە وەنەوز نوێژ نابڕێ، ئەگەریش نوێژی بڕیبایە پێغەمبەر ﷺ نەیدەفەرموو: کەسەکە نازانێ چ دەڵێ، لەوانەیە داوای لێبوردن لە خوا بکات و جنێویش بەخۆی بدات پێکەوە، زانراویشە هۆکاری وازهێنان لە نوێژەکە، ترسانە لە جنێو و قسەی خراپ لە کاتی دوعاکردن، نەک لە کاتی جگە لە نوێژکردندا کە وەنەوز دێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.




## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْأَفْعَالِ الْمَكْرُوهَةِ فِي الصَّلَاةِ الَّتِي قَدْ نُهِيَ عَنْهَا الْمُصَلِّي

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الِاخْتِصَارِ فِي الصَّلَاةِ

٩٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. وَقَالَ إِسْمَاعِيلُ فِي حَدِيثِهِ: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الِاخْتِصَارِ فِي الصَّلَاةِ»[1].

## کۆباسی ئەو کردارانەی کە کەراهەتیان هەیە و باش نین لەنێو نوێژدا، کە قەدەغەکراوە لە نوێژخوێن ئەنجامیان بدات

## باسی قەدەغەکردن لەوەی بەندە لەنێو نوێژدا دەستی بخاتە کەلەکەی

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کەسێك نوێژ بکات و دەستی لەسەر کەمەری یان کەلەکەی دابنێت. ئیسماعیلیش لە فەرموودەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە دەستدانان لەسەر کەمەر یان کەلەکە لەنێو نوێژ.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا زُجِرَ عَنِ الِاخْتِصَارِ فِي الصَّلَاةِ إِذْ هِيَ رَاحَةُ أَهْلِ النَّارِ، بِاللَّهِ نَتَعَوَّذُ مِنَ النَّارِ

٩٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الِاخْتِصَارُ فِي الصَّلَاةِ رَاحَةُ أَهْلِ النَّارِ»[2].

## باسی ئەو هۆکارەی لە پێناویدا دانانی دەست لەسەر کەمەر یان کەلەکە لەنێو نوێژ سەرزەنشت کراوە، چونکە ئەوە شێوازی پشوودانی دۆزەخییەکانە، پەنا دەگرین بە خوا لە ئاگر

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستدانان لەسەر کەلەکە لەنێو نوێژدا پشووی دۆزەخییەکانە.

---

(١) صحيح.

(٢) هذا حديث ضعيف جدا.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْعَقْصِ فِي الصَّلَاةِ وَتَمْثِيلِ الْعَاقِصِ فِي الصَّلَاةِ بِالْمَكْتُوفِ فِيهَا. وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى كَرَاهَةِ صَلَاةِ الْمَرْءِ مَكْتُوفًا إِذَا كَانَ لَهُ السَّبِيلُ إِلَى حَلِّ يَدَيْهِ مِنَ الْأَكْتَافِ

٩١٠- عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ ﭬ رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ ﭬ يُصَلِّي وَرَأْسُهُ مَعْقُوصٌ مِنْ وَرَائِهِ، فَقَامَ، فَجَعَلَ يَحُلُّهُ، وَأَقَرَّ لَهُ الْآخَرَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: مَا لَكَ وَرَأْسِي؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا مِثَالُ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ»[1].

## باسی قەدەغەکردن لە بەستنی قژ لەنێو نوێژدا، وە وێناکردنی ئەو کەسەی قژی بەستووە بە کەسێك هەردوو دەستی بەسترابێتەوە لە دواوەی، وە بەڵگەشی تێدایە باش نییە بەندە نوێژ بکات و هەردوو دەستی بەسترابێتەوە، ئەگەر توانی دەستی بکاتەوە

واتە: کوڕەیب مەولای ئیبنو عەباس ﭬ دەگێڕێتەوە، عەبدوڵای کوڕی عەباس ﭬ عەبدوڵای کوڕی حاریسی ﭬ بینی نوێژی دەکرد قژی لە دواوە بەستبۆیەوە، هەستا قژی کردەوە، یەکێکی دیکە دانی بەکارەکەدا نا، کاتێ لە نوێژ بۆیەوە ڕووی کردە ئیبنو عەباس و وتی: تۆ چیتە بەسەری منەوە؟ ئەویش وتی: من گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەڕاستی نموونەی ئەوە وەکوو کەسێك وایە نوێژ بکات و هەردوو دەستی بەسترابێتەوە.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ غَرْزِ الضَّفَائِرِ فِي الْقَفَا فِي الصَّلَاةِ، إِذْ هُوَ مَقْعَدٌ لِلشَّيْطَانِ

٩١١- أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ ﭬ، أَنَّهُ رَأَى أَبَا رَافِعٍ مَوْلَى النَّبِيِّ ﷺ مَرَّ بِحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﭬ، وَحَسَنٌ يُصَلِّي، قَدْ غَرَزَ ضِفْرَيْهِ فِي قَفَاهُ، فَحَلَّهُمَا أَبُو رَافِعٍ، فَالْتَفَتَ حَسَنٌ إِلَيْهِ مُغْضَبًا، فَقَالَ أَبُو رَافِعٍ: أَقْبِلْ عَلَى صَلَاتِكَ، وَلَا تَغْضَبْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ذَلِكَ كِفْلُ الشَّيْطَانِ» يَقُولُ: مَقْعَدُ الشَّيْطَانِ، يَعْنِي مَغْرَزَ ضِفْرَيْهِ[2].

---

(١) صحيح.

(٢) حسنه الترمذي.

## باسی سەرزەنشتکردن لە هۆنینەوەی قژ و کردنی بە پەلکە یان پێچانەوەی و دانانی لە پشتەمل لە نوێژدا، چونکە ئەوە جێگای دانیشتنی شەیتانە

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو سەعیدی مەقبوری دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﵁، ئەو ئەبو ڕافیعی مەولای پێغەمبەری ﷺ بینی، بەلای حەسەنی کوڕی عەلی ﵄ تێ پەڕی، حەسەن نوێژی دەکرد قژی هۆنیبۆیەوە یان پێچابووی بە پشتەملیەوە، ئەبو ڕافیع کردیەوە، حەسەن بەتوڕەییەوە لای لێی کردەوە، ئەبو ڕافیع وتی: نوێژەکەی خۆت بکە و توڕە مەبە، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوە بەشی شەیتانە، دەیفەرموو: ئەوە جێگای دانیشتنی شەیتانە، واتە: قژپێچانەوەکەی.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى كَرَاهَةِ تَشْبِيكِ الْأَصَابِعِ فِي الصَّلَاةِ إِذِ النَّبِيُّ ﷺ لَمَّا زَجَرَ عَنْ تَشْبِيكِ الْأَصَابِعِ عِنْدَ الْخُرُوجِ إِلَى الْمَسْجِدِ وَفِي الْمَسْجِدِ، وَأَعْلَمَ أَنَّ الْخَارِجَ إِلَى الصَّلَاةِ فِي صَلَاةٍ، كَانَ الْمُصَلِّي أَوْلَى أَنْ لا يُشَبِّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ مِمَّنْ قَدْ خَرَجَ إِلَيْهَا أَوْ هُوَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُهَا

**٩١٢-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ هَذِهِ الْأَخْبَارَ(١).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی کەراهەتی هەیە پەنجەکان بخرێنە نێو یەکدی لە کاتی نوێژدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەرزەنشتی کرد لە پەنجە خستنە نێو یەکدی لە کاتی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت و لەنێو مزگەوت، وە ڕایگەیاندووە ئەو کەسەی دەردەچێت بۆ نوێژ لەنێو نوێژدایە، کەواتە نوێژخوێن لەپێشترە پەنجەکانی نەخاتە نێو یەکدی لەو کەسەی کە بۆ مزگەوت، یان لەنێو مزگەوتدایە و چاوەڕوانی نوێژە

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودانەم لە پێشەوە باس کردووە.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ تَحْرِيكِ الْحَصَا بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

**٩١٣-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ، فَلَا يَمْسَحِ الْحَصَى»[١].

## باسی سەرزەنشتكردن لە جوڵاندنی بەرد بە دەستەواژەیەكی (مُجْمَل) كورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیكراوە و ڕوون

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەكێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژ، بێگومان ڕەحمەت و میهرەبانی بەرەوڕووی دێن، (كاتێ چووە سوژدە) با دەستكاری بەرد نەكات.

**٩١٤-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ، فَلَا تُحَرِّكُوا الْحَصَى»[٢].

---

(١) هذا الحديث تفرد به أبو الأحوص وهو مولى بني ليث أو بني غفار، وقد تفرد بالرواية عنه الزهري، قال عنه ابن حجر في التقريب: ((مقبل من الثلاثة، لم يرو عنه غير الزهري))، وقال عنه النسائي: ((لا نعرفه))، وقال ابن معين ((ليس بشيء))، وقال أبو أحمد الحاكم: ((ليس بالمتين عندهم))، وقال ابن القطان الفاسي: ((لا نعرف له حالاً)). ومع كل هذا فقد حسنه البغوي، وقال عنه ابن حجر في بلوغ المرام (٢٤١): ((رواه الخمسة بإسناد صحيح)).

أخرجه الحميدي (١٢٨)، وابن أبي شيبة (٧٨١٩)، وأحمد (١٤٩/٥)، والدارمي (١٣٩٥)، وأبو داود (٩٤٥)، وابن ماجه (١٠٢٧)، والترمذي (٢٧٩)، والنسائي (٦/٣)، وفي الكبرى له (٥٣٢) و (١١١٤)، وابن الجارود (٢١٩)، والطحاوي في شرح المشكل (١٤٢٧)، وابن حبان (٢٢٧٣)، والبيهقي (٢٨٤/٢)، والبغوي (٦٦٢) من طرق عن سفيان بن عيينة، عن الزهري، عن أبي الأحوص، بهذا الإسناد.

وأخرجه: الطيالسي (٤٧٦)، وعبدالرزاق (٢٣٩٩)، وأحمد (١٥٠/٤ و ١٧٩)، والطحاوي في شرح المشكل (١٤٢٦)، والطبراني في مسند الشاميين (١٨٠٤)، وابن حبان (٢٢٧٤)، والبغي (٦٦٣) من طرق عن الزهري، عن أبي الأحوص، بهذا الإسناد.

انظر: انحاف المهرة ٢١٢/١٤ (١٧٦٤٩).

(٢) انظر ما سبق عند الحديث (٩١٣).

أخرجه: ابن المبارك في الزهد (١١٨٥)، وعبدالرزاق (٢٣٩٨)، وأحمد (١٦٣/٥) من طرق عن معمر، به.

انظر: اتحاف المهرة ٢١٢/١٤ (١٧٦٤٩).




واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژ، بێگومان ڕەحمەت و میهرەبانی بەرەوڕووی دێت، (کاتێک چوونە سوژدە) دەستکاری بەرد مەکەن.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسِّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ أَبَاحَ مَسْحَ الْحَصَا فِي الصَّلَاةِ مَرَّةً وَاحِدَةً

٩١٥- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ فِيمَا قَبْلُ خَبَرَ مُعَيْقِيبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِنْ كُنْتَ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً»[١].

**باسی فەرموودەیەك (مُفَسِّر) ڕوونکەرەوەی ئەو دەستەواژە (مُجْمَل) کورت و ناڕوونەیە کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ یەك جار ڕێگەی داوە بە دەستکاریکردنی بەرد لەنێو نوێژدا (بە مەبەستی ڕێکخستن)**

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: پێشتر فەرموودەکەی موعەیقیبم ﷺ باس کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ: ئەگەر تۆ هەر دەستکاری بەردت کرد با جارێك بێت.

٩١٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى سَأَلْتُهُ عَنْ مَسْحِ الْحَصَى فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «وَاحِدَةٌ أَوْ دَعْ»[٢].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی هەموو شتێك، تەنانەت پرسیارم لێ کرد دەربارەی دەستکاریکردنی بەرد لەنێو نوێژدا، فەرمووی: یەکجار یان وازی لێ بێنە.

## بَابُ فَضْلِ تَرْكِ مَسْحِ الْحَصَا فِي الصَّلَاةِ

٩١٧- قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ حَدِيثَ جَابِرٍ ﷺ قَبْلُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

## باسی فەزڵ و گەورەیی وازهێنان لە دەستکاریکردنی بەرد لەنێو نوێژدا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: لە پێشەوە فەرموودەکەی جابیرم ﷺ باس کرد لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ تَغْطِيَةِ الْفَمِ فِي الصَّلَاةِ بِلَفْظِ خَبَرٍ مُجْمَلٍ غَيْرِ مُفَسَّرٍ

٩١٨ - عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ، وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ[١].

## باسی قەدەغەکردن لە داپۆشینی دەم لە نوێژدا بە دەستەواژەی (مُجْمَل) کورت و ناڕوون نەك (مُفَسَّر) شیکراوە و ڕوون

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە شۆڕکردنەوەی هەردوو دەست لە نوێژدا، وە نەهی کردووە لەوەی پیاو لە نوێژدا دەمی داپۆشێ.

## بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُفَسَّرِ لِلَّفْظَةِ الْمُجْمَلَةِ الَّتِي ذَكَرْتُهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ زَجْرَ النَّبِيِّ ﷺ عَنْ تَغْطِيَةِ الْفَمِ فِي الصَّلَاةِ فِي غَيْرِ التَّثَاؤُبِ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَمَرَ بِتَغْطِيَةِ الْفَمِ عِنْدَ التَّثَاؤُبِ

٩١٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسُدَّ بِيَدِهِ فَاهُ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ»[٢].

## باسی فەرموودەیەکی (مُفَسَّر) شیکراوە بۆ ئەو دەستەواژە (مُجْمَل) کورت و ناڕوونەی کە باسم کرد، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کردووە لە داپۆشینی دەم لە نوێژدا بەبێ باوێشك، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە داپۆشینی دەم لە کاتی باوێشکدان

---

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی دا با بەدەستی بەربەستی بکات (ئەگەر زۆری بۆ هێنا با دەستی چەپی بخاتە بەردەمی)، چونکە شەیتان دەچێتە نێو دەمیەوە.

## بَابُ كَرَاهَةِ التَّثَاؤُبِ فِي الصَّلَاةِ إِذْ هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ وَالْأَمْرِ بِكَظْمِهِ مَا اسْتَطَاعَ الْمُصَلِّي

**٩٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «التَّثَاؤُبُ فِي الصَّلَاةِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ»(١).

## باسی باوێشکدان لەنێو نوێژدا باش نییە و کەڕاهەتی هەیە، چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیە، وە فەرمانکردن بە گێڕانەوەی ئەوەندەی لە توانای نوێژخوێندایە

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باوێشك لەنێو نوێژدا لە شەیتانەوەیە، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە باوێشکی هات هەتا دەتوانێت با بیگێڕێتەوە، (ئەگەر هەر نەیتوانی با دەستی چەپی لەسەر دەمی دانێت).

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ قَوْلِ الْمُتَثَائِبِ فِي الصَّلَاةِ هَاهْ وَمَا أَشْبَهَهُ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَضْحَكُ فِي جَوْفِهِ عِنْدَ قَوْلِهِ: هَاهْ

**٩٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعُطَاسُ مِنَ اللَّهِ، وَالتَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَقُلْ: هَاهْ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَضْحَكُ فِي جَوْفِهِ»(٢).

## باسی سەرزەنشتکردن لە وتەی ئەو کەسەی لە نوێژدا باوێشك دەدات و دەڵێ: هاه، یان هاوشێوەی ئەوە، چونکە شەیتان لە کاتی وتنی ئەو قسەیە لەبەر خۆیەوە پێ دەکەنێت

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده حسن.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پژمین لەلایەن خواوەیە، باوێشکیش لەلایەن شەیتانەوەیە، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە، باوێشکی هات با نەڵێ: هاه، چونکە شەیتان لەبەر خۆیەوە پێ دەکەنێت.

**٩٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَقُلْ: آهْ آهْ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَضْحَكُ مِنْهُ، أَوْ قَالَ: «يَلْعَبُ بِهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ﷻ پژمینی خۆش دەوێ، وە حەزی لە باوێشك نییە، ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە، باوێشکی هات با نەڵێ: ئاه ئاه، چونکە شەیتان پێی پێ دەکەنێت، یان فەرمووی: گاڵتەی پێ دەکات.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ بَصْقِ الْمُصَلِّي أَمَامَهُ إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قِبَلَ وَجْهِ الْمُصَلِّي مَا دَامَ فِي صَلَاتِهِ مُقْبِلًا عَلَيْهِ

**٩٢٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَحَكَّهَا، أَوْ قَالَ: فَحَتَّهَا بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قِبَلَ وَجْهِ أَحَدِكُمْ فِي صَلَاتِهِ، فَلَا يَنْتَخِمَنَّ أَحَدٌ قِبَلَ وَجْهِهِ فِي صَلَاتِهِ»[٢].

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی نوێژخوێن تف فڕێ بداتە پێشی خۆی، چونکە خوای بەرز و مەزن ڕووی لە نوێژخوێنە مادام لە نوێژەکەیدایە و ڕووی تێ کردووە

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەڵغەمێکی بینی لە قیبلەی مزگەوت، کڕاندی یان بە دەستی لایبرد، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە بەتوڕەییەوە، فەرمووی: بەڕاستی خوا ڕوو دەکاتە هەر یەکێك لە ئێوە لە نوێژەکەیدا، با هیچ کەسێکتان لە نوێژەکەیدا بەڵغەم بەرەوڕووی خۆی فڕێ نەدات.

---

(١) إسناده حسن.

(٢) صحيح.

٩٢٤- عَنْ أَبِي وَائِلٍ، أَنَّ شَيْثَ بْنَ رِبْعِيٍّ صَلَّى إِلَى جَنْبِ حُذَيْفَةَ، فَبَزَقَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ ﷺ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا عَنْ ذَلِكَ قَالَ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا دَخَلَ فِي صَلَاتِهِ أَقْبَلَ اللَّهُ بِوَجْهِهِ، فَلَا يَنْصَرِفُ عَنْهُ حَتَّى يَنْصَرِفَ عَنْهُ، أَوْ يُحْدِثَ حَدَثًا»(١).

واتە: ئەبو وائیل دەگێڕێتەوە، شەیسی کوڕی ڕیبعی لە تەنیشت حوزەیفە نوێژی کرد، تفی کردە پێشی خۆی، حوزەیفە ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی لێ کردووین ئەو کارە بکەین، فەرموویەتی: بەڕاستی پیاو ئەگەر چووە نێو نوێژەکەیەوە خوا بە ڕوخساری خۆی ڕووی تێ دەکات، ڕووی لێ وەرناچەرخێنێ تا ئەو ڕووی لێ وەرنەچەرخێنێ، یان دەستنوێژی بشکێ.

## بَابُ ذِكْرِ عِلَاقَةِ الْبَاصِقِ فِي الصَّلَاةِ تِلْقَاءَ الْقِبْلَةِ مَجِيئُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَتَفْلَتُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ

٩٢٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَفَلَ تُجَاهَ الْقِبْلَةِ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَتَفْلَتُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ»(٢).

## باسی ئەو کەسەی لە نوێژەکەیدا تف بە ئاراستەی قیبلە دەکات لە ڕۆژی دوایی دێت تفەکە بە نێوچاوانیەوەیەتی

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە ڕووی قیبلە تف بکات لە ڕۆژی قیامەت دێت تفەکەی بە نێوچاوانیەوەیەتی.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ تَوْجِيهِ جَمِيعِ مَا يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ أَذًى تِلْقَاءَ الْقِبْلَةِ فِي الصَّلَاةِ

٩٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَاسْتَبْرَأَهَا بِعُودٍ مَعَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى الْقَوْمِ، يَعْرِفُونَ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ صَاحِبُ هَذِهِ النُّخَامَةِ؟» فَسَكَتُوا، فَقَالَ: «أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي أَنْ يَسْتَقْبِلَهُ رَجُلٌ فَيَتَنَخَّعُ فِي وَجْهِهِ؟» فَقَالُوا: لَا

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

قَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ فِي صَلَاتِكُمْ، فَلَا تُوَجِّهُوا شَيْئًا مِنَ الْأَذَى بَيْنَ أَيْدِيكُمْ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِ أَحَدِكُمْ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ»[1].

## باسی سەرزەنشتکردن لە فڕێدانی هەموو ئەوانەی کە پیسن بەرەوڕووی قیبلە لە نوێژدا

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵغەمێکی لە قیبلەی مزگەوت بینی بە دارێك لایدا، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە، تورەییان بە ڕوخسارییەوە دەبینی، فەرمووی: کێ لە ئێوە خاوەنی ئەو بەڵغەمەیە؟ هەموویان بێدەنگ بوون، فەرمووی: ئایا یەکێك لە ئێوە پێی خۆشە کاتێ هەڵبستێ نوێژ بکات پیاوێك لە پێشی بێت تف بەرەوڕووی ئەو بکات؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: بێگومان خوا ﷻ لە کاتی نوێژکردنتان لە پێشتانەوەیە، هیچ شتێکی پیس فڕێ مەدەنە پێشی خۆتان، بەڵکوو با فڕێی بداتە لای چەپی یان ژێرپێی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ بَزْقِ الْمُصَلِّي عَنْ يَمِينِهِ

**٩٢٧-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ أَمْلَيْتُ بَعْضَ الْأَخْبَارِ الَّتِي فِي هَذِهِ اللَّفْظَةِ قَبْلُ[2].

## باسی قەدەغەکردن لەوەی نوێژخوێن تف بکاتە لای ڕاستی لە کاتی نوێژدا

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: پێشتر بەشێك لەو فەرموودانەم باس کرد کە پەیوەستە بەم بەشەوە.

## بَابُ كَرَاهَةِ نَظَرِ الْمُصَلِّي إِلَى مَا يَشْغَلُهُ عَنِ الصَّلَاةِ

**٩٢٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلَامٌ، فَقَالَ: «شَغَلَتْنِي أَعْلَامُ هَذِهِ، اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَائْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةٍ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## باسی باشنەبوون و ناپەسەندی ئەوەی نوێژخوێن لەنێو نوێژ تەماشای ئەو شتە بکات کە سەرقاڵی دەکات لە نوێژ

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد پۆشاکێکی گوڵدار لەسەر شانی بوو، فەرمووی: نەخشەکانی ئەم پۆشاکە سەرقاڵیان کردم، بیبەنەوە بۆ لای ئەبو جەهمی (کوڕی حوزەیفە) پۆشاکێکی دیکەم بۆ بێنن نەخشی بەسەرەوە نەبێت.

**٩٢٩-** عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂ بِـهَذَا[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە هاتووە.

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الِالْتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ

**٩٣٠-** عَنِ الْحَارِثِ الْأَشْعَرِيِّ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَدَّثَهُمْ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ يَعْمَلُ بِهِنَّ، وَيَأْمُرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ قَالَ: فَكَانَ يُبْطِئُ بِهِنَّ، فَقَالَ لَهُ عِيسَى: إِنَّكَ أُمِرْتَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ تَعْمَلُ بِهِنَّ، وَتَأْمُرُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهِنَّ، فَإِمَّا أَنْ تَأْمُرَهُمْ بِهِنَّ، وَإِمَّا أَنْ أَقُومَ فَآمُرَهُمْ بِهِنَّ قَالَ يَحْيَى: إِنَّكَ إِنْ تَسْبِقْنِي بِهِنَّ أَخَفْ أَنْ أُعَذَّبَ أَوْ يُخْسَفَ بِي، فَجَمَعَ بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ حَتَّى امْتَلَأَ الْمَسْجِدُ، حَتَّى جَلَسَ النَّاسُ عَلَى الشُّرُفَاتِ، فَوَعَظَ النَّاسَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَنِي بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَعْمَلُ بِهِنَّ، وَآمُرُكُمْ أَنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ، أُولَاهُنَّ، أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا؛ فَإِنَّ مَنْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ مَثَلُهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْدًا مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِذَهَبٍ أَوْ وَرِقٍ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: هَذِهِ دَارِي وَعَمَلِي، فَاعْمَلْ لِي وَأَدِّ إِلَيَّ عَمَلَكَ، فَجَعَلَ يَعْمَلُ وَيُؤَدِّي عَمَلَهُ إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ لَهُ عَبْدٌ كَذَلِكَ، يُؤَدِّي عَمَلَهُ لِغَيْرِ سَيِّدِهِ، وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ خَلَقَكُمْ وَرَزَقَكُمْ فَلَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَمَرَكُمْ بِالصَّلَاةِ، فَإِذَا نَصَبْتُمْ وُجُوهَكُمْ فَلَا تَلْتَفِتُوا؛ فَإِنَّ اللَّهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ حِينَ يُصَلِّي لَهُ، فَلَا يَصْرِفُ عَنْهُ وَجْهَهُ حَتَّى يَكُونَ الْعَبْدُ هُوَ يَنْصَرِفُ وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِه[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی قەدەغەکردنی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا

واتە: حاریسی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردن فەرموویەتی: خوای بەرز و مەزن فەرمانی کرد بە یەحیای کوڕی زەکەریا بە پێنج وشە کردەوەیان پێ بکات، وە فەرمان بکات بە نەوەکانی ئیسرائیل کردەوەی پێ بکەن، فەرمووی: خاوەخاوی تێدا دەکرد، عیسا پێی فەرموو: تۆ فەرمانت پێ کراوە بە پێنج وشە کردەوەیان پێ بکەیت و فەرمانیش بە نەوەکانی ئیسرائیل بکەیت کردەوەی پێ بکەن، جا یان تۆ فەرمانیان پێ بکە، یان من هەڵدەستم فەرمانیان پێ دەکەم، یەحیا وتی: تۆ ئەگەر پێشم بکەویت ئەترسم سزا بدرێم یان بخرێم بە ناخی زەویدا، نەوەکانی ئیسرائیلی لەنێو بەیتولمەقدیس کۆ کردەوە تا مزگەوتەکە پڕ بوو، وە تا خەڵکەکە لەسەر بەرزاییەکان دانیشتن، ئینجا ئامۆژگاری خەڵکەکەی کرد، پاشان وتی: خوا ﷻ فەرمانی پێ کردووم بە پێنج وشە خۆم کردەوەی پێ بکەم و فەرمانیش بکەم بە ئێوە کردەوەی پێ بکەن: یەکەمینیان ئەوەیە خوا بپەرستن و بە هیچ شێوەیەك هاوبەشی بۆ دامەنێن، چونکە هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت نموونەی ئەو کەسە وەکوو پیاوێکە کۆیلەیەکی بە ماڵ و سامانی کڕیبێت بە زێڕ بێت یان زیو، پاشان پێی بڵێ: ئەمە ماڵەکەمە و ئەمەش کارەکەمە، کارم بۆ بکە و بەرهەمەکەم بۆ بهێنە، جا کۆیلەکەش ئیش و کاری تێدا بکات بەرهەمەکەی ببات بۆ کەسێکی دیکە جگە لە گەورەکەی، جا کێ لە ئێوە پێی خۆشە کۆیلەیەکەی بەو شێوەیەی هەبێت، بەرهەمی کارەکەی ببات بۆ جگە لە گەورەکەی، بێگومان خوا ﷻ دروستی کردوون و ڕزق و ڕۆزی داون، تەنها ئەو بپەرستن و هاوبەشی بۆ دامەنێن، وە فەرمووی: خوا ﷻ فەرمانی پێ کردوون بە نوێژکردن، جا کاتێ ڕووتان کردە ڕووگە ئاوڕ مەدەنەوە، چونکە خوا ﷻ بە ڕوخساری ڕوو دەکاتە بەندەکەی کاتێ کە نوێژ دەکات، ڕووی لێ وەرناچەرخێنێ هەتا بەندەکەی ڕوو وەردەچەرخێنێ. دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد.

## بَابُ ذِكْرِ نَقْصِ الصَّلَاةِ بِالِالْتِفَاتِ فِيهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الِالْتِفَاتَ فِيهَا لَا يُوجِبُ إِعَادَتَهَا

**٩٣١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْتِفَاتِ الرَّجُلِ فِي الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ»(١).

## باسی ئەوەی نوێژکردن بە ئاوڕدانەوە کەموکورتی تێ دەکەوێت، بەڵگەش لەسەر ئەوەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا دووبارەکردنەوەی نوێژەکە پێویست (واجب) ناکات

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا، فەرمووی: بێگومان ئەوە دزینێکە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیدزێت (واتە: شەیتان وای لێ دەکات ئەو کارە بکات تا بەو هۆیەوە کەموکوڕی بخاتە نێو نوێژەکەی).

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ دُخُولِ الْحَاقِنِ الصَّلَاةِ وَالْأَمْرِ بِبَدْءِ الْغَائِطِ قَبْلَ الدُّخُولِ فِيهَا

**٩٣٢-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَرْقَمِ ﵄، أَنَّهُ كَانَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَجَاءَ وَقَدْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَقَالَ: لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَحَضَرَ الْغَائِطُ فَابْدَءُوا بِالْغَائِطِ»(٢).

## باسی سەرزەنشتکردن لەوەی کەسێك تەنگاو بێت و بچێت نوێژ بکات، وە فەرمانکردن بەوەی سەرەتا سەرئاو بکات پێش ئەوەی بچێتە نێو نوێژەوە

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە، لە عەبدوڵای کوڕی ئەرقەمەوە ﵄، ئەو پیشنوێژی قەومەکەی دەکرد، کاتێ هات قامەتی نوێژ کرابوو، وتی: با یەکێکتان پێشنوێژی بکات، چونکە من گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر کاتی نوێژ هات و کاتی سەرئاوکردن هات سەرەتا سەرئاو بکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنْ مُدَافَعَةِ الْغَائِطِ وَالْبَوْلِ فِي الصَّلَاةِ

**٩٣٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ابْنُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيق ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَائِشَةَ فَجِيءَ بِطَعَامٍ فَقَامَ الْقَاسِمُ يُصَلِّي، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يُصَلَّى صَلَاةٌ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ، وَلَا وَهُوَ يُدَافِعُهُ الْأَخْبَثَانِ»[١].

## باسی سەرزەنشتکردن لەو کەسەی پیسی و میزکردن لەنێو نوێژ تەنگی پێ هەڵبچنن

واتە: عەبدوڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری صدیق ﷺ دەڵێ: ئێمە لەلای عائیشە بووین خواردن هێنرا، قاسم هەستا نوێژ بکات، عائیشە ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ نوێژێك ئەنجام نادرێت لە کاتێکدا خواردن ئامادە بێت، وە لە کاتێکیشدا دوو پیسییەکە (پیسی و میزکردن) تەنگی پێ هەڵچنیبێت.

## بَابُ الْأَمْرِ بِبَدْءِ الْعَشَاءِ قَبْلَ الصَّلَاةِ عِنْدَ حُضُورِهَا

**٩٣٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَؤوا بِالْعَشَاءِ»[٢].

## باسی فەرمانکردن بە دەستپێکردنی خواردن پێش نوێژ لە کاتی ئامادەبوونی

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خواردن ئامادە بوو، وە قامەتیش بۆ نوێژ کرا، ئەوە سەرەتا دەست بە خواردنەکە بکەن.

**٩٣٥-** عَنِ نافع عَن ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ، وَنُودِيَ بِالصَّلَاةِ، فَابْدَؤوا بِالْعَشَاءِ قَالَ وَتَعَشَّى ابْنُ عُمَرَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، وَهُوَ يُسْمَعُ قِرَاءَةَ الْإِمَامِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خواردن دانرا و کاتی نوێژیش هات، ئەوە سەرەتا دەست بە خواردنەکە بکەن، وتی: ئیبنو عومەر شەوێك نانی دەخوارد گوێیشی لە قورئانخوێندنی پێشنوێژ بوو.

## بَابُ الزَّجْرِ عَنِ الِاسْتِعْجَالِ عَنِ الطَّعَامِ قَبْلَ الْفَرَاغِ مِنْهُ عِنْدَ حُضُورِ الصَّلَاةِ

**٩٣٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ عَلَى طَعَامٍ فَلَا يَعْجَلَنَّ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ وَإِنْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ»(١).

## باسی سەرزەنشتکردن لە پەلەکردن لە خواردن پێش لێبوونەوەی لە کاتی ئامادەبوونی نوێژ

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە لەسەر خواردن بوو با پەلە نەکات تا لە خواردنەکەی دەبێتەوە ئەگەرچی قامەتیش کرا بۆ نوێژ.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْمُرَاءَاةِ بِتَزْيِينِ الصَّلَاةِ وَتَحْسِينِهَا

**٩٣٧-** عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ إِيَّاكُمْ وَشِرْكَ السَّرَائِرِ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا شِرْكُ السَّرَائِرِ؟ قَالَ: «يَقُومُ الرَّجُلُ فَيُصَلِّي فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ جَاهِدًا لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ النَّاسِ إِلَيْهِ، فَذَلِكَ شِرْكُ السَّرَائِرِ»(٢).

## باسی هەڕەشەکردن لە ڕازاندنەوەی نوێژ و جوانکردنی بەمەبەستی ڕیایی

واتە: مەحمودی کوڕی لەبید ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ نێومان فەرمووی: ئەی خەڵکینە، خۆتان بەدوور بگرن لە هاوبەشدانانی نهێنی. وتیان: هاوبەشدانانی نهێنی چییە؟ فەرمووی: پیاوێك هەڵدەستێت نوێژ دەکات نوێژەکەی دەڕازێنێتەوە لەبەرئەوەی خەڵکی ببینن، ئا ئەوەیە هاوبەشدانانی نهێنی.

---

(١) صحيح.
(٢) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ نَفْيِ قَبُولِ صَلَاةِ الْمُرَائِي بِهَا

**٩٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ قَالَ: «أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ فَمَنْ عَمَلَ عَمَلًا فَأَشْرَكَ فِيهِ غَيْرِي فَأَنَا مِنْهُ بَرِيءٌ وَهُوَ لِلَّذِي أَشْرَكَ»[١].

## باسی ڕەتکردنەوەی وەرگرتنی نوێژی ڕیاباز و ڕووپامابەر

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردگاریەوە گێڕاویەتەوە دەفەرمووێ: من بێنیازترینی هاوبەشەكانم لە هاوبەشدانان، هەر كەسێك كردەوەیەك ئەنجام بدات كەسێكی دیكە لەگەڵ مندا بكات بە هاوبەش ئەوە من لێی بێبەریم، ئەو كردەوەیەی كە كردوویەتی بۆ هاوبەشەكەیە.

## بَابُ نَفْيِ قَبُولِ صَلَاةِ شَارِبِ الْخَمْرِ

**٩٣٩-** عَن عُروَةَ بنِ رُوَيمِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ الَّذِي كَانَ يَسْكُنُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ، أَنَّهُ مَكَثَ فِي طَلَبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ، فَسَأَلَ عَنْهُ قَالُوا: قَدْ سَارَ إِلَى مَكَّةَ، فَأَتْبَعَهُ فَوَجَدَهُ قَدْ سَارَ إِلَى الطَّائِفِ فَأَتْبَعَهُ فَوَجَدَهُ فِي زُرْعَةٍ يَمْشِي مُخَاصِرًا رَجُلًا مِنْ قُرَيْشٍ، وَالْقُرَيْشِيُّ يُزَنُّ بِالْخَمْرِ، فَلَمَّا لَقِيتُهُ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيَّ قَالَ: مَا عَدَا بِكَ الْيَوْمَ، وَمِنْ أَيْنَ أَقْبَلْتَ، فَأَخْبَرْتُهُ، ثُمَّ سَأَلْتُهُ، هَلْ سَمِعْتَ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَكَرَ شَرَابَ الْخَمْرِ بِشَيْءٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَانْتَزَعَ الْقُرَشِيُّ يَدَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي فَيُقْبَلُ لَهُ صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا»[٢].

## باسی قبووڵنەبوونی نوێژی ئارەقخۆر

واتە: عورووەی كوڕی ڕووەیمی كوڕی دەیلەمی، كە نیشتەجێی بەیتولمەقدیس بوو، دەگێڕێتەوە كە دیتی عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص لە مەدینە مایەوە و

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

پرسیاری دەربارەی کرد، وتیان: ڕۆیشتووە بۆ مەککە، ئەویش شوێنی کەوت بۆ مەککە، ئینجا هەواڵی پێ درا چووە بۆ تائیف، ئیدی بە شوێنیدا ڕۆیشت، لەنێو کشتوکاڵێکدایە دیتیەوە، لەو کاتەدا لەگەڵ پیاوێکی قورەیشی قۆڵیان لە قوڵی یەکدیدا بوو، کابرای قورەیشی تۆمەتی ئەوەی لەسەر بوو ئارەقخۆرە، جا کاتێ بە عەبدوڵا گەیشتم سەلامم لێ کرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەمی دایەوە، وتی: چی ئەمڕۆ تۆی سەرقاڵ کردووە و لەکوێوە هاتووی، منیش ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، پاشان پرسیارم لێ کرد کە ئایا ئەی عەبدوڵای کوڕی عەمر ﭫ هیچ شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە دەربارەی ئارەقخۆر؟ وتی: بەڵێ، ئیدی کابرای قورەیشی دەستی عەبدوڵای بەردا و پاشان ڕۆیشت، ئینجا وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ ئارەقخۆرێك نییە لە ئوممەتی من کە ئارەق بخوات تاکوو چل ڕۆژ نوێژی لێ وەربگیرێ.

## بَابُ نَفْيِ قَبُولِ صَلَاةِ الْمَرْأَةِ الْعَاصِيةِ لِزَوْجِهَا، وَصَلَاةِ الْعَبْدِ الْآبِقِ

٩٤٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﭫ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ لَهُمْ صَلَاةً وَلَا يَصْعَدُ لَهُمْ حَسَنَةٌ: الْعَبْدُ الْآبِقُ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى مَوَالِيهِ، فَيَضَعُ يَدَهُ فِي أَيْدِيهِمْ، وَالْمَرْأَةُ السَّاخِطُ عَلَيْهَا زَوْجُهَا حَتَّى يَرْضَى، وَالسَّكْرَانُ حَتَّى يَصْحُوَ»[1].

## باسی قبووڵنەبوونی نوێژی ئەو ئافرەتەی کە لە مێردەکەی یاخییە، هەروەها نوێژی ئەو کۆیلەیەش کە یاخی بووە لە گەورەکەی

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﭫ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن خوا ﷻ نە نوێژیان لێ وەردەگرێ و نە کردەوە چاکەکانیان بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان: کۆیلەیەکی یاخی هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لای گەورەکەی و دەستی دەخاتە نێو دەستیان، ئافرەتێکیش مێردەکەی لێی تورە بێت هەتا مێردەکەی لێی ڕازی دەبێ، سەرخۆشێکیش هەتا دێتەوە هۆش خۆی.

---

(١) إسناده ضعيف.

**٩٤١-** عَنْ جَرِيرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَبَقَ الْعَبْدُ لَمْ يُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى مَوَالِيهِ»(١).

واته: جەرير ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كۆیلە یاخی بوو (لە گەورەكەی) نوێژی وەرناگیرێ تا دەگەڕێتەوە بۆ لای گەورەكەی.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي النَّوْمِ عِنْدَ الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ

**٩٤٢-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ لِأَصْحَابِهِ: «هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رُؤْيَا فَيَقُصُّ عَلَيْهِ مَنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُصَّ، وَإِنَّهُ قَالَ لَنَا ذَاتَ غَدَاةٍ: إِنَّهُ أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ، وَإِنَّهُمَا ابْتَعَثَانِي، فَقَالَا لِي: انْطَلِقْ، انْطَلِقْ، فَأَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ وَإِذَا آخَرُ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِهِ بِصَخْرَةٍ، وَإِذَا هُوَ يَهْوِي بِالصَّخْرَةِ فَيَبْلُغُ رَأْسَهُ، فَيُدَهْدِهُ الْحَجَرَ هَاهُنَا، فَيَتْبَعُهُ، فَيَأْخُذُهُ، فِمَا يَرْجِعُ إِلَيْهِ حَتَّى يُصْبِحَ رَأْسُهُ كَمَا كَانَ، ثُمَّ يَعُودُ عَلَيْهِ، فَيَفْعَلُ بِهِ كَمَا فَعَلَ الْمَرَّةَ الْأُولَى، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ، وَقَالَ: قَالَا: أَمَا إِنَّا سَنُخْبِرُكَ، أَمَّا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتَ عَلَيْهِ يُثْلَغُ رَأْسُهُ؛ فَإِنَّهُ رَجُلٌ يَأْخُذُ الْقُرْآنَ فَيَرْفُضُهُ وَيَنَامُ عَنِ الصَّلَاةِ الْمَكْتُوبَةِ وَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ»(٢).

## باسی هەڕەشەكردن لە خەوتن لە كاتی نوێژی فەڕز

واته: سەمورەی كوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەكانی دەفەرموو: ئایا كەسێك لە ئێوە خەوێكی بینیوە، ئیدی ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بووایە خەویان بۆی باس دەكرد، پێغەمبەر ﷺ بەیانییانێك پێیانی فەرموو: ئەمشەو دوو كەس هاتن بۆ لام و منیان لەگەڵ خۆیان برد، پێیان وتم: بەڕێ كەوە، بەڕێ كەوە، (منیش لەگەڵیان بەڕێ كەوتم) تا گەیشتین بە پیاوێك ڕاكشا بوو، كەسێكی دیكەش بەسەر سەریەوە وەستابوو بە بەردێكەوە، بەردی دەدا بە سەریدا و سەری دەشكاند و پانی دەكردەوە، بەردەكەش بەملا و بەولادا دەڕۆیشت، كابراش شوێنی بەردەكە دەكەوت و هەڵیدەگرت، هەر جارێ دەگەڕایەوە سەری كابرا وەك خۆی لێ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

دەهاتەوە چاك دەبۆیەوە، ئەویش دیسان وەکوو جاری یەکەم سەری پێ دەشکاند -دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد- فەرمووی: وتیان: ئێستا هەواڵت پێ ئەدەین دەربارەی ئەوانە، جا ئەو پیاوەی کە هاتی بۆ لای سەری دەشکێنرا بە بەرد، ئەوە ئەو پیاوەیە کە قورئان وەردەگرێت و ڕەتی دەکاتەوە، وە بۆ نوێژە فەرزەکان لەخەو هەڵناستێ -دواتر فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد-.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ الْفَرِيضَةِ فِي السَّفَرِ

### بَابُ فَرْضِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ مِنْ عَدَدِ الرَّكَعَاتِ بِذِكْرِ خَبَرٍ لَفْظُهُ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ

**٩٤٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ ﷻ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً»[١].

## کۆباسی نوێژە فەرزەکان لە کاتی گەشتکردندا

### باسی ژمارەی ڕکاتی نوێژە فەرزەکان لە گەشتدا، بە باسکردنی دەستەواژەی فەرموودەیەك دەستەواژەکەی (عَام) گشتییە مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: خوا ﷻ فەرزی کردووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ لە شوێنی نیشتەجێبوون چوار ڕکات نوێژ، لە گەشتیشدا دوو ڕکات، لە کاتی ترسیش یەك ڕکات.

### بَابُ ذِكْرِ الْخَبَرِ الْمُبَيِّنِ بِأَنَّ اللَّفْظَةَ الَّتِي ذَكَرْتُهَا فِي خَبَرِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ لَفْظٌ عَامٌّ مُرَادُهُ خَاصٌّ، أَرَادَ أَنَّ فَرْضَ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ خَلَا الْمَغْرِبِ

**٩٤٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: فَرْضُ صَلَاةِ السَّفَرِ وَالْحَضَرِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ زِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ رَكْعَتَانِ رَكْعَتَانِ، وَتُرِكَتْ صَلَاةُ الْفَجْرِ بِطُولِ الْقِرَاءَةِ، وَصَلَاةُ الْمَغْرِبِ لِأَنَّهَا وِتْرُ النَّهَارِ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

**باسی فەرموودەیەك ڕوونكەرەوەیە بۆ ئەو دەستەواژەیەی كە لە فەرموودەكەی ئیبنو عەباس ﷺ باسم كرد، دەستەواژەیەكی (عَام) گشتییە مەبەستی پێی (خَاص) تایبەتە، مەبەستی ئەوەیە نوێژی فەڕز لە گەشتدا دوو ڕكاتە جگە لە ئێوارە (شێوان)**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: نوێژی گەشت و نیشتەجێبوون (ماڵەوە) دوو ڕكات دوو ڕكات فەڕز كرا، كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە جێگیر بوو، نوێژی نیشتەجێ دوو ڕكاتی لێ زیاد كرا، نوێژ بەیانیش وازی لێ هێنرا (بە دوو ڕكات مایەوە) لەبەر قوڕئانخوێندنی زۆر تیایدا، هەروەها نوێژی ئێوارەش (بە سێ ڕكات) چونكە ویتری (نوێژەكانی) ڕۆژە.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ يُبِيحُ الشَّيْءَ فِي كِتَابِهِ بِشَرْطٍ وَقَدْ يُبِيحُ ذَلِكَ الشَّيْءَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ بِغَيْرِ ذَلِكَ الشَّرْطِ الَّذِي أَبَاحَهُ فِي الْكِتَابِ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ ذِكْرُهُ إِنَّمَا أَبَاحَ فِي كِتَابِهِ قَصْرَ الصَّلَاةِ إِذَا ضَرَبُوا فِي الْأَرْضِ عِنْدَ الْخَوْفِ مِنَ الْكُفَّارِ أَنْ يَفْتِنُوا الْمُسْلِمِينَ، وَقَدْ أَبَاحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ ﷺ الْقَصْرَ وَإِنْ لَمْ يَخَافُوا أَنْ يَفْتِنَهُمُ الْكُفَّارُ، مَعَ الدَّلِيلِ أَنَّ الْقَصْرَ فِي السَّفَرِ إِبَاحَةٌ لَا حَتْمٌ أَنْ يَقْصُرُوا الصَّلَاةَ.**

**٩٤٥-** عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: عَجِبْتُ لِلنَّاسِ وَقَصْرِهِمْ لِلصَّلَاةِ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴿١٠١﴾﴾ النساء، وَقَدْ ذَهَبَ هَذَا، فَقَالَ عُمَرُ ﷺ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «هُوَ صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ»[١].

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ هەندێ جار ڕێگا بە شتێك دەدات لە كتێبەكەیدا بە مەرج، هەندێ جاریش ڕێگا بەو شتە دەدات لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی ﷺ بەبێ ئەو مەرجەی كە لە كتێبەكەیدا ڕێگەی پێ داوە، چونكە خوا ﷻ لە كاتێكدا ڕێگەی داوە بە كورتكردنەوەی نوێژ ئەگەر بگەڕێن**

---

(١) صحيح.

**بەسەر زەویدا (بۆ جیهادکردن) لە کاتێکدا بترسن لە بێباوەڕان جەنگیان لەگەڵ بکەن، هەروەها خوا ﷻ لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕێگای بە کورتکردنەوەی نوێژ داوە ئەگەرچی نەترسن لەوەی بێباوەڕان بجەنگن لەگەڵیان، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کورتکردنەوەی نوێژ لە گەشتدا ڕێگەپێدراوە نەك پێویست بێت کورتی بکەنەوە**

واتە: یەعلای کوڕی ئومەیە دەڵێ: بە عومەری کوڕی خەتابم ﷺ وت: سەرم لەو خەڵکە سوڕماوە نوێژەکانیان کورت دەکەنەوە، لە کاتێکدا خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: هەر کاتێك سەفەرتان کرد و گەڕان بە زەویدا ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە کە هەندێ لە نوێژەکەتان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترسان ئەوانەی بێباوەڕن جەنگتان لەگەڵ بکەن. بێگومان ئەو (ترسە) ڕۆیشت، عومەر ﷺ وتی: منیش سەرم سوڕما لەوەی تۆ سەرت لێی سوڕما، ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەخششێکی خوایە بەخشیویەتی پێتان، بەخششەکەی وەربگرن.

**بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَلَّى نَبِيَّهُ الْمُصْطَفَى ﷺ تِبْيَانَ عَدَدِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ لَا أَنَّهُ عَزَّ ذِكْرُهُ بَيَّنَ عَدَدَهَا فِي الْكِتَابِ بِوَحْيٍ مِثْلِهِ مَسْطُورٍ بَيْنَ الدَّفَّتَيْنِ، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَجْمَلَ اللَّهُ فَرْضَهُ فِي الْكِتَابِ وَوَلَّى نَبِيَّهُ تِبْيَانَهُ عَنِ اللَّهِ بِقَوْلٍ وَفِعْلٍ. قَالَ اللَّهُ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.**

**٩٤٦-** عَنْ أُمَيَّةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خَالِدٍ، أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: إِنَّا نَجِدُ صَلَاةَ الْحَضَرِ وَصَلَاةَ الْخَوْفِ فِي الْقُرْآنِ، وَلَا نَجِدُ صَلَاةَ السَّفَرِ فِي الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ رضي الله عنه: يَا ابْنَ أَخِي، إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بَعَثَ إِلَيْنَا مُحَمَّدًا ﷺ، وَلَا نَعْلَمُ شَيْئًا، فَإِنَّمَا نَفْعَلُ كَمَا رَأَيْنَا مُحَمَّدًا ﷺ يَفْعَلُ[1].

---

(١) عبدالله بن أبي بكر بن عبدالرحمن ترجم له البخاري في تاريخه الكبير ٥/ الترجمة ١٢١، وقال: ((لا يصح حديثه)).

أخرجه: عبدالرزاق (٤٢٧٦)، وأحمد (٩٤/٢ و ١٤٨)، وابن ماجه (١٠٦٦)، والنسائي (٢٦٦/١) و (١١٧/٣)، وفي الكبرى له (١٨٩٢)، وابن حبان (١٤٥١) و (٢٧٣٥)، والحاكم (٢٥٨/١)، والبيهقي (١٣٦/٣)، وابن عبد البر في التمهيد (١٦٣/١١)، والمزي في تهذيب الكمال (٢٨٥/١).

وأخرجه: مالك في الموطأ (٢٨٩) برواية الليثي، وأحمد (٦٥/٢)، لكنهم أبهموا اسم الرجل الذي سأل ابن عمر.

**باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاسپاردووە ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژی گەشت ڕوون بکاتەوە، نەك خوا ﷻ لە کتێبەکەیدا بە هەمان وەحی ڕوونی کردبێتەوە، ئەمەش لەو شێوازانەیە کە خوا ﷻ بەکورتی فەرزبوونی باس کردووە لە کتێبەکەیدا، پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاسپاردووە ڕوونی بکاتەوە بە گوفتار و کردار، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: قورئانیشمان بۆ تۆ نارد بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە**

واتە: ئومەیەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی خالید دەگێڕێتەوە ئەو بە عەبدوڵای کوڕی عومەری ﷺ وت: ئێمە نوێژی نیشتەجێ و نوێژی ترس لە قورئاندا دەبینین، بەڵام نوێژی گەشت لە قورئاندا نابینین؟ عەبدوڵا ﷺ پێی وت: ئەی برازام خوا موحەممەدی ﷺ بۆ نێومان نارد هیچمان نەدەزانی، ئێمە ئەوە دەکەین کە بینیمان ئەو دەیکرد.

**٩٤٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَافَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، فَكَانُوا يُصَلُّونَ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، لَا يُصَلُّونَ قَبْلَهَا، وَلَا بَعْدَهَا وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: لَوْ كُنْتُ مُصَلِّيًا قَبْلَهَا أَوْ بَعْدَهَا لَأَتْمَمْتُهَا[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەرم کرد، هەروەها لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیش، ئەوان نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان دوو ڕکات دوو ڕکات دەکرد (واتە: دوو ڕکات نیوەڕۆ و دوو ڕکات عەسر) نە لەپێشی (ئەو نوێژانە) نوێژیان دەکرد نە لە دوایانیشەوە. عەبدوڵای کوڕی عومەر وتی: ئەگەر من نوێژم بکردایە لە پێش ئەو نوێژانە یان لە دوایانەوە ئەوە نوێژی (عەسر و نیوەڕۆم) بەتەواوی دەکرد. (بەبێ کورتکردنەوە).

**٩٤٨-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَفِي خَبَرِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَالْعَصْرَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ دَالٌّ عَلَى أَنَّ لِلْآمِنِ غَيْرِ الْخَائِفِ مِنْ أَنْ يَفْتِنَهُ الْكُفَّارُ أَنْ يَقْصُرَ الصَّلَاةَ[2].

---

انظر: إتحاف المهرة ٢٦٩/٨ (٩٣٥٠).

(١) إسناده ضعيف.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: وە لە فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیکدا ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆی کرد، وە لە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) دوو ڕکات نوێژی عەسری کرد. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسەکە لە ئاساییش و هێمنیدا بوو، لە هیچ شتێك نەدەترسا بۆی هەیە نوێژ کورت بکاتەوە.

**٩٤٩-** وَكَذَلِكَ خَبَرُ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ ﷺ صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ أَكْثَرَ مَا كُنَّا وَآمَنُهُ، وَخَبَرُ أَبِي حَنْظَلَةَ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قُلْتُ: إِنَّا آمِنُونَ قَالَ: كَذَلِكَ سَنَّ النَّبِيُّ ﷺ، يَدُلُّ عَلَى أَنَّ لِغَيْرِ الْخَائِفِ قَصْرَ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ[١].

واتە: بەهەمان شێوە لە فەرموودەکەی حاریسی کوڕی وەهب ﷺ هاتووە: پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکاتی بۆ کردین لە ئەوپەڕی ئاساییش و هێمنیدا بووین، وە فەرموودەکەی ئەبو حەنزەلە لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە، وتم: ئێمە لە ئاساییشدا بووین، وتی: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەوشێوە بوو، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە بۆ جگە لە ترس لە گەشتدا نوێژ کورت بکرێتەوە.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ قَصْرِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ لِقَبُولِ الرُّخْصَةِ الَّتِي رَخَّصَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، إِذِ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ إِتْيَانَ رُخَصِهِ الَّتِي رَخَّصَهَا لِعِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ

**٩٥٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى رُخْصَه، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَةٌ»[٢].

## باسی چاکتر وایە لە گەشتدا نوێژ کورت بکرێتەوە لەبەر وەرگرتنی ئەو مۆڵەتەی کە خوا ﷻ مۆڵەتی پێ داوە، چونکە خوا پێی خۆشە کار بە مۆڵەتەکانی بکرێت کە مۆڵەتی داوە بە بەندە باوەڕدارەکانی

واتە: عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا حەز دەکات مۆڵەتەکانی وەربگیرێ وەك چۆن پێی ناخۆشە سەرپێچی بکرێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## بَابُ إِبَاحَةِ قَصْرِ الْمُسَافِرِ الصَّلَاةَ فِي الْمُدُنِ إِذَا قَدِمَهَا، مَا لَمْ يَنْوِ مُقَامًا يُوجِبُ إِتْمَامَ الصَّلَاةِ

**٩٥١-** عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ مُوسَى بْنِ سَلَمَةَ يَقُولُ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﭬ كَيْفَ أُصَلِّي بِمَكَّةَ إِذَا لَمْ أُصَلِّ فِي جَمَاعَةٍ؟ فَقَالَ: رَكْعَتَيْنِ سُنَّةُ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ[١].

## باسی ڕێگەدراوە گەشتیار لە شار و شارۆچکەکان نوێژ کورت بکاتەوە بە مەرجێ نییەتی مانەوەی نەبێت کە پێویست دەکات نوێژەکەی بەتەواوی بکات

واتە: قەتادە دەڵێ: گوێم لە موسای کوڕی سەلەمە بوو دەیوت: پرسیارم لە ئیبنو عەباس ﭬ کرد چۆن لە مەککە نوێژ بکەم ئەگەر بەکۆمەڵ نوێژم نەکرد؟ وتی: بە دوو ڕکات بیکە، ئەوە سوننەتی باوکی قاسمە ﷺ.

**٩٥٢-** قَالَ أَبُو بَكْر هَذَا الخَبَرُ عِنْدِي دَال عَلَى أَنَّ المسَافِر إذَا صَلَّى مَعَ الإِمَامِ فَعَلَيهِ إِتْمَام الصَّلَاةِ لِروَاية لَيْثِ بْنِ أبِي سليم عَنْ طَاوُس عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ الذي فِي الْمُسَافِرِ يُصَلِّي خَلْفَ الْمُقِيمِ، قَالَ يُصَلِّي بِصَلَاتِهِ، وَلَسْنَا نَحْتَجُّ بِرِوَايَةِ لَيْثِ بْنِ أَبِي سُلَيْمٍ، إِلَّا أَنَّ خَبَرَ قَتَادَةَ عَنْ مُوسَى بْنِ سَلَمَةَ دَالٌ عَلَى خِلَافِ رِوَايَةِ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ طَاوُسٍ فِي الْمُسَافِرِ يُصَلِّي خَلْفَ الْمُقِيمِ قَالَ: إِنْ شَاءَ سَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، وَإِنْ شَاءَ ذَهَبَ»[٢].

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لەلای من بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەشتیار ئەگەر لەگەڵ پێشنوێژی نیشتەجێ نوێژی کرد ئەوە پێویستە لەسەری نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام بدات، لەبەر ڕیوایەتەکەی لەیسی کوڕی ئەبو سولەیم لە تاوس لە ئیبنو عەباسەوە ﭬ کە لەبارەی گەشتیارەوە هاتووە نوێژ لەپشت نیشتەجێ بکات، وتی: وەکوو ئەو نوێژ دەکات، ئێمە ڕیوایەتەکەی لەیسی کوڕی ئەبو سولەیم بە بەڵگە وەرناگرین، ئەوە نەبێت فەرموودەکەی قەتادە لە موسای کوڕی سەلەمەوە بەڵگەیە لەسەر پێچەوانەی ڕیوایەتەکەی سولەیمانی تەیمی لە تاوسەوە دەربارەی نوێژی

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

گەشتیار لەپشت نیشتەجێ، وتی: ئەگەر ویستی لە دوو ڕکاتدا سەلام بداتەوە، وە ئەگەر ویستی نوێژەکەی تەواو بکات.

**٩٥٣-** قَالَ: ثنا بُنْدَارٌ، نا يَحْيَى، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، عَنْ طَاوُسٍ(١).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٩٥٤-** عَنْ عَاصِمِ بنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﵄، كَانَ إِذَا كَانَ بِمَكَّةَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، إِلَّا أَنْ يَجْمَعَهُ إِمَامٌ فَيُصَلِّي بِصَلَاتِهِ، فَإِنْ جَمَعَهُ الْإِمَامُ يُصَلِّي بِصَلَاتِهِ(٢).

واتە: عاصمی کوڕی شەعبی دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﵄ ئەگەر لە مەککە بووایە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد مەگەر پێشنوێژ نوێژەکەی کۆ بکردایەتەوە وەکوو ئەو نوێژی دەکرد، ئەگەر پێشنوێژ نوێژەکەی کۆ بکردایەتەوە وەکوو ئەو نوێژی دەکرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ قَصْرِ الْمُسَافِرِ إِذَا أَقَامَ بِالْبَلْدَةِ أَكْثَرَ مِنْ خَمْسَ عَشْرَةَ مِنْ غَيْرِ إِزْمَاعٍ عَلَى إِقَامَةٍ مَعْلُومَةٍ بِالْبَلْدَةِ عَلَى الْحَاجَةِ

**٩٥٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَفَرًا، فَأَقَامَ تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَنَحْنُ نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ فِيمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ تِسْعَةَ عَشَرَ يَوْمًا، فَإِذَا أَقَمْنَا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ صَلَّيْنَا أَرْبَعًا(٣).

## باسی ڕێگەدراوە بە گەشتیار نوێژەکەی کورت بکاتەوە ئەگەر زیاتر لە پازدە ڕۆژ لە شارێك مایەوە بەبێ سووربوون لەسەر مانەوەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی کرد نۆزدە ڕۆژ مایەوە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد، ئیبنو عەباس وتی: ئێمە دوو ڕکات نوێژمان دەکرد لە ماوەی نۆزدە ڕۆژ، ئەگەر زیاتر لەوە بماینایەوە چوار ڕکات نوێژمان دەکرد.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ خَبَرٍ احْتَجَّ بِهِ بَعْضُ مَنْ خَالَفَ الْحِجَازِيِّينَ فِي إِزْمَاعِ الْمُسَافِرِ مُقَامَ أَرْبَعٍ أَنَّ لَهُ قَصْرَ الصَّلَاةِ

**٩٥٦-** عَن يَحْيَى قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ قَصْرِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ نُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَا، فَسَأَلْتُهُ هَلْ أَقَامَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَقَامَ بِهَا عَشْرًا. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَسْتُ أَحْفَظُ فِي شَيْءٍ مِنْ أَخْبَارِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أَزْمَعَ فِي شَيْءٍ مِنْ أَسْفَارِهِ عَلَى إِقَامَةِ أَيَّامٍ مَعْلُومَةٍ غَيْرَ هَذِهِ السَّفْرَةِ الَّتِي قَدِمَ فِيهَا مَكَّةَ لِحَجَّةِ الْوَدَاعِ؛ فَإِنَّهُ قَدِمَهَا مُزْمِعًا عَلَى الْحَجِّ، فَقَدِمَ مَكَّةَ صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ(١).

## باسی فەرموودەیەك هەندێ لەوانەی كە ڕاوبۆچوونیان پێچەوانەی حیجازییەكانە، كردوویانە بە بەڵگە سەبارەت بەوەی گەشتیار تەنها ماوەی چوار ڕۆژ بۆی هەیە نوێژەكەی كورت بكاتەوە

واتە: یەحیا دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ كرد دەربارەی كورتكردنەوەی نوێژ، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتمان كرد لە مەدینەوە بۆ مەككە دوو ڕكات نوێژمان دەكرد هەتا گەڕاینەوە، پرسیارم لێ كرد ئایا ئەو لە مەككە مایەوە؟ وتی: بەڵێ، دە ڕۆژ لە مەككە مایەوە. ئەبو بەكر دەڵێ: من هیچ شتێكم لە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ لەبەر نییە كە لە یەكێك لە گەشتەكانی سوور بووبێت لەسەر مانەوە بۆ چەند ڕۆژێكی دیاریكراو، جگە لەم گەشتەی نەبێت كە هات بۆ مەككە لە حەجیماڵئاوایی، سەرلەبەیانی هات بۆ مەككە سوور بوو لەسەر حەجكردن چوار ڕۆژ تێپەڕ بووبوو لە مانگی (ذِي الْحِجَّةِ).

**٩٥٧-** عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: قَالَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: فَقَدِمَهَا ﷺ صُبْحَ رَابِعَةٍ مَضَتْ مِنْ ذِي الْحِجَّةَ، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ أَرْبَعَةَ أَيَّامٍ، خَلَا الْوَقْتِ الَّذِي كَانَ سَائِرًا فِيهِ مِنَ الْبَدْءِ الرَّابِعِ، إِلَى أَنْ قَدِمَهَا وَبَعْضُ يَوْمِ الْخَامِسِ مُزْمِعًا عَلَى هَذِهِ الْإِقَامَةِ عِنْدَ قُدُومِهِ مَكَّةَ، فَأَقَامَ بَاقِي الرَّابِعِ وَالْخَامِسَ وَالسَّادِسَ وَالسَّابِعَ وَالثَّامِنَ إِلَى مُضِيِّ بَعْضِ النَّهَارِ، وَهُوَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى(٢).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

واتە: عەتاء دەڵێ: جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرلەبەیانی چوارەم ڕۆژ لە مانگی (ذِي الْحِجَّةِ) هات بۆ مەککە، ئەبو بەکر ﷺ وتی: سەرلەبەیانی چوارەم ڕۆژ لە مانگی (ذِي الْحِجَّةِ) پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەککە، چوار ڕۆژ لە مەککە مایەوە، جگە لەو ڕۆژەی لە مەککە دەرچوو کە سەرلەبەیانی چوارەم ڕۆژی (ذِي الْحِجَّةِ) بوو تا گەیشتە مەککە، وە هەندێکیش لە ڕۆژی پێنجەم، سەرەتا سوور بوو لەسەر ئەو مانەوەی لە کاتی گەیشتنی بە مەککە، جا ئەوەی مابوو لە ڕۆژی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم و هەشتەم مایەوە تا تێپەڕبوونی بەشێك لە ڕۆژەکە، ئەویش ڕۆژی (التَّرْوِيَة) بوو، پاشان لە ڕۆژی (التَّرْوِيَةِ) لە مەککە دەرچوو نوێژی نیوەڕۆی لە مینا کرد.

تێبینی: (التَّرْوِيَةِ): بریتییە لە ڕۆژی هەشتەم لە مانگی (ذي الحجة) بە مێژووی کۆچی، هەروەها بریتییە لەو ڕۆژەی کە حاجییەکان دەچن بۆ مینا، بۆ مانەوە تیایدا، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ چوونە عەرەفە.

**٩٥٨-** عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ رُفَيْعٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ قُلْتُ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ، عَقَلْتَهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيْنَ صَلَّى الظُّهْرَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ؟ قَالَ: بِمِنًى. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قُلْتُ: فَأَقَامَ ﷺ بَقِيَّةَ يَوْمِ التَّرْوِيَةِ بِمِنًى، وَلَيْلَةَ عَرَفَةَ، ثُمَّ غَدَاةَ عَرَفَةَ، فَسَارَ إِلَى الْمَوْقِفِ بِعَرَفَاتٍ، يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِهِ، ثُمَّ سَارَ إِلَى الْمَوْقِفِ، فَوَقَفَ عَلَى الْمَوْقِفِ حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ دَفَعَ حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمُزْدَلِفَةِ، فَجَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمُزْدَلِفَةِ وَبَاتَ فِيهَا حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَسَارَ وَرَجَعَ إِلَى مِنًى، فَأَقَامَ بَقِيَّةَ يَوْمِ النَّحْرِ، وَيَوْمَيْنِ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، وَبَعْضَ الثَّالِثِ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ بِمِنًى، فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ رَمَى الْجِمَارَ الثَّلَاثَ، وَرَجَعَ إِلَى مَكَّةَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ مِنْ آخِرِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ، ثُمَّ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، ثُمَّ رَقَدَ رَقْدَةً بِالْمُحَصَّبِ، فَهَذِهِ تَمَامُ عَشَرَةِ أَيَّامٍ جَمِيعُ مَا أَقَامَ بِمَكَّةَ وَمِنًى فِي الْمَرَّتَيْنِ وَبِعَرَفَاتٍ، فَجَعَلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ كُلَّ هَذَا إِقَامَةً بِمَكَّةَ، وَلَيْسَ مِنًى وَلَا عَرَفَاتٌ مِنْ مَكَّةَ، بَلْ هُمَا خَارِجَانِ مِنْ مَكَّةَ وَعَرَفَاتٌ خَارِجٌ مِنَ الْحَرَمِ أَيْضًا، فَكَيْفَ يَكُونُ مَا هُوَ خَارِجٌ مِنَ الْحَرَمِ مِنْ مَكَّةَ؟. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ ذَكَرَ مَكَّةَ وَتَحْرِيمَهَا: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مَكَّةَ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ، فَهِيَ حَرَامٌ بِحَرَامِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، لَا يُنْفَرُ صَيْدُهَا، وَلَا يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلَا يُخْتَلَى خَلَاهَا». فَلَوْ كَانَتْ عَرَفَاتٌ مِنْ مَكَّةَ لَمْ يَحِلَّ أَنْ يُصَادَ بِعَرَفَاتٍ صَيْدٌ، وَلَا يُعْضَدُ بِهَا شَجَرٌ وَلَا يُخْتَلَى بِهَا خَلَاءٌ، وَفِي إِجْمَاعِ أَهْلِ الصَّلَاةِ

عَلَى أَنَّ عَرَفَاتٍ خَارِجَةٌ مِنَ الْحَرَمِ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّهَا لَيْسَتْ مِنْ مَكَّةَ، وَإِنَّ مَا كَانَ اسْمُ مَكَّةَ يَقَعُ عَلَى جَمِيعِ الْحَرَمِ فَعَرَفَاتٌ خَارِجَةٌ مِنْ مَكَّةَ لِأَنَّهَا خَارِجَةٌ مِنَ الْحَرَمِ وَمِنًى بَائِنٌ مِنْ بِنَاءِ مَكَّةَ وَعُمْرَانِهَا، وَقَدْ يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ اسْمُ مَكَّةَ يَقَعُ عَلَى جَمِيعِ الْحَرَمِ فَمِنًى دَاخِلٌ فِي الْحَرَمِ، وَأَحْسَبُ خَبَرَ عَائِشَةَ دَالًّا عَلَى أَنَّ مَا كَانَ مِنْ وَرَاءِ الْبِنَاءِ الْمُتَّصِلِ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ لَيْسَ مِنْ مَكَّةَ، وَكَذَلِكَ خَبَرُ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما[١].

واتە: عەبدولعەزیزی كوڕی ڕوفەیع دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی كوڕی مالیك رضي الله عنه كرد وتم: هەواڵم بدەرێ بە شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرتگرتبێت، ئەو لە ڕۆژی تەرویە لەكوێ نوێژی نیوەڕۆی كرد؟ وتی: لە مینا. ئەبو بەكر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو كاتەی مایەوە لە ڕۆژی تەرویە لە مینا بەسەری برد، وە شەوی عەرەفە و سەرلەبەیانی عەرەفەش، ئینجا بەرێ كەوت بۆ (الْمَوْقِفِ) لە عەرەفات، لەوێ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری كۆ كردەوە، پاشان كەوتە ڕێ بۆ عەرەفە لەسەر عەرەفە ڕاوەستا هەتا خۆر ئاوا بوو، پاشان هاتە خوارەوە بۆ موزدەلیفە، لەوێ نوێژی ئێوارە و عیشای كۆ كردەوە، ئینجا خەوت تا بەیانی كردەوە، پاشان نوێژی بەیانی لە موزدەلیفە كرد، ئینجا كەوتە ڕێ و گەڕایەوە بۆ مینا، ئەو كاتەی مابۆیەوە لە ڕۆژی جەژنی قوربان لەوێ بەسەری برد، هەروەها دوو ڕۆژیش لە ڕۆژەكانی تەشریق، هەندێكیش لە ڕۆژی سێیەمی تەشریق، كاتێ خۆر ترازا لە ڕۆژەكانی تەشریق هەر سێ جارەكە بەردبارانی جەمەرەی كرد، دواتر گەڕایەوە بۆ مەككە، دواتر نوێژی نیوەڕۆ و عەسری كرد لە كۆتا ڕۆژەكانی تەشریق، پاشان ئێوارە و عیشا، پاشان لە (الْمُحَصَّبُ) (كە شوێنێك بوو لە نێوان مەككە و مینا، لە میناوە نزیكتر بوو) خەوت، ئەمە تەواوی دە ڕۆژەكەیە دوو جار لە مەككە و مینا ماوەتەوە و لە عەرەفاتیش، ئەنەسی كوڕی مالیك هەموو ئەمانەی داناوە بە مانەوە لە مەككە، نە مینا و نە عەرەفە هیچ كامیان مەككە نییە، بەڵكوو ئەو دووانە لە دەرەوەی مەككەن، هەروەها عەرەفەیش لە دەرەوەی حەرەمە، چۆن دەبێت ئەوەی لە دەرەوەی حەرەم بێت بە مەككە هەژمار بكرێت؟ پێغەمبەر ﷺ كاتێ باسی مەككە و حەرەمەكەی كرد فەرمووی: بێگومان خوا تعالى مەككەی حەرام كردووە لەو ڕۆژەی ئاسمانەكان و زەوی دروست كرد، ئەم شارە حەرامە لەبەر ئەوەی خوا پیرۆزی كردووە حەرامی

---

(١) صحيح.

کردووه تا ڕۆژی دوایی، نێچیرەکانی تار ناکرێن، دار و درەختەکانی نابڕدرێن، گژوگیاکانی هەڵناکەندرێن. ئەگەر عەرەفە بەشێك بووایە لە مەککە حەڵاڵ نەدەبوو ڕاوی تێدا بکرایە و دارودرەختی ببڕدرایە و گژوگیای هەڵکەنرایە، جا لە یەکدەنگی ئەهلی نوێژ لەسەر ئەوەی عەرەفە لە دەرەوەی حەرەمە ئەوە ڕوون بووەتەوە و جێگیر بووە عەرەفە بەشێك نییە لە مەککە، بێگومان ناوی مەککە بۆ هەموو حەرەم بەکار هاتووە، بۆیە عەرەفەیش لە دەرەوەی مەککەیە چونکە لە دەرەوەی حەرەمە، مینایش جیایە لە بونیادی مەککە و بیناکەی، دروستە ناوی مەککە بۆ هەموو حەرەم بەکار بهێنرێ، میناش لە نێوەوەی حەرەمە، پێم وایە فەرموودەکەی عائیشە ﵂ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر شتێ لەپشت ئەو خانووانە بێت کە دیوارەکانیان شانی داوە بە یەکدییەوە بەشێك نییە لە مەککە، بەهەمان شێوە فەرموودەکەی ئیبنو عومەریش ﵄.

**٩٥٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَهَا مِنْ أَعْلَاهَا، وَخَرَجَ مِنْ أَسْفَلِهَا[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچووایەتە نێو مەککەوە لە سەرەوە دەچۆیە نێویەوە، لە خوارەوەش دەردەچوو.

**٩٦٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَامَ الْفَتْحِ مِنْ كَدَاءٍ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا، لە (كَدَاءٍ)ەوە (کە جێگایەکە) لە بەرزاییەکانی مەککە، چۆیە نێو مەککەوە.

**٩٦١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا الَّتِي عِنْدَ الْبَطْحَاءِ، وَخَرَجَ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى[3].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَقَوْلُ ابْنِ عُمَرَ ﵄: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا دَالٌّ عَلَى أَنَّ الثَّنِيَّةَ لَيْسَتْ مِنْ مَكَّةَ وَالثَّنِيَّةُ مِنَ الْحَرَمِ، وَوَرَاءَهَا أَيْضًا مِنَ الْحَرَمِ، وَكَدَا مِنَ الْحَرَمِ، وَمَا وَرَاءَهَا أَيْضًا مِنَ الْحَرَمِ إِلَى الْعَلَامَاتِ الَّتِي أَعْلَمَتْ بَيْنَ الْحَرَمِ وَبَيْنَ الْحِلِّ، فَكَيْفَ يَجُوزُ أَنْ يُقَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ، فَلَوْ كَانَتِ الثَّنِيَّةُ مِنْ مَكَّةَ وَكَدَا مِنْ مَكَّةَ لَمَا جَازَ أَنْ يُقَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ مِنَ الثَّنِيَّةِ وَمِنْ كَدَا. وَقَدْ يَجُوزُ أَنْ يُحْتَجَّ بِأَنَّ جَمِيعَ الْحَرَمِ مِنْ مَكَّةَ، لِقَوْلِهِ ﷺ: «أَنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ»، فَجَمِيعُ الْحَرَمِ قَدْ يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ قَدْ يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ مَكَّةَ إِلَّا أَنَّ الْمُتَعَارَفَ عِنْدَ النَّاسِ أَنَّ مَكَّةَ مَوْضِعُ الْبِنَاءِ الْمُتَّصِلِ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ، يَقُولُ الْقَائِلُ: خَرَجَ فُلَانٌ مِنْ مَكَّةَ إِلَى مِنًى، وَرَجَعَ مِنْ مِنًى إِلَى مَكَّةَ، وَإِذَا تَدَبَّرْتَ أَخْبَارَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَنَاسِكِ وَجَدْتَ مَا يُشْبِهُ هَذِهِ اللَّفْظَةَ كَثِيرًا فِي الْأَخْبَارِ، فَأَمَّا عَرَفَةُ وَمَا وَرَاءَ الْحَرَمِ فَلَا شَكَّ وَلَا مِرْيَةَ أَنَّهُ لَيْسَ مِنْ مَكَّةَ، وَالدَّلِيلُ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَفَرَ مِنْ مِنًى يَوْمَ الثَّالِثِ مِنْ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

**واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆیە نێو مەککەوە لە ڕێگای سەرەوە کە لە (الْبَطْحَاء)ە، وە لە ڕێگای خوارەوەش دەرچوو.**

ئەبو بەکر دەڵێ: وتەکەی ئیبنو عومەر ﵄: پێغەمبەر ﷺ چۆیە نێو مەککەوە لە ڕێگای سەرەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو شوێنە (الثَّنِيَّةِ) بەشێك نییە لە مەککە، وە (الثَّنِيَّةِ) بەشێکە لە حەڕەم، هەروەها پشتەوەیشی بەشێکە لە حەڕەم، وە (كَدَا)یش (کە جێگایەکە لە بەرزاییەکانی مەککە) بەشێکە لە حەڕەم، وە پشتەوەیشی تا ئەو نیشانانەی دیاریم کرد لە نێوان حەڕەم لە نێوان شکاندنی ئیحڕام، چۆن دروستە بوترێ پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە چۆیە نێو مەککە، ئەگەر (الثَّنِيَّة) بەشێك بووایە لە مەککە و (كَدَا)یش بەشێك بووایە لە مەککە، ئیدی چۆن دروست بوو بوترێ: پێغەمبەر ﷺ چووە مەککە لە (الثَّنِيَّة) وە لە (كَدَا)یشەوە. هەندێ جار دروستە هەموو حەڕەم بەشێك بێت لە مەککە، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: بەڕاستی خوا مەککەی حەڕام کردووە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە. جا دروستە بە هەموو ناوچەکانی حەڕەم بوترێ مەککە، بەڵام ئەوەی لەلای خەڵکی ناسراوە مەککە ئەو خانووانەیە کە هەندێکی لکاوە بە هەندێکی دیکەیەوە، کەسێك دەڵێ: فڵانە کەس لە مەککەوە ڕۆیشت بۆ مینا، لە مینایشەوە گەڕاوە بۆ مەککە، ئەگەر سەرنجی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بدەی لە ڕێوڕەسمەکانی حەج هاوشێوەی ئەم دەستەواژەیە زۆر دەبینی، بەڵام عەرەفە و ئەوەیشی لەپشت حەڕەمەوەیە هیچ گومان و دوودڵی تێدا نییە بەشێك نین لە مەککە، بەڵگەش لەسەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی سێیەم لە ڕۆژەکانی تەشریق مینای بەجێ هێشت.

**٩٦٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، وَرَقَدَ رَقْدَةً بِالْمُحَصَّبِ، ثُمَّ رَكِبَ إِلَى الْبَيْتِ، فَطَافَ بِهِ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: ثُمَّ خَرَجَ ﷺ مِنْ لَيْلَتِهِ تِلْكَ مُتَوَجِّهًا نَحْوَ الْمَدِينَةِ»[١].

**واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و ئێوارە و عیشای کرد پاشان لە (الْمُحَصَّبُ) (کە شوێنێك بوو لە نێوان مەککە و مینا، لە میناوە نزیکتر بوو) خەوت، پاشان سوار بوو بۆ بەیت، تەوافی کرد. ئەبو بەکر دەڵێ: پاشان شەوەکەی دەرچوو ڕووی کردە مەدینە.**

**٩٦٣-** عَنِ القَاسِمِ بْنِ محمد، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، فَذَكَرَتْ بَعْضَ صِفَةِ حَجَّةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَالَتْ: فَأَذِنَ بِالرَّحِيلِ فِي أَصْحَابَهُ، فَارْتَحَلَ النَّاسُ، فَمَرَّ بِالْبَيْتِ قَبْلَ صَلَاةِ الصُّبْحِ، فَطَافَ بِهِ، ثُمَّ خَرَجَ، فَرَكِبَ، ثُمَّ انْصَرَفَ مُتَوَجِّهًا إِلَى الْمَدِينَةِ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَلَمْ نَسْمَعْ أَحَدًا مِنَ الْعُلَمَاءِ مِنْ أَهْلِ الْفِقْهِ يَجْعَلُ مَا وَرَاءَ الْبِنَاءِ الْمُتَّصِلُ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ فِي الْمُدُنِ مِنَ الْمُدُنِ، وَإِنْ كَانَ مَا وَرَاءَ الْبِنَاءِ مِنْ حَدِّ تِلْكَ الْمَدِينَةِ، وَمِنْ أَرَاضِيهَا الْمَنْسُوبَةِ إِلَى تِلْكَ الْمَدِينَةِ، لَا نَعْلَمُهُمُ اخْتَلَفُوا أَنَّ مَنْ خَرَجَ مِنْ مَدِينَةٍ يُرِيدُ سَفَرًا، فَخَرَجَ مِنَ الْبُنْيَانِ الْمُتَّصِلُ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ أَنَّ لَهُ قَصْرَ الصَّلَاةِ، وَإِنْ كَانَتِ الْأَرْضُونَ الَّتِي وَرَاءَ الْبِنَاءِ مِنْ حَدِّ تِلْكَ الْمَدِينَةِ وَكَذَلِكَ لَا أَعْلَمُهُمُ اخْتَلَفُوا أَنَّهُ إِذَا رَجَعَ يُرِيدُ بَلْدَةً فَدَخَلَ بَعْضَ أَرَاضِي بَلْدَةٍ، وَلَمْ يَدْخُلِ الْبِنَاءَ، وَكَانَ خَارِجًا مِنْ حَدِّ الْبِنَاءِ الْمُتَّصِلِ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ أَنَّ لَهُ قَصْرَ الصَّلَاةِ مَا لَمْ يَدْخُلْ مَوْضِعَ الْبِنَاءِ الْمُتَّصِلِ بَعْضُهُ بِبَعْضٍ وَلَا أَعْلَمَهُمُ اخْتَلَفُوا أَنَّ مَنَ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ مِنْ أَهْلِهَا، أَوْ مَنْ قَدْ أَقَامَ بِهَا قَاصِدًا سَفَرًا يَقْصُرُ فِيهِ الصَّلَاةَ، فَفَارَقَ مَنَازِلَ مَكَّةَ، وَجَعَلَ جَمِيعَ بِنَائِهَا وَرَاءَ ظَهْرِهِ وَإِنْ كَانَ بَعْدُ فِي الْحَرَمِ أَنَّ لَهَ قَصْرَ الصَّلَاةِ، فَالنَّبِيُّ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ فِي حَجَّتِهِ، فَخَرَجَ يَوْمَ التَّرْوِيَةِ قَدْ فَارَقَ جَمِيعَ بِنَاءِ مَكَّةَ، وَسَارَ إِلَى مِنًى، وَلَيْسَ مِنًى مِنَ الْمَدِينَةِ الَّتِي هِيَ مَدِينَةُ مَكَّةَ، فَغَيْرُ جَائِزٍ مِنْ جِهَةِ الْفِقْهِ إِذَا خَرَجَ الْمَرْءُ مِنْ مَدِينَةٍ -لَوْ أَرَادَ سَفَرًا- بِخُرُوجِهِ مِنْهَا جَازَ لَهُ قَصْرُ الصَّلَاةِ أَنْ يُقَالَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بِنَائِهَا هُوَ فِي الْبَلْدَةِ، إِذْ لَوْ كَانَ فِي الْبَلْدَةِ لَمْ يَجُزْ لَهُ قَصْرُ الصَّلَاةِ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْهَا، فَالصَّحِيحُ عَلَى مَعْنَى الْفِقْهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُقِمْ بِمَكَّةَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ إِلَّا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ كَوَامِلَ، يَوْمَ الْخَامِسِ وَالسَّادِسِ وَالسَّابِعِ، وَبَعْضَ يَوْمِ الرَّابِعِ، دُونَ لَيْلِهِ، وَلَيْلَةَ الثَّامِنَةِ وَبَعْضِ يَوْمِ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

الثَّامِنِ، فَلَمْ يَكُنْ هُنَاكَ إِزْمَاعٌ عَلَى مُقَامِ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ بِلَيَالِيهَا فِي بَلْدَةٍ وَاحِدَةٍ، فَلَيْسَ هَذَا الْخَبَرُ إِذَا تَدَبَّرْتَهُ بِخِلَافِ قَوْلِ الْحِجَازِيِّينَ فِيمَنْ أَزْمَعَ مُقَامَ أَرْبَعٍ، أَنَّهُ يُتِمُّ الصَّلَاةَ؛ لِأَنَّ مُخَالِفِيهِمْ يَقُولُونَ: إِنَّ مَنْ أَزْمَعَ مُقَامَ عَشَرَةِ أَيَّامٍ فِي مَدِينَةٍ، وَأَرْبَعَةِ أَيَّامٍ خَارِجًا مِنْ تِلْكَ الْمَدِينَةِ فِي بَعْضِ أَرَاضِيهَا الَّتِي هِيَ خَارِجَةٌ مِنَ الْمَدِينَةِ عَلَى قَدْرِ مَا بَيْنَ مَكَّةَ وَمِنًى فِي مَرَّتَيْنِ لَا فِي مَرَّةٍ وَاحِدَةٍ، وَيَوْمًا وَلَيْلَةً فِي مَوْضِعٍ ثَالِثٍ مَا بَيْنَ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ كَانَ لَهُ قَصْرُ الصَّلَاةِ، وَلَمْ يَكُنْ هَذَا عِنْدَهُمْ إِزْمَاعًا عَلَى مُقَامِ خَمْسَ عَشْرَةَ عَلَى مَا زَعَمُوا أَنَّ مَنْ أَزْمَعَ مُقَامَ خَمْسَ عَشْرَةَ وَجَبَ عَلَيْهِ إِتْمَامُ الصَّلَاةِ».

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە، عائیشە ﵂ باسی هەندێ لە سیفەتەکانی حەجی پێغەمبەری ﷺ کرد و وتی: مۆڵەتی دەرچوونی دا بە هاوەڵەکانی، خەڵکەکەیش دەرچوون، پێش نوێژی بەیانی تێ پەڕی بەلای کەعبەدا و تەوافی کرد، پاشان دەرچوو، ئینجا سواری وشترەکەی بوو، پاشان بەرەو مەدینە گەڕایەوە.

ئەبو بەکر دەڵێ: نەمانبیستووە هەندێك لە زانایان لە ئەهلی فیقە ئەوەی لە دەرەوەی ئەو خانووانەوەیە کە دیوارەکانیان لکاوە بە یەکدییەوە بە شار لە قەڵەمی بدات، ئەگەرچی دەرەوەی ئەو خانووانە لە سنووری جوگرافیای ئەو شارەدان، وە لەو زەوییانەن کە دراونەتە پاڵ ئەو شارە، نەمانزانیوە ئەوان جیاوازییەکیان هەبێت لەوەی هەر کەسێك لە شارێك دەربچێت بەمەبەستی گەشتکردن، ماڵەکان تێ بپەڕێنێت بۆی هەیە نوێژەکەی کورت بکاتەوە، ئەگەرچی ئەو زەوییانەی لە دەرەوەی ماڵەکانن لە سنووری ئەو شارەن، بەهەمان شێوە نەمانزانیوە جیاوازییان هەبێت لەوەی ئەگەر کەسێك بگەڕێتەوە بۆ شارێك و بگاتە نێو زەوی ئەو شارە و نەگەیشتبێت بە خانووەکانی کە هەندێکیان لکاون بە هەندێکی دیکەوە، بۆی هەیە نوێژەکەی کورت بکاتەوە، بە مەرجێ نەچووبێتە نێو ماڵەکانەوە، وە نەمانزانیوە جیاوازییان هەبێت لەوەی ئەو کەسەی کە خەڵکی مەککەیە یان تیایدا ماوەتەوە، دەربچێت بەمەبەستی گەشتێك نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، ماڵەکانی مەککەی بەجێ هێشت، سەرجەم خانووەکانی خستە پشتی خۆیەوە، ئەگەرچی هیشتا لە ناوچەی حەرەمیش بێت بۆی هەیە نوێژەکەی کورت بکاتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەککە لە حەجکردنەکەیدا، لە ڕۆژی تەرویە دەرچوو هەموو خانووەکانی مەککەی بەجێ هێشت، وە ڕۆیشت بۆ مینا، مینایش بەشێك نییە لە مەککە، دروست نییە لە ڕووی فیقهییەوە ئەگەر کەسێك لە شارێکەوە دەربچێت -ئەگەرچی مەبەستیشی گەشت بێت-

هەر بە دەرچوونەکەی لە شارەکە نوێژ کورتکردنەوەی بۆ دروست بێت، لەوەیە بچێت بۆ شارێك دروست نەبێت بۆی نوێژەکەی کورت بکاتەوە هەتا لێی دەردەچێت، ئەوەی ڕاست و دروستە لەسەر مانای تێگەیشتن ئەوەیە، پێغەمبەر ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا لە مەککە نەمایەوە سێ ڕۆژ و سێ شەو نەبێت بەتەواوی، ڕۆژی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، وە هەندێك لە ڕۆژی چوارەم، جگە لە شەوەکەی، وە شەوی هەشتەم و بەشێك لە ڕۆژی هەشتەم، هیچ سووربوونێك نییە لەسەر مانەوەی چوار ڕۆژ و چوار شەو لە یەك شاردا، ئەگەر سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەیت پێچەوانەی وتەی حیجازییەکان نییە کە دەڵێن: هەر کەسێك سوور بێت لە مانەوەی تا چوار ڕۆژ نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام ئەدات، چونکە پێچەوانەکانیان دەڵێن: هەر کەسێك سوور بێت لەسەر مانەوەی دە ڕۆژ لە شارێکدا و چوار ڕۆژ لە دەرەوەی ئەو شارە لە بەشێك لە زەوییەکانیدا کە لە دەرەوەی شارەکەیە بەئەندازەی نێوان مەککە و مینا لە دوو جاردا نەك جارێك، وە ڕۆژ و شەوێکیش لە جێگای سێیەم بێت لە نێوان مینا بۆ عەرەفە، بۆی هەیە نوێژەکەی کورت بکاتەوە، بەمەرجێ ئەو کەسە سوور نەبێت لەسەر مانەوەی بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ، چونکە ئەوان پێیان وایە هەر کەسێك سوور بێت لەسەر مانەوەی بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ پێویستە لەسەری نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام بدات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْجَمْعِ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي السَّفَرِ بِذِكْرِ خَبَرٍ غَلِطَ فِي مَعْنَاهُ بَعْضُ مَنْ لَمْ يُحْسِنْ صِنَاعَةَ الْفِقْهِ، فَتَأَوَّلَ هَذَا الْخَبَرَ عَلَى ظَاهِرِهِ وَزَعَمَ أَنَّ الْجَمْعَ غَيْرُ جَائِزٍ إِلَى أَنْ يَجِدَّ بِالْمُسَافِرِ السَّفَرُ

٩٦٤- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ[1].

**باسی مۆڵەتدان بە کۆکردنەوە لە نێوان نوێژی ئێوارە و عیشا لە گەشتدا، بە باسکردنی فەرموودەیەك هەندێ لەوانەی کە شارەزا نییە لە فیقە بەهەڵە لە ماناکەی تێ گەیشتووە، ئەم فەرموودەی لەیەك داوەتەوە بەپێی ڕواڵەتەکەی پێی وایە کۆکردنەوەی نوێژ دروست نییە بۆ گەشتیار کاتێ پەلەی نەبێت لە ڕۆیشتن لە گەشتەکەیدا**

---

(١) صحيح.

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ گەشتی بکردایە و بەپەلە بووایە لە ڕۆیشتن و (دانەبەزیبایە بۆ پشوودان) نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە کۆ دەکردەوە.

**٩٦٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی کاتێ گەشتی بکردایە و بەپەلە بووایە لە ڕۆیشتن و (دانەبەزیبایە بۆ پشوودان) نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە کۆ دەکردەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْجَمْعِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَإِنْ لَمْ يَجِدَّ بِالْمُسَافِرِ السَّيْرِ

**٩٦٦-** عَنْ أَبِي الطُّفَيلِ، عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَفْرَةٍ سَافَرَهَا، وَذَلِكَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَجَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ قَالَ: قُلْتُ: مَا حَمَلَهُ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ[٢].

## باسی مۆڵەتدان بە کۆکردنەوەی نوێژ لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر، وە لە نێوان ئێوارە و عیشا ئەگەرچی گەشتیار بەدەم ڕێگایشەوە نەبوو

واتە: ئەبو توفەیل دەگێڕێتەوە، موعازی کوڕی جەبەل ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێك لە گەشتەکانیدا نوێژی کۆ کردەوە، ئەویش لە غەزای تەبووکدا بوو، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە، هەروەها ئێوارە و عیشایش، وتی: وتم: چی وای لێ کرد ئەوە بکات؟ وتی: ویستی لەسەر ئوممەتەکەی گرانی نەکات.

**٩٦٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، بِمِثْلِ ذَلِكَ[٣].

واتە: هەمان فەرموودە لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ بەهەمان شێوە هاتوو.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي السَّفَرِ، وَإِنْ كَانَ الْمَرْءُ نَازِلًا فِي الْمَنْزِلِ غَيْرَ سَائِرٍ وَقْتَ الصَّلَاتَيْنِ

**٩٦٨-** عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّهُمْ، خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ تَبُوكَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ قَالَ: فَأَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءِ جَمِيعًا، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَأْتُونَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ عَيْنَ تَبُوكَ، وَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْتُوا حَتَّى يُضْحِيَ النَّهَارُ، فَمَنْ جَاءَهَا فَلَا يَمَسُّ مِنْ مَائِهَا شَيْئًا حَتَّى آتِيَ» قَالَ: فَجِئْنَاهَا وَقَدْ سَبَقَ إِلَيْهَا رَجُلَانِ، وَالْعَيْنُ مِثْلُ الشِّرَاكِ تَبِضُّ بِشَيْءٍ مِنْ مَاءٍ، فَسَأَلَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلْ مَسَسْتُمَا مِنْ مَائِهَا شَيْئًا؟»، فَقَالَا: نَعَمْ، فَسَبَّهُمَا، وَقَالَ لَهُمَا مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ غَرَفُوا مِنَ الْعَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ قَلِيلًا قَلِيلًا حَتَّى اجْتَمَعَ فِي شَيْءٍ، ثُمَّ غَسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهِ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ أَعَادَهُ فِيهَا فَجَرَتِ الْعَيْنُ بِمَاءٍ كَثِيرٍ، فَاسْتَقَى النَّاسُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ يَا مُعَاذُ إِنْ طَالَتْ بِكَ حَيَاةٌ أَنْ تَرَى مَا هُنَا قَدْ مُلِئَ جِنَانًا»[١].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي الْخَبَرِ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَدْ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، وَهُوَ نَازِلٌ فِي سَفَرِهِ غَيْرُ سَائِرٍ وَقْتَ جَمْعِهِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ؛ لِأَنَّ قَوْلَهُ: أَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، تُبَيِّنُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ رَاكِبًا سَائِرًا فِي هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ اللَّذَيْنِ جَمَعَ فِيهِمَا بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، وَبَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَخَبَرُ ابْنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ لَيْسَ بِخِلَافِ هَذَا الْخَبَرِ؛ لِأَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَدْ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ بَيْنَهُمَا حِينَ جَدَّ بِهِ السَّيْرُ، فَأَخْبَرَ بِمَا رَأَى مِنْ فِعْلِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ قَدْ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ قَدْ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ، وَهُوَ نَازِلٌ فِي الْمَنْزِلِ غَيْرُ سَائِرٍ، فَخَبَّرَ بِمَا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَهُ، فَالْجَمْعُ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ إِذَا جَدَّ بِالْمُسَافِرِ السَّيْرُ جَائِزٌ، كَمَا فَعَلَهُ النَّبِيُّ ﷺ، وَكَذَلِكَ جَائِزٌ لَهُ الْجَمْعُ بَيْنَهُمَا، وَإِنْ كَانَ نَازِلًا لَمْ يَجِدَّ بِهِ السَّيْرُ كَمَا فَعَلَهُ ﷺ، وَلَمْ يَقُلِ ابْنُ عُمَرَ ﷺ إِنَّ الْجَمْعَ بَيْنَهُمَا غَيْرُ جَائِزٍ إِذَا لَمْ يَجِدَّ بِهِ السَّيْرُ لَا أَثَرًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ ذَلِكَ، وَلَا مُخْبِرًا عَنْ نَفْسِهِ.

---

(١) صحيح.

## باسی مۆڵەتدان بە کۆکردنەوە لە نێوان دوو نوێژدا، ئەگەرچی بەندە لە گەشتەکەیدا دابەزێتە جێگایەك بۆ پشوودان لە کاتی دوو نوێژەکەدا بەدەم ڕێگاوە نەبێت

واتە: ئەبو توفەیل عامری کوڕی واسیلە دەگێڕێتەوە، موعازی کوڕی جەبەل ﷺ هەواڵی پێ دا، ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون لە ساڵی تەبووك، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کۆ دەکردەوە لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر و لە نێوان مەغریب و عیشا، وتی: (پێغەمبەر ﷺ) ڕۆژێك نوێژی دواخست، پاشان دەرچوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە، پاشان چووە ژوورەوە، پاشان هاتە دەرەوە نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوە کرد، پاشان فەرمووی: ئێوە بە ویستی خوا بەیانی دەگەنە کانیاوی تەبووك، ئێوە ناگەنە ئەو شوێنە لە کاتی چێشتەنگاودا نەبێت، هەر کەسێك گەیشتە ئەو جێگایە با دەست لە ئاوەکەی نەدات هەتا خۆم دێم، وتی: هاتین بۆ لای کانیاوەکە دوو کەس پێشمان کەوتبوون، کانیاوەکەیش بەئەندازەی قەیتانێك ئاوی لێ دەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لەو دووانە کرد: ئایا دەستتان بەر ئاوەکە کەوت؟ وتیان: بەڵێ، قسەی پێ وتن، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو بێت قسەی پێ وتن، پاشان بە دەستەکانیان لە کانیاوەکە کەم کەم ئاویان لێ دەردەکرد، هەتا لەنێو شتێکدا کۆیان کردەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕوخسار و دەستی پێی شۆرد، پاشان ئاوەکەی کردە نێو کانیاوەکە، ئاوەکە بەشێوەیەکی زۆر زیادی کرد و کەوتە ڕێ، ئینجا خەڵکەکە ئاویان لێی خواردەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نزیکە ئەی موعاز ئەگەر تەمەنت درێژ بێت لەم جێگایەدا باخ و باخات ببینیت.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەدا ئەوە ڕوون بۆتەوە و جێگیر بووە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردۆتەوە، هەروەها ئێوارە و عیشایش، ئەو لە گەشتەکەیدا دابەزیوە بۆ پشوو بەدەم ڕێگاوە نەبوو لە کاتی کۆکردنەوەی نێوان ئەو دوو نوێژە، چونکە وتەکەی موعاز: (پێغەمبەر ﷺ) ڕۆژێك نوێژی دوا خست، پاشان دەرچوو نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ کردەوە، پاشان چووە ژوورەوە، پاشان هاتە دەرەوە نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوە کرد. ڕوون بۆتەوە لەو دوو کاتەدا کە نوێژەکانی ئێوارە و عیشای تێدا کۆ کردۆتەوە، وە نیوەڕۆ و عەسریش،

بەدەم ڕێگاوە نەبووە (بەڵکوو بارگەی ڕاخستووە و پشووی داوە). وە فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ﷺ: کاتێ گەشتی بکردایە و بەپەلە بووایە لە ڕۆیشتن (و دانەبەزیبایە بۆ پشوودان) دوو نوێژی پێکەوە کۆ دەکردەوە. پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە نییە، چونکە ئیبنو عومەر ﷺ پێغەمبەری بینیوە ﷺ هەردوو نوێژەکەی پێکەوە کۆ کردەوە کاتێ بەپەلە بووایە لە ڕۆیشتندا، ئەو هەواڵی داوە بەوەی بینیوەتی لە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ، موعازی کوڕی جەبەلیش پێغەمبەری ﷺ بینی دوو نوێژی پێکەوە کۆ کردەوە، دابەزیبوو بارگەی گەشتیشی ڕاخستبوو ڕێی نەدەکرد، ئەو هەواڵی داوە بەوەی پێغەمبەری ﷺ بینیوە کردوویەتی، جا کۆکردنەوە لە نێوان دوو نوێژ کاتێ گەشتیار بەپەلە بێت دروستە، وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، بەهەمان شێوە دروستە دوو نوێژ پێکەوە کۆ بکاتەوە ئەگەرچی بارگەیشی ڕاخستبێت و بەپەلە نەبێت لە گەشتەکەیدا وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، ئیبنو عومەر ﷺ نەیوت: کۆکردنەوە لە نێوانیاندا دروست نییە ئەگەر بەدەم ڕێگاوە نەبوو نە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، نە خۆیشی قسەی لەو جۆرەی کردووە.

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي وَقْتِ الْعَصْرِ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي وَقْتِ الْعِشَاءِ

**٩٦٩-** عَنْ ابنِ شِهَابٍ عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا عَجَّلَ بِهِ السَّيْرُ يَوْمًا جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِذَا أَرَادَ السَّفَرَ لَيْلَةً جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، يُؤَخِّرُ الظُّهْرَ إِلَى أَوَّلِ وَقْتِ الْعَصْرِ، فَيَجْمَعُ بَيْنَهُمَا وَيُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ، حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ حِينَ يَغِيبُ الشَّفَقُ(١).

## باسی کۆکردنەوە لە نێوان نیوەڕۆ و عەسر لە کاتی عەسردا، وە لە نێوان ئێوارە و عیشا لە کاتی عیشادا

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە گەشتدا پەلەی ڕۆیشتنی بکردایە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کۆ دەکردەوە، ئەگەر

---

(١) صحيح.

**لە شەویشدا بیویستایە گەشت بکات نوێژی ئێوارە و عیشای پێکەوە کۆ دەکردەوە، نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تا سەرەتای یەکەم کاتی عەسر ئینجا هەردووکیانی پێکەوە کۆ دەکردەوە، ئێوارەیشی دوا دەخست تا لەگەڵ عیشادا کۆی دەکردەوە کاتێ سوورایی بن ئاسمان نەمابایە.**

**٩٧٠-** عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، وَحَفْصِ بْنِ عَاصِمٍ، وَمُسَاحِقِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: فَغَابَتِ الشَّمْسُ، فَقِيلَ لِابْنِ عُمَرَ ﷺ: الصَّلَاةُ قَالَ: فَسَارَ، فَقِيلَ لَهُ: الصَّلَاةُ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا عَجَّلَ بِهِ السَّيْرُ أَخَّرَ هَذِهِ الصَّلَاةَ، وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُؤَخِّرَهَا قَالَ: فَسِرْنَا حَتَّى نِصْفِ اللَّيْلِ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ نِصْفِ اللَّيْلِ قَالَ: فَنَزَلَ، فَصَلَّاهَا[1].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي هَذَا الْخَبَرِ وَخَبَرِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَنَسٍ مَا بَانَ وَثَبَتَ أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي وَقْتِ الْعَصْرِ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي وَقْتِ الْعِشَاءِ بَعْدَ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ جَائِزٌ لَا عَلَى مَا قَالَ بَعْضُ الْعِرَاقِيِّينَ: إِنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ أَنْ يُصَلَّى الظُّهْرُ فِي آخِرِ وَقْتِهَا وَالْعَصْرُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا، وَالْمَغْرِبُ فِي آخِرِ وَقْتِهَا قَبْلَ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ، وَكُلُّ صَلَاةٍ فِي حَضَرٍ وَسَفَرٍ عِنْدَهُمْ جَائِزٌ أَنْ يُصَلَّى عَلَى مَا فَسَّرُوا الْجَمْعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ، إِذْ جَائِزٌ عِنْدَهُمْ لِلْمُقِيمِ أَنْ يُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا إِنْ أَحَبَّ فِي آخِرِ وَقْتِهَا، وَإِنْ شَاءَ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا.

**واتە: نافیع دەڵێ: لە گەشتێکدا من لەگەڵ عەبدوڵای کوڕی عومەر ﷺ و حەفصی کوڕی عاصم و موساحیقی کوڕی عەمر بووم، وتی: خۆر ئاوا بوو، بە ئیبنو عومەر ﷺ وترا: کاتی نوێژە؟ ئەو هەر ڕێی دەکرد، پێی وترا: کاتی نوێژە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە گەشتدا پەلەی ڕۆیشتنی بکردایە ئەم نوێژەی دوا دەخست، (واتە: نوێژی ئێوارە) منیش دەمەوێ دوای بخەم، وتی: ڕێمان کرد تا نیوەی شەو، یان نزیکی نیوەی شەو، وتی: دواتر دابەزی نوێژەکەی کرد.**

**ئەبو بەکر دەڵێ: لەم فەرمووده و فەرموودەکەی ئیبنو شیهاب لە مالیکەوە ئەوە ڕوون بۆیەوە و جێگیر بوو کۆکردنەوە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر لە کاتی عەسردا ئەنجام ئەدرێ، هەروەها ئێوارە و عیشایش لە کاتی عیشا ئەنجام ئەدرێ لەدوای نەمانی سوورایی بن ئاسمان دروستە، نەك وەکوو ئەوەی هەندێ لە**

---

(١) صحيح.

عێراقییەکان دەڵێن: کۆکردنەوە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر ئەوەیە نوێژی نیوەڕۆ لە کۆتا کاتەکەیدا دەکرێت، عەسریش لە سەرەتای کاتەکەی، ئێوارەیش لە کۆتا کاتیدا پێش نەمانی سوواریی بن ئاسمان، وە هەموو نوێژێك لە شوێنی نیشتەجێ یا لە گەشت لەلای ئەوان دروستە ئەنجام بدرێ بەو شێوەیەی کە کۆکردنەوەی نێوان دوو نوێژیان شی کردەوە، چونکە لەلای ئەوان دروستە کەسی نیشتەجێ هەموو نوێژەکان ئەنجام بدات ئەگەر پێی خۆش بوو دوایان بخات بۆ کۆتا کات، ئەگەر ویستیشی لە یەکەم کاتدا ئەنجامیان بدات.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْحَضَرِ فِي الْمَطَرِ

**٩٧١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ ثَمَانِيًا، وَسَبْعًا جَمِيعًا، قُلْتُ: لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ قَالَ: وَهُوَ مُقِيمٌ مِنْ غَيْرِ سَفَرٍ، وَلَا خَوْفٍ[1].

## باسی مۆڵەتدان بە کۆکردنەوەی نێوان دوو نوێژ لە شوێنی نیشتەجێ لە کاتی بارانباریندا

واتە: ئیبنو عەباس ﭬ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەشت ڕکات نوێژم کرد (واتە: نوێژی نیوەڕۆ و عەسر) پێکەوە، هەروەها حەوت ڕکاتیش (واتە: نوێژی ئێوارە و عیشا)، وتم: بۆچی ئەوەی کرد؟ وتی: ویستی ئەرکی سەرشانی ئوممەتەکەی گران نەکات، وتی: ئەو نیشتەجێ بوو بەبێ گەشت و بەبێ ترس.

**٩٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا سَفَرٍ قَالَ مَالِكٌ: أَرَى ذَلِكَ كَانَ فِي مَطَرٍ[2].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: لَمْ يَخْتَلِفِ الْعُلَمَاءُ كُلُّهُمْ أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْحَضَرِ فِي غَيْرِ الْمَطَرِ غَيْرُ جَائِزٍ، فَعَلِمْنَا وَاسْتَيْقَنَّا أَنَّ الْعُلَمَاءَ لَا يُجْمِعُونَ عَلَى خِلَافِ خَبَرٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ صَحِيحٌ مِنْ جِهَةِ النَّقْلِ،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

لَا مُعَارِضَ لَهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَمْ يَخْتَلِفْ عُلَمَاءُ الْحِجَازِ أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْمَطَرِ جَائِزٌ، فَتَأَوَّلْنَا جَمْعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْحَضَرِ عَلَى الْمَعْنَى الَّذِي لَمْ يَتَّفِقِ الْمُسْلِمُونَ عَلَى خِلَافِهِ، إِذْ غَيْرُ جَائِزٍ أَنْ يَتَّفِقَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى خِلَافِ خَبَرِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَرْوُوا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ خَبَرًا خِلَافَهُ، فَأَمَّا مَا رَوَى الْعِرَاقِيُّونَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ، فَهُوَ غَلَطٌ وَسَهْوٌ، وَخِلَافُ قَوْلِ أَهْلِ الصَّلَاةِ جَمِيعًا، وَلَوْ ثَبَتَ الْخَبَرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ جَمَعَ فِي الْحَضَرِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ لَمْ يَحِلَّ لِمُسْلِمٍ عَلِمَ صِحَّةَ هَذَا الْخَبَرِ أَنْ يَحْظُرَ الْجَمْعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي الْحَضَرِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ، فَمَنْ يَنْقِلُ فِي رَفْعِ هَذَا الْخَبَرِ بِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا سَفَرٍ وَلَا مَطَرٍ، ثُمَّ يَزْعُمُ أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ عَلَى مَا جَمَعَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا، غَيْرُ جَائِزٍ، فَهَذَا جَهْلٌ وَإِغْفَالٌ غَيْرُ جَائِزٍ لِعَالِمٍ أَنْ يَقُولَهُ.

واتە: ئیبنو عەباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوە کرد، وە ئێوارە و عیشاش پێکەوە بەبێ ترس و بەبێ گەشت. مالیك دەڵێ: پێم وایە ئەوە لە کاتی باراندا بوو.

ئەبو بەکر دەڵێ: زانایان جیاوازییان نییە لەسەر ئەوەی کۆکردنەوە لە نێوان دوو نوێژ لە شوێنی نیشتەجێ بەبێ باران دروست نییە، جا دەزانین و دڵنیان لەوەی زانایان بە پێچەوانەی فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەر ﷺ کۆ نابنەوە، کە هیچ فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە پێچەوانەی نەهاتبێت، هەروەها زانایانی حیجاز جیاوازییان نییە لەوەی کۆکردنەوەی دوو نوێژ لەباراندا دروستە، جا کۆکردنەوەی نوێژی پێغەمبەرمان ﷺ لەیەکدایەوە لە نیشتەجێ لەسەر ئەو مانایەی موسوڵمانان یەکدەنگن لەسەر پێچەوانەکەی، چونکە دروست نییە موسوڵمانان یەکدەنگ بن لەسەر پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، بەبێ ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکیان گێڕابێتەوە پێچەوانەی بێت، بەڵام ئەوەی عێراقییەکان گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە نوێژی کۆ کردەوە بەبێ ترس و بەبێ باران ئەوە هەڵە و لێتێکچوونە، وە پێچەوانەی ئەهلی نوێژە بەگشتی، ئەگەرچی فەرموودە جێگیر بووبێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەو نوێژی کۆ کردبێتەوە لە شوێنی نیشتەجێ بەبێ ترس و بەبێ باران حەڵاڵ نییە بۆ موسوڵمان ڕاستی ئەم فەرموودەیەی زانیبێت و کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە شوێنی

نیشتەجێ بەبێ ترس و بەبێ باران بە حەرام بزانێت، هەر کەسێك ئەم فەرموودەیە باس دەکات بەوەی پێغەمبەر ﷺ دوو نوێژی پێکەوە کۆ کردەوە بەبێ ترس و بەبێ گەشت و بەبێ باران، پاشان پێی وایە کۆکردنەوەی نوێژ بەو شێوەیەی پێغەمبەرە ﷺ دروست نییە، بەڕاستی ئەمە نەفامی و بێئاگاییە دروست نییە بۆ زانایەك شتی وا بڵێت.

## بَابُ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ لِلصَّلَاتَيْنِ إِذَا جَمَعَ بَيْنَهُمَا فِي السَّفَرِ، وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْأَوَّلَ مِنْهُمَا يُصَلِّي بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ، وَالْأَخِيرَةَ مِنْهُمَا بِإِقَامَةٍ مِنْ غَيْرِ أَذَانٍ

**٩٧٣-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ قَالَ: أَفَضْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ عَرَفَاتٍ، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى جَمْعٍ أَذَّنَ وَأَقَامَ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ لَمْ يَحِلَّ آخِرُ النَّاسِ حَتَّى أَقَامَ، فَصَلَّى الْعِشَاءَ[١].

## باسی بانگدان و قامەت بۆ دوو نوێژ ئەگەر کۆی بکاتەوە لە گەشتدا، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی یەکەمینی ئەو دووانە بە بانگ و قامەت دەبێت، وە نوێژی دووەم تەنها قامەتی بۆ دەکرێ بەبێ بانگدان

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفە دابەزیم، کاتێ گەیشتە موزدەلیفە فەرمانی کرد بانگ درا و قامەتیش کرا، پاشان نوێژی ئێوارەی کرد، بەشێك لە خەڵکەکە کە لەدواوە بوون هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو، قامەتی بۆ کرا، ئینجا نوێژی عیشای کرد.

## بَابُ إِبَاحَةِ تَرْكِ الْأَذَانِ لِلصَّلَاةِ إِذَا فَاتَ وَقْتُهَا وَإِنْ صُلِّيَتْ جَمَاعَةً

**٩٧٤-** قَالَ أَبُو بَكْرٍ: خَبَرُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ عَنِ الصَّلَاةِ، حَتَّى كَانَ هَوِيٌّ مِنَ اللَّيْلِ قَدْ خَرَّجْتُهُ فِي غَيْرِ هَذَا الْمَوْضِعِ، وَفِي الْخَبَرِ أَنَّهُ أَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ الْعَصْرَ، ثُمَّ أَقَامَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَقَامَ الْعِشَاءَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

## باسی ڕێگەدان بە وازهێنان لە بانگدان بۆ نوێژ
## ئەگەر کاتەکەی لەدەست چوو، ئەگەرچی بەکۆمەڵیش ئەنجام بدرێت

واتە: ئەبو بەکر دەڵێ: فەرموودەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری لە باوکیەوە ﷺ، لە ڕۆژی خەندەق سەرقاڵ کراین لە نوێژ، تا شەومان بەسەردا هات، -ئەم فەرموودەیەم لە چەند شوێنێکی دیکە هێناوە جگە لەم شوێنە- لە فەرموودەکەدا ئەو فەرمانی کرد بە بیلال قامەتی بۆ نوێژی نیوەڕۆ کرد، پاشان قامەتی بۆ عەسر کرد، پاشان قامەتی بۆ ئێوارە کرد، پاشان قامەتی بۆ عیشا کرد.

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الصَّلَاةِ فِي أَوَّلِ الْوَقْتِ قَبْلَ الِارْتِحَالِ مِنَ الْمَنْزِلِ

٩٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلًا لَمْ يَرْتَحِلْ حَتَّى يُصَلِّيَ الظُّهْرَ، قُلْتُ: وَإِنْ كَانَ بِنِصْفِ النَّهَارِ؟ قَالَ: وَإِنْ كَانَ بِنِصْفِ النَّهَارِ»[١].

## باسی چاکتر وایە نوێژ لە یەکەم کاتدا ئەنجام بدرێ
## پێش دەرچوون لە شوێنی پشوودان

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دابەزیبایەتە شوێنێك بۆ پشوودان لێی دەرنەدەچوو تا نوێژی نیوەڕۆی نەکردایە، وتم: ئەگەر نیوەی ڕۆژیش بووایە (ئەگەر سەرەتای کاتی نوێژیش بووایە پەلەی دەکرد و نوێژەکەی دەکرد، ئینجا بەڕێ دەکەوت نوێژەکەی دوا نەدەخست)؟ وتی: ئەگەر نیوەی ڕۆژیش بووایە.

## بَابُ نُزُولِ الرَّاكِبِ لِصَلَاةِ الْفَرِيضَةِ فِي السَّفَرِ، فَرْقًا بَيْنَ الْفَرِيضَةِ وَالتَّطَوُّعِ فِي غَيْرِ الْمُسَابَقَةِ وَالْتِحَامِ الْقِتَالِ وَمُطَارَدَةِ الْعَدُوِّ

٩٧٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَكَانَ يُصَلِّي التَّطَوُّعَ عَلَى رَاحِلَتِهِ مُسْتَقْبِلَ الشَّرْقِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ الْمَكْتُوبَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ[٢].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

باسی دابەزینی سوار لە گەشت بەمەبەستی ئەنجامدانی نوێژی فەرز، وەكوو جیاكردنەوەیەك لە نێوان فەرز و سوننەت جگە لە كاتی جەنگ و تێكەڵبوون لەگەڵ دوژمن و دەرپەڕاندنیان

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لە غەزایەكدا، لەسەر وشترەكەی نوێژی سوننەتی دەكرد ڕووبەڕووی خورهەڵات، كاتێ بیویستایە نوێژی فەرز بكات دادەبەزی و ڕووی دەكردە قیبلە.

## جُمَّاعُ أَبْوَابِ صَلَاةِ الْفَرِيضَةِ عِنْدَ الْعِلَّةِ تَحْدُثُ

## بَابُ صَلَاةِ الْمَرِيضِ جَالِسًا إِذَا لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الْقِيَامِ

٩٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَقَطَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ فَرَسٍ، فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا[١].

## كۆباسی نوێژی فەرز لە كاتی ڕوودانی هەر هۆكارێكدا

## باسی نوێژكردنی نەخۆش بەدانیشتنەوە ئەگەر توانای هەستانی نەبوو

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئەسپێك كەوتە خوارەوە لای ڕاستی بریندار بوو، ئێمەیش سەردانیمان كرد، كاتی نوێژ هات بەدانیشتنەوە نوێژی بۆ كردین.

## بَابُ صِفَةِ الصَّلَاةِ جَالِسًا إِذَا لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الْقِيَامِ

٩٧٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مُتَرَبِّعًا[٢].

## باسی شێوازی نوێژ بەدانیشتنەوە ئەگەر نەیتوانی هەستێت

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەچوارمەشقی نوێژی دەكرد.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

## بَابُ صِفَةِ صَلَاةِ الْمَرِيضِ مُضْطَجِعًا إِذَا لَمْ يَقْدِرْ عَلَى الْقِيَامِ وَلَا عَلَى الْجُلُوسِ

**٩٧٩-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بِي النَّاصُورُ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: «صَلِّ قَائِمًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَجَالِسًا، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ»(١).

## باسی نەخۆش ئەگەر نەیتوانی بەپێوە یان بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، با بەپاڵکەوتنەوە بیکات

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: نەخۆشی ناسۆرم هەبوو، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی چۆنییەتی نوێژکردن، فەرمووی: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر نەتوانی بەدانیشتنەوە، ئەگەر نەتوانی بەپاڵکەوتنەوە.

## بَابُ إِبَاحَةِ الصَّلَاةِ رَاكِبًا وَمَاشِيًا مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةَ وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا عِنْدَ الْخَوْفِ قَالَ اللَّهُ ﷻ: ﴿فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ٢٣٩﴾ البقرة.

**٩٨٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلَاةِ الْخَوْفِ قَالَ: يَقُومُ الْإِمَامُ وَطَائِفَةٌ مِنَ النَّاسِ فَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَةً، وَتَكُونُ طَائِفَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ لَمْ يُصَلُّوا، فَإِذَا صَلَّى الَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً اسْتَأْخَرُوا مَكَانَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا، وَلَا يُسَلِّمُونَ وَيَتَقَدَّمُ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا فَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَنْصَرِفُ الْإِمَامُ، وَقَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَيَقُومُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ فَيُصَلُّونَ لِأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً، فَإِنْ كَانَ خَوْفًا أَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ صَلَّوْا رِجَالًا قِيَامًا عَلَى أَقْدَامِهِمْ، وَرُكْبَانًا مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةَ، أَوْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا(٢).

## باسی ڕێگەدان بە نوێژکردن بەسواری و بەپیادە بەرەوڕووی قیبلە یان بەرەوڕووی نەبێت لە کاتی ترسان، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ٢٣٩﴾، واتە: بەپیادە یان بەسواری

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو کاتێ پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی نوێژی ترس، دەیوت: پێشنوێژ و کۆمەڵێك لە خەڵکەکە هەڵدەستن یەك ڕکاتیان بۆ دەکات،

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

کۆمەڵێك لە نێوان پێشنوێژ و دوژمن دەبن نوێژیان نەکردووە، ئەگەر ئەوانەی کە لەگەڵ پێشنوێژن یەك ڕکاتیان کرد، دەچنە دواوە بۆ جێگای ئەوانەی نوێژیان نەکردووە، سەلام نادەنەوە، ئینجا ئەوانە پێش دەکەون کە نوێژیان نەکردووە، لەگەڵ پێشنوێژ یەك ڕکات دەکەن، ئینجا پێشنوێژ سەلام دەداتەوە، ئەو دوو ڕکاتی کردووە، هەریەکە لە دوو کۆمەڵەکە هەڵدەستن ڕکاتێك بۆ خۆیان دەکەن، ئەگەر ترسەکە لەوە زیاتر بوو بەپیادە لەسەر پێیەکانیان نوێژ دەکەن، هەروەها بەسواری بەرەوڕووی قیبلە بێت یان بەرەوڕووی نەبێت.

**٩٨١-** عَن مَالِكٍ بِهَذَا الْإِسْنَادِ سَوَاءً، وَقَالَ: قَالَ نَافِعٌ: إِنَّ ابْنَ عُمَرَ ﷺ رَوَى ذَلِكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ(١).

واتە: لە مالیکەوە بە هەمان سەنەد هاتووە، وتی: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر ﷺ ئەو باسەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي الصَّلَاةِ مَاشِيًا عِنْدَ طَلَبِ الْعَدُوِّ

**٩٨٢-** عَنْ محمد بْنِ جَعْفَرِ بْنِ الزُّبَيْرِ عَنْ بنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى خَالِدِ بْنِ سُفْيَانَ بْنِ نُبَيْحٍ الْهُذَلِيِّ، وَبَلَغَهُ أَنَّهُ يَجْمَعُ لَهُ، وَكَانَ بَيْنَ عُرَنَةَ وَعَرَفَاتٍ قَالَ لِيَ: «اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ» قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صِفْهُ لِي قَالَ: «إِذَا رَأَيْتَهُ أَخَذَتْكَ قُشَعْرِيرَةٌ، لَا عَلَيْكَ أَنْ لَا أَصِفَ لَكَ مِنْهُ غَيْرَ هَذَا» قَالَ وَكَانَ رجلاً إرباً وأشعر قَالَ: انْطَلَقْتُ حَتَّى إِذَا دَنَوْتُ مِنْهُ حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، صَلَاةَ الْعَصْرِ قَالَ: قُلْتُ إِنِّي لَأَخَافُ أَنْ يَكُونَ بَيْنِي مَا أَنْ أُؤَخِّرَ الصَّلَاةَ، فَصَلَّيْتُ وَأَنَا أَمْشِي أُومِئُ إِيمَاءً نَحْوَهُ، ثُمَّ انْتَهَيْتُ إِلَيْهِ، فَوَاللَّهِ مَا عَدَا أَنْ رَأَيْتُهُ اقْشَعْرَرْتُ وإذا هو ظُعُنٍ له: فِي نسائه، فَمَشَيْتُ مَعَهُ، فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: رَجُلٌ مِنَ الْعَرَبِ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَجْمَعُ لِهَذَا الرَّجُلِ فَجِئْتُكَ فِي ذَاكَ، فَقَالَ: إِنِّي لَفِي ذَاكَ قَالَ: قُلْتُ فِي نَفْسِي: سَتَعْلَمُ قَالَ: فَمَشَيْتُ مَعَهُ سَاعَةً حَتَّى إِذَا أَمْكَنَنِي عَلَوْتُهُ بِسَيْفِي حَتَّى بَرَدَ، ثُمَّ قَدِمتُ الْمَدِينَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، فَأَعْطَانِي مِخْصَرًا -يَقُولُ: عَصاً- فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ عِنْدِهِ، فَقَالَ لِي أَصْحَابِي: مَا هَذَا الَّذِي أَعْطَاكَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: قُلْتُ: مِخْصَرًا قَالُوا: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ، أَلَا سَأَلْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِمَ أَعْطَاكَ

---

(١) صحيح.

هَذَا، وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ عُدْ إِلَيْهِ، فَاسْأَلْهُ قَالَ: فَعُدْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، الْمِخْصَرُ أَعْطَيْتَنِيهُ لِمَاذَا؟ قَالَ: «إِنَّهُ بَيْنِي وَبَيْنَكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَأَقَلُّ النَّاسِ يَوْمَئِذٍ الْمُخْتَصِرُونَ» قَالَ: فَعَلَّقَهَا فِي سَيْفِهِ، لَا يُفَارِقُهُ، فَلَمْ يُفَارِقْهُ مَا كَانَ حَيًّا، فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ أَمَرَنَا أَنْ نَدْفِنَ مَعَهُ قَالَ: فَجُعِلَتْ وَاللَّهِ فِي كَفَنِهِ»[١].

## باسی مۆڵەتدان بە نوێژکردن بەپیادە لە کاتی گەڕان بەدوای دوژمن

واتە: موحەممەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە لە کوڕەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ لای خالیدی کوڕی سوفیانی کوڕی نوبەیحی هوزەلی، هەواڵی پێ گەیشتبوو ئەو خەڵك لە دژی کۆ دەکاتەوە، لە نێوان عوڕنە و عەڕەفەدا بوو، پێمی فەرموو: بڕۆ بیکوژە، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی بکە بۆم، فەرمووی: ئەگەر بینیت تەرزێك دێت بە لەشتدا، پێویست ناکات لەمە زیاتر وەسفی بکەم بۆت، وتی: پیاوێکی قەڵەوی توکن بوو وتی: ڕۆیشتم تا لێی نزیك بوومەوە کاتی نوێژی عەسر هات، وتی: وتم: دەترسم لەوەی لە نێوانی من و ئەودا شتێك بێتە پێش دوا بکەوم لە نوێژەکەم، بۆیە بەدەم ڕێکردنەوە نوێژم کرد، بەدەم ڕێکردنەوە بەلاچاو تەماشام دەکرد، پاشان گەیشتمە لای، سوێند بە خوا کە بینیم تەرزێك بە گیانمدا هات، ئەو لەنێو کەژاوەکەیدا بوو، لەگەڵ خێزانەکانی، لەگەڵی ڕێم کرد، وتی: تۆ کێی؟ وتم: پیاوێکم لە عەرەب هەواڵم پێ گەیشتووە خەڵك کۆ دەکەیتەوە لە دژی ئەو پیاوە، منیش بۆ ئەو مەبەستە هاتووم، وتی: من خەریکی ئەوەم، وتی: لە دەروونی خۆمدا وتم: ئێستا دەزانی، وتی: ماوەیەك لەگەڵی ڕێم کرد هەتا فورسەتم سەند بە شمشێرەکەم پەلامارم دا هەتا سارد بۆیەوە، پاشان هاتم بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، هەواڵم پێ دا، ئەویش (مِخْصَر) ێکی پێ دام، -دەیوت: گۆچان- لەلای دەرچووم، هاوەڵەکانم پێمیان وت: ئەوە چییە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دای؟ وتی: وتم: گۆچانە، وتیان: چی لێ دەکەی، ئەی بۆ پرسیارت نەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ بزانی بۆچی ئەوەی پێ دای و چی پێ بکەی؟

---

(١) إسناده ضعيف.

بگەڕێرەوە بۆ لای، پرسیاری لێ بکە، وتی: گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو گۆچانەی کە پێت دام بۆچی بوو؟ فەرمووی: ئەوە لە نێوانی من و تۆدایە لە ڕۆژی دوایی، کەمترینی خەڵکی لەو ڕۆژەدا گوچانیان هەیە، وتی: هەڵمواسی بە شمشێرەکەمدا، لێی جیا نەبوویەوە تا زیندوو بوو، کاتێ کەوتە سەرەمەرگ فەرمانی پێ کردین لەگەڵیدا بینێژین، وتی: سوێند بە خوا خستمە نێو کفنەکەی.

**٩٨٣** - عَنِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَدْ خَرَّجْتُ أَبْوَابَ صِفَاتِ الْخَوْفِ فِي آخِرِ كِتَابِ الصَّلَاةِ[1].

واتە: کوڕەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە ﷺ، -باسی فەرموودەکەی کرد بەدرێژی- ئەبو بەکر دەڵێ: بەشەکانی سیفاتی ترسم باس کردووە لە کۆتایی کتێبی نوێژ.

## بَابُ النَّاسِي لِلصَّلَاةِ وَالنَّائِمِ عَنْهَا يُدْرِكُ رَكْعَةً مِنْهَا قَبْلَ ذَهَابِ وَقْتِهَا

**٩٨٤**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَتَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ أَوْ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ فَقَدْ أَدْرَكَ»[2].

## باسی ئەو کەسەی نوێژی بیر دەچێت یان دەخەوێت و بەخەبەر نایەت بگات بەیەك ڕکاتیدا پێش ئەوەی کاتەکەی بڕوات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بگات بە دوو ڕکاتی نوێژی عەسر پێش خۆرئاوابوون، یان ڕکاتێك لە نوێژی بەیانی پێش خۆرهەڵاتن ئەوە گەیشتووە بە نوێژەکەیدا.

---

(١) هذا السند حسنه ابن حجر في فتح الباري.

(٢) صحيح.

**بَابُ ذِكْرِ الْبَيَانِ ضِدَّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الْمُدْرِكَ رَكْعَةً مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ غَيْرُ مُدْرِكٍ الصُّبْحَ زَعَمَ أَنَّهُ خَرَجَ مِنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ إِلَى غَيْرِ وَقْتِ الصَّلَاةِ، فَفَرَّقَ بَيْنَ مَا جَمَعَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَخَالَفَ النَّبِيَّ ﷺ الْمُصْطَفَى بِجَهْلِهِ، وَالنَّبِيُّ الْمُصْطَفَى الَّذِي أَخْبَرَ أَنَّ الْمُدْرِكَ رَكْعَةً قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ مُدْرِكٌ الصَّلَاةَ عَالِمٌ بِأَنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ وَقْتِ الصَّلَاةِ إِلَى غَيْرِ وَقْتِ صَلَاةٍ فَجَعَلَهُ مُدْرِكًا لِلصَّلَاةِ، كَالْمُدْرِكِ رَكْعَةً أَوْ رَكْعَتَيْنِ مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، وَإِنْ كَانَ يَخْرُجُ مِنْ وَقْتٍ إِلَى وَقْتِ صَلَاةٍ.**

**٩٨٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَهَا»(١).

**باسی ڕوونکردنەوە بە پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی پێی وایە ئەو کەسەی دەگات بە ڕکاتێك لە نوێژی بەیانی پێش دەرچوونی خۆر ئەوە نەگەیشتووە بە نوێژی بەیانیدا، پێی وایە لە کاتی نوێژ دەرچووە بۆ کاتی نوێژێکی دیکە، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆی کردۆتەوە لە نێوانیاندا ئەو جیای کردۆتەوە، بەنەفامی خۆی پێچەوانەی پێغەمبەری ﷺ کردووە، وە پێغەمبەر ﷺ کە هەواڵی دا ئەوەی بگات بە ڕکاتێك پێش دەرچوونی خۆر ئەوە گەیشتووە بە نوێژەکەدا، زانیویەتی ئەو دەرچووە لە کاتی ئەو نوێژە بۆ نێو کاتی نوێژێکی دیکە، دایناوە گەیشتووە بە نوێژەکەی، هەر وەکوو ئەوەی بگات بە ڕکاتێك یان دوو ڕکات لە نوێژی عەسر پێش ئاوابوونی خۆر، ئەگەرچی لە کاتێکەوە دەربچێت بۆ کاتی نوێژێکی دیکە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێ لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر دەربچێت ئەوە گەیشتووە بە نوێژی بەیانی، وە هەر کەسێك بگات بە ڕکاتێك لە نوێژی عەسر پێش خۆرئاوابوون ئەوە گەیشتووە بە نوێژی عەسردا.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْمُدْرِكَ هَذِهِ الرَّكْعَةَ مُدْرِكٌ لِوَقْتِ الصَّلَاةِ وَالْوَاجِبَ عَلَيْهِ إِتْمَامُ صَلَاتِهِ

٩٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی بگات بە ڕکاتێك ئەوە گەیشتووە بە کاتی نوێژەکە، پێویستە لەسەری نوێژەکەی تەواو بکات

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕکاتێك لە نوێژی بەیانی کرد، پاشان خۆر دەرکەوت، ئەوە با ڕکاتەکەی دیکەش بکات.

## بَابُ النَّائِمِ عَنِ الصَّلَاةِ وَالنَّاسِي لَهَا، لَا يَسْتَيْقِظُ وَلَا يَذْكُرُهَا إِلَّا بَعْدَ ذَهَابِ الْوَقْتِ

٩٨٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّا سَرَيْنَا ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى إِذَا كَانَ السَّحَرُ قَبْلَ الصُّبْحِ وَقَعْنَا تِلْكَ الْوَقْعَةِ، وَلَا وَقْعَةَ أَحْلَى عِنْدَ الْمُسَافِرِ مِنْهَا، فَمَا أَيْقَظَنَا إِلَّا حَرُّ الشَّمْسِ، وَكَانَ أَوَّلُ مَنِ اسْتَيْقَظَ فُلَانٌ، ثُمَّ فُلَانٌ كَانَ يُسَمِّيهِمْ أَبُو رَجَاءٍ، وَيُسَمِّيهِمْ عَوْفٌ، ثُمَّ عُمَرُ الرَّابِعُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَامَ لَمْ نُوقِظْهُ، حَتَّى يَكُونَ هُوَ يَسْتَيْقِظُ، لِأَنَّا لَا نَدْرِي مَا يَحْدُثُ لَهُ فِي نَوْمِهِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وَرَأَى مَا أَصَابَ النَّاسَ، فَكَانَ رَجُلًا أَجْوَفَ جَلِيدًا، فَكَبَّرَ وَرَفَعَ صَوْتَهُ بِالتَّكْبِيرِ، فَمَا زَالَ يُكَبِّرُ وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ حَتَّى اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَوْتِهِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ شَكَوْا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي أَصَابَهُمْ، فَقَالَ: «لَا ضَيْرَ أَوْ لَا يَضِيرُ ارْتَحِلُوا»، فَارْتَحَلُوا فَسَارَ غَيْرَ بَعِيدٍ، ثُمَّ نَزَلَ فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ نَادَى بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى بِالنَّاسِ[2].

## باسی ئەو کەسەی خەوتووە و بەخەبەر نەهاتۆتەوە بۆ نوێژ و ئەوەیشی بیری چووە و بیری نەکەوتۆتەوە، مەگەر دوای ڕۆشتنی کاتی نوێژەکەی نەبێت

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بووین، شەوێك ڕێمان کرد تا پارشێو پێش نوێژی بەیانی، پشوومان دا پشوویەکی زۆر

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

خۆش بەلای گەشتیارەوە، بەخەبەر نەهاتینەوە تا گەرمای خۆر بەخەبەری کردینەوە، یەکەم کەس بەخەبەر هاتەوە فڵانە کەس بوو، پاشان فڵانە کەس، - ئەبو ڕەجاء ناویانی هێنا هەروەها عەوفیش- پاشان چوارەم کەس عومەری کوڕی خەتاب بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بخەوتایە بەخەبەرمان نەدەکردەوە تا خۆی لە خەو هەڵدەستا، چونکە ئێمە نەماندەزانی چی ڕوودەدات لە خەوەکەیدا، بەڵام کاتێ عومەر لە خەو هەستا ئەوەی بینی تووشی خەڵکەکە بووە، وتی: عومەر پیاوێکی وشك و بوێر بوو، تەکبیری کرد و دەنگی بەرز کردەوە، بەردەوام تەکبیری دەکرد و دەنگی بەرز دەکردەوە بە تەکبیرکردن تا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەنگی بەخەبەر بۆیەوە، کاتێ لەخەو هەستا سکاڵای ئەوەیان کرد کە تووشیان بووە، فەرمووی: هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، بەڕێ بکەون، ئەندازەیەك ڕێیان کرد زۆر دوور نەڕۆیشتن، پاشان دابەزی داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی پێ گرت، پاشان فەرمانی کرد بانگ درا بۆ نوێژ و نوێژی بە خەڵکەکە کرد.

## بَابُ ذِكْرِ الْعِلَّةِ الَّتِي لَهَا أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحَابَهُ بِالِارْتِحَالِ وَتَرْكِ الصَّلَاةِ فِي ذَلِكَ الْمَكَانِ

٩٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَعْرَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِيَأْخُذْ كُلُّ إِنْسَانٍ بِرَأْسِ رَاحِلَتِهِ؛ فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ، فَفَعَلْنَا فَدَعَا بِالْمَاءِ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ صَلَاةَ الْغَدَاةِ[1].

## باسی هۆکاری ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پێناویدا فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن و نوێژی تێدا نەکەن

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەو دابەزین و خەوتین بەخەبەر نەهاتینەوە تا خۆر هەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هەر کەس ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت، چونکە ئەم جێگایەی ئێمە بۆی دابەزین شەیتانی تێدایە، ئێمەش ئەوەمان کرد، دواتر داوای کرد ئاوی بۆ بهێنرێ و دەستنوێژی گرت، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان قامەت کرا بۆ نوێژی بەیانی.

---

(١) صحيح.

## بَابُ النَّائِمِ عَنِ الصَّلَاةِ وَالنَّاسِي لَهَا يَسْتَيْقِظُ أَوْ يَذْكُرُهَا فِي غَيْرِ وَقْتِ الصَّلَاةِ

**٩٨٩-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: ذَكَرُوا تَفْرِيطَهُمْ فِي النَّوْمِ، فَقَالَ: نَامُوا، حَتَّى إِذَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ، فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلَاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، وَلِوَقْتِهَا مِنَ الْغَدِ»[١].

## باسی ئەو کەسەی خەوتووە و بەخەبەر نەهاتووەتەوە بۆ نوێژ و ئەوەیشی بیری چووەتەوە، لە کاتێکی دیکەدا هەڵدەستێ یان بیری دەکەوێتەوە

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: باسی کەمتەرخەمیی خۆیانیان کرد لەوەی زۆر خەوتن، وتی: خەوتن تاکوو خۆر هەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان لە خەودا هیچ کەمتەرخەمییەك نییە، بەڵکوو کەمتەرخەمی لە بەخەبەربووندایە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژێکی بیر چوو یان خەوت و بەخەبەر نەهاتەوە، با نوێژەکەی بکات ئەگەر بیری هاتەوە، وە لە بەیانییەکەی دیکە نوێژەکەی (دووبارە) بکاتەوە لە کاتی خۆیدا.

**٩٩٠-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَأَصْحَابَهُ لَمَّا نَامُوا عَنِ الصَّلَاةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوهَا لِلْغَدِ لِوَقْتِهَا»[٢].

تَنْبيهٌ هَامٌّ :تَرْجَمَ ابْنُ خُزَيْمَةَ عَلَى الْبَابِ التَّالِي لِهَذَا بِقَوْلِهِ : " بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبيِّ ﷺ بِإِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلاةِ الَّتِي قَدْ نَامَ عَنْهَا أَوْ نَسِيَهَا مِنْ الغَدِ لِوَقْتِهَا بَعْدَ قَضَائِها عِنْدَ الِاسْتِيقَاظِ أَوْ عِنْدَ ذِكْرِها أَمْرٌ فَضِيلَةٌ لَا أَمْرَ عَزِيمَةٌ وَفَرِيضَةٌ إِذْ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمُ أَنَّ كَفَّارَةَ نِسْيانِ الصَّلَاةِ أَوْ النَّوْمِ عَنْهَا أَنْ يُصَلِّيَها النَّائِمُ إِذَا ذَكَرَها وَأَعْلَمُ أَنْ لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ " - فَتَعَقبهُ الأَلْبانيُّ بِقَوْلِهِ " لَا يَظْهَرُ مِنْ مَجْموعِ رِواياتِ أَحاديثِ البَابِ أَنَّ النَّبيَّ ﷺ أَمَرٌ بِإِعَادَةِ الصَّلاةِ الَّتِي قَضَاهَا نَفْسُها مِنْ الغَدِ وَإِنَّمَا أَمَرَ بِأَدَاءِ صَلاةِ الغَدِ فِي وَقْتِها وَأَنْ لَا تُؤَخَّرَ عَنْهُ فَتَأَمَّلَ فَإِنَّ هَذَا الْبَابَ وَكَذَا الَّذِي بَعْدَهُ مِمَّا لَا حاجَةَ إِلَيْه بَلْ هُمَا خَطَأٌ أ . هـ . وَتَرْجَمَةُ الْبَابِ الَّذِي بَعْدَهُ هِيَ : " بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِإِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلاةِ الَّتِي قَدْ يَنامُ عَنْهَا أَوْ ذَكَرَها بَعْدَ نِسْيانٍ مِنْ الغَدِ

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده صحيح.

لِوَقْتِهَا قَبْلَ نَهْيِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَنْ الرِّبَا إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ زَجَرَ عَنْ إِعادَةِ تِلْكَ الصَّلاةِ مِنْ الغَدِ بَعْدَ أَمْرِهِ كَانَ بِهَا وَأَعْلَمَ أَصْحابَهُ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَنْهَى عَنْ الرِّبَا وَيُقْبِلُ مِنْ عِبادِهِ الرِّبَا وَصَلَاتَانِ بِصَلاةٍ واحِدَةٍ كَدِرْهَمٍ بِدِرْهَمَيْنِ وَواحِدٌ مَا شَاءَ مِمَّا لَا يَجُوزُ فِيه التَّفاضُلُ ".

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی کاتێ خەوتن و بەخەبەر نەهاتنەوە بۆ نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەیانی لە کاتی خۆیدا نوێژەکە (دووبارە) بکەنەوە.

ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگ: ئیبنو خوزەیمە لە بەشەکەی دوای ئەمە گوتوویەتی: باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە ئەو نوێژەی کە خەوتبوو بەخەبەر نەهاتبووەوە یان بیری چووبوو، لە بەیانییەکەی دیکە لە کاتی خۆیدا دووبارەی بکاتەوە، دوای ئەوەی لە کاتی بەخەبەرهاتنەوەی یان بیرهاتنەوەی ئەنجامی دابێت، فەرمانێکە بۆ فەزڵ و چاکە نەك بۆ جەختکردنەوە و فەرزبوون، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەفارەتی بیرچوونەوەی نوێژ یان خەوتن و بەخەبەر نەهاتنەوەی، ئەوەیە کاتێ بەخەبەر هاتەوە نوێژەکەی بکات، هەواڵیشی داوە ئەو نوێژەی کە چووە هیچ کەفارەتێکی نییە جگە لەوە نەبێت. ئەلبانیش بەدوایدا وتوویەتی: لە کۆی فەرموودەکانی بەشەکەدا دەرناکەوێت پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردبێت بە دووبارەکردنەوەی ئەو نوێژی بەیانییەی کە ئەنجامی داوە، بەڵکوو فەرمانی کردووە بە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی لە کاتی خۆیدا و دوای نەخات، چاك سەرنج بدە چونکە ئەم بەشە و بەهەمان شێوە ئەو بەشەیش کە بە دوایدا دێت، هیچ پێویست نییە بەڵکوو هەردووکیان هەڵەن. هەروەها بەشەکەی دوای ئەویش کە بریتییە لە: باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانی کرد ئەو نوێژەی کە خەوتبوو بەخەبەر نەهاتبووەوە یان بیری چووبوو، لە بەیانییەکەی دیکە لە کاتی خۆیدا دووبارەی بکاتەوە، پێش ئەوە بوو کە خوا ﷺ قەدەغەی ڕیبا بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی کرد لە دووبارەکردنەوەی ئەو نوێژە لە بەیانیدا دوای ئەوەی کە فەرمانی پێ کردبوو، هاوەڵەکانیشی ئاگادار کردەوە خوا ﷻ ڕیبا قەدەغە ناکات و لە بەندەکانی بۆ خۆی قبووڵ بکات، وە دوو نوێژ بە نوێژێك وەکوو درهەمێك وایە بە دوو درهەم، یەك دانە بە یەك دانەیە دروست نییە زیادەی تێ بکەوێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ أَمْرَ النَّبِيِّ ﷺ بِإِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلَاةِ الَّتِي قَدْ نَامَ عَنْهَا أَوْ نَسِيَهَا، مِنَ الْغَدِ لِوَقْتِهَا بَعْدَ قَضَائِهَا عِنْدَ الِاسْتِيقَاظِ أَوْ عِنْدَ ذِكْرِهَا، أَمْرُ فَضِيلَةٍ لَا أَمْرُ عَزِيمَةٍ وَفَرِيضَةٍ، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ أَعْلَمَ أَنَّ كَفَّارَةَ نِسْيَانِ الصَّلَاةِ أَوِ النَّوْمَ عَنْهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا النَّائِمُ إِذَا ذَكَرَهَا، وَأَعْلَمَ أَنْ لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ

٩٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَرْقُدُ عَنِ الصَّلَاةِ أَوْ يَغْفُلُ عَنْهَا قَالَ: «كَفَّارَتُهَا يُصَلِّيهَا إِذَا ذَكَرَهَا»[1].

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە کە کەسێك ئەو نوێژەی کە خەوتبوو بەخەبەر نەهاتبووەوە یان بیری چووبوو، لە بەیانییەکەی دیکە لە کاتی خۆیدا دووبارەی بکاتەوە، دوای ئەوەی لە کاتی بەخەبەرهاتنەوەی یان بیرهاتنەوەی ئەنجامی دابێت، فەرمانێکە بۆ فەزڵ و چاکە نەك بۆ جەختکردنەوە و فەرزبوون، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەفارەتی بیرچوونەوەی نوێژ یان خەوتن و بەخەبەرنەهاتنەوەی، ئەوەیە کاتێ بەخەبەر هاتەوە نوێژەکەی بکات، هەواڵیشی داوە ئەوە هیچ کەفارەتێکی نییە جگە لەوە نەبێت

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی پیاوێکەوە دەخەوێت و بەخەبەر نایەتەوە بۆ نوێژ یان لێی بێئاگا دەبێت، فەرمووی: کەفارەتەکەی ئەوەیە کاتێ بیری کەوتەوە نوێژەکەی بکات.

٩٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلَاةً، أَوْ نَامَ عَنْهَا، فَكَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژێکی بیر چوو، یان خەوی لێ کەوت و بەخەبەر نەهاتەوە، ئەوە کەفارەتەکەی ئەوەیە ئەگەر بیری هاتەوە نوێژەکەی بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

**٩٩٣-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، لَا كَفَّارَةَ لَهَا إِلَّا ذَلِكَ(١).

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك نوێژێكی بیر چوو، ئەگەر بیری هاتەوە نوێژەكەی بكات، هیچ كەفارەتێكی لەسەر نییە ئەوە نەبێت.

## بَابُ ذِكْرِ الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّمَا أَمَرَ بِإِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلَاةِ الَّتِي قَدْ يَنَامُ عَنْهَا أَوْ ذَكَرَهَا بَعْدَ النِّسْيَانِ مِنَ الْغَدِ لِوَقْتِهَا قَبْلَ نَهْيِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَنِ الرِّبَا، إِذِ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ زَجَرَ عَنْ إِعَادَةِ تِلْكَ الصَّلَاةِ مِنَ الْغَدِ بَعْدَ أَمْرِهِ كَانَ بِهَا، وَأَعْلَمَ أَصْحَابَهُ أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَنْهَى عَنِ الرِّبَا وَيَقْبَلُ مِنْ عِبَادِهِ الرِّبَا، وَصَلَاتَانِ بِصَلَاةٍ وَاحِدَةٍ كَدِرْهَمٍ بِدِرْهَمَيْنِ، وَوَاحِدٌ مَا شَاءَ مِمَّا لَا يَجُوزُ فِيهِ التَّفَاضُلُ

**٩٩٤-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: سَرَيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ عَرَّسْنَا، فَغَلَبَتْنَا أَعْيُنُنَا، فَمَا أَيْقَظَنَا إِلَّا حَرُّ الشَّمْسِ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَقُومُ إِلَى وَضُوئِهِ دَهِشًا، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَتَوَضَّؤُوا، ثُمَّ أَمَرَ بِلَالًا فَأَذَّنَ، ثُمَّ صَلَّوْا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ، فَصَلَّى الْفَجْرَ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَّطْنَا أَفَلَا نُعِيدُهَا لِوَقْتِهَا مِنَ الْغَدِ؟ فَقَالَ: «يَنْهَاكُمْ رَبُّكُمْ عَنِ الرِّبَاءِ»(٢).

## باسی بەڵگە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ كاتێ فەرمانی كرد كە كەسێك ئەگەر ئەو نوێژەی كە خەوتبوو بەخەبەر نەهاتبووەوە یان بیری چووبوو، لە بەیانییەكەی دیكە لە كاتی خۆیدا دووبارەی بكاتەوە، پێش ئەوە بوو كە خوا قەدەغەی ڕیبا بكات، چونكە پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی كرد لە دووبارەكردنەوەی ئەو نوێژە لە بەیانیدا دوای ئەوەی كە فەرمانی پێ كردبوو، هاوەڵەكانیشی ئاگادار كردەوە خوا ﷻ ڕیبا قەدەغە ناكات و لە بەندەكانی بۆ خۆی قبووڵ بكات، وە دوو نوێژ بە نوێژێك وەكوو درهەمێك وایە بە دوو درهەم، یەك دانە بە یەك دانەیە دروست نییە زیادەی تێ بكەوێت

واتە: عیمرانی كوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێیان دەكرد، كاتێ گەیشتینە كۆتایی شەو پشوومان دا خەو زاڵ بوو بەسەر چاوماندا، بەخەبەر

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

نەهاتینەوە تاکوو گەرمای خۆر بە خەبەری کردینەوە، جا هەر پیاوێك بەشپرزەیی هەڵدەستا بۆ لای ئاوی دەستنوێژەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن دەستنوێژ بگرن، پاشان فەرمانی بە بیلال کرد بانگی دا، پاشان دوو ڕکات نوێژی سوننەتی بەیانییان کرد، پاشان فەرمانی پێ کرد، ئینجا قامەتی بۆ کرا نوێژی بەیانی کرد، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەمتەرخەم بووین و لە دەستمان چوو، ئایا لە بەیانییەکەی دیکەدا دووبارەی نەکەینەوە؟ فەرمووی: پەروەردگارتان ڕێگری لێ کردوون لە ڕیبا.

## بَابُ ذِكْرِ النَّاسِي لِلصَّلَاةِ يَذْكُرُهَا فِي وَقْتِ صَلَاةِ الثَّانِيَةِ وَالْبَدْءِ بِالْأُولَى ثُمَّ بِالثَّانِيَةِ

**٩٩٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: جَاءَ عُمَرُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَجَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، فَقَالَ: وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَا صَلَّيْتُ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتِ الشَّمْسُ أَنْ تَغِيبَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَنَا وَاللَّهِ مَا صَلَّيْتُهَا، فَنَزَلَ إِلَى بُطْحَانَ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ بَعْدَمَا غَابَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ بَعْدَهَا»[1].

### باسی ئەو کەسەی نوێژێکی بیر دەچێتەوە، لە کاتی نوێژی دووەم بیری دەکەوێتەوە، ئەوا با سەرەتا بە یەکەم نوێژ دەست پێ بکات پاشان دووەم

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵا ﵄ دەڵێ: لە ڕۆژی خەندەقدا عومەر هات جنێوی بە بێباوەڕانی قورەیش ئەدا، وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نوێژی عەسرم نەکرد تا خەریك بوو خۆر ئاوا بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا منیش نەمکرد، دواتر دابەزیە (بُطْحَان) (کە شیوێك بووە لە نزیك مەدینە) دەستنوێژی گرت، پاشان نوێژی عەسری کرد دوای ئەوەی خۆر ئاوا بوو، پاشان دوای ئەوە نوێژی ئێوارەی کرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ ذِكْرِ فَوْتِ الصَّلَوَاتِ وَالسُّنَّةِ فِي قَضَائِهَا، إِذَا قُضِيَتْ فِي وَقْتِ صَلَاةِ الْآخِرَةِ مِنْهَا وَالِاكْتِفَاءِ بِكُلِّ صَلَاةٍ مِنْهَا بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ وَالدَّلِيلِ عَلَى ضِدِّ قَوْلِ مَنْ زَعَمَ أَنَّ الصَّلَوَاتِ إِذَا فَاتَ وَقْتُهَا لَمْ تُصَلَّ جَمَاعَةً وَإِنَّمَا تُصَلَّى فُرَادَى

**٩٩٦-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْمَغْرِبِ هَوِيًّا، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ فِي الْقِتَالِ، فَلَمَّا كُفِينَا الْقِتَالَ، وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ ﷻ: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾ الأحزاب، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِلَالًا، فَأَقَامَ - يَعْنِي الظُّهْرَ - فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَقَامَ الْعَصْرَ، فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَقَامَ الْمَغْرِبَ فَصَلَّاهَا كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا»[1].

## باسی لەدەستچوونی نوێژەکان، وە سوننەت لە قەزاکردنەوەیان، ئەگەر لە کۆتا نوێژدا قەزا کرانەوە، وە بۆ هەر نوێژێك یەك قامەتی بەسە، وە بەڵگە لەسەر پێچەوانەی وتەی ئەو کەسەی کە پێی وایە نوێژەکان ئەگەر کاتەکەیان ڕۆیشت بەکۆمەڵ ئەنجام نادرێن بەڵکوو بەتاك ئەنجام ئەدرێن

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری دەگێڕێتەوە، لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی خەندەق تا دوای ئێوارە سەرقاڵ کراین، ئەویش پێش ئەوەی خوا ﷻ ئایەت دابەزێنێت دەربارەی نوێژی ترس لە جەنگدا، کاتێ خوا ئێمەی پاراست لە جەنگ، ئەویش فەرمایشتەکەی خوایە ﷻ: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾، واتە: خوا ﷻ ئیماندارانی لە جەنگ پاراست، بەڕاستی خوا هەمیشە بەهێز و بە دەسەڵاتە. پیغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە بیلال قامەتی بۆ نوێژی نیوەڕۆ کرد، ئینجا نوێژی کرد وەکوو چۆن لە کاتی خۆیدا دەیکرد، پاشان قامەتی عەسری کرد، نوێژی کرد وەکوو چۆن لە کاتی خۆیدا دەیکرد، پاشان قامەتی نوێژی مەغریبی کرد، نوێژی کرد وەکوو چۆن لە کاتی خۆیدا دەیکرد.

---

(١) صحيح.

## بَابُ الْأَذَانِ لِلصَّلَاةِ بَعْدَ ذَهَابِ الْوَقْتِ وَإِنْ كَانَتِ الْإِقَامَةُ تُجْزِئُ

**٩٩٧-** عَن عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي سَفَرٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ فِي نَوْمِهِمْ عَنِ الصَّلَاةِ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَقَالَ: ثُمَّ نَادَى بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى بِالنَّاسِ[١].

## باسی بانگدان بۆ نوێژ دوای تێپەڕبوونی کاتەکەی، ئەگەرچی تەنها قامەتیش دروستە

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: ئێمە لە گەشتێك بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، -باسی بەسەرهاتەکەیانی کرد دەربارەی خەوتنەوەیان لە نوێژی بەیانی تا خۆر دەرچوو- وتی: پاشان فەرمانی کرد بانگ درا بۆ نوێژ، دواتر نوێژی بە خەڵکەکە کرد.

**٩٩٨-** عَنْ بِلَالٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَنَامَ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَأَمَرَ بِلَالًا، فَأَذَّنَ، فَتَوَضَّؤُوا، ثُمَّ صَلَّوَا الرَّكْعَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّوَا الْغَدَاةَ[٢].

قَالَ أَبُو بَكْرٍ: فِي خَبَرِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: فَأَمَرَ بِلَالًا ﷺ، فَأَذَّنَ، ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى بِنَا.

واتە: بیلال ﷺ دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لە گەشتێکدا خەوت تا خۆر دەرچوو، فەرمانی کرد بە بیلال بانگی دا، دواتر دەستنوێژیان گرت پاشان دوو ڕکات نوێژیان کرد، پاشان نوێژی بەیانییان کرد.

ئەبو بەکر دەڵێ: لە فەرموودەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مەسعود لە باوکیەوە ﷺ دەڵێ: فەرمانی کرد بە بیلال ﷺ، بانگی دا، پاشان قامەتی کرد، دواتر نوێژی بۆ کردین.

---

(١) صحيح.

(٢) إسناده ضعيف.

## بَابُ النَّاسِي لِصَلَاةِ الْفَرِيضَةِ يَذْكُرُهَا بَعْدَ ذَهَابِ وَقْتِهَا، وَالرُّخْصَةِ لَهُ فِي التَّطَوُّعِ قَبْلَ الْفَرِيضَةِ وَفِيهِ مَا دَلَّ عَلَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُرِدْ بِقَوْلِهِ: «مَنْ نَامَ عَنْ صَلَاةٍ فَلْيُصَلِّهَا إِذَا اسْتَيْقَظَ» أَنَّ وَقْتَهَا حِينَ يَسْتَيْقِظُ لَا وَقْتَ لَهَا غَيْرُ ذَلِكَ، وَإِنَّمَا أَرَادَ أَنَّ فَرْضَ الصَّلَاةِ غَيْرُ سَاقِطٍ عَنْهُ بِنَوْمِهِ عَنْهَا حَتَّى يَذْهَبَ وَقْتُهَا، بَلِ الْوَاجِبُ قَضَاؤُهَا بَعْدَ الِاسْتِيقَاظِ، فَإِذَا قَضَاهَا عِنْدَ الِاسْتِيقَاظِ أَوْ بَعْدَهُ، كَانَ مُؤَدِّيًا لِفَرْضِ الصَّلَاةِ الَّتِي قَدْ نَامَ عَنْهَا

٩٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَعْرَسْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَمْ نَسْتَيْقِظْ حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَأْخُذْ كُلُّ إِنْسَانٍ بِرَأْسِ رَاحِلَتِهِ؛ فَإِنَّ هَذَا مَنْزِلٌ حَضَرَنَا فِيهِ الشَّيْطَانُ»، فَفَعَلْنَا، فَدَعَا بِالْمَاءِ، فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ صَلَّى سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، وَصَلَّى الْغَدَاةَ [(١)].

**باسی ئەو کەسەی نوێژێکی فەرزی بیر چووە لەدوای ڕۆیشتنی کاتەکەی بیری دەکەوێتەوە، وە مۆڵەتدان بە نوێژی سوننەت پێش فەرز، وە بەڵگەشی تێدایە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەیدا کە فەرموویەتی: (مَنْ نَامَ عَنْ صَلَاةٍ فَلْيُصَلِّهَا إِذَا اسْتَيْقَظَ)، واتە: هەر کەسێك خەوی لێ کەوت و بەخەبەر نەهاتەوە بۆ نوێژ، با نوێژەکەی بکات ئەگەر بەخەبەر هاتەوە. مەبەستی ئەوە نەبوو کاتەکەی تەنها ئەو کاتەیە کە بەخەبەر هاتەوە جگە لەو کاتە کاتێکی دیکەی بۆ نییە، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە نوێژی فەرز لەسەری لاناچێت بەهۆی ئەوەی بەسەریدا خەوتووە بەخەبەر نەهاتووە، تا کاتەکەی ڕۆیشتووە، بەڵکوو پێویستە دوای بەخەبەرهاتنەوەی دووبارەی بکاتەوە، جا ئەگەر قەزای کردەوە لە کاتی بەخەبەرهاتنەوە یان دوای ئەوە، ئەوە ئەو فەرزەکەی بەجێ هێناوە کە بەسەریدا خەوتووە و بەخەبەر نەهاتۆتەوە**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆتایی شەو دابەزین و خەوتین بەخەبەر نەهاتینەوە تا خۆر هەڵهات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هەر کەسێك ڕەشمەی وشترەکەی بگرێت، چونکە ئەم جێگایەی ئێمە بۆی دابەزین شەیتانی تێدایە، وتی: ئێمەش ئەوەمان کرد، دواتر داوای کرد ئاوی بۆ بهێنرێ، دەستنوێژی گرت، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان قامەتی نوێژ کرا، نوێژی بەیانی کرد.

---

(١) صحيح.

**بَابُ إِسْقَاطِ فَرْضِ الصَّلَاةِ عَنِ الْحَائِضِ أَيَّامَ حَيْضِهَا وَالدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ اللَّهَ ﷻ إِنَّمَا فَرَضَ الصَّلَاةَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٣١﴾ ﴾ إبراهيم، وَفِي قَوْلِهِ: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقرة، عَلَى بَعْضِ الْمُؤْمِنِينَ لَا عَلَى جَمِيعِهِمْ، إِذْ لَوْ كَانَ فَرْضُ الصَّلَاةِ عَلَى جَمِيعِ الْمُؤْمِنِينَ كَانَ فَرْضُ الصَّلَاةِ عَلَى الْحَائِضِ كَمَا هُوَ عَلَى غَيْرِهَا، وَهَذَا مِنَ الْجِنْسِ الَّذِي أَجْمَلَ اللَّهُ فَرْضَهُ، وَوَلَّى نَبِيَّهُ ﷺ بَيَانَهُ عَنْهُ، فَأَعْلَمَ أَنَّ فَرْضَ الصَّلَاةِ زَائِلٌ عَنِ الْمَرْأَةِ أَيَّامَ حَيْضِهَا:**

١٠٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ فَوَعَظَهُمْ، ثُمَّ قَالَ: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ، إِنَّكُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ»، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ جَزْلَةٌ: وَبِمَ ذَاكَ؟ قَالَ: «بِكَثْرَةِ اللَّعْنِ، وَكُفْرِكُنَّ الْعَشِيرَ، وَمَا رَأَيْتُ مِنَ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَغْلَبَ لِذَوِي الْأَلْبَابِ وَذَوِي الرَّأْيِ مِنْكُنَّ» قَالَتِ امْرَأَةٌ: مَا نُقْصَانُ عُقُولِنَا وَدِينِنَا؟ قَالَ: «شَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ مِنْكُنَّ بِشَهَادَةِ رَجُلٍ، وَنُقْصَانُ دِينِكُنَّ الْحَيْضَةُ، تَمْكُثُ إِحْدَاكُنَّ الثَّلَاثَ أَوِ الْأَرْبَعَ لَا تُصَلِّي»[1].

**باسی هەڵگرتنی حوکمی نوێژکردن لەسەر ئافرەتی حەیزدار لە ڕۆژانی حەیز، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوا ﷻ لە فەرماییشتەکەی فەرموویەتی: ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ بە بەندەکانم بڵێ کە باوەڕیان هێناوە نوێژەکانیان بەجێ بهێنن. لە فەرماییشتەکەی: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: نوێژەکانتان بەجێ بهێنن. تەنها نوێژی لەسەر هەندێ لە باوەڕداران فەرز کردووە نەك هەموویان، چونکە ئەگەر نوێژ لەسەر هەموو باوەڕداران بووایە ئەوە نوێژ لەسەر حەیزدار فەرز دەبوو وەکوو چۆن لەسەر جگە لە ئەو فەرزە، ئەمەش لەو شێوازەیە کە خوا ﷻ فەرزبوونی بەکورتی هێناوە و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاسپاردووە ڕوونی بکاتەوە، ئەویش ڕایگەیاندووە نوێژی فەرز لەسەر ئافرەت لادەچێ لە ڕۆژانی حەیزدا**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ خەڵك دا و ئامۆژگاری کردن، پاشان (وتاری بۆ ئافرەتان دا) فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، بەڕاستی زۆربەی خەڵکی نێو ئاگر ئێوەن، ئافرەتێك وتی: لەبەر چی؟ فەرمووی: بەهۆی نەفرین

---

(١) صحيح.

و لەعنەتی زۆر، وە کوفرکردنتان بەرانبەر مێردەکانتان (واتە: شتی نابەجێیان بەرانبەر دەکەن)، نەمبینیوە هیچ شتێك لە ئەقڵ و دین نوقسان لە ئێوە (واتە: ئافرەتان) زاڵتر بێت بەسەر پیاوانی ژیر و خاوەن بۆچوونی پەسەند. (واتە: لەگەڵ ئەوەدا ئافرەتان ئەقڵ و دینیان ناتەواوە دەتوانن ئەقڵی پیاوێکی ژیر و تیگەیشتوو ببەن و بەلای خۆیاندا ڕایبکێشن)، ئافرەتێك وتی: ناتەواوی و کەموکوڕی ئەقڵ و دینی لەکوێدایە؟ فەرمووی: شایەتی دوو ئافرەت لە ئێوە بە شایەتی پیاوێك وەردەگیرێ، وە ناتەواوی دینیشتان حەیزە، هەر یەکێك لە ئێوە سێ ڕۆژ یان چوار ڕۆژی بەسەردا تێپەڕ دەبێت نوێژ ناکات.

## بَابُ ذِكْرِ نَفْيِ إِيجَابِ قَضَاءِ الصَّلَاةِ عَنِ الْحَائِضِ بَعْدَ طُهْرِهَا مِنْ حَيْضِهَا

١٠٠١- عَنْ مُعَاذَةَ: أَنَّ امْرَأَةً، سَأَلَتْ عَائِشَةَ ﵂: أَتَقْضِي الْحَائِضُ لِلصَّلَاةِ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ كَانَتْ تَحِيضُ فَلَا تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ قَالَتْ: وَذَكَرَتْ أَنَّهَا سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ[1].

## باسی ئافرەتی حەیزدار دوای پاکبوونەوەی لە حەیزەکەی، گێڕانەوەی نوێژەکانی لەسەر پێویست نابێت

واتە: موعازە دەگێڕێتەوە، ئافرەتێك پرسیاری لە عائیشە ﵂ کرد ئایا حەیزدار نوێژەکانی قەزا دەکاتەوە؟ وتی: ئایا تۆ (حەروریەی)؟ (کە دەستەیەك بوون لە خەواریج، جا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ) ئافرەت دەکەوتە حەیزەوە فەرمانی پێ نەدەکرا نوێژەکانی قەزای بکاتەوە. وتی: ئەو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد.

---

(١) صحيح.

## ناوەڕۆک

